04

بەرگی چوارەم

# سنن الترمذي

بەکوردی

لأبي عيسى محمد بن عيسى الترمذي

وەرگێڕانی:

ناصح ئیبراهیم سازانی



# سنن الترمذي به کوردی به سەرجەم وتەکانی (ترمذی)ەوە - بەرگی چوارەم

## نووسینی: لأبي عیسی محمد بن عیسی (الترمذي)، ناصح ئیبراهیم سازانی(وەرگێڕ)



چاپی یەکەم ١٤٤١ك - ٢٠٢١ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێرست - نوسینگەی تەفسیر
ناصح ئیبراهیم سازانی
سنن الترمذي به کوردی - بەرگی چوارەم، لأبي عیسی- محمد بن عیس (الترمذي)، ناصح ئیبراهیم سازانی(وەرگێڕ)
٨٤٦ لاپەڕە،
١٧* ٢٤ سم
بابەت، فەرمووده
ISBN: 978-9922-632-89-6

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٧٥) ی ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین: نوسینگەی تەفسیر
خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

# سنن الترمذي

## بەکوردی

لأبی عیسی محمد بن عیسی الترمذی
(٢٠٩ - ٢٧٩ هـ)

بەرگی چوارەم

لە فەرموودەی

(3956-2950)


وەرگێڕانی

ناصح ئیبراهیم سازانی

# باسەکانی تەفسیری قورئان لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٤٤ – أَبْوَابُ تَفْسِيرِ الْقُرْآنِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### دەربارەی کەسێ بە بیروبۆچوونی خۆی تەفسیر بکات

### ١ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الَّذِي يُفَسِّرُ الْقُرْآنَ بِرَأْيِهِ

٢٩٥٠ – (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَالَ فِي الْقُرْآنِ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەبێ زانست و بەبێ بەڵگەو بەبیروبۆچوونی خۆی تەفسیری قورئان بکات ئەوە با جێگەیە لەئاگری دۆزەخ بۆ خۆی دابنێ).

٢٩٥١ – (ضعيف) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ عَمْرٍو الكَلْبِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: اتَّقُوا الحَدِيثَ عَنِّي إِلاَّ مَا عَلِمْتُمْ، فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، وَمَنْ قَالَ فِي القُرْآنِ بِرَأْيِهِ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاگاداربن فەرموودە لە منەوە مەگێڕنەوە هەتا سوور نەزانن فەرموودەی منە، هەركەس بەناوی منەوە درۆ بكات با جێگەیە لەئاگری دۆزەخ بۆ خۆی دابنێ، هەركەس بەبێ زانست و بەبێ بەڵگەو بەبیروبۆچوونی خۆی تەفسیری قورئان بكات ئەوە با جێگەیە لەئاگری دۆزەخ بۆ خۆی دابنێ).

٢٩٥٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُهَيْلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ وَهُوَ ابْنُ أَبِي حَزْمٍ، أَخُو حَزْمٍ القُطَعِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ الجَوْنِيُّ، عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَالَ فِي القُرْآنِ بِرَأْيِهِ فَأَصَابَ فَقَدْ أَخْطَأَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ فِي سُهَيْلِ بْنِ أَبِي حَزْمٍ، وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ، أَنَّهُمْ شَدَّدُوا فِي هَذَا فِي أَنْ يُفَسَّرَ القُرْآنُ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَأَمَّا الَّذِي رُوِيَ عَنْ مُجَاهِدٍ وَقَتَادَةَ وَغَيْرِهِمَا مِنْ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُمْ فَسَّرُوا القُرْآنَ، فَلَيْسَ الظَّنُّ بِهِمْ أَنَّهُمْ قَالُوا فِي القُرْآنِ أَوْ فَسَّرُوهُ بِغَيْرِ عِلْمٍ أَوْ مِنْ قِبَلِ أَنْفُسِهِمْ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُمْ مَا يَدُلُّ عَلَى مَا قُلْنَا، أَنَّهُمْ لَمْ يَقُولُوا مِنْ قِبَلِ أَنْفُسِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ.

واتە: لە جوندوبی كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس بەبێ زانست و بەبێ بەڵگەو بەبیروبۆچوونی خۆی تەفسیری قورئان بكات ئەگەر بیشیپێكێ هەر هەڵەی كردووە و گوناهبارە).

٢٩٥٢ (م١)- (صحيح الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مَهْدِيٍّ البَصْرِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: مَا فِي القُرْآنِ آيَةٌ إِلاَّ وَقَدْ سَمِعْتُ فِيهَا شَيْئًا.

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هیچ ئایەتێ نیە لە قورئاندا شتێكم لەبارەیی تەفسیرەكەیەوە نەبیستبێ.

٢٩٥٢ (م٢)- (صحيح الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: قَالَ مُجَاهِدٌ: لَوْ كُنْتُ قَرَأْتُ قِرَاءَةَ ابْنِ مَسْعُودٍ لَمْ أَحْتَجْ أَنْ أَسْأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ كَثِيرٍ مِنَ القُرْآنِ مِمَّا سَأَلْتُ.

واتە: لە ئەعمەشەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: موجاهید فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر بە قیرائەتی ئینو مەسعود قورئانم بخوێندایەتەوە ئەوەندە پرسیارم نەدەكرد لە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەربارەی تەفسیرەكەی.

## دەربارەی سورەتی (فَاتِحَةِ)

## ٢ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ

٢٩٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ فَهِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تَمَامٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، إِنِّي أَحْيَانًا أَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ. قَالَ: يَا ابْنَ الفَارِسِيِّ، فَاقْرَأْهَا فِي نَفْسِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ

بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، فَنِصْفُهَا لِي وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ. يَقُومُ الْعَبْدُ فَيَقُولُ: (الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ) فَيَقُولُ اللَّهُ: حَمِدَنِي عَبْدِي. فَيَقُولُ (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) فَيَقُولُ اللَّهُ: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي. فَيَقُولُ (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ) فَيَقُولُ: مَجَّدَنِي عَبْدِي وَهَذَا لِي، وَبَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) وَآخِرُ السُّورَةِ لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، يَقُولُ: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ. وَرَوَى ابْنُ جُرَيْجٍ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي السَّائِبِ، مَوْلَى هِشَامِ بْنِ زُهْرَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا. وَرَوَى ابْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، وَأَبُو السَّائِبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر كەسێك لە نوێژەكەیدا سورەتی فاتیحە نەخوێنێت ئەوە نوێژەكەی ناكامڵە، ناكامڵە، ناكامڵە، تەواو نیە). وتی: وتم: ئەی ئەبو هورەیرە! هەندێ جار لەدوای پێشنوێژەوەم سورەتی فاتیحە چۆن بخوێنم، وتی: ئەی كوڕی فارسی، بە نهێنی بۆ خۆت بیخوێنە، چونكە من بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (خوای گەورە دەفەرموێت: نوێژم دابەش كردووە لە نێوان خۆم و بەندەكەمدا، نیوەی بۆ منە، نیوەكەی تریشی بۆ بەندەكەمە، ئەوەی بەندەكەم داوای دەكات پێی دەبەخشم، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دەفەرموێت: (بخوێنن، كاتێ كە بەندە دەڵێت: (**الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ**). واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوای خاوەنی هەموو

جیهانیـان و بوونـەوەر، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: بەندەکـەم سـوپاس و ستایشـی کردم. کاتیێ کە بەندە دەڵێت: (**الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**). واتـە: بەخشـندەو میهرەبانـە ئـەو خوایەی کانگای رەحمەت و سۆزو بەزەییە، خوای گـەورەش دەفـەرموێت: بەندەکـەم مـەدح و سـەنای کـردم. کـاتیێ کـە دەڵێـت: (**مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ**). واتـە: خـاوەن و سەرداری رۆژی قیامەت، خوای گەورە دەفەرموێت: سەرنج بـدەن ئـەوەتا بەندەکـەم بەخاوەن دەسـەڵات و شـکۆمەندم دەزانێـت.. کاتێـك دەڵێـت: (**إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ**). واتە: خودایە عیبادەت هەر بۆ تـۆ دەکـەم، داوای کۆمـەکی هـەر لـە تـۆ دەکەم، پشت و پەنام هەر تۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم راسـت دەکـات ئەوەتە بەکردارو بەگوفتار هەر من دەپەرستێت و هەر منیش بە پشتیوان دەزانێت. تائێرە بەینی من و بەندەکەم بوو، بـۆ بەندەکـەم هەیـە داوا بکـات، کاتێـك دەڵـێ: (**إِيَّاكَ نَعْبُدُ، وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ**). خوای گەورە دەفەرموێت: ئەمە بۆ بەندەکەمە، ئەوەی داوای کرد پێی دەبەخشم)، دەڵێ: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ**).

٢٩٥٣ (م١) - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، وَيَعْقُوبُ بْنُ سُفْيَانَ الفَارِسِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، وَأَبُو السَّائِبِ، مَوْلَى هِشَامِ بْنِ زُهْرَةَ، وَكَانَا جَلِيسَيْنِ لأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ، فَهِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تَمَامٍ وَلَيْسَ فِي حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي أُوَيْسٍ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا وَسَأَلْتُ أَبَا زُرْعَةَ عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: كِلاَ الحَدِيثَيْنِ صَحِيحٌ، وَاحْتَجَّ بِحَدِيثِ ابْنِ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ العَلاَءِ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی:

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك لە نوێژەکەیدا سورەتی فاتیحە نەخوێنێت ئەوە نوێژەکەی ناکامڵە، ناکامڵە، ناکامڵە، تەواو نیە).

٢٩٥٣ (م٢)- (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ أَبِي قَيْسٍ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ حُبَيْشٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ الْقَوْمُ: هَذَا عَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ وَجِئْتُ بِغَيْرِ أَمَانٍ وَلاَ كِتَابٍ، فَلَمَّا دُفِعْتُ إِلَيْهِ أَخَذَ بِيَدِي، وَقَدْ كَانَ قَالَ قَبْلَ ذَلِكَ: إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ يَدَهُ فِي يَدِي، قَالَ: فَقَامَ فَلَقِيَتْهُ امْرَأَةٌ وَصَبِيٌّ مَعَهَا، فَقَالاَ: إِنَّ لَنَا إِلَيْكَ حَاجَةً. فَقَامَ مَعَهُمَا حَتَّى قَضَى حَاجَتَهُمَا، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِي حَتَّى أَتَى بِي دَارَهُ، فَأَلْقَتْ لَهُ الْوَلِيدَةُ وِسَادَةً فَجَلَسَ عَلَيْهَا، وَجَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: مَا يُفِرُّكَ أَنْ تَقُولَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَهَلْ تَعْلَمُ مِنْ إِلَهٍ سِوَى اللهِ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ. قَالَ: ثُمَّ تَكَلَّمَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا تَفِرُّ أَنْ تَقُولَ اللَّهُ أَكْبَرُ، وَتَعْلَمُ شَيْئًا أَكْبَرُ مِنَ اللهِ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَإِنَّ الْيَهُودَ مَغْضُوبٌ عَلَيْهِمْ، وَإِنَّ النَّصَارَى ضُلاَّلٌ قَالَ: قُلْتُ: فَإِنِّي ضَيْفٌ مُسْلِمٌ، قَالَ: فَرَأَيْتُ وَجْهَهُ تَبَسَّطَ فَرَحًا، قَالَ: ثُمَّ أَمَرَ بِي فَأُنْزِلْتُ عِنْدَ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ جَعَلْتُ أَغْشَاهُ آتِيهِ طَرَفَيِ النَّهَارِ، قَالَ: فَبَيْنَا أَنَا عِنْدَهُ عَشِيَّةً إِذْ جَاءَهُ قَوْمٌ فِي ثِيَابٍ مِنَ الصُّوفِ مِنْ هَذِهِ النِّمَارِ، قَالَ: فَصَلَّى وَقَامَ فَحَثَّ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ قَالَ: وَلَوْ صَاعٌ وَلَوْ بِنِصْفِ صَاعٍ وَلَوْ قَبْضَةٌ وَلَوْ بِبَعْضِ قَبْضَةٍ يَقِي أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ حَرَّ جَهَنَّمَ أَوِ النَّارِ وَلَوْ بِتَمْرَةٍ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لاَقِي اللَّهَ وَقَائِلٌ لَهُ مَا أَقُولُ لَكُمْ: أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ سَمْعًا وَبَصَرًا؟ فَيَقُولُ: بَلَى، فَيَقُولُ: أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ مَالاً وَوَلَدًا؟ فَيَقُولُ: بَلَى، فَيَقُولُ، أَيْنَ مَا قَدَّمْتَ لِنَفْسِكَ؟ فَيَنْظُرُ قُدَّامَهُ وَبَعْدَهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ لاَ يَجِدُ شَيْئًا يَقِي بِهِ وَجْهَهُ حَرَّ جَهَنَّمَ، لِيَقِ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ، فَإِنِّي لاَ أَخَافُ عَلَيْكُمُ

الفَاقَةَ، فَإِنَّ اللَّهَ نَاصِرُكُمْ وَمُعْطِيكُمْ حَتَّى تَسِيرَ الظَّعِينَةُ فِيمَا بَيْنَ يَثْرِبَ وَالحِيرَةِ أَوْ أَكْثَرَ مَا يُخَافُ عَلَى مَطِيَّتِهَا السَّرَقُ قَالَ: فَجَعَلْتُ أَقُولُ فِي نَفْسِي: فَأَيْنَ لُصُوصُ طَيِّئٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ حُبَيْشٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الحَدِيثَ بِطُولِهِ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەمزگەوت، خەڵکەکە وتیان: ئەوە عەدی کوڕی حاتیمە، بەبێ ئەمان و بەبێ نامە ڕۆشتبووم، کاتێ بردمیانە خزمەتی دەستی گرتم، بێگومان پێشتر فەرموو بووی: (ئاواتەخوازم خوای گەورە کارێ بکات دەستم بەر دەستی بکەوێ)، عەدی وتی: هەستایەوە لەبەرم، ژنێك منداڵێکی لەگەڵ بوو هاتن بۆ خزمەتی: وتیان: کارمان بە تۆ هەیە، هەستان لەگەڵی ڕۆشتن و کارەکەیان جێبەجێکرد، لەپاشدا دەستی گرتم و بردمی بۆماڵی خۆیان، کەنیزەکێ سەرینێکی بۆ دانا لەسەری دانیشت، منیش لەبەردەمیدا دانیشتم، ئینجا فەرمووی: (بۆچی هەڵدێی لەوەی بڵێی: (**لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ**)، جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە، ئایا تۆ جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی بەهەق دەزانیت؟) وتی: وتم: نەخێر، وتی: ماوەیەکی تر قسەی کرد، لەپاشدا فەرمووی: (بێگومان تۆ لەوە هەڵدێی کە بڵێ: (الله أکبر)، وا دەزانی شتێ لە خوا گەورەتر هەیە؟) وتی: وتم: نەخێر، فەرمووی: (بێگومان (**غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ**) مەبەستی لە جولەکەیە، هەروەها (**وَلاَ الضَّالِّينَ**). مەبەستی لە گاورەکانە)، وتی: وتم: بەڕاستی من بە موسوڵمانیەتی هاتووم بۆ خزمەتت، وتی: بینیم لەخۆشی و شادیدا ڕوخساری گەشایەوە، وتی: لەپاشدا فەرمانی پێ کردم لەماڵی پیاوێکی

ئەنصاری دابەزم و میوانی ئەوان بم، ئیتر ڕۆژانە سەردانی پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم دەکرد، جارێ لە خزمەتیدا بووم، کۆمەڵێ هاتن پۆشاکی خوریان لەبەردا بوو لە نیمار، بەرنوێژی کردو هەستا، خەڵکەکەی هاندا لەسەر ئەوەی چەندیان لەتوانادایە پێیان ببەخشن، لەپاشدا فەرمووی: ببەخشن با (صاع)مەنێ یان نیو مەن بێ، یا پڕی مشتێ یان نیو مشتیش بێ، هەریەکێ لەئێوە ڕوومەتی خۆی بپارێزێ لە گەرمای دۆزخ یان ئاگر، ئەگەر بە دەنکە خورمایە یان بە لەتە خورمایەکیش بووە، چونکە هەریەکێ لەئێوە کاتێ گەیشت بە خوای گەورە پێتان دەفەرموێت، وەك چۆن من ئێستا پێتان دەفەرموم: ئایا گوێ و چاوم پێ نەدای؟ دەڵێ: بەڵێ، دەفەرموێت: ئایا ماڵ و سامان منداڵم پێ نەبەخشیت؟ دەڵێ: بەڵێ، دەفەرموێت: ئەی چیت پێشخستووە بۆ خۆت، ئەویش سەیری پێش و پاشی و لای ڕاستی و لای چەپی خۆی دەکات، هیچ شتێکی دەست ناکەوێ ڕوومەتی خۆی پێ بپارێزێ لە گەرمای دۆزخ، جا با هەریەکێ لەئێوە ڕوومەتی خۆی بپارێزێ لە ئاگر، ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بووە، ئەگەر ئەوەشی دەست نەکەوت با بە وشەیەکی جوان ڕوومەتی خۆی بپارێزێ لە ئاگر، من لە هەژاری و نەداریتان ناترسم، خوای گەورە سەرتان دەخات و پێتان دەبەخشێ، بە شێوەیە ئافرەت لەناو کەژاوەدا بە سواری وڵاخەوە لە مەدینەوە دەڕوات بۆ حیرە، زیاتر لەوە دەترسێت وڵاخەکەی بدزن). وتی: لەدڵی خۆمدا وتم: ئەی دز و جەردە و ڕێگرەکانی هۆزی (طيء) لەکوێن.

٢٩٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، وَبُنْدَارٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ حُبَيْشٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ،

عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اليَهُودُ مَغْضُوبٌ عَلَيْهِمْ وَالنَّصَارَى ضُلاَّلٌ فَذَكَرَ الحَدِيثَ بِطُولِهِ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((**غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ**) واتە: جولەکەکان، (**وَلاَ الضَّالِّينَ**). واتە: گاوورەکان).

**دەربارەی تەفسیری سورەتی (الْبَقَرَةِ).**

**٣ – بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ البَقَرَةِ**

٢٩٥٥ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، وَمُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَعَبْدُ الوَهَّابِ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَوْفُ بْنُ أَبِي جَمِيلَةَ الأَعْرَابِيُّ، عَنْ قَسَامَةَ بْنِ زُهَيْرٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى خَلَقَ آدَمَ مِنْ قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جَمِيعِ الأَرْضِ، فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الأَرْضِ، فَجَاءَ مِنْهُمُ الأَحْمَرُ وَالأَبْيَضُ وَالأَسْوَدُ وَبَيْنَ ذَلِكَ، وَالسَّهْلُ وَالحَزْنُ وَالخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان خوای گەورە ئادەمی دروستکردووە لە مشتێ خۆڵ لەهەموو بەش و پارچەکانی سەر زەوی، بۆیە نەوەکانی لەسەر شێوازی هەموو زەوین، هەیانە ڕەنگی سورە، هەیانە سپی، هەشیانە ڕەش، لەنێوان ئەو ڕەنگانەدا کەسانی لەسەرخۆ و ڕۆح سوك و توند و ڕەق و خەمۆك و، دەرون پیس و دەرون پاك هەن).

٢٩٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (وَادْخُلُوا البَابَ سُجَّدًا) قَالَ: دَخَلُوا مُتَزَحِّفِينَ عَلَى أَوْرَاكِهِمْ أَيْ مُنْحَرِفِينَ، وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ) قَالَ: قَالُوا حَبَّةٌ فِي شَعْرَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: **(وَادْخُلُوا البَابَ سُجَّدًا)**. واتە: لەدەروازەی شارەکەوە بچنە ژوورەوە بەڕێز و بەکڕنووشی (پێزانینەوە). فەرمووی: کەچی ئەوان بە قنەخشکێ لەسەر سمت چوونە ژوورەوە. **(فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ)**. سورة البقرة: ٥٩. واتە: کەچی ئەوانەی ستەمکاربوون (ئەوەی پێیان وترابوو) گۆڕییان بەوەی پێیان نەوترابوو.، فەرمووی: لە جیاتی (حطة) وتیان: **(حَبَّةٌ فِي شَعْرَةٍ)**.

٢٩٥٧ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَشْعَثُ السَّمَّانُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ فَلَمْ نَدْرِ أَيْنَ القِبْلَةُ، فَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا عَلَى حِيَالِهِ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا ذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلَتْ: (فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ). هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَشْعَثَ السَّمَّانِ أَبِي الرَّبِيعِ عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ وَأَشْعَثُ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ.

واتە: لە عامیری کوڕی رەبیعەوە، لەباوکیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەشەوێکی تاریکدا لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بووین، نەماندەزانی قیبلە لەکوێوەیە، هەریەك لە ئێمە بە

مەزەندەی خۆی قیبلەی دیاریکرد و نوێژمان کرد، کاتێ کە ڕۆژ بوویەوە، ئەو حاڵەمان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتە دابەزی: **(فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ)**. واتە: ڕووبکەنە هەر لایە (لەنوێژدا) ئەوە ڕووگەی خوایە.

٩٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ تَطَوُّعًا حَيْثُمَا تَوَجَّهَتْ بِهِ وَهُوَ جَاءٍ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ ثُمَّ قَرَأَ ابْنُ عُمَرَ، هَذِهِ الآيَةَ: (وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالمغْرِبُ) الآيَةَ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَفِي هَذَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيُرْوَى عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّهُ قَالَ فِي هَذِهِ الآيَةِ: (وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالمغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ) قَالَ قَتَادَةُ: هِيَ مَنْسُوخَةٌ نَسَخَهَا قَوْلُهُ: (فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الحَرَامِ) أَيْ تِلْقَاءَهُ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ. وَيُرْوَى عَنْ مُجَاهِدٍ، فِي هَذِهِ الآيَةِ: (فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ) قَالَ: فَثَمَّ قِبْلَةُ اللَّهِ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ عَرَبِيٍّ، عَنْ مُجَاهِدٍ، بِهَذَا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەر وڵاخەکەیەوە نوێژی سوننەتی دەکرد ڕووی لەکوێ بوایە، کاتێ لەمەککەوە دەهات بۆ مەدینە، جا ئیبنو عومەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ)**. واتە: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەر بۆ خوایە. ئیبنو عومەر فەرمووی: ئەم ئایەتە بەو هۆیەوە دابەزی. لەقەتادەوە کە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: **(وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ)**. واتە: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەر بۆ خوایە، ڕووبکەنە هەر لایە (لەنوێژدا)

ئەوە رووگەی خوایە. نەسخ بۆتەوە بەم ئایەتە: (**فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ**). واتە: ئیتر روو وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (الْمَسْجِدِ الحَرَامِ).

| ٢٩٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ عُمَرَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ لَوْ صَلَّيْنَا خَلْفَ الْمَقَامِ، فَنَزَلَتْ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. |
|---|

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خۆزگە لەدوای مەقامی ئیبراهیمەوە نوێژمان دەکرد، ئەم ئایەتە بەو هۆیەوە دابەزی: (**وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى**). واتە: پێمان وتن شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم لەسەری رادەوەستا (لەکاتی دروسکردنی کەعبەدا) بکەنە جێگای نوێژ.

| ٢٩٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ: لَوِ اتَّخَذْتَ مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى، فَنَزَلَتْ (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. |
|---|

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خۆزگە مەقامی ئیبراهیمت دەکردە جێگای نوێژ، ئەم ئایەتە بەو هۆیەوە دابەزی: (**وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى**).

| ٢٩٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: |
|---|

(وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا) قَالَ: عَدْلاً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يُدْعَى نُوحٌ فَيُقَالُ: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُدْعَى قَوْمُهُ، فَيُقَالُ: هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: مَا أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ، وَمَا أَتَانَا مِنْ أَحَدٍ، فَيُقَالُ: مَنْ شُهُودُكَ؟ فَيَقُولُ مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ، قَالَ: فَيُؤْتَى بِكُمْ تَشْهَدُونَ أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ، فَذَلِكَ قَوْلُ اللهِ: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) وَالوَسَطُ: العَدْلُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: **(وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا)**. واتە: كردوومانن بە گەلێكی میانڕەوی (هەڵبژاردە). (وسطا) واتە: (عدلا).

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژی قیامەتدا نوح بانگ دەكرێت، پێی دەوترێت: ئایا بانگەوازەكەت گەیاند؟ دەفەرمووێ: بەڵێ، قەومەكەی بانگ دەكرێت، پێیان دەوترێت: ئایا بانگەوازەكەی پێ گەیاندن؟ دەڵێن: ترسێنەرمان بۆ نەهاتووە، كەسمان بۆ نەهاتووە، بە نوح دەوترێت: كێ شایەتتە كە بانگەوازەكەت پێ گەیاندوون؟ دەفەرمووێت: موحەممەد و ئوممەتەكەی، جا دەتانهێنن و شایەتی دەدەن كە گەیاندویەتی، ئەمەش وتەی خوای گەورە لەوبارەوە: **(وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا)**. سورة البقرة: ١٤٣. واتە: كردوومانن بە گەلێكی میانڕەو (ی

هەڵبژاردە)، تا ببنە چاودێر بەسەر خەڵکەوە، وە پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم چاودێر بێت بەسەر ئێوەوە. (وسط) واتە: (عدل).

٢٩٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ صَلَّى نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الكَعْبَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الحَرَامِ) فَوُجِّهَ نَحْوَ الكَعْبَةِ، وَكَانَ يُحِبُّ ذَلِكَ، فَصَلَّى رَجُلٌ مَعَهُ العَصْرَ، قَالَ: ثُمَّ مَرَّ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُمْ رُكُوعٌ فِي صَلاَةِ العَصْرِ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَقَالَ: هُوَ يَشْهَدُ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَّهُ قَدْ وُجِّهَ إِلَى الكَعْبَةِ، قَالَ: فَانْحَرَفُوا وَهُمْ رُكُوعٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کۆچی کرد بۆ مەدینە شانزە یان حەڤدە مانگ بەرەو قودس نوێژی دەکرد، بەڵام ئەو حەزی دەکرد ڕوویکاتە کەعبە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ)**. سورة البقرة: ١٤٤.
واتە: بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕوخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین، دەی سوێند بەخوا ڕووت دەکەینە ڕووگەیەك کە پەسەندت بێ، ئیتر ڕووت وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە، ئێوەش ئەی موسوڵمانان لەهەر لایەك بوون (لەنوێژدا) ڕووتان بکەنە ئەویەوە. جا خوای گەورە لە نوێژدا ڕووی پێ وەرچەرخاند بەرەو لای کەعبە، ئەویش پێی خۆش بوو، پیاوێ لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بەرەو

كەعبە نوێژی كرد، فەرمووی: كاتێ كە ڕۆشت دای بەلای كۆمەڵێ لە ئەنصارەكاندا لە ركوعی نوێژی عەسردا بوون بەرەو قودس، فەرمووی: شایەتیدا كە لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم نوێژی عەسری كردووە، بێگومان بەرەو كەعبە، فەرمووی: ئەوانیش لەركوعدا ڕوویان وەرچەرخاند بەرەو كەعبە.

٢٩٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانُوا رُكُوعًا فِي صَلاَةِ الفَجْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعُمَارَةَ بْنِ أَوْسٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە ركوعی نوێژی بەیانیدا بوون.

٢٩٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَأَبُو عَمَّارٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا وُجِّهَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الكَعْبَةِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ كَيْفَ بِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يُصَلُّونَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەنوێژدا ڕووی وەرگێڕا بەرەو كەعبە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی ئەوانە حاڵیان چۆنە مردن و لەنوێژەكانیاندا ڕوویان دەكردە (بيت المقدس)، نوێژەكانیان قبوڵە یان نا؟ خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ)**. سورة البقرة: ١٤٣. واتە: خۆ خوای گەورە پاداشتی ئەو نوێژ و بڕوای جارانتانە بەفیڕۆ نادا.

٢٩٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ، يُحَدِّثُ عَنْ عُرْوَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا أَرَى عَلَى أَحَدٍ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ شَيْئًا، وَمَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَطُوفَ بَيْنَهُمَا، فَقَالَتْ: بِئْسَ مَا قُلْتَ يَا ابْنَ أُخْتِي، طَافَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَطَافَ الْمُسْلِمُونَ، وَإِنَّمَا كَانَ مَنْ أَهَلَّ لِمَنَاةَ الطَّاغِيَةِ الَّتِي بِالمشَلَّلِ لاَ يَطُوفُونَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (فَمَنْ حَجَّ البَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) وَلَوْ كَانَتْ كَمَا تَقُولُ لَكَانَتْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لأَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَأَعْجَبَهُ ذَلِكَ، وَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَعِلْمٌ، وَلَقَدْ سَمِعْتُ رِجَالاً مِنْ أَهْلِ العِلْمِ يَقُولُونَ: إِنَّمَا كَانَ مَنْ لاَ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ مِنَ العَرَبِ يَقُولُونَ: إِنَّ طَوَافَنَا بَيْنَ هَذَيْنِ الحَجَرَيْنِ مِنْ أَمْرِ الجَاهِلِيَّةِ، وَقَالَ آخَرُونَ مِنَ الأَنْصَارِ: إِنَّمَا أُمِرْنَا بِالطَّوَافِ بِالبَيْتِ، وَلَمْ نُؤْمَرْ بِهِ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (إِنَّ الصَّفَا وَالمرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ) قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: فَأُرَاهَا قَدْ نَزَلَتْ فِي هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عوروەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ وت: وا ئەزانم هەرکەسێ لەکاتی حەج و عومرەدا هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە ئەنجام نەدات گوناهی ناگات و حەج و عومرەکەشی تەواوە، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی خوشکەزاکەم شتێکی خراپت وت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و موسوڵمانانان هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەیان کردووە، لەسەردەمی نەفامی دا ئەنصارەکان ئیحرامیان بۆ بتێ دادەبەست کە ناوی مەنات بوو بەرامبەر بە قەدید، ئەنصارەکان لەسەردەمی نەفامی دا هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەیان بە تاوان دەزانی، کاتێ کە ئیسلام

هات لەوبارەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا**). سورة البقرة:١٥٨. واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەكانی (دینی) خوان، جا هەركەسێ حەجی ماڵی خوای كرد یان عومرەی كرد هیچ تاوانی ناگات تەوافی ئەو دوانەش بكات.

جا عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ بە عوروەی فەرموو: ئایەتەكە بەو شێوەیە نیە كە تۆ لێی تێگەیشتویت و دەیڵێی، بەڵكو بەم شێوەیەیە: هەركەسێ لەكاتی حەج و عومرەدا هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە ئەنجام بدات ئەوە گوناهی ناگات.

٢٩٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي حَكِيمٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، عَنِ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، فَقَالَ: كَانَا مِنْ شَعَائِرِ الجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا كَانَ الإِسْلاَمُ أَمْسَكْنَا عَنْهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (إِنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ فَمَنْ حَجَّ البَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) قَالَ: هُمَا تَطَوُّعٌ (وَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عاصیمی كوڕی ئەحوەلەوە ورووەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: دەربارەی هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە لە ئەنەسی كوڕی مالیكم ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ فەرمووی: لە دروشمەكانی سەردەمی نەفامی بوون، كاتێ كە ئیسلام هات ئیتر هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەمان نەدەكرد، ئەوەبوو لەوبارەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا**). سورة البقرة: ١٥٨. واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەكانی (دینی) خوان، جا هەركەسێ حەجی ماڵی خوای كرد یان عومرەی

کرد هیچ تاوانی ناگات تەوافی ئەو دوانەش بکات.

فەرمووی: واجب نین، (**وَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ**) واتە: هەرکەسێك بە ئارەزووی خۆی چاکەیەکی کرد، ئەوە بێگومان خودا سوپاسگوزارێکی زانایە.

٢٩٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ طَافَ بِالبَيْتِ سَبْعًا فَقَرَأَ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) فَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ، ثُمَّ أَتَى الحَجَرَ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ قَالَ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ وَقَرَأَ: (إِنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە مەککە حەوت جار تەوافی ماڵی خوای کرد، جا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى**). جا لەدوای مەقامەوە دوو ڕکات نوێژی کرد، لەپاشدا چووە لای بەردە ڕەشەکەو دەستی پێدا هێناو ماچی کرد، ئینجا فەرمووی: بەوە دەست پێ دەکەین کە خوای گەورە دەستی پێ کردووە: (**إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ**). سورة البقرة: ١٥٨. واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەکانی (دینی) خوان.

٢٩٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ بْنِ يُونُسَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمًا فَحَضَرَ الإِفْطَارُ فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ، لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلاَ يَوْمَهُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِمًا، فَلَمَّا حَضَرَهُ الْإِفْطَارُ أَتَى امْرَأَتَهُ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكِ طَعَامٌ؟ قَالَتْ: لاَ، وَلَكِنْ أَنْطَلِقُ فَأَطْلُبُ لَكَ، وَكَانَ يَوْمَهُ

يَعْمَلُ فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ وَجَاءَتْهُ امْرَأَتُهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ: خَيْبَةً لَكَ. فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ) فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحًا شَدِيدًا (وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واته: لە بەرائەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر پیاویٚ بەڕۆژوو بوایە پێش ئەوەی بەربانگ بکاتەوە خەوی لیٚ بکەوتایە و هیچەی نەخواردایە، ئیتر دەبوو ئەو شەوەیش هەتا سبەی ئێواریٚ بەڕۆژوو بوایەو هیچی نەخواردایەو ڕۆژووی نەشکاندایە، ڕۆژیٚ صیرمەی کوڕی قەیسی ئەنصاری بەڕۆژوو دەبیٚ ئەو ڕۆژە لەناو زەویەکەیدا کار دەکات و شەکەت و ماندو دەبیٚ کاتیٚ کە دێتەوە بۆماڵەوە کە بەربانگ دەبیٚ بە ژنەکەی دەڵێ: هیچ شتێکت لە خواردن لەلا دەست دەکەوێت؟ وتی: نەخێر، دەڕۆم مشورێکت بۆ دەخۆم بەڵکو شتێکت بۆ پەیدا بکەم، لەبەر ماندوێتی و شەکەتی خەو زۆری بۆ دەهێنیٚ و خەوی لیٚ دەکەوێت، کاتیٚ کە ژنەکەی دێتەوە دەبینیٚ خەوتوە دەڵێ: داخ لەدەست تۆ، نائومێدی بۆ تۆ، لەکاتی نیوەڕۆدا صیرمە لە برسان دەبورێتەوە، جا ئەم باسەیان بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە، لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (**أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ**...) سورة البقرة: ١٨٧. واتە: چونە لای ژنانتان و تێکەڵاوی کردن لەگەڵیاندا لە شەوانی ڕەمەزاندا بۆتان حەڵاڵ کرا . ئیتر هاوەڵان زۆر زۆر شادو دڵخۆش بوون، (**وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ**). سورة البقرة: ١٨٤. واتە: بخۆن و بخۆنەوە تا هێڵی ڕەشی شەو لە هێڵی سپی ڕۆژ جیادەکەنەوە لە شەبەقدا.

٢٩٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ ذَرٍّ، عَنْ يُسَيْعٍ الكِنْدِيِّ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ) قَالَ: الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ، وَقَرَأَ: (وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ)، إِلَى قَوْلِهِ: (دَاخِرِينَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ)**. واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە، فەرمووی: (پاڕانەوە بریتیە لە پەرستش، جا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)** سورة غافر: ٦٠.

٢٩٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُصَيْنٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الفَجْرِ) قَالَ لِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا ذَلِكَ بَيَاضُ النَّهَارِ مِنْ سَوَادِ اللَّيْلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُجَالِدٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ)**. سورة البقرة: ١٨٤. واتە: بخۆن و بخۆنەوە تا هێڵی ڕەشی شەو لە هێڵی سپی ڕۆژ جیادەکەنەوە لە شەبەقدا.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (بێگومان مەبەست لە جیاکردنەوەی رووناکی ڕۆژە لە تاریکی شەو).

٢٩٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الصَّوْمِ فَقَالَ: (حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ) قَالَ: فَأَخَذْتُ عِقَالَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْيَضُ وَالآخَرُ أَسْوَدُ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهِمَا، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، شَيْئًا لَمْ يَحْفَظْهُ سُفْيَانُ، فَقَالَ: إِنَّمَا هُوَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ڕۆژوو واتە هەتا کەی خواردن بخۆین و بخۆینەوە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ ئەویش فەرمووی: **(وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ)**. عەدی فەرمووی: منیش کاتێ پارشێوم دەکرد پەتێکی ڕەش و پەتێکی سپیم ئەهێنا دامئەنا و سەیرم دەکردن هەتا لەیەکم جیادەکردنەوە خواردنم دەخوارد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شتێکی پێ فەرمووم، سوفیان لەبەری نەکرد، فەرمووی: (جیاکردنەوەی ڕووناکی ڕۆژە لە تاریکی شەو).

٢٩٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الضَّحَّاكُ بْنُ مَخْلَدٍ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَسْلَمَ أَبِي عِمْرَانَ التُّجِيبِيِّ، قَالَ: كُنَّا بِمَدِينَةِ الرُّومِ، فَأَخْرَجُوا إِلَيْنَا صَفًّا عَظِيمًا مِنَ الرُّومِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِثْلُهُمْ أَوْ أَكْثَرُ، وَعَلَى أَهْلِ مِصْرَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ، وَعَلَى الْجَمَاعَةِ فَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى صَفِّ الرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ، فَصَاحَ النَّاسُ وَقَالُوا: سُبْحَانَ اللهِ يُلْقِي بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ. فَقَامَ أَبُو أَيُّوبَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ لَتُؤَوِّلُونَ هَذِهِ الآيَةَ هَذَا التَّأْوِيلَ، وَإِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةَ فِينَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ لَمَّا أَعَزَّ اللَّهُ الإِسْلاَمَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ سِرًّا دُونَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَمْوَالَنَا

قَدْ ضَاعَتْ، وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعَزَّ الإِسْلاَمَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَلَوْ أَقَمْنَا فِي أَمْوَالِنَا، فَأَصْلَحْنَا مَا ضَاعَ مِنْهَا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرُدُّ عَلَيْنَا مَا قُلْنَا: (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللهِ وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ)، فَكَانَتِ التَّهْلُكَةُ الإِقَامَةَ عَلَى الأَمْوَالِ وَإِصْلاَحِهَا، وَتَرْكَنَا الغَزْوَ فَمَا زَالَ أَبُو أَيُّوبَ، شَاخِصًا فِي سَبِيلِ اللهِ حَتَّى دُفِنَ بِأَرْضِ الرُّومِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: ئەسلەمی ئەبو عیمران دەڵێ: بەنیازی جیهادی ڕۆمەکان لە مەدینەوە بەرەو قوستەنتینیە بەڕێ کەوتین، کۆمەڵێکی زۆر لە ڕۆمەکان هاتنەپێشەوە بۆ جەنگی لەگەڵ ئێمە، کۆمەڵێکی هێندەی ئەوان یان زیاتر لە موسوڵمانان دەرچوون بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، عوقبەی کوڕی عامیر فەرمانڕەوای میصر بوو، (فضالة)ی کوڕی عوبەید سەرکردەی سوپای کۆمەڵی موسوڵمانان بوو، ڕۆمەکان پشتیان بەدیواری شاری قوستەنتینیەوە قایمکردبوو، پیاوێك لە ریزی موسوڵمانان خۆی هاوێشتە ناویانەوەو بەتەنها هێرشی کردەسەریان، خەڵك هاواریان کرد وتیان: (سبحان الله) بەدەستی خۆی خۆی تەهلوکەو تیاچونەوە، ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ڕەزای خوای لێ بێ هەستایەوە فەرمووی: ئەی خەڵکینە بۆ لەخۆتانەوە تەئویلی ئەو ئایەتە دەکەن و لێکی دەدەنەوە، بێگومان ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمەی کۆمەڵانی ئەنصار دابەزی، لەکاتێکدا کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەرخست و دینی ئیسلامی بالاکرد ئێمەش وتمان: ئیدی وەرن با بڕۆین بەدەم ماڵو کاروبارمانەوە چاکی بکەین و پەرەی پێبدەین، ئەوەی فەوتاوە دەستی بخەینەوە، خوای گەورەش لەوبارەوە ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەرەکەی دابەزاند: (**وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ**). سورة البقرة: ١٩٥. واتە: ببەخشن لەڕێی خوای گەورەدا، بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تەهلوکەو تیاچونەوە.

خۆخستنە ناو تەهلوکەو خۆتیابردنمان بەوە دەبێت کە لەناو ماڵو

سامانەکەماندا بمێنینەوەو هەوڵی پەرەپێدانی بدەین و واز لەجیهادی ڕێگەی خوا بێنین، جا ئەبو ئەیوب هەتا لەژیاندابوو بەردەوام لە جیهاددا بوو هەتا دواجار لە قوستەنینیە لە خاکی ڕۆمەکان بەخاکیان سپارد.

٢٩٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُغِيرَةُ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: قَالَ كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَفِيَّ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، وَلِإِيَّايَ عَنَى بِهَا (فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالحُدَيْبِيَةِ وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ وَقَدْ حَصَرَنَا الْمُشْرِكُونَ، وَكَانَتْ لِي وَفْرَةٌ فَجَعَلَتِ الهَوَامُّ تَسَاقَطُ عَلَى وَجْهِي، فَمَرَّ بِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: كَأَنَّ هَوَامَّ رَأْسِكَ تُؤْذِيكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَاحْلِقْ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ. قَالَ مُجَاهِدٌ: الصِّيَامُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَالطَّعَامُ لِسِتَّةِ مَسَاكِينَ، وَالنُّسُكُ شَاةٌ فَصَاعِدًا حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِنَحْوِ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ سَوَّارٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْقِلٍ، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِنَحْوِ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَصْبِهَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْقِلٍ أَيْضًا.

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سوێند بە (الله) کە گیانی منی بە دەستە، ئەم ئایەتە بەهۆی منەوە دابەزی: **(فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ)**. واتە: واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان ئازارێك لە سەریدا بوو فدیە بدات.

کەعب فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم لە سەردەمی

ڕێککەوتنی حودەیبییەدا لە ئیحرامدابووین، هاوبەش بۆ خوا دانەران چوردەوریان دابووین، منیش قژم هەتا نەرمایی گوێم دەهات، جانەوەر دەکەوتنە سەر دەم و چاوم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەلامدا تێپەڕی - جانەوەرەکانی بینی - فەرمووی: (جانەوەرەکانی سەرت ئازارت دەدەن؟). وتی: وتم: بەڵێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی سەرت بتاشە)، ئیتر ئەو ئایەتە دابەزی، موجاهید دەفەرموێت: لەپاشدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە، یان نان بدە بە شەش هەژار، یا مەڕێ زیاتر سەربڕە بۆ خوا.

٢٩٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، قَالَ: أَتَى عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أُوقِدُ تَحْتَ قِدْرٍ وَالقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى جَبْهَتِي، أَوْ قَالَ: حَاجِبَيَّ، فَقَالَ: أَتُؤْذِيكَ هَوَامُّ رَأْسِكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَاحْلِقْ رَأْسَكَ وَانْسُكْ نَسِيكَةً أَوْ صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ قَالَ أَيُّوبُ: لاَ أَدْرِي بِأَيَّتِهِنَّ بَدَأَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلام، لەوکاتەدا ئاگری ژێر مەنجەڵێکم خۆش دەکرد، جانەوەر دەکەوتنە سەر دەم و چاوم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (جانەوەرەکانی سەرت ئازارت دەدەن؟). وتی: وتم: بەڵێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی سەرت بتاشە، لەپاشدا مەڕێ سەربڕە بۆ خوا، یان سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە، یا خواردن بدە بە شەش هەژار). ئەیوب فەرمووی: جا نازانم لەکامیانەوە دەستی پێ کرد.

٢٩٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الحَجُّ عَرَفَاتٌ، الحَجُّ عَرَفَاتٌ، الحَجُّ عَرَفَاتٌ، أَيَّامُ مِنًى ثَلاَثٌ (فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ) وَمَنْ أَدْرَكَ عَرَفَةَ قَبْلَ أَنْ يَطْلُعَ الفَجْرُ فَقَدْ أَدْرَكَ الحَجَّ.

قَالَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: قَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ: وَهَذَا أَجْوَدُ حَدِيثٍ رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَرَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ، وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی یەعمەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (حەج عەرەفاتە، حەج عەرەفاتە، حەج عەرەفاتە، ڕۆژەکانی مینا سێ ڕۆژن)، **(فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ)**. واتە: هەرکەسێ پەلە بکات و لە دوو ڕۆژدا ئەنجامیان بدات هیچ تاوانێکی ناگات، ئەوەشی دوای بخات و سێ ڕۆژ لە مینا بمێنێتەوە هیچ تاوانێکی ناگات. هەرکەس پێش خۆرهەڵاتن بگاتە عەرەفە ئەوە گەیشتووە بە حەجدا.

٢٩٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَبْغَضُ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لەهەموو کەس زیاتر ڕقی لە کەسێکی شەڕانی ڕق ئەستووری داخ لەدڵی ڕەزا قورسە).

٢٩٧٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَتِ الْيَهُودُ إِذَا حَاضَتْ امْرَأَةٌ مِنْهُمْ لَمْ يُؤَاكِلُوهَا وَلَمْ يُشَارِبُوهَا وَلَمْ يُجَامِعُوهَا فِي الْبُيُوتِ، فَسُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى) فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُؤَاكِلُوهُنَّ وَيُشَارِبُوهُنَّ وَأَنْ يَكُونُوا مَعَهُنَّ فِي الْبُيُوتِ، وَأَنْ يَفْعَلُوا كُلَّ شَيْءٍ مَا خَلاَ النِّكَاحَ. فَقَالَتِ الْيَهُودُ: مَا يُرِيدُ أَنْ يَدَعَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِنَا إِلاَّ خَالَفَنَا فِيهِ، قَالَ: فَجَاءَ عَبَّادُ بْنُ بِشْرٍ وَأُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَاهُ بِذَلِكَ، وَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَفَلاَ نَنْكِحُهُنَّ فِي الْمَحِيضِ، فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ قَدْ غَضِبَ عَلَيْهِمَا، فَقَامَا فَاسْتَقْبَلَتْهُمَا هَدِيَّةٌ مِنْ لَبَنٍ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَثَرِهِمَا فَسَقَاهُمَا، فَعَلِمَا أَنَّهُ لَمْ يَغْضَبْ عَلَيْهِمَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە جولەكەكان هەر كاتێ ئافرەتێكیان بكەوتایەتە بێ نوێژییەوە، لە ماڵ دەریان دەكرد، نە خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵی دەخوارد، نە لە ماڵیشەوە لەگەڵی دادەنیشتن، بەڵكو پارێزیان لێ دەكردوو جێیان بۆ جیادەكردەوە، بۆیە یارانی پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم لەوبارەیەوە لێیان پرسی؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ ڕەوانە كرد: (**وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ**). واتە: وە پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی حەیز بڵێ حەیز ئازارە، كەواتە دووربكەونەوە لە هاوسەرەكانتان لەكاتی حەیزدا. هەتا كۆتایی ئایەتەكە، ئینجا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: لە ماڵەكاندا لەگەڵیان كۆببنەوەو، هەموو شتێكیان لەگەڵ ئەنجام بدەن جگە لە كاری جوتبون(جماع). جولەكە وتیان:

ئەم پیاوە دەیەوێت لە هەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێ. جا ئوسەیدی کوڕی (حُضَیْر) و عەببادی کوڕی بیشر چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوەو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جولەکە ئاواو ئاوا دەڵێن، ئەی بۆچی ڕێگامان پێ نادەی هەتا لەکاتی بێ نوێژیدا بچینە لایان و دروست ببین لەگەڵیانا؟ جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕووی گرژ کردوو ڕەنگی گۆڕا، هەتا وامان دەزانی کە لێیان توڕە بووە، بۆیە هەردووکیان هەستان چوونە دەرەوەو ڕۆیشتن، لەپاشدا هەندێ شیریان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش هەندێ لەو شیرەی نارد بۆیان و خواردیانەوەو تێگەیشتن کە دڵی لێیان نەیاشەوە.

٢٩٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرًا، يَقُولُ: كَانَتِ اليَهُودُ تَقُولُ: مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ فِي قُبُلِهَا مِنْ دُبُرِهَا كَانَ الوَلَدُ أَحْوَلَ، فَنَزَلَتْ: (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو مونکەدیرەوە دەگێڕنەوە، کە گوێی لە جابیر ڕەزای خوای لێ بێ بووە دەیفەرموو: جولەکەکان دەیانوت: ئەگەر پیاو لەڕووی دواوە لەشوێنی منداڵ بوونەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی دروست ببێت، ئەوە منداڵەکەی خێل دەردەچێت، خوای گەورە لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ**). سورة البقرة: ٢٢٣. واتە: ژنەکانتان کێڵگەی خۆتانن جا تۆ بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە بەهەرشێوەیەك دەتانەوێ (لەشوێنی تایبەتی خۆی کە پێشەوەیە نەك لەدواوە).

٢٩٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ خُثَيْمٍ، عَنِ ابْنِ سَابِطٍ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) يَعْنِي: صِمَامًا وَاحِدًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَابْنُ خُثَيْمٍ هُوَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ خُثَيْمٍ، وَابْنُ سَابِطٍ هُوَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَابِطٍ الْجُمَحِيُّ الْمَكِّيُّ، وَحَفْصَةُ هِيَ بِنْتُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ. وَيُرْوَى فِي سِمَامٍ وَاحِدٍ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی: **(نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ)**. فەرموویەتی: (مەبەستی پێشی ئافرەتە). — نەك دواوەی چونکە شوێنی کشتوکاڵ نیە -.

٢٩٨٠ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَشْعَرِيُّ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي الْمُغِيرَةِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: جَاءَ عُمَرُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَلَكْتُ قَالَ: وَمَا أَهْلَكَكَ؟ قَالَ: حَوَّلْتُ رَحْلِي اللَّيْلَةَ، قَالَ: فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا، قَالَ: فَأُوحِيَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الآيَةُ: (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) أَقْبِلْ وَأَدْبِرْ، وَاتَّقِ الدُّبُرَ وَالْحَيْضَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَيَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَشْعَرِيُّ هُوَ: يَعْقُوبُ الْقُمِّيُّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لیٚ بیٚ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تیاچووم؟ فەرمووی: (بۆ)، فەرمووی: ئەمشەو لەدواوە چوومە لای خێزانم بەلاّم هێنەکەم کردووە

بەپێشیدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رەدی نەدایەوە و هیچ شتێکی نەفەرموو، خوای گەورە وەحی بۆ نارد و ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند: (**نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ**). لەپێشەوە و لەدواوە بچنە لایان بەلاّم هۆشیاربن لەدواوە لەرێی کۆمەوە لەگەڵیان جووت مەبن، هەروەها لەکاتی حەیزیشدا.

٢٩٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الهَاشِمُ بْنُ القَاسِمِ، عَنِ الْمُبَارَكِ بْنِ فَضَالَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُ زَوَّجَ أُخْتَهُ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانَتْ عِنْدَهُ مَا كَانَتْ، ثُمَّ طَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً لَمْ يُرَاجِعْهَا حَتَّى انْقَضَتِ العِدَّةُ، فَهَوِيَهَا وَهَوِيَتْهُ، ثُمَّ خَطَبَهَا مَعَ الخُطَّابِ، فَقَالَ لَهُ: يَا لُكَعُ أَكْرَمْتُكَ بِهَا وَزَوَّجْتُكَهَا فَطَلَّقْتَهَا، وَاللهِ لاَ تَرْجِعُ إِلَيْكَ أَبَدًا آخِرُ مَا عَلَيْكَ، قَالَ: فَعَلِمَ اللَّهُ حَاجَتَهُ إِلَيْهَا، وَحَاجَتَهَا إِلَى بَعْلِهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: تَبَارَكَ وَتَعَالَى (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ)، إِلَى قَوْلِهِ: (وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ) فَلَمَّا سَمِعَهَا مَعْقِلٌ قَالَ: سَمْعًا لِرَبِّي وَطَاعَةً، ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ: أُزَوِّجُكَ وَأُكْرِمُكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ الحَسَنِ وَهُوَ عَنِ الحَسَنِ غَرِيبٌ وَفِي هَذَا الحَدِيثِ دَلاَلَةٌ عَلَى أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ النِّكَاحُ بِغَيْرِ وَلِيٍّ لأَنَّ أُخْتَ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ كَانَتْ ثَيِّبًا فَلَوْ كَانَ الأَمْرُ إِلَيْهَا دُونَ وَلِيِّهَا لَزَوَّجَتْ نَفْسَهَا وَلَمْ تَحْتَجْ إِلَى وَلِيِّهَا مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ وَإِنَّمَا خَاطَبَ اللَّهُ فِي هَذِهِ الآيَةِ الأَوْلِيَاءَ فَقَالَ: (لاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ) فَفِي هَذِهِ الآيَةِ دَلاَلَةٌ عَلَى أَنَّ الأَمْرَ إِلَى الأَوْلِيَاءِ فِي التَّزْوِيجِ مَعَ رِضَاهُنَّ.

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خوشکێکی دا بە پیاوێ لە موسوڵمانان، ماوەیە لای بوو تەلاّقی دا نەیگێڕایەوە ژێر رکێفی خۆی هەتا عیددەی تەواو بوو، ئیتر هەردووکیان موشتاقی یەکتر بوون و حەزیان دەکرد پێك

بێنەوە، لەپاشدا داوای کردەوە، مەعقیل پێی وت: ئەی گەمژەی سوك و هیچ و پووچ، ڕێزم گرتی و لێم مارەکردی کەچی تۆ تەڵاقت دا، سوێند بە (الله) هەرگیز ناتدەمەوە ئەوە کۆتایی ژیانی هاوسەریتانەو جارێکی تر ناچیتە لای، فەرمووی: خوای گەورە بۆ خۆی دەیزانی چەندە موشتاقی یەکن و پێویستیان بەیەك هەیە، بۆیە ئەم ئایەتەی بەو بۆنەوە دابەزاند: (**وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ**). هەتا: (**وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ**). واتە: کاتێك ژنەکانتان تەڵاقدا عیددەیان تەواو بوو ئیتر قەدەغەیان مەکەن کە شوو بکەن بە مێردەکانیان.

کاتێ مەعقیل ئایەتەکەی بیست فەرمووی: بیستم و گوێڕایەڵی فەرمایشتی خوای گەورەم، ئینجا بانگی کردەوە و فەرمووی: لێت مارەدەکەم و ڕێزیشت دەگرم.

٢٩٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، قَالَ: (ح) وحَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنِ القَعْقَاعِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِي يُونُسَ، مَوْلَى عَائِشَةَ قَالَ: أَمَرَتْنِي عَائِشَةُ، أَنْ أَكْتُبَ لَهَا مُصْحَفًا، فَقَالَتْ: إِذَا بَلَغْتَ هَذِهِ الآيَةَ فَآذِنِّي (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الوُسْطَى) فَلَمَّا بَلَغْتُهَا آذَنْتُهَا، فَأَمْلَتْ عَلَيَّ حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الوُسْطَى وَصَلاَةِ العَصْرِ وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ، وَقَالَتْ: سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَابِ عَنْ حَفْصَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبی یونس نۆکەر(مَوْلَى)ی عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: خاتوو عائیشە فەرمانی پێ کردم کە قورئان(مُصْحَف)ێکی بۆ بنوسمەوە وتیشی: ئاگادارم بکەرەوە هەر کاتێ گەیشتیتە ئەم ئایەتە: (**حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى**). سورة البقرة:٢٣٨. واتە: ئاگاداری نوێژەکانتان بکەن، بە تایبەتی نوێژی ناوەڕاست.

كاتێ كە گەیشتمە ئایەتەكە ئاگادارم كردەوە، خاتوو عائیشە ئایەتەكەی بۆ خوێندمەوە: (**حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَصَلَاةِ الْعَصْرِ وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ**). واتە: ئاگاداری نوێژەكانتان بكەن، بە تایبەتی نوێژی ناوەراست نوێژی عەسر، لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بە گەردنكەچی.

پاشان عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بەم شێوەیە لە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بیستووە. - عائیشە (وَصَلَاةِ الْعَصْرِ)ی بۆ زیاد كرد، بەلام ئەمە خوێندنەوەیەكی دەگمەنە(القراءة شاذة) و (متواتر) نیە، ئەوەی لە (مُصْحَف)دا چەسپاوە ئەمەیە: (**حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ**) -.

٢٩٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صَلَاةُ الوُسْطَى صَلَاةُ العَصْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەمورەی كوڕی جوندوبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ( (الصَّلَاةِ الْوُسْطَى) نوێژی عەسرە).

٢٩٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي حَسَّانَ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبِيدَةَ السَّلْمَانِيِّ، أَنَّ عَلِيًّا، حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَ الأَحْزَابِ: اللَّهُمَّ امْلَأْ قُبُورَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ نَارًا كَمَا شَغَلُونَا عَنْ صَلَاةِ الوُسْطَى حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبُو حَسَّانَ الأَعْرَجُ اسْمُهُ: مُسْلِمٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە رۆژی غەزای خەندەق(ئەحزاب)دا فەرمووی: (خوای گەورە

گۆڕەكانیان و ماڵەكانیان پڕ بكات لە ئاگر، چۆن سەرقاڵیان كردین لە (الصَّلاَةِ الْوُسْطَى) نوێژی عەسر هەتا رۆژ ئاوا بوو).

٢٩٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو النَّضْرِ، وَأَبُو دَاوُدَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَلاَةُ الوُسْطَى صَلاَةُ العَصْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَأَبِي هَاشِمِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((الصَّلاَةِ الْوُسْطَى) نوێژی عەسرە).

٢٩٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ شُبَيْلٍ، عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، قَالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّلاَةِ فَنَزَلَتْ (وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ) فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ، نَحْوَهُ، وَزَادَ فِيهِ: وَنُهِينَا عَنِ الكَلاَمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو عَمْرٍو الشَّيْبَانِيُّ اسْمُهُ: سَعْدُ بْنُ إِيَاسٍ.

واتە: لە زەیدی كوڕی ئەرقەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئێمە لەنوێژدا قسەمان دەكرد، ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ)**. واتە: لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بە گەردنكەچی. جا فەرمانمان پێ كرا بە بێدەنگی.

٢٩٨٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ أَبِي مَالِكٍ، عَنِ البَرَاءِ، (وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ) قَالَ: نَزَلَتْ فِينَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ، كُنَّا أَصْحَابَ نَخْلٍ فَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي مِنْ نَخْلِهِ عَلَى قَدْرِ كَثْرَتِهِ وَقِلَّتِهِ، وَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي بِالقِنْوِ وَالقِنْوَيْنِ فَيُعَلِّقُهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَكَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ، فَكَانَ أَحَدُهُمْ إِذَا جَاعَ أَتَى القِنْوَ فَضَرَبَهُ بِعَصَاهُ فَيَسْقُطُ مِنَ البُسْرِ وَالتَّمْرِ فَيَأْكُلُ، وَكَانَ نَاسٌ مِمَّنْ لاَ يَرْغَبُ فِي الخَيْرِ يَأْتِي الرَّجُلُ بِالقِنْوِ فِيهِ الشِّيصُ وَالحَشَفُ وَبِالقِنْوِ قَدْ انْكَسَرَ فَيُعَلِّقُهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ) قَالُوا: لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أُهْدِيَ إِلَيْهِ مِثْلُ مَا أَعْطَى، لَمْ يَأْخُذْهُ إِلاَّ عَلَى إِغْمَاضٍ أَوْ حَيَاءٍ. قَالَ: فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ يَأْتِي أَحَدُنَا بِصَالِحِ مَا عِنْدَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو مَالِكٍ هُوَ: الغِفَارِيُّ وَيُقَالُ اسْمُهُ: غَزْوَانُ وَقَدْ رَوَى الثَّوْرِيُّ، عَنِ السُّدِّيِّ، شَيْئًا مِنْ هَذَا.

واتە: لە بەرائەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە: **(وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ)** دەربارەی ئێمەی کۆمەڵی ئەنصارەکان هاتەخوارەوە، ئێمە خاوەن باخی دار خورما بووین، هەرکەس بەپێی زۆر و کەمی خورمای ئەهێنا بۆ زەکات، پیاوی وا هەبوو دوو هێشوی ئەهێنا، هەبوو یەك هێشوی ئەهێنا، لە مزگەوتدا هەڵی ئەواسی، لەبەرئەوەی ئەهلی صوففە خواردنیان نەبوو بیخۆن، کاتێ یەکێکیان برسی بوایە ئەهاتە بەردەم هێشوەکەو دارێکی پێدا دەکێشا، دەنکەکانی ئەکەوتنەخوارەوە و ئەیخواردن، ئەو کەسانەی نیازی خێریان نەبوو خورمای خراپیان ئەهێنا هەڵیانئەواسی، هێشوی (شیص) و هێشوی (حشف) هێشوی شکاویان تێدا بوو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ**

**آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُوا الخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ).** سورة البقرة: ٢٦٧. واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لە باشترین جۆر لەو شتانەی بەدەستی ئەهێنن، وە ئەو شتانەی خوا بۆی دەرکردن لەزەوی بدەن بە زەکات، جۆری قەڵب و خراپەکەی مەدەن بە زەکات، لە حاڵێکدا ئەگەر بەخۆتانی بدەن وەرینـاگرن مەگەر چاوپۆشی بکەن لە خراپیەکەی.

وتیان: ئەگەر کەسێ وەك ئەوەتان بۆ بنێرێ بەدیاری وەری ناگرێ مەگەر چاوپۆشی بکات یان لەشەرماندا وەری نەگرێ، فەرمووی: ئیتر لەپاش ئەوە کەسێ لە ئێمە لە ماڵێ چاکی خۆی دەیبەخشی.

٢٩٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ مُرَّةَ الهَمْدَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ لِلشَّيْطَانِ لَمَّةً بِابْنِ آدَمَ، وَلِلْمَلَكِ لَمَّةً، فَأَمَّا لَمَّةُ الشَّيْطَانِ فَإِيعَادٌ بِالشَّرِّ وَتَكْذِيبٌ بِالحَقِّ، وَأَمَّا لَمَّةُ الْمَلَكِ فَإِيعَادٌ بِالخَيْرِ وَتَصْدِيقٌ بِالحَقِّ، فَمَنْ وَجَدَ ذَلِكَ فَلْيَعْلَمْ أَنَّهُ مِنَ اللهِ فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ الأُخْرَى فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، ثُمَّ قَرَأَ (الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالفَحْشَاءِ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَهُوَ حَدِيثُ أَبِي الأَحْوَصِ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الأَحْوَصِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەیتان ختورەو خەیاڵاتی خراپ دەخاتە دڵی ئادەمیزادەوە هانی دەدا باوەڕ بەهەق نەکات، مەلائیکەش ختورەو خەیاڵاتی باش دەخاتە دڵی ئادەمیزادەوە و هانی دەدا باوەڕ بەهەق بکات، هەرکەس ختورەو خەیاڵاتی باش هاتە دڵیەوە ئەوە با بزانێ لە

خواوەیە و سوپاس و ستایشی خوا بكات، خۆ ئەگەر جگە لەوە بوو ئەوە لە شەیتانەوەیە و پەنا بگرن بە خوا لە شەیتانی رەجم كراو: لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالفَحْشَاءِ)**. سورة البقرة: ٢٦٨. واتە: كاتێ دەیبەخشن شەیتان بەڵێنی هەژاری و نەداریتان پێ دەدات (دەتان ترسێنێ بە هەژاری) و فەرمانتان پێ دەكات بە تاوان و خراپە و نەبەخشین.

٢٩٨٩ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ مَرْزُوقٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ وَلاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبًا وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ، فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ)، وَقَالَ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ) قَالَ: وَذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَهُ إِلَى السَّمَاءِ يَا رَبِّ، يَا رَبِّ وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِّيَ بِالحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَإِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ فُضَيْلِ بْنِ مَرْزُوقٍ وَأَبُو حَازِمٍ هُوَ: الأَشْجَعِيُّ اسْمُهُ: سَلْمَانُ مَوْلَى عَزَّةَ الأَشْجَعِيَّةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی خەڵكینە، خوای گەورە بۆ خۆی پاك و خاوێنە هەرچی پاك و خاوێن و حەڵاڵ نەبێ قبوڵی ناكات، بێگومان خوا هەر فەرمانێكی بە پێغەمبەران كردبێ، هەمان فەرمانیشی بە باوەڕداران كردووە، دەفەرمووێت: **(يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ)** سورة المؤمنون: ٥١. واتە: ئەی پێغەمبەر بخۆن لە خواردەمەنی حەڵاڵ و پاك، كار و كردەوەی باش بكەن. بەڕاستی من بەوەی ئێوە دەیكەن ئاگادارم).

هەروەها دەفەرمووێت: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ**) سورة البقرة: ١٧٢. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بخۆن لە خواردەمەنی حەڵاڵ و پاك كە ئێمە كردومانن بە رزق و رۆزی ئێوە).

فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی پیاوێكی كرد دەچێ بۆ سەفەری دوور و درێژ قژی گف دەبێ و دەئالۆسكێ و چڵك و تەپ و تۆزی لێ دەنیشێ دەستی بەرزدەكاتەوە بۆ ئاسمان و دەپاڕێتەوە: ئەی پەروەردگارم، ئەی پەروەردگارم، خواردن و خواردنەوەی حەرامە، پۆشاكی حەرامە، بە حەرام گۆش كراوە، دەی ئیتر دوعاو پاڕانەوەی چۆن لێ وەردەگیرێ).

٢٩٩٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ السُّدِّيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ سَمِعَ عَلِيًّا، يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ) الآيَةَ أَحْزَنَتْنَا قَالَ: قُلْنَا: يُحَدِّثُ أَحَدُنَا نَفْسَهُ فَيُحَاسَبُ بِهِ، لاَ نَدْرِي مَا يُغْفَرُ مِنْهُ وَلاَ مَا لاَ يُغْفَرُ؟ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا (لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ).

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێت: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی دڵگرانی كردین: (**إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ**). سورة البقرة: ٢٨٤. واتە: ئەوەی لەدڵ و دەروونتاندا جێگیر بووە دەری ببڕن یان بیشارنەوە خوا دەربارەی لێتان دەپرسێتەوە، ئینجا لەهەركەس بیەوێت خۆش دەبێت وە هەركەس بیەوێت سزای دەدات. فەرمووی: جا هەركەسێ لەئێمە لەگەڵ خۆی دەدوا و لێپرسینەوەی نەفسی خۆی دەكرد، نەیئەزانی خوا لێی خۆش بووە یان نا، دوای ئەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە و نەسخی كردەوە: (**لاَ يُكَلِّفُ**

**اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ)**. سورة البقرة: ٢٨٦. واتە: خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ كەسێ مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت، هەر كارێكی چاك بكات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەكیشی كردبێت یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی.

٢٩٩١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُوسَى، وَرَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أُمَيَّةَ، أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ، عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: (إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ) وَعَنْ قَوْلِهِ: (مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ) فَقَالَتْ: مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ مُنْذُ سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: هَذِهِ مُعَاتَبَةُ اللهِ العَبْدَ بِمَا يُصِيبُهُ مِنَ الحُمَّى وَالنَّكْبَةِ حَتَّى البِضَاعَةُ يَضَعُهَا فِي كُمِّ قَمِيصِهِ فَيَفْقِدُهَا فَيَفْزَعُ لَهَا حَتَّى إِنَّ العَبْدَ لَيَخْرُجُ مِنْ ذُنُوبِهِ كَمَا يَخْرُجُ التِّبْرُ الأَحْمَرُ مِنَ الكِيرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ.

واتە: ئومەییە دەبارەی ئەم ئایەتە لە عائیشەی رەزای خوای لێ بێ پرسی: **(إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ)**. سورة البقرة: ٢٨٤. هەروەها دەربارەی ئەم ئایەتەش: **(مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ)**. سورة النساء ١٢٣. واتە: هەركەسێك هەر كارێكی نارەواو خراپ بكات، دڵنیابن هەر بەو كارەی خۆیە جەزرەبە دەدرێت. عائیشە فەرمووی: لەوكاتەوە لەم بارەوە پرسیارم كردووە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هیچ كەسێ پرسیاری لێ نەكردووم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە سەرزەنشت و سەركۆنەی بەندەیە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە لەدونیا توشی تاو ئازار و كارەسات و بەلا دەبێ، یان ماڵێكی لە گیرفانی كراسەكەی دەكەوێ و لێی ون دەبێ و دەفەوتێ

خەمی بۆ دەخوات، بەردەوام لەسەر ئەو حاڵە لە گوناهەكانی پاك دەبێتەوە، هەروەك چۆن ئاڵتونی زەرد لە كورە دەدەچێت لەچڵك پاك دەبێتەوە).

٢٩٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ آدَمَ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ) قَالَ: دَخَلَ قُلُوبَهُمْ مِنْهُ شَيْءٌ، لَمْ يَدْخُلْ مِنْ شَيْءٍ، فَقَالُوا لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: قُولُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا، فَأَلْقَى اللَّهُ الإِيمَانَ فِي قُلُوبِهِمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالمؤْمِنُونَ) الآيَةَ (لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا) قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ (رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا) قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ (رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا) الآيَةَ قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا مِنْ غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَآدَمُ بْنُ سُلَيْمَانَ يُقَالُ: هُوَ وَالِدُ يَحْيَى بْنِ آدَمَ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كاتێ كە ئەم ئایەتە دابەزی: **(إِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ)**. سورة البقرة: ٢٨٤. واتە: ئەوەی لەدڵ و دەروونتاندا جێگیر بووە دەری ببڕن یان بیشارنەوە خوا دەربارەی لێتان دەپرسێتەوە. فەرمووی: شتێ چووە دڵیانەوە و زۆر دڵگران بوون دەربارەی ئەوەیان راگەیاند بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: بڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداریین، خوای گەورە باوەڕی خستە دڵیانەوە، ئەم ئایەتەی دابەزاند **(آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ)**. واتە: پێغەمبەر و باوەڕداران باوەڕیان هەیە بەوەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتەخوارەوە. **(لَا**

**يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا)**. واتە: خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێ مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت، هەر کارێکی چاك بکات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکیشی کردبێت یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی، پەروەردگارا، لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لەدەست قەوما، خوای گەورە فەرمووی: بێگومان ئەوا کردم ئەرك ناخەمە سەرشانتان بەپێی توانی خۆتان نەبێت، (**رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا)**. واتە: پەروەردگارا، ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا وەك ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا. فەرمووی: بێگومان ئەوا کردم، (**رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا)**. واتە: پەروەردگارا، ئەرکێ مەدە بەسەرماندا لەتواناماندا نەبێت، چاوپۆشی بکە لە هەڵەو تاوانەکانمان و بەزەییت بێتەوە پێماندا. فەرمووی: بێگومان ئەوا کردم ئەرکێ ناخەمە سەرشانتان لەتواناتاندا نەبێت.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی سورەتی (آلِ عِمْرَانَ).

### ٤ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ

٢٩٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ وَهُوَ الخَزَّازُ، وَيَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ كِلَاهُمَا، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ. قَالَ يَزِيدُ: عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ،، وَلَمْ يَذْكُرْ أَبُو عَامِرٍ القَاسِمَ -. قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَوْلِهِ: (فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ)، قَالَ: فَإِذَا رَأَيْتِيهِمْ

فَاعْرِفِيهِمْ وقَالَ يَزِيدُ: فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ فَاعْرِفُوهُمْ قَالَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئەم ئایەتە لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پرسی: **(فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ)**. واتە: جا ئەوانەی لەدڵیاندا لادان و چەوتی هەیە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە موتەشابیهن (هاوشێوەن)، بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسوڵمانان وە بۆ راڤەکردنی بە ئارەزووی ناپاکی خۆیان، لەکاتێکدا کەس راڤەکردنی نازانێ. فەرمووی: (ئەگەر بینیتن خۆتیان لێ بپارێزە). یەزید وتی: دوو جار یان سێ جار فەرمووی: (ئەگەر بینینتان خۆتانیان لێ بپارێزن).

٢٩٩٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو الوَلِيدِ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّاهُمُ اللَّهُ فَاحْذَرُوهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، هَذَا الحَدِيثُ، وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَإِنَّمَا ذَكَرَهُ يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ القَاسِمِ فِي هَذَا الحَدِيثِ. وَابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ هُوَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ وَقَدْ سَمِعَ مِنْ عَائِشَةَ أَيْضًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی

ئەم ئایەتە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم: **(هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ)** واتـە: ئـەو خوایـە ناردویێتیـەخوارەوە بـۆت قورئان هەندێك ئایاتی (مەبەستەکانیان) ڕۆشنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئـانن، وە ئەوانی تر (ئایەتانێکن مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین.... پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (ئەگـەر ئەوانـەتان دی شـوێن ئـەو ئایەتانـە کـەوتوون کـە موتەشابیهن(هاوشێوەن)، ئەوە ئەوانەن کە خوای گـەورە پێناسـەی کـردوون بـەوەی لاری و چەوتی لە دڵیاندا هەیە بۆیە خۆتانیان لـێ بپـارێزن و گوێیـان بـۆ مـەگرن و لەگەڵیان دامەنیشن).

٢٩٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ وُلاَةً مِنَ النَّبِيِّينَ، وَإِنَّ وَلِيِّي أَبِي وَخَلِيلُ رَبِّي، ثُمَّ قَرَأَ: (إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ). حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ وَلَمْ يَقُلْ فِيهِ عَنْ مَسْرُوقٍ. هَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الضُّحَى عَنْ مَسْرُوقٍ، وَأَبُو الضُّحَى اسْمُهُ: مُسْلِمُ بْنُ صُبَيْحٍ. حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ أَبِي نُعَيْمٍ وَلَيْسَ فِيهِ عَنْ مَسْرُوقٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسـعودەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (هـەموو پێغەمبەرێ خاوەن و پشـتیوانێکی هەیـە لـە پێغەمبـەران، دۆسـت و خۆشەویسـتی

منیش باوكم ئیبراهیمە كە خۆشەویستی پەروەردگارمە، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ**). سورة آلِ عِمْرَانَ: ٦٨.

واتە: نزیكترین كەس لە ئیبراهیمەوە: ئەو كەسانەن كە لەسەردەمی خۆیدا شوێنی كەوتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش صلی الله علیه وسلم و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، بێگومان خوا یار و یاوەری باوەڕدارانە.

٢٩٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ وَهُوَ فِيهَا فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ، فَقَالَ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ: فِيَّ وَاللهِ كَانَ ذَلِكَ، كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنَ اليَهُودِ أَرْضٌ فَجَحَدَنِي، فَقَدَّمْتُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟ فَقُلْتُ: لاَ، فَقَالَ لِلْيَهُودِيِّ: احْلِفْ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِذَنْ يَحْلِفُ فَيَذْهَبُ بِمَالِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس بەدرۆ سوێند بخوات بۆ ئەوەی ماڵی كەسێكی تر ببچڕێت بۆ خۆی كاتێ كە دەگات بە دیداری خوای پەروەردگار لێی توڕەیەو سزای دەدات). (أَشْعَث)ی كوڕی قەیس وتی: سوێند بە (الله) ئەمە لەمن ڕویداوە، پارچەیە زەویم هەبوو لە نێوان مـن و پیاوێكی جولەكەدا بوو، كێشە كەوتە نێوانمانەوە لەسەری جولەكەكە ئینكاری دەكردم و نكوڵی لێ دەكرد زەویەكەی بە هی خۆی دەزانی، منیش سكاڵام

بەرزکردەوە بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جولەکەکەم بردە خزمەتی، پێی فەرمووم: (بەڵگەت هەیە؟). وتم: نەخێر، بە جولەکەکەی فەرموو: (سوێند بخۆ). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەواتە سوێند دەخوات و ماڵەکەی من دەبات بۆ خۆی، خوای پەروەردگار لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)** سورة آل عمران: ٧٧. واتە: بێگومان ئەوانەی دەیفرۆشن پەیمانی خواو و سوێندەکانی خۆیان بەنرخێکی کەم، ئەوانە بێبەشن لە (بەهرەی خوا) لەرۆژی دوایی دا و، خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و، تەماشایان ناکات لەرۆژی قیامەتدا، وە لە گوناهیان خۆش نابێت، وە بۆ ئەوان هەیە سزای بە ئازار.

٢٩٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ بَكْرٍ السَّهْمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (لَنْ تَنَالُوا البِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) أَوْ (مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا)، قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: وَكَانَ لَهُ حَائِطٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ حَائِطِي لِلَّهِ، وَلَوْ اسْتَطَعْتُ أَنْ أُسِرَّهُ لَمْ أُعْلِنْهُ فَقَالَ: اجْعَلْهُ فِي قَرَابَتِكَ أَوْ أَقْرَبِيكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کەی ئەم ئایەتە دابەزی: **(لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ)**. واتە: ئێوە هەرگیز بەخێر و چاکە ناگەن هەتا بەختی نەکەن هەندێ لەو داراییەی کە خۆشتان دەوێت. یان: **(مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا)** سورة البقرة: ٢٤٥. واتە: کێیە ئەو کەسەی قەرز بدات بە خوا، قەرزێکی باش، **(أَبُو طَلْحَةَ)**

ڕەزای خوای لێ بێ باخە خورماکی هەبوو خۆشەویسترین ماڵ و سامان بوو بولایەوە، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، باخە خورماکەم دەبەخشم بە خوا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ئەگەر ئەتوانی ئەو بەخشینە بشارەوە با نهێی بێ ئاشکرای مەکە، بیبەخشە بە خزمە نزیکەکانی خۆت).

٢٩٩٨ - (ضعيف جدا، لكن جملة: (العج والثج) ثبت في حديث آخر) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ يَزِيدَ، قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ، يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَامَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَنِ الحَاجُّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الشَّعِثُ التَّفِلُ، فَقَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: أَيُّ الحَجِّ أَفْضَلُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: العَجُّ وَالثَّجُّ، فَقَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: مَا السَّبِيلُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الزَّادُ وَالرَّاحِلَةُ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ يَزِيدَ الخُوزِيِّ الْمَكِّيِّ، وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي إِبْرَاهِيمَ بْنِ يَزِيدَ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کێ حاجی تەواوە؟ فەرمووی: (ئەو کەسەی قژی تۆزاوی بێ و خۆی نەڕازاندبێتەوە و بۆنی خۆشی لەخۆی نەدابێ)، پیاوێکی تر هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، چ حەجێ خێری چاکتر و گەورەترە؟ فەرمووی: (تەلبیە بەدەنگی بەرز و قوربانی کردن)، پیاوێکی تر هەستایەوە وتی: ئەی مەبەست لە (سبیل) چیە وەك لەم ئایەتەدا هاتووە: (مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا) سورة آلِ عِمْرَان: ٩٧؟ فەرمووی: (تێشوی سەفەر و وڵاخی سواری). - کەسێ توانای ماڵی و جەستەیی هەبوو حەجی لەسەر فەرزە - .

٢٩٩٩- (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ مِسْمَارٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الآيَةَ: (تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ)، دَعَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيًّا وَفَاطِمَةَ وَحَسَنًا وَحُسَيْنًا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلاَءِ أَهْلِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کەی ئەم ئایەتە دابەزی: (**تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ**). سورة آل عِمْرَان: ٦١. واتە: وەرن با بانگی کوڕەکانمان و کوڕەکانتان و ژنەکانمان و ژنەکانتان و خۆمان و خۆتان بکەین، لەپاشان لە خوا بپاڕێینەوە، ئینجا نەفرەتی خوا بکەین لە درۆزنان. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشەوا عەلی و (فاطمة) و حەسەن و حوسەینی بانگ کرد، فەرمووی: (خودایە ئەمانە خانەوادە و خزم و کەسوکارە نزیکەکانی منن).

٣٠٠٠ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ صَبِيحٍ، وَحَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي غَالِبٍ، قَالَ: رَأَى أَبُو أُمَامَةَ رُءُوسًا مَنْصُوبَةً عَلَى دَرَجِ دِمَشْقَ، فَقَالَ أَبُو أُمَامَةَ: كِلاَبُ النَّارِ شَرُّ قَتْلَى تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ، خَيْرُ قَتْلَى مَنْ قَتَلُوهُ، ثُمَّ قَرَأَ: (يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قُلْتُ لأَبِي أُمَامَةَ: أَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَوْ لَمْ أَسْمَعْهُ إِلاَّ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا أَوْ أَرْبَعًا حَتَّى عَدَّ سَبْعًا مَا حَدَّثْتُكُمُوهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو غَالِبٍ اسْمُهُ: حَزَوَّرٌ، وَأَبُو أُمَامَةَ البَاهِلِيُّ اسْمُهُ: صُدَيُّ بْنُ عَجْلاَنَ وَهُوَ سَيِّدُ بَاهِلَةَ.

واتە: لە ئەبی غالیبەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو ئومامە ڕەزای خوای لێ بێ سەری هەندێ لە سەرانی خەواریجەکانی دی هەڵواسرابوون لەسەرە ڕێگاکانی دیمەشق، فەرمووی: ئەمانە سەگەکانی دۆزەخن خراپترینی کوژراون لەژێر ڕووی

ئاسماندا، چاکترینی کوژراوانیش ئەوانەن کە بەدەستی ئەمانە کوژراون، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ**). سورة آلِ عِمْرَان: ١٠٦. واتە: رۆژێك دێ چەند روویەك سپی دەبن وە چەند روویەك رەش دەبن، جا ئەوانەی کە روویان رەش بووە (پێیان دەوترێت) بۆچی بێ بڕوابوون لەپاش بڕواهێنانتان، کەواتە بچێژن سزا بەهۆی بێ بڕوایتانەوە.

ئەبی غالیب وتی: بە ئەبو ئومامەم وت: تۆ خۆت ئەم فەرمایشتەت لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیستووە؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر جارێ یان دووجار یان سێ جار یا چوار جار تا حەوت جاری ژمارد لێم نەمبیستایە بۆم نەدەگێڕانەوە.

٣٠٠١ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) قَالَ: أَنْتُمْ تُتِمُّونَ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ خَيْرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ نَحْوَ هَذَا، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ).

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بۆ خۆی گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە دەربارەی ئەم ئایەتە: (**كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ**). سورة آلِ عِمْرَان: ١١٠. واتە: ئێوە (موسوڵمانان) باشترین گەلێك بوون بۆ خەڵك هێنرابێتنەدی... دەیفەرموو: (ئێوە تەواوکەری حەفتا گەلن، ئێوە چاکترین و بەڕێزترینیانن لەلای خوا). - لەوانەیە ئەو حەفتایە بۆ زۆری بەکار هێنا بێ -.

٣٠٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ يَوْمَ أُحُدٍ وَشُجَّ وَجْهُهُ شَجَّةً فِي جَبْهَتِهِ حَتَّى سَالَ الدَّمُ عَلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ: كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ فَعَلُوا هَذَا بِنَبِيِّهِمْ وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللهِ؟ فَنَزَلَتْ: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ) إِلَى آخِرِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لە جەنگی ئوحوددا ددانە چوارینەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شکا، ڕوومەتی بریندار بوو بەشێوەیە خوێن بە دەم و چاویدا دەهاتەخوارەوە، فەرمووی: (چۆن قەومێ سەردەکەون و ڕزگاریان دەبێ کاری ئاوا بکەن لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا لەکاتێکدا کە ئەو بانگیان دەکات بۆ لای خوای گەورە؟). ئەم ئایەتە دابەزی: **(لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ)**. سورة آل عِمْرَان: ١٢٨. واتە: بەڕاستی (ئەی موحەممەد) هیچ شتێ لەو کارەدا بەدەست تۆ نیە چ (خوا) تەوبەیان لێ وەرگرێ یان سزایان بدات، چونکە بەڕاستی ئەوانە ستەمکارن.

٣٠٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شُجَّ فِي وَجْهِهِ وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ وَرُمِيَ رَمْيَةً عَلَى كَتِفِهِ، فَجَعَلَ الدَّمُ يَسِيلُ عَلَى وَجْهِهِ، وَهُوَ يَمْسَحُهُ وَيَقُولُ: كَيْفَ تُفْلِحُ أُمَّةٌ فَعَلُوا هَذَا بِنَبِيِّهِمْ وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللهِ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ). سَمِعْت عَبْدَ بْنَ حُمَيْدٍ يَقُولُ: غَلِطَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ فِي هَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە جەنگی ئوحوددا روومەتی بریندار بوو، ددانە چوارینەکەی شکا، تیرێ بەر شانی کەوت، خوێن بە دەم و چاویدا دەهاتەخوارەوە، خوێنەکەی دەسڕی و دەیفەرموو: (چۆن قەومێ سەردەکەون و رزگاریان دەبێ کاری ئاوا بکەن لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا لەکاتێکدا کە ئەو بانگیان دەکات بۆ لای خوا؟). جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ**). سورة آلِ عِمْرَان: ١٢٨.
واتە: بەڕاستی (ئەی موحەممەد) هیچ شتێ لەو کارەدا بەدەست تۆ نیە چ (خوا) تەوبەیان لێ وەرگرێ یان سزایان بدات، چونکە بەڕاستی ئەوانە ستەمکارن.

٣٠٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو السَّائِبِ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ الْكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ حَمْزَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ: اللَّهُمَّ العَنْ أَبَا سُفْيَانَ، اللَّهُمَّ العَنِ الحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ العَنْ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ، قَالَ: فَنَزَلَتْ (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ) فَتَابَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ فَأَسْلَمُوا فَحَسُنَ إِسْلَامُهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، يُسْتَغْرَبُ مِنْ حَدِيثِ عُمَرَ بْنِ حَمْزَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَكَذَا رَوَاهُ الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، لَمْ يَعْرِفْهُ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ مِنْ حَدِيثِ عُمَرَ بْنِ حَمْزَةَ، وَعَرَفَهُ مِنْ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە، ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە جەنگی ئوحوددا فەرمووی: (خودایە نەفرەت بکە لە ئەبو سوفیان، خودایە نەفرەت بکە لە (حارث)ی کوڕی هیشام، خودایە نەفرەت بکە لە صەفوانی کوڕی ئومەییە). فەرمووی: جا ئەم ئایەتە دابەزی: (**لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ**). سورة آلِ عِمْرَان: ١٢٨.

واتە: بەڕاستی (ئەی موحەممەد) هیچ شتێ لەو کارەدا بەدەست تۆ نیە چ (خوا) تەوبەیان لێ وەرگرێ... بەڵێ بە چاکی موسوڵمان بوون و تەوبەی لێ وەرگرتن.

٣٠٠٥ – (حسن صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَبِيبِ بْنِ عَرَبِيٍّ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ ابْنُ الْحَارِثِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُو عَلَى أَرْبَعَةِ نَفَرٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ). فَهَدَاهُمُ اللَّهُ لِلإِسْلاَمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ يُسْتَغْرَبُ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَرَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوعای کرد لە چوار کەس، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ)**. خوای گەورە هیدایەتی دان بۆ ئیسلام و بە چاکی موسوڵمان بوون.

٣٠٠٦ – (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ بْنِ الْحَكَمِ الْفَزَارِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا، يَقُولُ: إِنِّي كُنْتُ رَجُلاً إِذَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثًا نَفَعَنِي اللَّهُ مِنْهُ بِمَا شَاءَ أَنْ يَنْفَعَنِي، وَإِذَا حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ اسْتَحْلَفْتُهُ. فَإِذَا حَلَفَ لِي صَدَّقْتُهُ، وَإِنَّهُ حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ، وَصَدَقَ أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلاَّ غَفَرَ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ (وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. هَذَا حَدِيثٌ قَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَرَفَعُوهُ، وَرَوَاهُ مِسْعَرٌ،

وَسُفْيَانُ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَلَمْ يَرْفَعَاهُ، وَلاَ نَعْرِفُ لأَسْمَاءَ بْنِ الْحَكَمِ حَدِيثًا إِلاَّ هَذَا.

واتە: لە ئەسمائی كچی حەكەمی فەزارییەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: گوێم لەپێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ بوو دەیفەرموو: من كەسێ بووم كاتێ كە فەرموودەیەكم دەبیست لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەندەی خوا بیەوێ سودی پێ دەگەیاندم بەكردەوە، ئەگەر یەكێ لە یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموودەیەكی بۆ بگێڕامایەتەوە سوێندم دەدا ئەگەر سوێندی بۆ بخواردمایە باوەڕم پێ دەكردو لێم وەردەگرت — ئەمە بۆ زیاتر دڵنیا بوون بووە ئەگینا یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەر هەموویان ڕاستگۆ بوون-، پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە و ڕاستی فەرموو، - پێشەوا عەلی ئەبو بەكری سوێند نەدا ئەمەش بۆ گەورەیی پلەو پایەی ئەبو بەكر دەگەڕێتەوە - ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (هەر بەندەیەك تاوانێ یان خراپەیە بكات دەستنوێژێكی چاك بگرێ، لەپاشدا هەستێ دوو ركات نوێژ بكات، ئینجا (أستغفر الله) بكات و داوای لێ خۆشبوون لە خوای گەورە بكات، خوای گەورەش لێی خۆشدەبێ، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە هەتا كۆتایی: (**وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ**) سورة آلِ عِمْرَان: ١٣٥. واتە: وە ئەوانەی كاتێك كە كردەوەیەكی ناشیرین دەكەن یان ستەم لە خۆیان دەكەن، كە یادی خوایان كردەوە ئینجا داوای لێ بووردن دەكەن بۆ گوناهەكانیان، ئایا كێ دەبوورێ لە گوناهەكان بێجگە لە خوا؟ وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی كە كردویانە لە كاتێكدا بزانن گوناهە.

٣٠٠٧ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ، قَالَ: رَفَعْتُ رَأْسِي يَوْمَ أُحُدٍ فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ، وَمَا مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ إِلاَّ يَمِيدُ تَحْتَ حَجَفَتِهِ مِنَ النُّعَاسِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: (ثُمَّ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الغَمِّ أَمَنَةً نُعَاسًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عَبَادَةَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ الزُّبَيْرِ، مِثْلَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو (طلحة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە ڕۆژی جەنگی ئوحود سەرم بەرزکردەوە سەیرم کرد هیچ کەسێ نیە لەژێر زرێ و قەڵغانەکەیەوە وەنەوز نەدات هەرهەموویان خەودەیبردنەوەو خواردەبوونەوە، ئەم ئایەتەش بەڵگە بوو لەسەر ئەوە: (**ثُمَّ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الغَمِّ أَمَنَةً نُعَاسًا**). سورة آلِ عِمْرَان: ١٥٤. واتە: پاشان دایبەزاند بەسەرتاندا ئارامی لەپاش ئەو غەمە (ی چەشتان) کە وەنەوزێك بوو.

٣٠٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ، قَالَ: غُشِينَا وَنَحْنُ فِي مَصَافِّنَا يَوْمَ أُحُدٍ، حَدَّثَ أَنَّهُ كَانَ فِيمَنْ غَشِيَهُ النُّعَاسُ يَوْمَئِذٍ قَالَ: فَجَعَلَ سَيْفِي يَسْقُطُ مِنْ يَدِي وَآخُذُهُ، وَيَسْقُطُ مِنْ يَدِي وَآخُذُهُ، وَالطَّائِفَةُ الأُخْرَى الْمُنَافِقُونَ لَيْسَ لَهُمْ هَمٌّ إِلاَّ أَنْفُسُهُمْ، أَجْبَنُ قَوْمٍ وَأَرْعَبُهُ وَأَخْذَلُهُ لِلْحَقِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئەبو (طلحة) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لە ڕۆژی جەنگی ئوحود ئێمە لەناو ڕیزکانی خۆماندا بەرامبەر بە دوژمن لە بۆسەدا بووین وەنەوزمان دەداو خەودیبردینەوە، شمشێرەکەم لەدەست کەوتەخوارەوە هەڵمگرتەوە، هەر شمشێرەکەم لەدەست

دەكەوتەخوارەوە و هەڵمگرتەوە، كۆمەڵێ لە دووڕووەكان جگە لە غەمی خۆیان هیچ غەم و هەمێكیان نەبوو، بێ غیرەت ترین و ترسنۆكترین و ریسواو سەرشۆڕترین قەومن بۆ هەق.

٣٠٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ خُصَيْفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مِقْسَمٌ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَغُلَّ) فِي قَطِيفَةٍ حَمْرَاءَ افْتُقِدَتْ يَوْمَ بَدْرٍ. فَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لَعَلَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَغُلَّ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَى عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ خُصَيْفٍ، نَحْوَ هَذَا وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ خُصَيْفٍ، عَنْ مِقْسَمٍ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێت: لە رۆژی جەنگی بەدردا پۆشاكێكی قەیفەی سوور لە غەنیمەت دیار نەمابوو داوا دەكرایەوە، هەندێ وتیان: لەوانەیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بردبێتی بۆ خۆی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾. سورة آلِ عِمْرَانَ: ١٦١. واتە: وە بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبوو كە خیانەت بكات، وە هەر كەس خیانەت بكات بەو خیانەتەوەی كردویەتی دێت (بەكۆڵیەوەیە) لە پاشەڕۆژدا (رۆژی هەستانەوە)، پاشان پاداشت دەدرێتەوە هەموو كەسێك هەرچی كردبێت، وە ئەوان ستەمیان لێ ناكرێت.

٣٠١٠ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَبِيبِ بْنِ عَرَبِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ كَثِيرٍ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ طَلْحَةَ بْنَ خِرَاشٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ،

يَقُولُ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لِي: يَا جَابِرُ مَا لِي أَرَاكَ مُنْكَسِرًا؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ اسْتُشْهِدَ أَبِي، وَتَرَكَ عِيَالاً وَدَيْنًا، قَالَ: أَفَلاَ أُبَشِّرُكَ بِمَا لَقِيَ اللَّهُ بِهِ أَبَاكَ؟ قَالَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: مَا كَلَّمَ اللَّهُ أَحَدًا قَطُّ إِلاَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ، وَأَحْيَا أَبَاكَ فَكَلَّمَهُ كِفَاحًا. فَقَالَ: يَا عَبْدِي تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ. قَالَ: يَا رَبِّ تُحْيِينِي فَأُقْتَلَ فِيكَ ثَانِيَةً. قَالَ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ: إِنَّهُ قَدْ سَبَقَ مِنِّي: (أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لاَ يُرْجَعُونَ) قَالَ: وَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ جَابِرٍ، شَيْئًا مِنْ هَذَا، وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُوسَى بْنِ إِبْرَاهِيمَ، وَرَوَاهُ عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمَدِينِيِّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ كِبَارِ أَهْلِ الحَدِيثِ، هَكَذَا عَنْ مُوسَى بْنِ إِبْرَاهِيمَ.

واتە: جابیری كوڕی (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پێگەیشت، پێی فەرمووم: (ئەی جابیر، ئەوە بۆ دەتبینم تێك شكاوی و كز دیاریت؟) وتم: باوكم لەجەنگی ئوحوددا شەهید بووە، كۆمەڵێ منداڵ و قەرز و قۆڵەیەكی بۆ جێهێشتووم، فەرمووی: (ئەرێ مـوژدەت بـدەمێ كـە خوای گەورە چۆن پێشوازی كرد لە باوكت؟) وتی: وتم: بەڵێ، فەرمووی: (بێگومـان خوای گەورە هەرگیز قسەی لەگەڵ كەس نەكردووە لەپشت پەردەوە نەبێت، بـەڵام لەگەڵ باوكت ڕوو بە ڕوو قسەی كـرد، فـەرمووی: ئـەی بەندەكـەم ، ئـاواتی خـۆت بخوازە هـەتا پێـت بـدەم، وتـی: ئـەی پـەروەردگارم، زینـدووم بكـەرەوە بـا دووبـارە بكوژرێمەوە لەپێناوی تۆدا، پەروەردگار فـەرمووی: پێشـتر بڕیـاری ئـەوەم داوە كـە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئەوان: (**أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لاَ يُرْجَعُونَ**) سورة يس: ٣١. فەرمووی: جـا ئـەم ئایەتەش هاتەخوارەوە: (**وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ**) سورة آلِ عِمْرَانَ: ١٦٩. واتە: هەرگیز وا گومـان مـەبـەن ئەوانـەی كـە

کـوژران لـەرێی خـوادا مـردوون، بـەڵکو ئەوانـە زینـدوون لای پـەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن.

٣٠١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ قَوْلِهِ: (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ) فَقَالَ: أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ، فَأُخْبِرْنَا أَنَّ أَرْوَاحَهُمْ فِي طَيْرٍ خُضْرٍ تَسْرَحُ فِي الجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، وَتَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مُعَلَّقَةٍ بِالعَرْشِ، فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّكَ اطِّلاَعَةً، فَقَالَ: هَلْ تَسْتَزِيدُونَ شَيْئًا فَأَزِيدُكُمْ؟ قَالُوا رَبَّنَا: وَمَا نَسْتَزِيدُ وَنَحْنُ فِي الجَنَّةِ نَسْرَحُ حَيْثُ شِئْنَا؟ ثُمَّ اطَّلَعَ عَلَيْهِمُ الثَّانِيَةَ، فَقَالَ: هَلْ تَسْتَزِيدُونَ شَيْئًا فَأَزِيدُكُمْ؟ فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لاَ يُتْرَكُونَ قَالُوا: تُعِيدُ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، فَنُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ)** سورة آلِ عِمْرَان: ١٦٩. واتـە: هـەرگیز وا گومـان مەبـەن ئەوانـــەی کـــە کـــوژران لـــەرێی خـــوادا مـــردوون، بـــەڵکو ئەوانـــە زینـــدوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن.

پرسیار کرا لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: ئێمە دەربارەی ڕاڤەی ئەم ئایەتە پرسیارمان کردووە لە پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وســلم، پێـی ڕاگەیانـدین کـە ڕۆحـەکانیان لـەناو جەسـتەی باڵنـدەی سـەوزدایە لەبەهەشتدا گەشتوگوزار دەکەن و دێن و دەچن بە ئـارەزووی خۆیـان، بـۆ حەوانـەوە دەگەڕێنەوە بۆ ناو چراخانێ کە هەڵواسراون بـە عەرشـەوە، خـوای گـەورە سـەیریان دەکات و دەفەرمووێ: هیچ شتێکتان دەوێ هەتا بۆتانی زیـاد بکـەم؟ دەڵـێن: ئـەی

پەروەردگارما، لەمە زیاتر چی ترمان بوێت لەبەهەشتدا بە ئارەزووی خۆمان دەخۆین و دەخۆینەوە و دەسوڕێینەوە، جارێکی تر سەیریان دەکاتەوەو دەفەرمووێ: هیچ شتێکتان دەوێ هەتا بۆتانی زیاد بکەم؟ شەهیدەکان کە دەبینن خوای گەورە وازیان لێ ناهێنێ دەڵێن: رۆحەکانمان بکەرەوە بە بەر جەستەماندا هەتا بگەڕێینەوە بۆ دونیاو، جارێکی تر بکوژرێینەوە لەپێناوی تۆدا).

٣٠١١(م) - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، مِثْلَهُ وَزَادَ فِيهِ: وَتُقْرِئُ نَبِيَّنَا السَّلاَمَ وَتُخْبِرُهُ أَنْ قَدْ رَضِينَا وَرُضِيَ عَنَّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

(عبد الله)ی کوڕی مەسعود رەزای خوای لێ بێ ئەمەی بۆ زیاد کرد: هەتا سەلام بکەین لە پێغەمبەرەکەمان صلى الله عليه وسلم و پێی رابگەیەنین کە بێگومان ئێمە لە خوای خۆمان رازین و ئەویش لێمان رازیە.

٣٠١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ جَامِعٍ وَهُوَ ابْنُ أَبِي رَاشِدٍ، وَعَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَعْيَنَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا مِنْ رَجُلٍ لاَ يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ إِلاَّ جَعَلَ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ فِي عُنُقِهِ شُجَاعًا، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْنَا مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ) الآيَةَ، وقَالَ مَرَّةً: قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِصْدَاقَهُ: (سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ) وَمَنْ اقْتَطَعَ مَالَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ بِيَمِينٍ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللهِ: (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللهِ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، يَعْنِي: حَيَّةً.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس زەکاتی ماڵ و سامانەکەی دەرنەکات لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە مارێك دەکاتە ملی، ئینجا بۆ سەلماندنی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ**) سورة آلِ عِمْرَان: ١٨٠. واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەو کەسانەی کە چرووکی دەکەن لەوەی کە خوا پێی بەخشیوون لەڕێز و بەهرەی خۆی.... (**سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). واتە: ئەوەی کە چرووکیان پێ دەکرد وەك تەوق دەکرێتە ملیان لەڕۆژی قیامەتدا. هەرکەس بەدرۆ سوێند بخوات بۆ ئەوەی ماڵی برا موسوڵمانەکەی ببچڕێت بۆ خۆی، کاتێ کە دەگات بە دیداری خوای پەروەردگار لێی توڕەیەو سزای دەدات). ئینجا بۆ سەلماندنی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**). سورة آلِ عِمْرَان: ٧٧.

واتە: بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان ئەفرۆشن بە نرخێکی کەم، ئەوانە لەڕۆژی قیامەتدا بێ بەشن (لەبەهرەی خوا)، خوا قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات لەڕۆژی قیامەتدا، وە لە گوناهیان خۆش نابێت ، وە بۆ ئەوانە هەیە سزای سەخت و بەسۆ.

٣٠١٣ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، وَسَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مَوْضِعَ سَوْطٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان جێگەیەکی کەمی هەریەکێ لەئێوە لە بەهەشتدا چاکترە لەدونیاو لەوەش لەناو دونیادا هەیە، گەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: **(فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ)**. سورة آلِ عِمْرَان: ١٨٥. واتە: هەرکەسێ دووربخرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە سەرکەوتووە، ژیانی دونیاش هیچ شتێك نیە جگە لە بەهرەو ئارەزوویەکی فریودەر.

٣٠١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنَّ حُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الحَكَمِ، قَالَ: اذْهَبْ يَا رَافِعُ، لِبَوَّابِهِ، إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْ لَهُ: لَئِنْ كَانَ كُلُّ امْرِئٍ فَرِحَ بِمَا أُوتِيَ، وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ مُعَذَّبًا، لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا لَكُمْ وَلِهَذِهِ الآيَةِ إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ فِي أَهْلِ الكِتَابِ ثُمَّ تَلاَ ابْنُ عَبَّاسٍ: (وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ) وَتَلاَ (لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا) قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: سَأَلَهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَيْءٍ فَكَتَمُوهُ، وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ فَخَرَجُوا، وَقَدْ أَرَوْهُ أَنْ قَدْ أَخْبَرُوهُ بِمَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ، وَاسْتُحْمِدُوا بِذَلِكَ إِلَيْهِ، وَفَرِحُوا بِمَا أُوتُوا مِنْ كِتْمَانِهِمْ، مَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: کاتێ (عبد الملك)ی کوڕی مەروان کاربەدەستی مەدینە بوو لەلایەن معاویەوە رەزای خوای لێ بێ، بەدەرگاوانەکەی خۆی وت: ئەی رافیع برۆ بە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ بلێ: ئەگەر هەموو کەسێ سزاو ئازار بدرێ لەسەر ئەوەی کە شادومانن بەوەی کە کردویانە، وە پێیان خۆشە سوپاس بکرێن لەسەر

شتێك کە نەیانکردووە، کەواتە هەر هەموویان سزا دەدرێن، ئیبنو عەباس ئینکاری پرسیارەکەی کردوو فەرمووی: ئێوە چیتانە بەسەر ئەم باسەوە ئەم ئایەتە دەربارەی خاوەن نامە ئاسمانیەکان هاتۆتەخوارەوە، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ)** سورة آلِ عِمْرَان: ١٨٧. واتە: خوا بەڵێن و پەیمانی وەریگرت لەوانەی کە نامەیان ئاسمانیان پێ بەخشرابوو، دەبێ ئەو نامەیە روون بکەنەوە بۆ خەڵك و نەیشارنەوە. **(لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلَا تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)** سورة آلِ عِمْرَان: ١٨٨. واتە: وە گومان مەبە ئەوانەی وا شادومانن بەوەی کە کردویانە، وە پێیان خۆشە سوپاس بکرێن بە شتێك کە نەیانکردووە، ئەوە هەرگیز گومانیان پێ مەبە بە رزگار بوو لە سزا، بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی ئازاردەر. ئیبنو عەباس فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی شتێ پرسیاری کرد لە جولەکەکان، ئەوان وەڵامە راستەکەیان شاردەوەو شتێکی تریان پێ راگەیاند، ئینجا وایان نیشاندا کە وەڵامی پرسیارەکەیان بەراستی داوەتەوە، کەواتە دەبێ سوپاسیان بکات، وە شادمان بوون بەوەی کە راستیەکەیان شاردۆتەوە.

### دەربارەی سورەتی (النِّسَاءِ).

### ٥ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ النِّسَاءِ

٣٠١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، يَقُولُ: مَرِضْتُ فَأَتَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي، وَقَدْ أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَلَمَّا أَفَقْتُ، قُلْتُ: كَيْفَ

أَقْضِي فِي مَالِي؟ فَسَكَتَ عَنِّي حَتَّى نَزَلَتْ: (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ. حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ وَفِي حَدِيثِ الفَضْلِ بْنِ الصَّبَّاحِ كَلَامٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا.

واتە: جابیری کوڕی (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ کە فەرمووی: نەخۆشکەوتم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ سەردانم، لەهۆش خۆم چوو بووم، کە هاتمەوە سەرخۆم، وتم: چی لە ماڵ و سامانەکەم بکەم، ئەویش بێدەنگ بوو هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: **(يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ)**. سورة النساء:١١. واتە: خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەکات دەربارەی ڕۆڵەکانتان بۆ نێرینە هەیە (لە میرات) بە وێنەی بەشی دوو مێ.

٣٠١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلَالٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَبِي الخَلِيلِ، عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ الهَاشِمِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أَوْطَاسٍ أَصَبْنَا نِسَاءً لَهُنَّ أَزْوَاجٌ فِي الْمُشْرِكِينَ فَكَرِهَهُنَّ رِجَالٌ مِنَّا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَالمحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە جەنگی (أَوْطَاس)دا هەندێ ژنمان بە دیل لێ گرتن، هەندێ لە هاوەڵان پێیان خۆش نەبوو بچنە لای ئەو ژنە دیلانە، گوایە ئەوانە مێردیان هەیەو مێردەکانیشیان هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرن، خوای گەورە لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ)**. سورة النساء: ٢٤. واتە:

(هەروەها حەرام کراوە لێتان) ئەوانەی کەمێردیان هەیە لە ئافرەتان جگە لەوانەی کە بوونەتە موڵکتان (کەنیزەك). واتە: ئەو ژنە دیلانە کە عیددەی شەرعیان تەواو بوو ئیتر دروستە بۆ خاوەنە موسوڵمانەکانیان بچنە لایان.

٣٠١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عُثْمَانُ الْبَتِّيُّ، عَنْ أَبِي الخَلِيلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: أَصَبْنَا سَبَايَا يَوْمَ أَوْطَاسٍ لَهُنَّ أَزْوَاجٌ فِي قَوْمِهِنَّ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَتْ: (وَالمحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَهَكَذَا رَوَى الثَّوْرِيُّ، عَنْ عُثْمَانَ البَتِّيِّ، عَنْ أَبِي الخَلِيلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَلَيْسَ فِي هَذَا الحَدِيثِ عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ، وَلاَ أَعْلَمُ أَنَّ أَحَدًا ذَكَرَ أَبَا عَلْقَمَةَ فِي هَذَا الحَدِيثِ إِلاَّ مَا ذَكَرَ هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ، وَأَبُو الخَلِيلِ اسْمُهُ: صَالِحُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە جەنگی (أَوْطَاس)دا هەندێ ژنمان بە دیل لێ گرتن خاوەن مێرد بوون لە قەمەکەی خۆیان، ئەوەمان باسکرد بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەم ئایەتە دابەزی: (**وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ**). سورة النساء:٢٤. واتە: (هەروەها حەرام کراوە لێتان) ئەوانەی کەمێردیان هەیە لە ئافرەتان جگە لەوانەی کە بوونەتە موڵکتان (کەنیزەك).

٣٠١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ شُعْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الكَبَائِرِ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ،

وَقَـوْلُ الـزُّورِ. هَـذَا حَـدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيـبٌ وَرَوَاهُ رَوْحُ بْـنُ عُبَـادَةَ، عَـنْ شُـعْبَةَ، وَقَالَ: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، وَلاَ يَصِحُّ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (گوناهو تاوانە هەرە گەورەکان ئەمانەن: هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای تـاك و تـەنیا، ئـازاردان و دڵ ڕەنجانـدنی دایـك و باوك، کوشتنی کەسێ بە ناڕەوا، وتەی درۆ و شایەتی ناهەق).

٣٠١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الجُرَيْرِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ بِأَكْبَرِ الكَبَائِرِ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: الإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ قَالَ: وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا قَالَ: وَشَهَادَةُ الزُّورِ، أَوْ قَوْلُ الزُّورِ، قَالَ: فَمَا زَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُهَا حَتَّى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبو بەکرەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (ئاگاداربن تاوانە هەرە گەورەکانتان پێ ڕابگەیەنم؟) وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبـەری خوا صلی الله علیـه وسـلم، فـەرمووی: (هـاوەڵ بڕیـاردان بـۆ خـوای تـاك و تـەنیا، ئازاردان و دڵ ڕەنجاندنی دایك و باوك)، وتـی: لەوکاتـەدا شـانی دادا بـوو جـا ڕێـك دانیشـت و فـەرمووی: (شـایەتی درۆ و ناهـەق یـان وتـەی درۆ و سـاختە). وتـی: ئەوەندەی وتەوە هەتا وتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو با ئەوەندە هیلاك نەبوایە.

٣٠٢٠ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ مُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أُنَيْسٍ الجُهَنِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الكَبَائِرِ الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ، وَاليَمِينُ الغَمُوسُ، وَمَا حَلَفَ حَالِفٌ بِاللَّهِ يَمِينَ صَبْرٍ، فَأَدْخَلَ فِيهَا مِثْلَ جَنَاحِ بَعُوضَةٍ إِلاَّ جُعِلَتْ نُكْتَةٌ فِي قَلْبِهِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ. وَأَبُو أُمَامَةَ الأَنْصَارِيُّ هُوَ: ابْنُ ثَعْلَبَةَ، وَلاَ نَعْرِفُ اسْمَهُ، وَقَدْ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَادِيثَ. وهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی ئونەیسی جوهەنیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی لە گوناهو تاوانە هەرە گەورەكان هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوای تاك و تەنیا، ئازاردان و دڵ ڕەنجاندنی دایك و باوك و، سوێندی ناهەقی ماڵوێرانكەرە كە خاوەنەكەی لەناو ئاگری دۆزەخدا نقوم دەكات، هەركەسێ سوێند لەسەر خۆڕاگرتن بخوا ئەوەندەی باڵە مێشوولەیە درۆی تێدا بكات دەبێتە خاڵێكی ڕەش لەدڵیدا لەڕۆژی قیامەتدا).

٣٠٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الكَبَائِرُ: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ أَوْ قَالَ: اليَمِينُ الغَمُوسُ شَكَّ شُعْبَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: ( گوناهو تاوانە هەرە

گەورەکان ئەمنەن: هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای تاك و تەنیا، ئازاردان و دڵ رەنجاندنی دایك و باوك)، یان فەرمووی: (سوێندی ناهەقی ماڵوێرانکەرە کە خاوەنەکەی لەناو ئاگری دۆزەخدا نقوم دەکات).

٣٠٢٢ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: يَغْزُو الرِّجَالُ وَلاَ تَغْزُو النِّسَاءُ وَإِنَّمَا لَنَا نِصْفُ الْمِيرَاثِ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَلاَ تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ). قَالَ مُجَاهِدٌ: وَأَنْزَلَ فِيهَا (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالمسْلِمَاتِ). وَكَانَتْ أُمُّ سَلَمَةَ أَوَّلَ ظَعِينَةٍ قَدِمَتِ الْمَدِينَةَ مُهَاجِرَةً. هَذَا حَدِيثٌ مُرْسَلٌ، وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، مُرْسَلاً، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: كَذَا وَكَذَا.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوان غەزا دەکەن و پاداشتی گەورەی لەسەر وەردەگرن، دیارە ئافرەتان غەزا ناکەن، بێگومان نیوەی میراتیشمان بەردەکەوت، واتە ئەوان دوو ئەوەندەی ئێمە بەشە میرات دەبەن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(وَلاَ تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ)**. سورة النساء: ٣٢. واتە: ئاوات مەخوازن بۆ ئەو پلەیەی کە خوا باوی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکی ترتاندا. موجاهید فەرمووی: لەسەر ئوممو سەلەمە ئەم ئایەتەش هاتەخوارەوە: **(إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ...)** سورة الاحزاب: ٣٥. واتە: بەڕاستی پیاوە موسوڵمانەکان و ئافرەتە موسوڵمانەکان....

٣٠٢٣ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ وَلَدِ أُمِّ سَلَمَةَ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ لاَ أَسْمَعُ اللَّهَ

ذَكَرَ النِّسَاءَ فِي الهِجْرَةِ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەرگوێم نەکەوتوە خوای گەورە لەباسی کۆچکردن بۆ مەدینەدا باسی ئافرەتانی کردبێ، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ)**. سورة آل عمران: ١٩٥. واتە: بەڕاستی من کاروکردەوەی هەرکام لەئێوە –نێر و مێ— لە ئێوە زایە و بێ پاداشت ناکەم، هەندێکتان لە هەندێکن، پیاو لە ژنە و ژنیش لە پیاوە گشتیان لای من چون یەکن.

٣٠٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ، أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْهِ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ. فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ مِنْ سُورَةِ النِّسَاءِ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ (فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاَءِ شَهِيدًا) غَمَزَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ وَعَيْنَاهُ تَدْمَعَانِ. هَكَذَا رَوَى أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، وَإِنَّمَا هُوَ إِبْرَاهِيمُ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر بوو فەرمانی پێ کردم قورئانی بۆ بخوێنم، منیش سورەتی (النساء)م بۆ خوێند هەتا گەیشتمە: **(فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاءِ شَهِيدًا)**. سورة النساء: ٤١. واتە: ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك هێنامان لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك (کە پێغەمبەرەکەیانە)، تۆیشمان هێنا(ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم)

بەشایەت بەسەر ئائەوانەوە. بەدەستی ئاماژەی بۆ کردم کە ئیتر نەخوێنم، (عبد الله) وتی: سەرم هەڵبڕی سەیرم کرد چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهاتەخوارەوە.

٣٠٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْرَأْ عَلَيَّ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي فَقَرَأْتُ سُورَةَ النِّسَاءِ حَتَّى بَلَغْتُ: (وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاَءِ شَهِيدًا) قَالَ: فَرَأَيْتُ عَيْنَيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَهْمِلاَنِ. هَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الأَحْوَصِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (قورئانم بۆ بخوێنە). (عبد الله) وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، من بۆتی بخوێنم لەکاتێکدا کە بۆ تۆ دابەزیوە؟! فەرمووی: (حەزدەکەم گوێم لەغەیری خۆم بێت کە بیخوێنێ)، (عبد الله) وتی: منیش منیش سورەتی (النساء)م بۆ خوێند هەتا گەیشتمە: (فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاءِ شَهِيدًا). سورة النساء:٤١. واتە: ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك هێنامان لە هەموو ئومەتێکدا شایەتێك (کە پێغەمبەرەکەیانە)، تۆیشمان هێنا(ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) بەشایەت بەسەر ئائەوانەوە. (عبد الله) وتی: سەرم هەڵبڕی سەیردەکەم چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دێتەخوارەوە.

٣٠٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَ حَدِيثِ مُعَاوِيَةَ بْنِ هِشَامٍ. حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ

الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الرَّازِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: صَنَعَ لَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ طَعَامًا فَدَعَانَا وَسَقَانَا مِنَ الخَمْرِ، فَأَخَذَتِ الخَمْرُ مِنَّا، وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَقَدَّمُونِي فَقَرَأْتُ: (قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ) وَنَحْنُ نَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف ڕەزای خوای لێ بێ خواردنێکی بۆ دروستکردین و دەعوەتی کردین و شەرابی دەرخواردداین – لەپێش حەرام کردنی – ، عەقڵ و هۆشی بردین، کاتی نوێژ هاتەپێشەوە منیان خستەپێشەوە بەرنوێژیم بۆ کردن، منیش: **(قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ)**م بۆ خوێندن، واتە: بڵێ: ئەی کافر و بێ باوەڕەکان ئەوەی ئێوە ئەیپەرستن من نایپەرستم، کەچی من لێم تێکچوو وتم: **(وَنَحْنُ نَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ)**. واتە: ئێمە ئەوە ئەپەرستین کە ئێوە ئەیپەرستن. فەرمووی: جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ)**. سورة النساء: ٤٣. واتە: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێك ئێوە سەرخۆشن هەتا بزانن چی دەڵێن.

٣٠٢٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، حَدَّثَهُ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ فِي شِرَاجِ الحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ لِلزُّبَيْرِ: اسْقِ يَا زُبَيْرُ وَأَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ. فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَغَيَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: يَا زُبَيْرُ اسْقِ وَاحْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الجُدُرِ فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ) الآيَةَ. سَمِعْت مُحَمَّدًا، يَقُولُ: قَدْ رَوَى ابْنُ وَهْبٍ، هَذَا الحَدِيثَ عَنِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ، وَيُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ، وَرَوَى شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنِ الزُّبَيْرِ، وَلَمْ يَذْكُرْ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێکی ئەنصاری لەگەڵ باوکم بوو بە کێشەو هەرایان لەسەر سەرەی ئاو کە لە ئاوەڕۆکانی ئەلحەڕڕەوە دەهات، باخە خورمایان پێ ئاو دەدا، پیاوە ئەنصاریەکە وتی: ئاوەکە بەردە با بڕوات بۆ ناو باخەکانی ئێمەش، زوبێر ڕازی نەبوو بەری نەدا، بۆ ئەو کێشەیە چونە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە زوبێری فەرموو: (ئەی زوبێر باخەکەت ئاو بدە ئینجا ئاوەکە بەرەڵابکە بۆ دراوسێکەت). پیاوە ئەنصاریەکە توڕە بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوە پورزای خۆتە، ڕووی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گۆڕاو ڕەنگی توڕەیی پێوە دیار بوو، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی زوبێر باخەکەت ئاو بدە، ئینجا ئاوەکە بگرەوە هەتا ئاوەکە دەدا لە قەدیان ئەوسا ئاوەکەش بگرەوە). زوبێر وتی: سوێند بە (الله) وا ئەزانم ئەم ئایەتە لەو بارەوە هاتە خوارەوە: (**فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا**) سورة النساء: ٦٥. واتە: نەخێر (وانی یە کەخۆیان بە باوەڕدار نیشیان دەدەن) سوێند بەپەروەردگارت بڕوا دارنین تاتۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و

دووبەرەکیەکی نێوانیاندا، لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزاریەك لەو بڕیارەی کە تۆ داوتەو ملکەچ نەکەن بەملکەچیەکی تەواو.

٣٠٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ يَزِيدَ، يُحَدِّثُ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فِي هَذِهِ الآيَةِ (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ) قَالَ: رَجَعَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَكَانَ النَّاسُ فِيهِمْ فِرْقَتَيْنِ: فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَقُولُ: اقْتُلْهُمْ، وَفَرِيقٌ يَقُولُ: لاَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ) وَقَالَ: إِنَّهَا طِيبَةُ، وَقَالَ: إِنَّهَا تَنْفِي الْخَبَثَ كَمَا تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الْحَدِيدِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ هُوَ: الأَنْصَارِيُّ الْخَطْمِيُّ وَلَهُ صُحْبَةٌ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و سوپاکەی بەرەو چیای ئوحود بەرێکەوتن بۆ جەنگ لەرێگە کۆمەڵێ گەڕانەوە، هاوەڵان بوون بە دوو تاقم و دەستەوە: تاقمێکیان وتیان: کە گەڕاینەوە دەیانکوژین، تاقمێکی تریان وتیان: نایانکوژین، جا ئەم ئایەتە دابەزی: **(فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ)** سورة النساء: ٦٨. واتە: لەبەرچی دەربارەی دووڕووەکان بوون بە دوو تاقم و دەستەوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەدینە شارێکی خۆش و باشە). هەروەها فەرمووی: (مەدینە ژەنگ و چڵك و پیسی لادەبات وەك چۆن ئاگری کورە ژەنگ و چڵك و پیسی ئاسن لادەبات بەو شێوەیە).

٣٠٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ بْنُ عُمَرَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ قَالَ: يَجِيءُ الْمَقْتُولُ بِالقَاتِلِ يَوْمَ القِيَامَةِ نَاصِيَتُهُ وَرَأْسُهُ بِيَدِهِ وَأَوْدَاجُهُ تَشْخَبُ دَمًا، يَقُولُ: يَا رَبِّ، قَتَلَنِي هَذَا، حَتَّى يُدْنِيَهُ مِنَ العَرْشِ قَالَ: فَذَكَرُوا لِابْنِ عَبَّاسٍ، التَّوْبَةَ، فَتَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا)، قَالَ: مَا نُسِخَتْ هَذِهِ الآيَةُ، وَلاَ بُدِّلَتْ، وَأَنَّى لَهُ التَّوْبَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ عَمْرِو بْنَ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتدا کوژراو قژی پێشی سەری بکوژ دەگرێ دەمارەکانی خوێنیان لێ دەتکێ، دەڵێ: ئەی پەروەردگار، ئەمە کوشتمی، هەتا نزیکی دەکاتەوە لە عەرش)، وتی: وتیان بە ئیبنو عەباس بکوژ تەوبەی لێ وەردەگیرێ یان نا؟ ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: فەرمووی: نەخێر ئەم ئایەتە نەسخ نەبۆتەوە و نەگۆڕاوە، دەی ئیتر چۆن تەوبەی لێ وەردەگیرێ.

٣٠٣٠ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي رِزْمَةَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ غَنَمٌ لَهُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ قَالُوا: مَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ لِيَتَعَوَّذَ مِنْكُمْ فَقَامُوا فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا غَنَمَهُ، فَأَتَوْا بِهَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ فَتَبَيَّنُوا وَلاَ تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ لە هۆزی بەنی سولەیم رانە مەڕێکی خۆی پێ بوو، دای بەلای کۆمەڵێ لە

هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، سڵاوی لێ کردن، وتیان: بۆیە سەلامی لێ کردین لەبەر ئەوەی خۆی و مەڕەکانی بپارێزێ و سەلامەت بن، هەستان کوشتیان و رانە مەڕەکەیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا**). سورة النساء: ٩٤. واتە: ئەی کەسانێك کە بڕواتان هێناوە کاتێ دەرچوون (بۆ جیهادکردن) لەرێگەی خوادا هەموو شتێ روون بکەنەوە، نەڵێن بەو کەسانەی کە سڵاو(ی موسڵمانانە)تان لێ دەکەن تۆ بڕوادار نیت؟ بەدوای شتومەك و سامانی دنیایی دا بگەرێن. - (**تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا**) مەبەستی لە رانە مەڕەکەیە - .

٣٠٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) الآيَةَ جَاءَ عَمْرُو ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَكَانَ ضَرِيرَ الْبَصَرِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا تَأْمُرُنِي؟ إِنِّي ضَرِيرُ الْبَصَرِ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ: (غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) الآيَةَ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ائْتُونِي بِالْكَتِفِ وَالدَّوَاةِ، أَوْ اللَّوْحِ وَالدَّوَاةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَيُقَالُ: عَمْرُو ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، وَيُقَالُ: عَبْدُ اللهِ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ زَائِدَةَ، وَأُمُّ مَكْتُومٍ أُمُّهُ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: (**لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ** ...). سورة النساء: ٩٥. واتە: یەکسان نین دانیشتوان (لە جیهادی رێی خودا) لە باوەڕداران لەگەڵ تێکۆشەرانی رێگەی خوادا بەماڵ و گیانیان.

عەمری کوڕی ئیبنو ئوممی مەکتوم کە پیاوێکی نابینا بوو کاتێ کە فەزڵ و گەورەیی خێر و پاداشتی تێکۆشەرانی(موجایدین)ی بیست هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من پیاوێکی نابینام فەرمانم بەچی پێ دەکەی؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ**). سورة النساء: ٩٥. واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئێسکی شانی وشترەکە بێنن و (**غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ**) بۆ ئایەتەکە زیاد بکەن لەسەری بینوسن). - ئەوکاتە قاڵەم و کاغەز نەبووە -.

٣٠٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الكَرِيمِ، سَمِعَ مِقْسَمًا، مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ قَالَ: (لاَ يَسْتَوِي القَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) عَنْ بَدْرٍ، وَالخَارِجُونَ إِلَى بَدْرٍ لَمَّا نَزَلَتْ غَزْوَةُ بَدْرٍ قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ جَحْشٍ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ: إِنَّا أَعْمَيَانِ يَا رَسُولَ اللهِ، فَهَلْ لَنَا رُخْصَةٌ؟ فَنَزَلَتْ: (لاَ يَسْتَوِي القَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) وَ (فَضَّلَ اللهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى القَاعِدِينَ دَرَجَةً) فَهَؤُلاَءِ القَاعِدُونَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ (وَفَضَّلَ اللهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى القَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا) دَرَجَاتٍ مِنْهُ عَلَى القَاعِدِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرِ أُولِي الضَّرَرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَمِقْسَمٌ يُقَالُ: هُوَ مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، وَيُقَالُ: هُوَ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، وَكُنْيَتُهُ أَبُو القَاسِمِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەوانەی دانیشتن و نەچوون بۆ غەزای بەدر ئەم ئایەتە دابەزی: (**لاَ يَسْتَوِى الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِى سَبِيلِ اللّهِ** ...). سورة النساء: ٩٥. (عبد

الله)ی کوڕی جەحش و ئیبنو ئومی مەکتوم وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، ئێمە دوو پیاوی نابینایین، روخسەتمان بۆ هەیە؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا**). سورة النساء: ٩٥. واتە: یەکسان نین دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خودا) لە باوەڕداران لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا بەماڵ و گیانیان، جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل)، خوا باوی داوە تێکۆشەران بەماڵ و گیانیان بەسەر دانیشتوان (لە جیهاد) بە پلەیەك، هەریەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاکی پێداون (کە بەهەشتە)، خوا ڕێزی تێکۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتوەکاندا بە پاداشتێکی گەورە. جا ئەوانە واتە (عبد الله)ی کوڕی جەحش و ئیبنو ئومی مەکتوم لە خاوەن عوزرەکانن: (**غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ**).

٣٠٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، قَالَ: رَأَيْتُ مَرْوَانَ بْنَ الحَكَمِ، جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ فَأَقْبَلْتُ حَتَّى جَلَسْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَأَخْبَرَنَا أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْلَى عَلَيْهِ: (لاَ يَسْتَوِي القَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) (وَالمجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) قَالَ: فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَاللَّهِ لَوْ أَسْتَطِيعُ الجِهَادَ لَجَاهَدْتُ، وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي فَثَقُلَتْ حَتَّى هَمَّتْ تَرُضُّ فَخِذِي، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ (غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ

صَحِيحٌ، هَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ نَحْوَ هَذَا وَرَوَى مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَفِي هَذَا الحَدِيثِ رِوَايَةُ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ التَّابِعِينَ رَوَاهُ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الحَكَمِ وَمَرْوَانُ لَمْ يَسْمَعْ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مِنَ التَّابِعِينَ.

واتە: سەهلی كوڕی سەعد فەرمووی: كاتێ مەروانی كوڕی حەكەم كاربەدەستی مەدینە بوو لە مزگەوت دیم، چووم بۆ لای هەتا لەتەنیشتیەوە دانیشتم، پێی راگەیاندین كە زەیدی كوڕی (ثابت) رەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕاوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەم ئایەتەی پێ نوسیوەتەوە: (**لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا**). سورة النساء: ٩٥.

واتە: یەكسان نین دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خودا) لە باوەڕداران لەگەڵ تێكۆشەرانی ڕێگەی خوادا بەماڵ و گیانیان، جگە لە خاوەن عوزرەكان (نەخۆش، كوێر، شەل)، خوا باوی داوە تێكۆشەران بەماڵ و گیانیان بەسەر دانیشتوان (لە جیهاد) بە پلەیەك، هەریەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاكی پێداون (كە بەهەشتە)، خوا ڕێزی تێكۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتوەكاندا بە پاداشتێكی گەورە.

لەوكاتەدا ئیبنو ئومی مەكتوم كە پیاوێكی نابینا بوو هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سوێند بە (الله) ئەگەر توانام هەبوایە جیهادم دەكرد، پێغەمبەری خوا صلی الله

علیه وسلم وەحی بۆ هات، رانی لەسەر رانم بوو، ئەوەندە قورس بوو خەریك بوو قاچم بشکێنێ، لەپاشدا ئەو حاڵەتەی نەما، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ**). سورة النساء: ٩٥. واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل).

٣٠٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ، يُحَدِّثُ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَابَاهُ، عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: إِنَّمَا قَالَ اللَّهُ: (أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمْ) وَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ، فَقَالَ عُمَرُ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ. فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَقَالَ: صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە پێشەوا عومەر کوڕی (خطاب)م ڕەزای خوای لێ بێ وت: بەڕاستی خوای گەورە دەفەرموێت: (**وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمْ**) سورة النساء: ١٠١. واتە: کاتێ بە سەفەر چوون بە وڵاتدا - بۆ جیهاد یان بۆ بازرگانی — ئەوە لە حاڵی وادا هیچ گوناهێکتان لەسەر نابێ نوێژە چوار رکاتیەکان کورت بکەنەوە، ئەگەر ترسان هەبوو کافر و بێ باوەڕن تووشی پیلانێکتان بکەن (بتانکوژن، بتانگرن و ئازارتان بدەن).

دەی خۆ ئێستا ترس نەماوەو خەڵك هێمن بوونەتەوە، ترسمان نەماوە و چۆن نوێژە چوار رکاتیەکان کورت بکەینەوە؟ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەوەی سەرنجی تۆی راکێشاوە سەرنجی منیشی راکێشاوە، بەڵام ئەمەم باسکرد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەو نوێژ

کورتکردنەوەیە خەڵاتێکە خوا پێی بەخشیون دەی ئێوەش خەڵاتەکە وەربگرن و ڕەتی مەکەنەوە).

٣٠٣٥ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُبَيْدٍ الهُنَائِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ شَقِيقٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَزَلَ بَيْنَ ضَجْنَانَ وَعُسْفَانَ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّ لِهَؤُلاَءِ صَلاَةً هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَبْنَائِهِمْ وَهِيَ الْعَصْرُ، فَأَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ فَمِيلُوا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً وَاحِدَةً، وَأَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَقْسِمَ أَصْحَابَهُ شَطْرَيْنِ فَيُصَلِّيَ بِهِمْ، وَتَقُومُ طَائِفَةٌ أُخْرَى وَرَاءَهُمْ، وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي الآخَرُونَ وَيُصَلُّونَ مَعَهُ رَكْعَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ يَأْخُذُ هَؤُلاَءِ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ، فَتَكُونُ لَهُمْ رَكْعَةٌ رَكْعَةٌ، وَلِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَانِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَحُذَيْفَةَ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَسَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ وَأَبُو عَيَّاشٍ الزُّرَقِيُّ اسْمُهُ: زَيْدُ بْنُ الصَّامِتِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنێوان (ضجنان) و عەسەفان دابەزی کێوێکە یان شوێنێکە لەنێوان مەکەو مەدینەدا، هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران وتیان: موسوڵمانان زۆرگرنگی بە نوێژی عەسر دەدەن و بەلایانەوە خۆشەویسترە لە باب و بپیرانیان و نەوەکانیان، جا بۆیە با خۆمان بۆ ئامادەکەین بۆ جەنگ و لەکاتی نوێژی عەسردا بەیەکجار پەلاماریان بدەین و لەناویان بەرین، جبریل هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکرد هاوەڵانی بکات بە

دوو دەستەو تاقمەوە و بەرنوێژیان بۆ بکات بەم شێوەیە: تاقمێکیان لەگەڵ ئەو رکاتێ نوێژ بکەن، تاقمەکەی تر لەپشتیانەوە پاسەوان بن و ئاگایان لەهێرشی دوژمن بێ و چەکەکانیان پێ بێ و وریای خۆیان بن، جا کە ئەو تاقمە رکاتەکەیان تەواو کرد ئەوانیش بچنە دواوە بۆ پاسەوانی و تاقمەکەی تر بێن رکاتێ نوێژ بکەن لەدوایەوە، لەپاشدا با ئەوانیش چەکەکانیان پێ بێ و وریای خۆیان بن، کەواتە هەر یەکێ لەو دوو تاقمە یەکی رکاتێ نوێژیان کردووە بە کۆمەڵ بۆ خۆشیان یەکی رکاتەکەی تر بکەن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆشی دوو رکات.

٣٠٣٦ - (حسن) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ أَبِي شُعَيْبٍ أَبُو مُسْلِمٍ الحَرَّانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ الحَرَّانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ، قَالَ: كَانَ أَهْلُ بَيْتٍ مِنَّا يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو أُبَيْرِقٍ بِشْرٌ وَبُشَيْرٌ وَمُبَشِّرٌ، وَكَانَ بُشَيْرٌ رَجُلاً مُنَافِقًا يَقُولُ الشِّعْرَ يَهْجُو بِهِ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَنْحَلُهُ بَعْضَ العَرَبِ ثُمَّ يَقُولُ: قَالَ فُلاَنٌ كَذَا وَكَذَا، فَإِذَا سَمِعَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَلِكَ الشِّعْرَ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا يَقُولُ هَذَا الشِّعْرَ إِلاَّ هَذَا الخَبِيثُ، أَوْ كَمَا قَالَ الرَّجُلُ، وَقَالُوا: ابْنُ الأُبَيْرِقِ قَالَهَا، قَالَ: وَكَانُوا أَهْلَ بَيْتِ حَاجَةٍ وَفَاقَةٍ، فِي الجَاهِلِيَّةِ وَالإِسْلاَمِ، وَكَانَ النَّاسُ إِنَّمَا طَعَامُهُمْ بِالمدِينَةِ التَّمْرُ وَالشَّعِيرُ، وَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا كَانَ لَهُ يَسَارٌ فَقَدِمَتْ ضَافِطَةٌ مِنَ الشَّامِ مِنَ الدَّرْمَكِ، ابْتَاعَ الرَّجُلُ مِنْهَا فَخَصَّ بِهَا نَفْسَهُ، وَأَمَّا العِيَالُ فَإِنَّمَا طَعَامُهُمُ التَّمْرُ وَالشَّعِيرُ، فَقَدِمَتْ ضَافِطَةٌ مِنَ الشَّامِ فَابْتَاعَ عَمِّي رِفَاعَةُ بْنُ زَيْدٍ حِمْلاً مِنَ الدَّرْمَكِ فَجَعَلَهُ فِي مَشْرَبَةٍ لَهُ، وَفِي الْمَشْرُبَةِ سِلاَحٌ وَدِرْعٌ وَسَيْفٌ، فَعُدِيَ عَلَيْهِ مِنْ تَحْتِ البَيْتِ، فَنُقِبَتْ الْمَشْرُبَةُ، وَأُخِذَ الطَّعَامُ وَالسِّلاَحُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَانِي عَمِّي رِفَاعَةُ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي إِنَّهُ قَدْ عُدِيَ عَلَيْنَا فِي لَيْلَتِنَا هَذِهِ، فَنُقِبَتْ مَشْرَبَتُنَا فَذُهِبَ بِطَعَامِنَا وَسِلاَحِنَا. قَالَ: فَتَحَسَّسْنَا

فِي الدَّارِ وَسَأَلْنَا فَقِيلَ لَنَا: قَدْ رَأَيْنَا بَنِي أُبَيْرِقٍ اسْتَوْقَدُوا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ، وَلاَ نَرَى فِيمَا نَرَى إِلاَّ عَلَى بَعْضِ طَعَامِكُمْ، قَالَ: وَكَانَ بَنُو أُبَيْرِقٍ قَالُوا وَنَحْنُ نَسْأَلُ فِي الدَّارِ: وَاللَّهِ مَا نُرَى صَاحِبَكُمْ إِلاَّ لَبِيدَ بْنَ سَهْلٍ، رَجُلٌ مِنَّا لَهُ صَلاَحٌ وَإِسْلاَمٌ، فَلَمَّا سَمِعَ لَبِيدٌ اخْتَرَطَ سَيْفَهُ وَقَالَ: أَنَا أَسْرِقُ؟ فَوَاللَّهِ لَيُخَالِطَنَّكُمْ هَذَا السَّيْفُ أَوْ لَتُبَيِّنُنَّ هَذِهِ السَّرِقَةَ، قَالُوا: إِلَيْكَ عَنْهَا أَيُّهَا الرَّجُلُ فَمَا أَنْتَ بِصَاحِبِهَا، فَسَأَلْنَا فِي الدَّارِ حَتَّى لَمْ نَشُكَّ أَنَّهُمْ أَصْحَابُهَا، فَقَالَ لِي عَمِّي: يَا ابْنَ أَخِي لَوْ أَتَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتَ ذَلِكَ لَهُ، قَالَ قَتَادَةُ: فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: إِنَّ أَهْلَ بَيْتٍ مِنَّا أَهْلَ جَفَاءٍ، عَمَدُوا إِلَى عَمِّي رِفَاعَةَ بْنِ زَيْدٍ فَنَقَبُوا مَشْرَبَةً لَهُ، وَأَخَذُوا سِلاَحَهُ وَطَعَامَهُ، فَلْيَرُدُّوا عَلَيْنَا سِلاَحَنَا، فَأَمَّا الطَّعَامُ فَلاَ حَاجَةَ لَنَا فِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سَآمُرُ فِي ذَلِكَ، فَلَمَّا سَمِعَ بَنُو أُبَيْرِقٍ أَتَوْا رَجُلاً مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ: أُسَيْرُ بْنُ عُرْوَةَ فَكَلَّمُوهُ فِي ذَلِكَ، فَاجْتَمَعَ فِي ذَلِكَ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الدَّارِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَتَادَةَ بْنَ النُّعْمَانِ وَعَمَّهُ عَمَدَا إِلَى أَهْلِ بَيْتٍ مِنَّا أَهْلِ إِسْلاَمٍ وَصَلاَحٍ، يَرْمُونَهُمْ بِالسَّرِقَةِ مِنْ غَيْرِ بَيِّنَةٍ وَلاَ ثَبَتٍ، قَالَ قَتَادَةُ: فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَلَّمْتُهُ، فَقَالَ: عَمَدْتَ إِلَى أَهْلِ بَيْتٍ ذُكِرَ مِنْهُمْ إِسْلاَمٌ وَصَلاَحٌ تَرْمِيهِمْ بِالسَّرِقَةِ عَلَى غَيْرِ ثَبَتٍ وَبَيِّنَةٍ، قَالَ: فَرَجَعْتُ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي خَرَجْتُ مِنْ بَعْضِ مَالِي وَلَمْ أُكَلِّمْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ، فَأَتَانِي عَمِّي رِفَاعَةُ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي مَا صَنَعْتَ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: اللَّهُ الْمُسْتَعَانُ، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ نَزَلَ الْقُرْآنُ (إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الكِتَابَ بِالحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلاَ تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا) بَنِي أُبَيْرِقٍ (وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ) أَيْ مِمَّا قُلْتَ لِقَتَادَةَ: (إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا) (وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ)، إِلَى قَوْلِهِ: (غَفُورًا رَحِيمًا)

أَيْ: لَوْ اسْتَغْفَرُوا اللَّهَ لَغَفَرَ لَهُمْ (وَمَنْ يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ)، إِلَى قَوْلِهِ: (وَإِثْمًا مُبِينًا) قَوْلَهُمْ لِلَبِيدٍ (وَلَوْلاَ فَضْلُ اللهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ)، إِلَى قَوْلِهِ: (فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا) فَلَمَّا نَزَلَ الْقُرْآنُ أَتَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالسِّلاَحِ فَرَدَّهُ إِلَى رِفَاعَةَ، فَقَالَ قَتَادَةُ: لَمَّا أَتَيْتُ عَمِّي بِالسِّلاَحِ، وَكَانَ شَيْخًا قَدْ عَشَا، أَوْ عَسَا، فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَكُنْتُ أُرَى إِسْلاَمُهُ مَدْخُولاً، فَلَمَّا أَتَيْتُهُ بِالسِّلاَحِ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، هُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَعَرَفْتُ أَنَّ إِسْلاَمَهُ كَانَ صَحِيحًا، فَلَمَّا نَزَلَ الْقُرْآنُ لَحِقَ بُشَيْرٌ بِالْمُشْرِكِينَ، فَنَزَلَ عَلَى سُلاَفَةَ بِنْتِ سَعْدِ ابْنِ سُمَيَّةَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا) فَلَمَّا نَزَلَ عَلَى سُلاَفَةَ رَمَاهَا حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ بِأَبْيَاتٍ مِنْ شِعْرٍ، فَأَخَذَتْ رَحْلَهُ فَوَضَعَتْهُ عَلَى رَأْسِهَا ثُمَّ خَرَجَتْ بِهِ فَرَمَتْ بِهِ فِي الأَبْطَحِ، ثُمَّ قَالَتْ: أَهْدَيْتَ لِي شِعْرَ حَسَّانَ؟ مَا كُنْتَ تَأْتِينِي بِخَيْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا أَسْنَدَهُ غَيْرَ مُحَمَّدِ بْنِ سَلَمَةَ الحَرَّانِيِّ. وَرَوَى يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ مُرْسَلاً، لَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ. وَقَتَادَةُ بْنُ النُّعْمَانِ هُوَ: أَخُو أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ لأُمِّهِ، وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: سَعْدُ بْنُ مَالِكِ بْنِ سِنَانٍ.

واتە: لە عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خزم و کەسوکارێکمان هەبوو ناسراوبوون بە بەنو ئوبەیریق بیشر و بەشیر و موبەشیر، بەشیر پیاوێکی شاعیر و دووڕوو بوو، شیعری دەوت، هەجوی هاوەڵانی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم دەکرد واتە بە ناوی خەڵکەوە بە شیعر هێرشی دەکردە سەریان و ناو ناتۆرەی

خراپی لێ دەنان و بە خراپە باسی دەکردن. لەپاشدا دەیوت: فلانە کەس ئاواو ئاوای دەوت، کاتێ کە هاوەڵان شیعرەکانیان بیست، وتیان: سوێند بە (الله) ئەمە جگە لە شیعری ئەو پیس و ناپیاوە شیعری کەسێکی تر نیە، واتە شیعری بەشیرە، قەتادەی وتی: بەنی ئوبەیریق لەسەردەمی نەفامی و لەسەردەمی ئیسلامیشدا خانەوادەیەکی هەژار و نەداربوون، خواردنی خەڵکی مەدینە بریتی بوو لە خورماو جۆ، کاروانی بازرگانی لەشامەوە دەهات بۆ مەدینە کەل و پەل و ئارد و زەیتیان دەهێنا ئەگەر کەسێ دەوڵەمەند بوایە بەشی خۆی لێ دەکرین، جارێ مامم ریفاعەی کوڕی زەید هەندێ ئاردی کڕی، لەهۆدەکەی خۆی داینا، هۆدەکەش کەرەسەی جەنگی و چەك و قەڵغان و شمشێری تێدا بوو ، شەو دز هات و هەموویانی برد، کاتێ کە رۆژ بوویەوە مامم ریفاعە هات بۆلام، وتی: ئەی برازاکەم، ئەمشەو چەکەکان و خواردنەکەمانیان دزیوە، قەتادە وتی: رۆشتین ئەو گوزەرە گەڕاین و پرسیارمان کرد، پێیان وتین: ئەمشەو بەنی ئوبەیریق ئاگریان ئەگرا، پێمان وایە ئەوان بوون، قەتادە وتی: بەنی ئوبەیریق وتیان: ئێمە لەو کۆڵان و دەوروبەرە پرسیارتان بۆ دەکەین، سوێند بە (الله) پێمان وایە لەبیدی کوڕی سەهل بردوونی کە پیاوێکە لە ئێمە، وتیان: پیاوێکی باش و موسوڵمانە، کاتێ لەبید ئەو هەواڵەی بیست شمشێری لەکالان دەرکێشاو هات وتی: من دزیومە ئێوە من دەکەن بەدز؟ سوێند بە (الله) یان ئەم شمشێرە لەجەستەتانداون دەکەم، یان ئەوەتا ئەم دزیە ئاشکرا دەکەن، وتیان: چیت داوە لێمان ئەی پیاو برۆ بەرێی خۆتەوە وازمان لێ بێنە، تۆ نەتدزیوە، مامم پێی وتم: ئەی برازاکەم، خۆزگە بچویتایە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم بەسەرهاتەت پێ رادەگەیاند، قەتادە وتی: چووم بۆ خزمەتی: وتم: کەسوکارەکەم جافین و ئاگای پەیوەندی خزمایەتی و چاکە نازانن، چەك و خۆراکیماڵی ریفاعەی مامیان

دزیوە، با چەکەکانمان بۆ بگێڕنەوە پێویستمان بە خۆراکەکە نیە، فەرمووی: (بڕیار دەدەم لەوبارەوە)، کاتێ بەنی ئوبەیریق هەواڵەکەیان بیست، پیاوێکی هۆزەکەی خۆیان بەناوی ئوسەیری کوڕی عورووەوە نارد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەوبارەوە قسەی لەگەڵ بکات، چەند کەسێ لە خەڵکی گەڕەکە کۆبوونەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەتادە و مامی ئەو کەسوکارەی ئێمەیان کردووە بە دز بەبێ بەڵگە و نیشانە، قەتادە وتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قسەم لەگەڵ کرد، فەرمووی: (بەبێ بەڵگە و شایەت تۆمەتی دزی دەدەیتە پاڵ خێزانێکی باش و موسوڵمان)، قەتادە وتی: ئیتر منیش بە پەشیمانی گەڕامەوە ئاواتەخوازبووم و لەدڵەوە حەزم دەکرد زیانێکی ماڵی گەورەم لێ بکەوتایە بەڵام لەوبارەوە قسەم لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەکردایە، مامم ریفاعە هات بۆلام ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم بۆم گێڕایەوە، ئەویش وتی: بیاندە دەستی خوا بە پشتیوانی خوا هەموو شتێ روون دەبێتەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلاَ تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا**) سورة النساء: ١٠٥. واتە: بێگومان ئێمە دامانبەزاندۆتە سەر تۆ ئەم قورئانە بەڕاستی، بۆ ئەوەی بڕیار بدەی لەنێوان خەڵکدا بەو بڕیارەی کە خوا نیشانی داویت، وە بۆ ناپاکان مەبە بە پارێزەر و داواچی. واتە بۆ بەنی ئوبەیریق، (**وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ**) سورة النساء: ١٠٦. واتە: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە، لەوەی فەرمووت بە قەتادە، (**إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا**) سورة النساء: ١٠٦. واتە: بەڕاستی خوا لێخۆشبووی بە بەزەییە، (**وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللهِ وَهُوَ مَعَهُمْ**) سورة النساء: ١٠٧- ١٠٨. واتە: بەرگری مەکە لەوانەی ناپاکی دەکەن دەربارەی

خۆیان، بێگومان خوا ئەوانەی خۆش ناوێت كە بەردەوام زۆر ناپاك و گوناهبارن، (تاوانەكانی) خۆیان دەشارنەوە لە خەڵكی (لەترساندا) و نایشارنەوە لە خوا (شەرم ناكەن لەخوا) لەكاتێكدا خوا لەگەڵیاندایە.... هەتا دەگاتە: (**غَفُوراً رَحِيمًا**). واتە: خوا لێبووردەی میهرەبانە. واتە: ئەگەر تەوبەیان بكردایە و داوای لێخۆشبوونیان بكردایە لەخوا، ئەوا خوا لێیان خۆش دەبوو: (**وَمَنْ يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ**)، سورة النساء: ١١١. واتە: هەركەسێك گوناهێك (ی گەورە) بكات بێگومان زیانی ئەو گوناهە هەر بۆ خۆیەتی .... هەتا دەگاتە: (**وَإِثْمًا مُبِينًا**) واتە: گوناهێكی ئاشكرا. وتەكەیان بە لەبید: (**وَلَوْلاَ فَضْلُ اللهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ**) واتە: ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا بەسەرتەوە نەبوایە، بێگومان دەستەیەك لەو ناپاكانە بە نیاز بوون كە گومرات بكەن .... هەتا دەگاتە: (**فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا**) سورة النساء: ١١١ - ١١٢. واتە: كە ئایەت دابەزی چەكەكانی رفاعەیان هێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش گەڕاندنیەوە بۆ ریفاعە، قەتادە وتی: كاتێ كە چەكەكانم هێنایەوە بۆ مامم، پیاوێكی پیر بوو لەسەردەمی نەفامیدا زۆر لەخوا یاخی بوو، گومانم هەبوو لە موسوڵمانەتیەكەی، بەڵام كاتێ چەكەكانم بۆ بردەوە وتی: ئەی برازاكەم ئەوە ئەو چەكانەم دا لەڕێی خوا، ئیتر زانیم كە بەڕاستی موسوڵمان بووە، كاتێ كە قورئان دابەزی بەشیر ریسوا بوو پەیوەندی كرد بە هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە، لەماڵی سولافەی كچی سەعدی كوڕی سومەیە دابەزی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا، إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا**). سورة النساء: ١١٥ - ١١٦. واتە: هەركەس دژایەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بكات پاش ئەوەی كە ڕێبازی راستی بۆ روون بوویەوە، شوێن

ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لە ڕێگەی بڕواداران، ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کە هەڵیبژاردووە و دەیخەینە دۆزەخ ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە، بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوەی کە هاوەڵی بۆ دابنرێت، بەڵام جگە لەوە هەرچی بێت لێی خۆش دەبێت، لەهەرکەسێك کە خوا بیەوێت، هەرکەسێك هاوەڵ بۆ خوا دابنێت ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕابوونێکی دوور لەڕاستی.

کاتێ کە بەشیر لەماڵی سولافە دابەزی، حەسانی کوڕی (ثابت) بە چەند کۆپلە شیعرێ هێرشی کردە سەر سولافە و هەجوی کرد، سولافەش کەلوپەلەکەی بەشیری خستە سەر سەری و بردی لە (أَبْطَح) فڕێیدا، لەپاشدا وتی: شیعری هەجوی حەسانت بەدیاری بۆ هێناوم تۆ هەرگیز خێرت بۆ من نەهێناوە.

٣٠٣٧ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ أَسْلَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ ثُوَيْرِ بْنِ أَبِي فَاخِتَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: مَا فِي الْقُرْآنِ آيَةٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ هَذِهِ الآيَةِ (إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ) . وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو فَاخِتَةَ اسْمُهُ: سَعِيدُ بْنُ عِلاَقَةَ، وَثُوَيْرٌ يُكْنَى أَبَا جَهْمٍ، وَهُوَ رَجُلٌ كُوفِيٌّ مِنَ التَّابِعِينَ، وَقَدْ سَمِعَ مِنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ الزُّبَيْرِ، وَابْنُ مَهْدِيٍّ كَانَ يَغْمِزُهُ قَلِيلاً.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە قورئاندا هیچ ئایەتێکم هێندەی ئەم ئایەتە لەلام خۆشتر نیە: **(إِنَّ اللَّـهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ)**. سورة النساء: ١١٦. واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوەی کە هاوەڵی بۆ دابنرێت، بەڵام جگە لەوە هەرچی بێت لێی خۆش دەبێت، لەهەرکەسێك کە خوا بیەوێت.

٣٠٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ أَبِي عُمَرَ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ مُحَيْصِنٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ قَيْسِ بْنِ مَخْرَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَ: (مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، وَفِي كُلِّ مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ كَفَّارَةٌ حَتَّى الشَّوْكَةَ يُشَاكُهَا وَالنَّكْبَةَ يُنْكَبُهَا، ابْنُ مُحَيْصِنٍ هُوَ: عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَيْصِنٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتیّ ئەم ئایەتە دابەزی: (**مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ**) سورة النساء: ١٢٣. واتە: هەرکەسێك خراپەیەك بکات پاداشتی دەدرێتەوە و تۆڵەی لیّ دەسێنرێت. زۆر قورس بوو بەلای موسوڵمانانەوە، بۆیە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەکوای حاڵی خۆیان کرد لەوبارەوە، ئەویش فەرمووی: (میانەڕەو و کار دروست بن و چاکە بکەن و زێدەڕۆیی مەکەن، هەرچی بەڵاو مەینەتیە کە تووشی موسوڵمان دەبێت قەرەبوو کەفارەتی گوناهە تەنانەت دڕکێکیش بچیّ بە جەستەیدا دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانی).

٣٠٣٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالاَ حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ أَخْبَرَنِي مَوْلَى ابْنِ سِبَاعٍ قَال سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةَ: (مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِنْ دُونِ اللهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا) ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا بَكْرٍ أَلاَ أُقْرِئُكَ آيَةً أُنْزِلَتْ عَلَيَّ قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ فَأَقْرَأَنِيهَا فَلاَ أَعْلَمُ إِلاَّ أَنِّي قَدْ كُنْتُ وَجَدْتُ انْقِصَامًا فِي ظَهْرِي فَتَمَطَّأْتُ لَهَا فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا شَأْنُكَ يَا أَبَا بَكْرٍ قُلْتُ يَا رَسُولَ

اللهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي وَأَيُّنَا لَمْ يَعْمَلْ سُوءًا وَإِنَّا لَمُجْزَوْنَ بِمَا عَمِلْنَا فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَّا أَنْتَ يَا أَبَا بَكْرٍ وَالْمُؤْمِنُونَ فَتُجْزَوْنَ بِذَلِكَ فِي الدُّنْيَا حَتَّى تَلْقَوْا اللَّهَ وَلَيْسَ لَكُمْ ذُنُوبٌ وَأَمَّا الآخَرُونَ فَيُجْمَعُ ذَلِكَ لَهُمْ حَتَّى يُجْزَوْا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ أَبُو عِيسَى هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَفِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ وَمُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ يُضَعَّفُ فِي الْحَدِيثِ ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ وَأَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ وَمَوْلَى ابْنِ سِبَاعٍ مَجْهُولٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ وَلَيْسَ لَهُ إِسْنَادٌ صَحِيحٌ أَيْضًا وَفِي الْبَاب عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە پێشەوا ئەبو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووم ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی: (**مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِنْ دُونِ اللهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا**) سورة النساء: ١٢٣.

واتە: هەرکەسێك خراپەیەك بکات پاداشتی دەدرێتەوە و تۆڵەی لێ دەسێنرێت، وە دەستی ناکەوێت بێجگە لە خوا هیچ دۆست و یارمەتیدەرێك. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەبو بەکر، ئاگاداربە ئایا ئەو ئایەتەت بۆ نەخوێنمەوە کە ئێستا بۆم دابەزی؟) وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆی خوێندمەوە، وا هەستم کرد پشتم شکا، وەستام، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەبو بەکر چیتە؟)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆم و باوکم و دایکم بە قوربانت بین،کامان خراپەمان نەکردووە، بێگومان تۆڵەشمان لێ دەسێنرێت، فەرمووی: (ئەی ئەبو بەکر تۆ و باوەڕداران لەدونیادا پاداشت دەدرێنەوە، هەتا دەگەنەوە بە خوا، گوناهتان نامێنێ، بەڵام کافران کردەوە خراپەکانیان بۆ کۆدەکرێتەوە، لەڕۆژی قیامەتدا تۆڵەیان لێ دەکرێتەوە).

٣٠٤٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ مُعَاذٍ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: خَشِيَتْ سَوْدَةُ أَنْ يُطَلِّقَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: لاَ تُطَلِّقْنِي وَأَمْسِكْنِي، وَاجْعَلْ يَوْمِي لِعَائِشَةَ، فَفَعَلَ فَنَزَلَتْ: (فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ) فَمَا اصْطَلَحَا عَلَيْهِ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ جَائِزٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: سەودە ئەترسا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەلاقی بدات، فەرمووی: تەلاقم مەدە و لای خۆت بمهێڵەوە، سەرەكەشم بۆ خاتو عائیشە، ئەم ئایەتە دابەزی: **(فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ)**. سورة النساء: ١٢٨. واتە: هەردووكیان هیچ گوناهێكیان لەسەر نیە كە ئاشتەواییەكی چاك بكەن لەنێوان خۆیاندا، هەر ئاشتەوایی و یەككەوتن چاكترە. لەسەر هەر شتێ رێكەون بە رەزامەندی هەردوو لا ئەوە دروستە.

٣٠٤١ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ مِغْوَلٍ، عَنْ أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الْبَرَاءِ، قَالَ: آخِرُ آيَةٍ أُنْزِلَتْ، أَوْ آخِرُ شَيْءٍ نَزَلَ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو السَّفَرِ اسْمُهُ: سَعِيدُ بْنُ أَحْمَدَ، وَيُقَالُ: ابْنُ يُحْمِدَ.

واتە: لە بەرائەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كۆتا ئایەت كە دابەزی یان كۆتا شت كە دابەزی ئەم ئایەتە بوو: **(يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ)**. سورة النساء: ١٧٦. واتە: (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم) داوای فتوات لێ دەكەن بڵێ خوا فتواتان بۆدەدات دەربارەی كەلالە (كەسێكە نەوەو كوڕو باوكو باپیری نەبێت).

٣٠٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلاَلَةِ)، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تُجْزِئُكَ آيَةُ الصَّيْفِ.

واتە: لە بەرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، (**يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلاَلَةِ**)، (**كَلاَلَةِ**) چی یە؟ فەرمووی: ئایەتی(الصیف)ت بەسە واتە ئایەتی: (١٧٦)ی سورەتی (النساء).

## دەربارەی سورەتی (الْمَائِدَةِ).

## ٦ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْمَائِدَةِ

٣٠٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مِسْعَرٍ وَغَيْرِهِ، عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ عَلَيْنَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا) لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: أَنِّي لأَعْلَمُ أَيَّ يَوْمٍ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، أُنْزِلَتْ يَوْمَ عَرَفَةَ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: (طارق)ی کوڕی شیهاب دەفەرموێ: پیاوێکی جولەکە وتی بە پێشەوا عومەر: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر ئەم ئایەتە بۆ ئێمە بهاتایەتەخوارەوە بەرز رامان دەگرت و هەموو ساڵێ ئەو ڕۆژەمان دەکرد بە جەژن: (**الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ**

**دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا)**. سورة المائدة: ٣. واتە: ئەمڕۆ دینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردووە بۆتان، چاکە و بەهرەی خۆم بەتەواوەتی ڕشتوە بەسەرتاندا، ڕازی بووم کە ئیسلام دینتان بێت. پێشەوا عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: مـن دەزانم ئـەم ئایەتـە چ ڕۆژێ هاتـەخوارەوە، ڕۆژی هـەینی لـە عەرەفە.

٣٠٤٤ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَمَّارِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ، قَالَ: قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا) وَعِنْدَهُ يَهُودِيٌّ فَقَالَ: لَوْ أُنْزِلَتْ هَذِهِ عَلَيْنَا لاَتَّخَذْنَا يَوْمَهَا عِيدًا، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَإِنَّهَا نَزَلَتْ فِي يَوْمِ عِيدَيْنِ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ، وَيَوْمِ عَرَفَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە عـەممارى کوڕی ئـەبی عـەممارەوە دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: ئیبنـو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ ئەم ئایەتەی خوێنـدەوە: **(الْيَـوْمَ أَكْمَلْـتُ لَكُـمْ دِيـنَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا)**. سورة المائدة: ٣. لەوکاتەدا پیاوێکی جولەکە لەلای دانیشتبوو وتی: ئەگەر ئەم ئایەتە بۆ ئێمە بهاتایەتەخوارەوە هـەموو ساڵێ ئەو ڕۆژەمان دەکرد بە جەژن، ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فـەرمووی: بێگومان لەڕۆژی دوو جەژندا هاتەخوارەوە، لە ڕۆژی هەینی و ڕۆژی عەرەفە.

٣٠٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَمِينُ الرَّحْمَنِ مَلأَى سَحَّاءُ لاَ يُغِيضُهَا اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ قَالَ: أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَمِينِهِ، وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ،

وَبِيَدِهِ الأُخْرَى الْمِيزَانُ يَرْفَعُ وَيَخْفِضُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَذَا الْحَدِيثُ فِي تَفْسِيرِ هَذِهِ الآيَةِ: (وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ) .. وَهَذَا حَدِيثٌ قَدْ رَوَتْهُ الأَئِمَّةُ، نُؤْمِنُ بِهِ كَمَا جَاءَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُفَسَّرَ أَوْ يُتَوَهَّمَ، هَكَذَا قَالَ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ: الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ تُرْوَى هَذِهِ الأَشْيَاءُ وَيُؤْمَنُ بِهَا وَلاَ يُقَالُ كَيْفَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە شەو و رۆژ بەردەوام رۆزی دەبەخشێ دەستی کراوەیە بۆ بەخشین، ئایا دەزانن لەورۆژەوە زەوی و ئاسمنەکانی دروستکردووە بەردەوام رۆزی دەبەخشێ، بەخشینی هەرگیز تەواو نابێ، بە دادگەری خۆی کەم و زیادی دەکات بۆ هەرکەسێ کە بیەوێت، عەرشەکەی لەسەر ئاوە). ئەم فەرموودە تەفسیری ئەم ئایەتە دەکات: **(وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ)**. سورة المائدة: ٦٤. واتە: جولەکەکان وتیان: خوا دەستی بەستراوە، یا خوا دەستی ئەوان چنگ قوچراو و دەست بەستراوبن، وە نەفرینیان لێکرا بەهۆی ئەوەی کە وتیان، (نەخێر وانیە) بەڵکو هەردوو دەستی هەمیشە کراوەیە، چۆن بیەوێت دەیبەخشێ.

٣٠٤٦ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَارِثُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحْرَسُ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) فَأَخْرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ مِنَ الْقُبَّةِ، فَقَالَ لَهُمْ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ انْصَرِفُوا فَقَدْ عَصَمَنِي اللَّهُ. حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ،

بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحْرَسُ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: لەپێشدا چەند كەسێ شەوانە ئێشكگری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوون و پاسەوانی هەبوو هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ)** سورة المائدة: ٦٧. واتە: خوا تۆ دەپارێزێ لەوەی كە خەڵك بتكوژن. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوكاتەدا لەناو گومەزییەكا بوو سەری دەرهێنا بە ئێشكچییەكانی فەرموو: (ئەی خەڵكینە برۆنەوە بەلای كاری خۆتانەوە و بلاوەی لێ بكەن ئیتر من پێویستم بە ئێشككگر نەماوە خوا بۆ خۆی دەمپارێزێت).

٣٠٤٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ بَذِيمَةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَمَّا وَقَعَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ فِي الْمَعَاصِي فَنَهَتْهُمْ عُلَمَاؤُهُمْ فَلَمْ يَنْتَهُوا، فَجَالَسُوهُمْ فِي مَجَالِسِهِمْ وَوَاكَلُوهُمْ وَشَارَبُوهُمْ، فَضَرَبَ اللَّهُ قُلُوبَ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَعَنَهُمْ (عَلَى لِسَانِ دَاوُدَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ) قَالَ: فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ: لاَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ حَتَّى تَأْطُرُوهُمْ عَلَى الحَقِّ أَطْرًا. قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: قَالَ يَزِيدُ: وَكَانَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ لاَ يَقُولُ فِيهِ عَنْ عَبْدِ اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمِ بْنِ أَبِي الوَضَّاحِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ بَذِيمَةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَبَعْضُهُمْ يَقُولُ: عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (کاتیٚ بەرەو نەوەی ئیسرائیل دەستیان دەیە خراپەکردن، زاناکانیان ڕێگریان لیٚ دەکردن، بەڵام ئەوان کۆڵیان نەدەداو هەر بەردەوام بوون، هەتا زاناکانیان بەشداری کۆڕ و دانیشتنیان دەکردن و لەگەڵیان دەیانخواردو دەیانخواردەوە، جا کە حاڵیان گەیشتە ئەو رادەیە خوای گەورە دڵیانی تێکەڵ و پێکەڵ کردو کردنی بە فیتنەو ئاژاوە بۆ یەکتری، دڵیان رەق بوو هەقیان وەرنەدەگرت، جا لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم نەفرینیان لیٚ کرا: **(لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ)**. سورة المائدة: ٧٨. واتە: نەفرین کرا لەوانەی بیٚ بڕوابوون لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم، ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کرد و هەمیشە دەست درێژیان دەکرد.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەوکاتەدا شانی دادابوو هاستایەوە ڕێك دانیشت فەرمووی: (نەخێر، سوێند بەوەی گیانی بەدەستە کە (الله)یە رزگارتان نابیٚ، یان دەبیٚ فەرمان بکەن بە چاکەو نەهی بکەن لە خراپە، بەری زۆری زۆرداران دەگرن و نایەڵن زوڵم و ستەم بکەن و دەیانگێڕنەوە بۆ ڕێگەی ڕاست و نایەڵن لەڕێی ڕاست لابدەن).

٣٠٤٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ بَذِيمَةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ بني إسرائيل لَمَّا وَقَعَ فِيهِمُ النَّقْصُ كَانَ الرَّجُلُ فِيهِمْ يَرَى أَخَاهُ يَقَعُ عَلَى الذَّنْبِ فَيَنْهَاهُ عَنْهُ، فَإِذَا كَانَ الغَدُ لَمْ يَمْنَعْهُ مَا رَأَى مِنْهُ أَنْ يَكُونَ أَكِيلَهُ وَشَرِيبَهُ وَخَلِيطَهُ، فَضَرَبَ اللهُ قُلُوبَ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ، وَنَزَلَ فِيهِمُ القُرْآنُ فَقَالَ: (لُعِنَ الَّذِينَ

كَفَرُوا مِنْ بنِي إسرائيل عَلَى لِسَانِ دَاوُدَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ) فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: (وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ فَاسِقُونَ) قَالَ: وَكَانَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ، فَقَالَ: لاَ، حَتَّى تَأْخُذُوا عَلَى يَدِ الظَّالِمِ فَتَأْطُرُوهُ عَلَى الحَقِّ أَطْرًا. حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ وَأَمْلاَهُ عَلَيَّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمِ بْنِ أَبِي الوَضَّاحِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ بَذِيمَةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ.

واتە: لە ئەبی عوبەیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (یەکەمین کەموکوڕیە کە رویدا لەناو نەوەی ئیسرائیل دا بەم شێوەیە بووو: کاتێ پیاوێ دەگەیشت بە براکەی کارێکی خراپی بکردایە رێگری لێ دەکرد، لەپاشدا بۆ رۆژی دواتر لەسەر ئەو حاڵە پێی دەگەیشتەوە رێگری لێ نەدەکرد، بەڵکو خۆشی لەگەڵی دەیخواردو دەیخواردەوەو دەبوو بە هاونشینی، جا کە حاڵیان گەیشتە ئەو رادەیە خوای گەورە دڵیانی تێکەڵ و پێکەڵ کردو کردنی بە فیتنەو ئاژاوە بۆ یەکتری، قورئان لەسەریان دابەزی: (**لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ (٧٨) كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَنْ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ (٧٩) تَرَى كَثِيرًا مِنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنْفُسُهُمْ أَنْ سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ (٨٠) وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ فَاسِقُونَ**(٨١). سورة المائدة: ٧٨ - ٨١. واتە: نەفرین کرا لەوانەی بێ بڕوابوون لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم، ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کرد و هەمیشە دەست درێژیان دەکرد. ئەوانە بەرگری یەکتری یان نەدەکرد لەهەر کارێکی بێزراوی بێ شەرعی

کەدەیانکرد، بێگومان زۆر بەدبوو ئەوەی کەئەیانکرد. ئەبینی (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) زۆربەیان دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون، بێگومان زۆر بەدو خراپە ئەوەی کەپێشیان خست بۆخۆیان (کردویانە) کە هۆی خەشم و قینی خوا بوو لێیان، وە ئەوانە لەسزای دۆزەخدا بێ بڕانەوە دەمێننەوە. وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بەخوا و پێغەمبەرو ئەو بەرنامەیەی کەنێراوەتە خوارەوە بۆ سەری، ئەو بێبڕوایانە یان نەدەکرد بەدۆستو برادەر بەلام زۆر بەیان لەئاین دەرچوونو یاخین لەخوا.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەوکاتەدا شانی دادابوو هاستایەوە رێك دانیشت فەرمووی: (نەخێر، سوێند بەوەی گیانی بەدەستە کە (الله)یە رزگارتان نابێ، یان دەبێ فەرمان بکەن بە چاکەو نەهی بکەن لە خراپە، بەری زۆری زۆرداران دەگرن و نایەڵن زوڵم و ستەم بکەن و دەیانگێڕنەوە بۆ رێگەی راست و نایەڵن لەرێی راست لابدەن).

٣٠٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ أَبِي مَيْسَرَةَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، أَنَّهُ قَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الخَمْرِ بَيَانَ شِفَاءٍ، فَنَزَلَتِ الَّتِي فِي البَقَرَةِ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الخَمْرِ وَالمَيْسِرِ)، فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الخَمْرِ بَيَانَ شِفَاءٍ، فَنَزَلَتِ الَّتِي فِي النِّسَاءِ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى)، فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنَ لَنَا فِي الخَمْرِ بَيَانَ شِفَاءٍ، فَنَزَلَتِ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ: (إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ العَدَاوَةَ وَالبَغْضَاءَ فِي الخَمْرِ وَالمَيْسِرِ)، إِلَى قَوْلِهِ: (فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ) فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ: انْتَهَيْنَا انْتَهَيْنَا. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ إِسْرَائِيلَ هَذَا الحَدِيثُ مُرْسَلاً. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ:

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، قَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الخَمْرِ بَيَانَ شِفَاءٍ فَذَكَرَ نَحْوَهُ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ يُوسُفَ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: خودایە لەبارەی شەراب و مەیەوە ڕونكردەوەیەكی بنەبڕ و تەواومان بۆ بەیان بكە، ئیتر ئەم ئایەتەی سورەتی (البقرة) دابەزی: (**يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ**) سورة البقرة: ٢١٩. واتە: پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی عەرەق و قومار، بڵێ لەم دووانەدا گواناهی گەورەو چەند قازانجێك هەیە بۆ خەڵكی، بەڵام گواناهەكەیان گەورەترە لە قازانجەكەیان.

لەپاشدا پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: خودایە لەبارەی شەراب و مەیەوە ڕونكردەوەیەكی بنەبڕ و تەواومان بۆ بەیان بكە، ئیتر ئەم ئایەتەی سورەتی (النساء) دابەزی: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى**). سورة المائدة: ٤٣. واتە: ئەی كەسانێ كەبڕواتان هێناوە نزیكی نوێژ مەبنەوە كاتێك ئێوە سەرخۆش بن هەتا بزانن چی دەڵێن. پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم پێشەوا عومەری بانگ كردو ئایەتەكەی بۆ خوێندەوە، لەپاشدا پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: خودایە لەبارەی عەرەق و مەیەوە ڕونكردەوەیەكی بنەبڕ و تەواومان بۆ بەیان بكە، ئیتر ئەم دوو ئایەتە دابەزی و بە یەكجاری حەرامی كرد: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٩٠) إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ**). سورة المائدة: ٩٠ - ٩١. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان بن كە ئارەق و قومارو ئەو بەردانەی كە كراون بەبت و، ئەو دارانەی (كە

بەکاردەهێنرێن بۆ دیاریکردنی بەش و چارەنوس) ئەوانە پیسن و لە کردەوە ناشیرینەکانن، کەواتە دوورکەونەوە لێی تا رزگاربن، بێگومان شەیتان ئەوەی دەوێت کە دوژمنایەتی بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارق و قومارەوە بەرگریتان بکات لە یادی خواو نوێژکردن، دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن؟. پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێشەوا عومەری بانگ کردو ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە، پێشەوا عومەریش رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بەڵێ واز دەهێنین، بەڵێ واز دەهێنین.

٣٠٥٠ - (صحيح بما بعده) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ، قَالَ: مَاتَ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الخَمْرُ، فَلَمَّا حُرِّمَتِ الخَمْرُ، قَالَ رِجَالٌ: كَيْفَ بِأَصْحَابِنَا وَقَدْ مَاتُوا يَشْرَبُونَ الخَمْرَ، فَنَزَلَتْ: (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ.

واتە: لە بەرائەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەپێش حەرامکردنی شەراب هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم مردن، کاتێ کە شەراب حەرامکرا، هەندێ کەس وتیان: دەبێ حاڵی هاوەڵانمان چۆن بێ شەرابیان دەخواردەوە و مردن، ئەم ئایەتە دابەزی: **(لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ)**. سورة المائدة: ٩٣. واتە: نەبوە و نیە لەسەر ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە هیچ گوناهێ لەوەی کە خواردوویانە (ئارەق و پارەی قومار پێش حەرامکردنیان)، ئەگەر خۆیان پاراستبێ (لەو چەرخەدا لەوەی حەرام بووە لەسەریان) وە باوەڕداربووبن و کردەوە چاکەکانیان کردبێ.

٣٠٥١ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: قَالَ الْبَرَاءُ: مَاتَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُمْ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ، فَلَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُهَا، قَالَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَكَيْفَ بِأَصْحَابِنَا الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يَشْرَبُونَهَا؟ قَالَ: فَنَزَلَتْ: (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبی ئیسحاقەوە دەگێڕنەوە، کە بەرائی کوڕی عازیب ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەپێش حەرامکردنی شەراب هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مردن، کاتێ کە شەراب حەرامکرا، هەندێ کەس وتیان: دەبێ حاڵی هاوەڵانمان چۆن بێ شەرابیان دەخواردەوە و مردن، ئەم ئایەتە دابەزی: **(لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ)**. سورة المائدة: ٩٣.

٣٠٥٢ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي رِزْمَةَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ أَرَأَيْتَ الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، فَنَزَلَتْ: (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە شەراب حەرامکرا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەبێ حاڵی ئەوانە چۆن بێ شەرابیان دەخواردەوە و مردن، ئەم ئایەتە دابەزی: **(لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا**

**وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ)**. سورة المائدة: ٩٣. واتە: نەبوە و نیە لەسەر ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە هیچ گوناهێ لەوەی کە خواردوویانە (ئارەق و پارەی قومار پێش حەرامکردنیان)، ئەگەر خۆیان پاراستبێ (لەو چەرخەدا لەوەی حەرام بووە لەسەریان) وە باوەڕداربووبن و کردەوە چاکەکانیان کردبێ.

٣٠٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ مُسْهِرٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ) قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْتَ مِنْهُمْ.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ)**. سورة المائدة: ٩٣. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (تۆ یەکێکی لەوانە).

٣٠٥٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَنْصُورُ بْنُ وَرْدَانَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي البَخْتَرِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ البَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فِي كُلِّ عَامٍ؟ فَسَكَتَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ فِي كُلِّ عَامٍ؟ قَالَ: لاَ، وَلَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَلِيٍّ.
وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ البَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً)**. سورة آل عمران: ٩٧. واتـە: خـوا حـەجی کەعبـەی بڕیـارداوە لەسـەر مـەردم، لەسـەر ئەوەی توانای ڕێگەی هەبێ. وتیان: ئەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم، ئەوە بـۆ هـەموو سـاڵێکە؟ بـێ دەنـگ بـوو هـیچ وەڵامـی نەدانـەوە، وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم، ئـەوە بـۆ هـەموو سـاڵێکە؟ فـەرمووی: (نەخێر، ئەگـەر بموتایـە: بـەڵێ، ئـەوە واجـب دەبـوو)، خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزاند: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ)**. سورة المائدة: ١٠١. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پرسیار مەکـەن دەربـارەی شـتانێك ئەگـەر ئاشکرا بکرێن بۆتان خراپ و ناخۆش دەبێ بۆتان.

٣٠٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَعْمَرٍ أَبُو عَبْدِ اللهِ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ أَنَسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ أَبِي؟ قَالَ أَبُوكَ فُلاَنٌ. فَنَزَلَتْ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بـاوکی مـن کێیە؟ فەرمووی: (فلانە کەسە). جا ئەم ئایەتە دابەزی: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ)**. سورة المائدة: ١٠١. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پرسیار مەکـەن دەربـارەی شـتانێك ئەگـەر ئاشـکرا بکـرێن بۆتـان خـراپ و ناخۆش دەبێ بۆتان.

٣٠٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، أَنَّهُ قَالَ: يَا

أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ)، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا ظَالِمًا، فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ مَرْفُوعًا وَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ، قَوْلَهُ وَلَمْ يَرْفَعُوهُ.

واتە: لە پێشەوا ئەبو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ**). سورة المائدة: ١٠٥. واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ خەریکی چاکسازی دەروونی خۆتان بن و هەمیشە هۆشتان بە خۆتانەوە بێ، ئیتر خەڵکانی گومڕا بوو ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن. هەرچەندە پیلان بگێڕن.

پێشەوا ئەبو بەکر وتی: بۆ خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (هەرکاتێ زاڵم و ستەمکار بە بەرچاوی خەڵکەوە ستەم بکات خەڵکەکە دەستی نەگرن و ڕێگری لێ نەکەن ئەوە نزیکە خوای گەورە بە زوویی سزایەکی گشتی بۆ سەرجەمیان بنێرێت).

٣٠٥٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَعْقُوبَ الطَّالَقَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عُتْبَةُ بْنُ أَبِي حَكِيمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ جَارِيَةَ اللَّخْمِيُّ، عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الشَّعْبَانِيِّ، قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيَّ، فَقُلْتُ لَهُ: كَيْفَ تَصْنَعُ بِهَذِهِ الآيَةِ؟ قَالَ: أَيَّةُ آيَةٍ؟ قُلْتُ: قَوْلُهُ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) قَالَ: أَمَا وَاللهِ لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْهَا خَبِيرًا، سَأَلْتُ عَنْهَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: بَلْ ائْتَمِرُوا بِالمَعْرُوفِ وَتَنَاهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ، حَتَّى إِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعًا، وَهَوًى مُتَّبَعًا، وَدُنْيَا مُؤْثَرَةً، وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ، فَعَلَيْكَ بِخَاصَّةِ

نَفْسِكَ وَدَعِ العَوَامَّ، فَإِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ أَيَّامًا الصَّبْرُ فِيهِنَّ مِثْلُ القَبْضِ عَلَى الجَمْرِ، لِلْعَامِلِ فِيهِنَّ مِثْلُ أَجْرِ خَمْسِينَ رَجُلاً يَعْمَلُونَ مِثْلَ عَمَلِكُمْ، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ: وَزَادَنِي غَيْرُ عُتْبَةَ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَجْرُ خَمْسِينَ رَجُلاً مِنَّا أَوْ مِنْهُمْ. قَالَ: بَلْ أَجْرُ خَمْسِينَ رَجُلاً مِنْكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: ئەبی ئومەییەی شەعبانی دەڵێ: چووم بۆلای ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنی، پێم وت: پرسی دەربارەی ئەم ئایەتە چی ئایەتە چی دەڵێی؟ وتی: کام ئایەتە؟ وتم: ئەم ئایەتە: (**عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ**). سورة المائدة: ١٠٥. واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ خەریکی چاکسازی دەروونی خۆتان بن و هەمیشە هۆشتان بە خۆتانەوە بێ، ئیتر خەڵکانی گومڕا بوو ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن. هەرچەندە پیلان بگێڕن.

ئەبو (ثعلبة) وتی: سوێند بە (الله)، دەربارەی ئەم ئایەتە پرسیارم لە کەسی شارەزاکردووە، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردوە دەربارەی فەرمووی: (ئێوە هەر فەرمان بە چاکە دەکەن و، نەهی لە خراپە دەکەن، چرووکی و ڕەزیلی و سوربوون بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و سامان زاڵ دەبێت بەسەر خەڵکدا، شوێن هەواو ئارەزوو دەکەون و، خۆشەویستی دونیا کاریان لێ دەکات و سوردەبن لەسەری، دونیا پێش قیامەت دەخرێت، هەرکەس رای خۆی لەلا پەسەند دەبێت، ئەو کاتە خەمی خۆتت بێ، واز لەکاری خەڵك بێنە، ڕۆژی ئارامگرتن لە پێشتانەو جگە لە ئارامگرتن هیچ چارەیەکی ترتان نیە، ئارامگرتن لەو کاتانەدا وەك پشکۆگرتن بەدەستەوە وایە، ئەوەی لەناویاندا کاردەکات لەو سەردەمەدا - واتە فەرمان بە چاکە دەکات و، نەهی لە خراپە دەکات، پاداشتی پەنجا پیاوی وەك ئێوەی هەیە کە هەمان کار دەکەن).

(عبد الله)ی كوڕی موبارەك فەرمووی: جگە لە عوتبە ئەمەی بۆ زیاد كرد، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پاداشتی پەنجا پیاوی وەك ئێمەی هەیە یان وەك خۆیان؟ فەرمووی: (نا، بەڵكو پاداشتی پەنجا پیاوی وەك ئێوەی هەیە).

٣٠٥٩ - حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ أَبِي شُعَيْبٍ الحَرَّانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ الحَرَّانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ بَاذَانَ، مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ، فِي هَذِهِ الآيَةِ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ) قَالَ: بَرِئَ مِنْهَا النَّاسُ غَيْرِي وَغَيْرَ عَدِيِّ بْنِ بَدَّاءٍ، وَكَانَا نَصْرَانِيَّيْنِ يَخْتَلِفَانِ إِلَى الشَّامِ قَبْلَ الإِسْلَامِ، فَأَتَيَا الشَّامَ لِتِجَارَتِهِمَا، وَقَدِمَ عَلَيْهِمَا مَوْلًى لِبَنِي سَهْمٍ، يُقَالُ لَهُ: بُدَيْلُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ بِتِجَارَةٍ، وَمَعَهُ جَامٌ مِنْ فِضَّةٍ يُرِيدُ بِهِ الْمَلِكَ وَهُوَ عُظْمُ تِجَارَتِهِ، فَمَرِضَ فَأَوْصَى إِلَيْهِمَا، وَأَمَرَهُمَا أَنْ يُبَلِّغَا مَا تَرَكَ أَهْلَهُ، قَالَ تَمِيمٌ: فَلَمَّا مَاتَ أَخَذْنَا ذَلِكَ الجَامَ فَبِعْنَاهُ بِأَلْفِ دِرْهَمٍ، ثُمَّ اقْتَسَمْنَاهُ أَنَا وَعَدِيُّ بْنُ بَدَّاءٍ، فَلَمَّا قَدِمْنَا إِلَى أَهْلِهِ دَفَعْنَا إِلَيْهِمْ مَا كَانَ مَعَنَا وَفَقَدُوا الجَامَ فَسَأَلُونَا عَنْهُ، فَقُلْنَا مَا تَرَكَ غَيْرَ هَذَا، وَمَا دَفَعَ إِلَيْنَا غَيْرَهُ، قَالَ تَمِيمٌ: فَلَمَّا أَسْلَمْتُ بَعْدَ قُدُومِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ تَأَثَّمْتُ مِنْ ذَلِكَ، فَأَتَيْتُ أَهْلَهُ فَأَخْبَرْتُهُمُ الخَبَرَ، وَأَدَّيْتُ إِلَيْهِمْ خَمْسَ مِائَةِ دِرْهَمٍ، وَأَخْبَرْتُهُمْ أَنَّ عِنْدَ صَاحِبِي مِثْلَهَا، فَأَتَوْا بِهِ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُمُ البَيِّنَةَ، فَلَمْ يَجِدُوا، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْتَحْلِفُوهُ بِمَا يَعْظُمُ بِهِ عَلَى أَهْلِ دِينِهِ، فَحَلَفَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ)، إِلَى قَوْلِهِ: (أَوْ يَخَافُوا أَنْ تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ) فَقَامَ عَمْرُو بْنُ العَاصِ، وَرَجُلٌ آخَرُ فَحَلَفَا، فَنُزِعَتِ الخَمْسُ مِائَةِ دِرْهَمٍ مِنْ عَدِيِّ بْنِ بَدَّاءٍ.

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ**

**الْمَوْتُ)**. سورة المائدة: ١٠٦. واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە شایەتی بدەن لە نێوانتاندا کاتێ کەمردنی هەرکامتان نزیك بوویەوە، لەکاتی وەسیەت کردنتاندا دوو کەسی دادپەروەر لەخۆتان (موسوڵمان بن)، یان دووکەسی تر جگەلە خۆتان (کافربن) ئەگەر ئێوە بەسەفەر ڕۆشتبوون بە وولاتداو بەڵای مردنتان تووش هات.

تەمیمی داری دەفەرمووێت: ئەم ئایەتە هەموو خەڵکی بەری نیشاندا جگە لە من و عەدی کوڕی بەدداء، لەپێش هاتنی دینی ئیسلام تەمیم و عەدی هەردوکیان هاتوچۆی شامیان دەکرد بەمەبەستی بازرگانی، جارێ دەچوون بۆ شام بۆ بازرگانی لەرێ بەندەیەکی رزگارکراوی بەنی سەهمیان تووش بوو بە ناوی بەدیلی کوڕی ئەبی مەریەمەوە کەلوپەلی بازرگانی پێ بوو، جامێکی زیوی پێ بوو دەیویست بیفرۆشێ بە پاشای ئەو ولاتە، ئەوە بەنرخترین و گەورەترین کەلوپەلی بازرگانیەکەی بوو، نەخۆشکەوت، وەسیەتی کرد بۆ تەمیمی داری و عەدی و فەرمانی پێ کردن بە کەسوکارەکەی رابگەیەنن کەچی بۆ بەجێهێشتوون، تەمیم وتی: کاتێ کە مرد من و عەدی جامە زیوەکەمان برد فرۆشتمان بە هەزار درهەم و لەنێوان خۆماندا بەشمان کرد، کاتێ کە رۆشتینەوە چووین بۆلای کەسوکارەکەی هەموو کەلوپەلەکەیان دایەوە پێیان جگە لە جامەکە، گەڕان بۆی دیار نەبوو، پرسیاریان لێ کردین دەربارەی وتمان: هەر ئەمانەیە و جگە لەمانە هیچی تری بەجێنەهێشتووە، تەمیم وتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کۆچی کرد بۆ مەدینە و موسوڵمان بووم ئیحراج بووم و خۆم بە گوناهبار دەزانی، پێنج سەد درهەمی جامەکەم دانەوە و پێم راگەیاندن کە عەدیش پێنج سەد درهەمی لایە، کەسوکاری بەدیل عەدیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم داوای بەڵگەی کرد لە کەسوکاری بەدیل بەڵام ئەوان هیچ بەڵگەیەکیان پێ نەبوو، عەدی سوێندی خوارد کە لەلای نیە، خوای گەورە ئەم

ئایەتەی دابەزاند: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ). سورة المائدة: ١٠٦. واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە شایەتی بدەن لە نێوانتاندا کاتێ کەمردنی هەرکامتان نزیك بوویەوە، لەکاتی وەسیەت کردنتاندا دوو کەسی دادپەروەر لەخۆتان (موسوڵمان بن)، یان دووکەسی تر جگەلە خۆتان (کافربن) ئەگەر ئێوە بەسەفەر ڕۆشتبوون بە وولاتداو بەلای مردنتان تووش هات.

٣٠٦٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنِ ابْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي الْقَاسِمِ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَهْمٍ، مَعَ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ وَعَدِيِّ بْنِ بَدَّاءٍ، فَمَاتَ السَّهْمِيُّ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مُسْلِمٌ، فَلَمَّا قَدِمْنَا بِتَرِكَتِهِ فَقَدُوا جَامًا مِنْ فِضَّةٍ مُخَوَّصًا بِالذَّهَبِ، فَأَحْلَفَهُمَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ وَجَدُوا الْجَامَ بِمَكَّةَ، فَقِيلَ: اشْتَرَيْنَاهُ مِنْ عَدِيٍّ وَتَمِيمٍ، فَقَامَ رَجُلَانِ مِنْ أَوْلِيَاءِ السَّهْمِيِّ، فَحَلَفَا بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا، وَأَنَّ الْجَامَ لِصَاحِبِهِمْ، قَالَ: وَفِيهِمْ نَزَلَتْ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَهُوَ حَدِيثُ ابْنِ أَبِي زَائِدَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ لە بەنی سەهم لەگەڵ تەمیمی داری و عەدی کوڕی بەددائدا دەرچوون بۆ سەفەرێ — تەمیم و عەدی هەردوکیان گاور بوون لەپاشدا تەمیم موسوڵمان بوو - سەهمی لە خاکێکدا وەفاتی کرد هیچ موسوڵمانێکی لێ نەبوو، کاتێ کە هاتنەوە کەلوپەل و میراتەکەیان هێنایەوە بۆ کەسوکاری جامێکی زیوی دیارنەمابو، جامەکە بە زێڕ روکەش کرابو لەشێوەی گەڵا(خوص)ی خورمادا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سوێندیدان، لەپاشدا جامەکە لە مەککە دۆزرایەوە، وتیان: لە تەمیم و عەدیمان کڕیوە، دوو پیاو لە دۆستانی سەهمی هەستانەوە سوێندیان خوارد

کە بەڕاستی شایەتیەکەی ئێمە ڕاسترە لە شایەتیەکەی ئەوان، جامەکە هی هاوڕێکەیانە. وتی: ئەم ئایەتە لەوبارەوە هاتەخوارەوە: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ**). سورة المائدة: ١٠٦. واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە شایەتی بدەن لە نێوانتاندا کاتێ کەمردنی هەرکامتان نزیك بوویەوە، لەکاتی وەسیەت کردنتاندا دوو کەسی دادپەروەر لەخۆتان (موسوڵمان بن)، یان دووکەسی تر جگەلە خۆتان (کافربن) ئەگەر ئێوە بەسەفەر ڕۆشتبوون بە وولاتداو بەلای مردنتان تووش هات.

٣٠٦١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ قَزَعَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ حَبِيبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ خِلاَسِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُنْزِلَتِ الْمَائِدَةُ مِنَ السَّمَاءِ خُبْزًا وَلَحْمًا، وَأُمِرُوا أَنْ لاَ يَخُونُوا وَلاَ يَدَّخِرُوا لِغَدٍ، فَخَانُوا وَادَّخَرُوا وَرَفَعُوا لِغَدٍ، فَمُسِخُوا قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ قَدْ رَوَاهُ أَبُو عَاصِمٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ خِلاَسٍ، عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، مَوْقُوفًا، وَلاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الحَسَنِ بْنِ قَزَعَةَ. حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ حَبِيبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ الحَسَنِ بْنِ قَزَعَةَ وَلاَ نَعْلَمُ لِلْحَدِيثِ الْمَرْفُوعِ أَصْلاً.

واتە: لە عەمماری کوڕی یاسرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە خوانێکی گۆشت و نانی لە ئاسمانەوە دابەزاند، فەرمانی کرد ناپاکی نەکەن و بەشی بەیانی لێ پاشەکەوت نەکەن، بەلام ئەوان ناپاکیان کردوو بەشی بەیانیان لێ پاشەکەوت کرد، خوای گەورەش شێوەی گۆڕین بۆ شێوەی مەیمون و بەراز).

٣٠٦٢ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: يُلَقَّى عِيسَى حُجَّتَهُ وَلَقَّاهُ اللَّهُ فِي قَوْلِهِ: (وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ) قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَقَّاهُ اللَّهُ: (سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ) الآيَةَ كُلَّهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: خوا عیسای فێرکرد کە چۆن بەڵگە بهێنێتەوە: **(وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ)**. سورة المائدة: ١١٦. واتە: لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا تۆ وتوتە بە خەڵك من دایکم بە دوو پەرستراو دابنێن (و بمانپەرستن) لەجیاتی خوا. (عیسا وتی) پاك و بێگەردی بۆ تۆ ئەی خوایە نابێ و ناگونجێ بۆ من شتێ بڵێم کە بەهیچ شێوەیەك مافی من نیە، ئەگەر من ئەو قسەیەم کردبێ ئەوە بەڕاستی تۆ ئاگات لێیە، چونکە تۆ ئەوەی لەناخم دایە تۆ دەیزانی، بەڵام من نازانم و بێ ئاگام لەوەی لەناخی تۆدایە، بەڕاستی تەنها تۆ زانای تەواوی بە هەموو نهێنیەك.

٣٠٦٣ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ حُيَيٍّ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: آخِرُ سُورَةٍ أُنْزِلَتِ الْمَائِدَةُ وَالْفَتْحُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرُوِي عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ قَالَ: آخِرُ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: کۆتا سورەت کە دابەزی سورەتی (المائدە) و سورەتی (الفتح) بوو. لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کۆتا سورەت کە دابەزی سورەتی سورەتی: (**إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ**) بوو.

## دەربارەی سورەتی (الأَنْعَامِ).

### ٧ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الأَنْعَامِ

٣٠٦٤ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ نَاجِيَةَ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ عَلِيٍّ: أَنَّ أَبَا جَهْلٍ، قَالَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّا لاَ نُكَذِّبُكَ، وَلَكِنْ نُكَذِّبُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللهِ يَجْحَدُونَ). حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ نَاجِيَةَ، أَنَّ أَبَا جَهْلٍ قَالَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَلِيٍّ، وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئەبو جەهل بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وت: ئێمە باوەڕ بە تۆ دەکەین کە پیاوێکی ڕاستگۆیت و درۆ ناکەیت، بەڵام باوەڕ بە قورئانەکەت ناکەین، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللهِ يَجْحَدُونَ**). سورة الأنعام: ٣٣. واتە: بەڵام بێگومان ئەوان تۆ بەدرۆزن دانانێن، بەڵکو ئەو ستەمکارانە ئینکاری ئایەتەکانی خوا دەکەن.

٣٠٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ) قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَعُوذُ

بِوَجْهِكَ، فَلَمَّا نَزَلَتْ: (أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ) قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَاتَانِ أَهْوَنُ، أَوْ هَاتَانِ أَيْسَرُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: جابیری کوڕی (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: کاتێ ئـەم ئایەتـە دابەزی: **(قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ)**. سورة الأنعام: ٦٥. واتە: بڵـێ هـەر ئـەو خوایـە بـە توانـاو دەسـەڵاتدارە، کـە سزاتان بۆ بنێرێ لەسەروتانەوە یان لەژێر پێتانەوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خودایە پەنا دەگرم بە زاتی تـۆ). کـاتێ ئـەم ئایەتـە دابـەزی: **(أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ)**. سورة الأنعام: ٦٥. واتـە: یـان سـەرتان لـێ بشێوێنێ بتانکات بەچەند دەستەو تاقمێکـەوە. پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم فەرمووی: (ئەمەیان سوکترە یان ئەمەیان ئاسانترە).

٣٠٦٦ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ الْغَسَّانِيِّ، عَنْ رَاشِدِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: (قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ) فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا إِنَّهَا كَائِنَةٌ وَلَمْ يَأْتِ تَأْوِيلُهَا بَعْدُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتە: **(قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ)**. سـورة الأنعام: ٦٥. فـەرمووی: (ئـەم هەڕەشەو گوڕەشەیە کە لەدەقی ئەم ئایەدایە هەردەبێ بێتەدی بـەڵام هێشـتا کـاتی ماوە و ڕووی نەداوە).

٣٠٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَأَيُّنَا لاَ يَظْلِمُ نَفْسَهُ. قَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ إِنَّمَا هُوَ الشِّرْكُ، أَلَمْ تَسْمَعُوا مَا قَالَ لُقْمَانُ لاِبْنِهِ: (يَا بُنَيَّ لاَ تُشْرِكْ بِاللهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ)**. سورة الأنعام: ٨٢. واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕواکەیان تێکەڵ بە زوڵم و ستەم نەکردووە. ئایەتەکە زۆر قورس بوو بەلای موسوڵمانانەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کاممان زوڵم و ستەممان لە خۆمان نەکردووە، فەرمووی: (مەبەست ئەوە نیە کە ئێوە تێی گەیشتوون، بەڵکو مەبەست هاوبەش بۆ خوا دانانە، ئایا فەرمایشتەکەی لوقمانتان نەبیستووە بەکوڕەکەی وت کە قورئان دەیگێڕێتەوە بۆمان: لە **(يَا بُنَيَّ لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ)**. سورة لقمان: ١٣. واتە: ئەی کوڕە شیرینەکەم هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، چونکە بەڕاستی هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی زۆر گەورەیە.

٣٠٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: كُنْتُ مُتَّكِئًا عِنْدَ عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: يَا أَبَا عَائِشَةَ، ثَلاَثٌ مَنْ تَكَلَّمَ بِوَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ عَلَى اللهِ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ الفِرْيَةَ عَلَى اللهِ، وَاللهُ يَقُولُ: (لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الخَبِيرُ) (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللهُ إِلاَّ وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ). وَكُنْتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْظِرِينِي وَلاَ تُعْجِلِينِي، أَلَيْسَ

يَقُولُ اللَّهُ: (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى) (وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ) قَالَتْ: أَنَا وَاللَّهِ أَوَّلُ مَنْ سَأَلَ عَنْ هَذَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّمَا ذَاكَ جِبْرِيلُ، مَا رَأَيْتُهُ فِي الصُّورَةِ الَّتِي خُلِقَ فِيهَا غَيْرَ هَاتَيْنِ الْمَرَّتَيْنِ، رَأَيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنَ السَّمَاءِ سَادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا كَتَمَ شَيْئًا مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَقَدْ أَعْظَمَ الفِرْيَةَ عَلَى اللهِ، يَقُولُ اللَّهُ: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولَ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ)، وَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ، فَقَدْ أَعْظَمَ الفِرْيَةَ عَلَى اللهِ، وَاللَّهُ يَقُولُ: (قُلْ لاَ يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ الغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَمَسْرُوقُ بْنُ الأَجْدَعِ يُكْنَى أَبَا عَائِشَةَ وَهُوَ: مَسْرُوقُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَكَذَا كَانَ اسْمُهُ فِي الدِّيوَانِ.

واتە: لە مەسروقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ لەلای عائیشە شانم دادابوو، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی باوکی عائیشە — کونیەی مەسروق بوو - سێ وشە هەیە هەرکەسێ یەکێ لەو وشانە بڵێ ئەوە درۆیەکی گەورە دەکات بەناوی خواوە، یەکەم: هەرکەسێ پێی وابێ موحەممەد صلی الله علیه وسلم خوای دیوە ئەوە درۆیەکی گەورە دەکات بەناوی خواوە، خوای گەورە دەفەرموێت: **(لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الخَبِيرُ)** . سورة الأنعام: ١٠٣. واتە: چاوەکان پەی پێ نابەن و ناتوانن بیبینن، بەڵام ئەو هەستی هێزی بینین و چاوەکانی دەبینێ، ئەو ئاگای وردبینە. **(وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلاَّ وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ)**. سورة شوری: ٥١. واتە: بۆ هیچ کەسێ نەبوو خوا قسەی لەگەڵ بکات مەگەر بە وەحی یان لەپشت پەردەوە.

مەسروق وتی: ڕێك دانیشتم و وتم: ئەی دایکی باوەڕداران، مۆڵەتم بدە و پەلەم لێ مەکە، مەگەر خوای گەورە نافەرموێت: **(وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى)**. سورة نجم: ١٣. واتە: سوێند بە خوا جارێکی تر جبریلی بینیوە. **(وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ)**. سورة التكوير: ٢٣. واتە: سوێند بە خوا مەلائیکەی وەحی بینیوە لە ئاسۆی ڕوندا.

عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموی: سوێند بە (الله) مـن یەكـەم كـەس بـووم ئەم پرسیارەی تۆم كرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش فەرمووی: (بێگومان ئەوەی من بینیم جبریل بوو، تەنیا ئەو دوو جارەش لەسەر شێوەی خـۆی دیومە، جبریلم دی كە لە ئاسمانەوە دابەزی نێوانی ئاسمان و زەوی داپۆشی).

دووەم: هەركەسێ پێی وابێ موحەممەد صلی الله علیه وسلم شوەحی شـاردۆتەوە ئەوە درۆیەكی گەورە دەكات بەناوی خواوە، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: (**يَـا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ**). سورة المائدة: ٦٧. واتە: ئەی پێغەمبەر صـلی الله علیه وسلم، رایگەیەنە بە خەڵك ئەوەی هێنراوەتەخوارەوە بۆت.

سێیەم: هەركەسێ پێی وابێ موحەممەد صلی الله علیه وسلم بەبێ وەحی غـەیبی زانیوە و دەیزانـی سـبەینێ چـی روودەدات ئـەوە درۆیـەكی گـەورە دەكـات بـەناوی خواوە، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: (**قُلْ لاَ يَعْلَمُ مَنْ فِـي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ الغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ**). سورة النمل: ٦٥. واتە: بڵێ كەسانێ لە ئاسمانـەكان و زەویـدان غــەیب نازانن بێجگە لە خوا (هەر خوا بۆ خۆی غـەیب دەزانێ).

٣٠٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى البَصْرِيُّ الحَرَشِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ البَكَّائِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَتَى أُنَاسٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَأْكُلُ مَا نَقْتُلُ وَلاَ نَأْكُلُ مَا يَقْتُلُ اللَّهُ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ)، إِلَى قَوْلِهِ: (وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَيْضًا وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كۆمەڵێ خەڵك هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم،

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، بۆچی ئەو ئاژەڵەی خۆمان سەری دەبڕین حەڵاڵە گۆشتەكەی، كەچی ئەو ئاژەڵەی بەدەردی خوا دەمرێ حەرامە و نایخۆین؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ وَذَرُوا۟ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾ الأنعام: ١١٨ - ١٢١.

واتە: دەبخۆن لەو (سەربڕاو)ەی كەناوی خوای لەسەر هێنراوە، ئەگەر ئێوە بە ئایەتەكانی خوا بڕوادارن، بۆچی ئێوە ناخۆن؟ لە گۆشتی ئەو ئاژەڵەی كە ناوی خوای لەسەر هێنراوە لەكاتی سەربڕیندا، كە بێگومان خوا بۆتانی روونكردۆتەوە ئەوەی حەرامی كردووە لەسەرتان، جگە لەوەی كە ناچار دەبن بۆی (كە بیخۆن)، بەڕاستی زۆر كەس خەڵك گومڕا دەكەن بە هەواو ئارەزووی خۆیان بەبێ هیچ زانیاریەك (كە لە خواوە وەرگیرا بێت)، بێگومان پەروەردگارت دەستدرێژی كاران و سەركەشان باش دەناسێت، لە گوناهی ئاشكراو نهێنی وازبێنن، بەڕاستی ئەوانەی گوناهو تاوان دەكەن بە ئەنقەست بەزوویی تۆڵەیان لێ دەسەنرێت، بەهۆی ئەو تاوانانەی دەیانكرد، لە گۆشتی ئەو ئاژەڵە مەخۆن كە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە لەكاتی سەربڕیندا، بێگومان خواردنی ئەوە تاوان و لەسنوور دەرچوونە، وە بێگومان شەیتانەكان بەنهێنی شت بە دۆستانیان دەڵێن، ئەوە بۆئەوەی موجادەلەو دەمەدەمێتان لەگەڵ بكەن، جا ئەگەر بەگوێیان بكەن بێگومان لەهاوبەش بۆ خوا دانەران دەبن.

٣٠٧٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ دَاوُدَ الأَوْدِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى الصَّحِيفَةِ الَّتِي عَلَيْهَا خَاتَمُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلْيَقْرَأْ هَذِهِ الآيَاتِ: (قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ)، الآيَةَ إِلَى قَوْلِهِ، (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەرکەس حەز دەکات سەیری ئەو لاپەڕنە بکات کە مۆری موحەممەدی صلی الله علیه وسلم پێوەیە، با ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە: ﴿قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰۖ وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾﴾ الأنعام: ١٥١ - ١٥٢.

٣٠٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ (أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ) قَالَ: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ﴾ الأنعام: ١٥٨. واتە: ئەو ڕۆژەی هەندێ لە نیشانە و

بەڵگە روونەكانی پەروەردگارت بەدی بێت. پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەبەست هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە).

٣٠٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْلَى بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ غَزْوَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ثَلاَثٌ إِذَا خَرَجْنَ (لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ)، الآيَةُ: الدَّجَّالُ، وَالدَّابَّةُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنَ الْمَغْرِبِ أَوْ مِنْ مَغْرِبِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو حَازِمٍ هُوَ: الأَشْجَعِيُّ الكُوفِيُّ، وَاسْمُهُ: سَلْمَانُ مَوْلَى عَزَّةَ الأَشْجَعِيَّةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سێ شت كە بەرپابوون هەركەس پێشتر بروای نەهێنابێ ئەوكاتە باوەڕهێنان سوودی پێ ناگەیەنێ: هاتنی دەججالی درۆزن و (دابە)زیندەوەرێك و خۆر لە خۆرئاواوە هەڵهاتن: (يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا). سورة الأنعام:١٥٨. واتە: ئەو رۆژەی هەندێ لەنیشانەو بەڵگە روونەكانی پەروەدگارت بەدی بێت باوەڕهێنان سوود ناگەیەنێت بەهیچ كەس كەپێشتر بروای نەهێنابێ، یان هیچ خێروچاكەیەكی نەكردبێ لەگەڵ ئیمانەكەیدا.

٣٠٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَقَوْلُهُ الحَقُّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِحَسَنَةٍ فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَإِذَا هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلاَ تَكْتُبُوهَا، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا بِمِثْلِهَا، فَإِنْ تَرَكَهَا، وَرُبَّمَا قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَعْمَلْ بِهَا، فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، ثُمَّ قَرَأَ: (مَنْ جَاءَ بِالحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت بێگومان وتەی هەق و راستە: ئەگەر بەندەكەم ویستی چاكەیە بكات چاكەیەكی بۆ بنوسن، ئەگەر ئەنجامیدا یەك بەدە بۆی بنوسن، بەلاّم ئەگەر بەندەكەم ویستی خراپەیە بكات بۆی مەنوسن، ئەگەر ئەنجامیدا یەك خراپەی بۆ بنوسن، خۆ ئەگەر ئەنجامی نەدا چاكەیەكی بۆ بنوسن، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا)**. سورة الأنعام: ١٦٠. واتە: هەر كەسێك چاكەیە بكات ئەوە (لەرۆژی دوایی دا) دە ئەوەندەی چاكەكەی پاداشتی بۆ هەیە.

## دەربارەی سورەتی (الأَعْرَاف).

### ٨ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الأَعْرَافِ

٣٠٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ (فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا) قَالَ حَمَّادٌ: هَكَذَا، وَأَمْسَكَ سُلَيْمَانُ بِطَرَفِ إِبْهَامِهِ عَلَى أَنْمُلَةِ إِصْبَعِهِ الْيُمْنَى قَالَ: فَسَاخَ الْجَبَلُ (وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ. حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الْوَرَّاقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ مُعَاذٍ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا)** . سورة الأعراف: ١٤٣. واتە: جا كاتێ پەروەردگاری خۆی

دەرخست بۆ شاخەكە، شاخەكەی وردو خاش كردو هەپروون هەپرونی كرد. حەمماد وتی: بەم شێوەیە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەنجەكەڵەی نایەسەر جومگەی پەنجە پەنجە توتەی خۆی و فەرمووی: شاخەكە هەپروون هەپروون بوو تەختی زەوی كرا، (وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا). سورة الأعْرَاف: ١٤٣. واتە: موساش بێهۆشكەوت و بوورایەوە.

٣٠٧٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي أُنَيْسَةَ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الخَطَّابِ، عَنْ مُسْلِمِ بْنِ يَسَارٍ الجُهَنِيِّ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، سُئِلَ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ) وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ القِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ، قَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسْأَلُ عَنْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ آدَمَ، ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ بِيَمِينِهِ، فَأَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً، فَقَالَ: خَلَقْتُ هَؤُلَاءِ لِلْجَنَّةِ وَبِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ يَعْمَلُونَ، ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً فَقَالَ: خَلَقْتُ هَؤُلَاءِ لِلنَّارِ وَبِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ يَعْمَلُونَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَفِيمَ العَمَلُ؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ إِذَا خَلَقَ العَبْدَ لِلْجَنَّةِ اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيُدْخِلَهُ اللَّهُ الجَنَّةَ، وَإِذَا خَلَقَ العَبْدَ لِلنَّارِ اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ النَّارِ، فَيُدْخِلَهُ اللَّهُ النَّارَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَمُسْلِمُ بْنُ يَسَارٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عُمَرَ، وَقَدْ ذَكَرَ بَعْضُهُمْ فِي هَذَا الإِسْنَادِ بَيْنَ مُسْلِمِ بْنِ يَسَارٍ وَبَيْنَ عُمَرَ رَجُلًا.

واتە: لە موسلیمی كوڕی یەسارەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە

فەرموویەتی: پرسار کرا لە پێشەوا عومەر کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ دەربارەی ئەم ئایەتە: (**وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ**). سورة الأعراف: ١٠٠. واتە: کاتێ کە پەروەردگارت وەریگرت (دەری هێنا) لەپشتی ئادەمی یەکان وەچە و نەوەکانیان وە کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە (پێی ووتن) ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ (لە وەڵامدا) ووتیان: بەڵێ شایەتیمان دا تا نەڵێن لە ڕۆژی دوایی دا بەڕاستی ئێمە بێ ئاگا بووین لەمە (کەخوا پەروەردگارمانە).

پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەربارەی ئەم ئایەتە پرسیاریان لێ کرد فەرمووی: (کاتێ خوای گەورە ئادەمی دروست کرد، دەستی ڕاستی هێنا بە پشتی ئادەمدا نەوەیەك دەرچوو، فەرمووی: ئەمانە بۆ بەهەشت، بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کار دەکەن، لەپاشدا دەستی هێنا بە پشتی ئادەمدا نەوەیەك دەرچوو، فەرمووی: ئەمانە بۆ دۆزەخ، بە کردەوەی ئەهلی دۆزەخ کار دەکەن). پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کەواتە بۆ کار بکەین لەکاتێکدا کە سەرەنجامان دیاریکراوە بۆ بەهەشت یان دۆزەخ؟ فەرمووی: (کاتێ کە خوای گەورە بەندەیەکی دروستکرد بۆ بەهەشت بەکاری دەهێنێ بۆ ئەنجامدانی کردەوەی ئەهلی بەهەشت هەتا سەرەنجام لەسەر یەکێ لە کردەوەکانی ئەهلی بەهەشت دەمرێ و بەوەش دەچێتە بەهەشتەوە، کاتێ کە بەندەیەکی دروستکرد بۆ دۆزەخ بەکاری دەهێنێ بۆ ئەنجامدانی کردەوەی ئەهلی دۆزەخ هەتا سەرەنجام لەسەر یەکێ لە کردەوەکانی ئەهلی دۆزەخ دەمرێ و بەوەش دەچێتە دۆزەخەوە).

٣٠٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مَسَحَ ظَهْرَهُ، فَسَقَطَ مِنْ ظَهْرِهِ كُلُّ نَسَمَةٍ هُوَ خَالِقُهَا مِنْ ذُرِّيَّتِهِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، وَجَعَلَ بَيْنَ عَيْنَيْ كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ وَبِيصًا مِنْ نُورٍ، ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى آدَمَ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ، مَنْ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ ذُرِّيَّتُكَ، فَرَأَى رَجُلًا مِنْهُمْ فَأَعْجَبَهُ وَبِيصُ مَا بَيْنَ عَيْنَيْهِ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: هَذَا رَجُلٌ مِنْ آخِرِ الأُمَمِ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ يُقَالُ لَهُ دَاوُدُ فَقَالَ: رَبِّ كَمْ جَعَلْتَ عُمْرَهُ؟ قَالَ: سِتِّينَ سَنَةً، قَالَ: أَيْ رَبِّ، زِدْهُ مِنْ عُمْرِي أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَلَمَّا قُضِيَ عُمْرُ آدَمَ جَاءَهُ مَلَكُ الْمَوْتِ، فَقَالَ: أَوَلَمْ يَبْقَ مِنْ عُمْرِي أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَوَلَمْ تُعْطِهَا ابْنَكَ دَاوُدَ قَالَ: فَجَحَدَ آدَمُ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ، وَنُسِّيَ آدَمُ فَنُسِّيَتْ ذُرِّيَّتُهُ، وَخَطِئَ آدَمُ فَخَطِئَتْ ذُرِّيَّتُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە ئادەمی دروست کرد، دەستی هێنا بە پشتی ئادەمدا هەرچی روح لەبەرە لەپشتی دەرچوو، هەتا رۆژی قیامەت ئەویش کردگاریانە، بۆ هەریەکەیان لەنێوچاوانیدا بریقەیەکی لە نور دانا، لەپاشدا نیشانی ئادەمی دان، ئادەم فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەمانە نەوەی تۆن، جا ئادەم لەناو نەوەکەیدا پیاوێکی دی بریقەکەی ناوچاوانی زۆر جوان و درەوشاوە بوو، فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە پیاوێکە لەنەوەی تۆ لە دواترین نەوەکان دەبێ، ناوی داوودە، فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! چەندە تەمەنت بۆ داناوە؟ فەرمووی: شەست ساڵ، فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! لە تەمەنی من چل ساڵی بۆ بخەرە سەری، کاتێ

تەمەنی ئادەم تەواو بوو مەلائیکەی مردن هات بۆ روح کێشانی، فەرمووی: مەگەر من چل سالّ تەمەنم نەماوە؟ فەرمووی: ئەی ئەو چل ساڵەت نەدا بە داوودی کوڕت؟ فەرمووی: ئادەم حاشای کرد، بۆیە نەوەکانیشی حاشا لە گفتی خۆیان دەکەن، ئادەم لەیادی چوو بۆیە نەوەکانیشی ززو شتیان لەیاد دەچێ، ئادەم هەڵەی کرد بۆیە نەوەکانیشی هەڵە دەکەن).

٣٠٧٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لَمَّا حَمَلَتْ حَوَّاءُ طَافَ بِهَا إِبْلِيسُ وَكَانَ لاَ يَعِيشُ لَهَا وَلَدٌ، فَقَالَ: سَمِّيهِ عَبْدَ الحَارِثِ، فَسَمَّتْهُ عَبْدَ الحَارِثِ، فَعَاشَ، وَكَانَ ذَلِكَ مِنْ وَحْيِ الشَّيْطَانِ وَأَمْرِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عُمَرَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ عَنْ قَتَادَةَ، وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنْ عَبْدِ الصَّمَدِ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە سەمورەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەپێشدا دایە حەوا منداڵی بۆ نەدەما، کاتێ سکی پڕ بوو شەیتان هاتە بن کلێشەیی وتی: ناوی بنێ (عبد الحارث)، ئەویش ناوی نا (عبد الحارث)،ئەمەش لە فەرمان و وەسوەسەی شەیتانەوە بوو.

٣٠٧٨ - حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَمَّا خُلِقَ آدَمُ ... الْحَدِيثُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە ئادەمی دروست کرد ...) تا کۆتایی فەرموودەکە.

## دەربارەی سورەتی (الأنفال).

## ٩ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الأَنْفَالِ

٣٠٧٩ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عَاصِمِ ابْنِ بَهْدَلَةَ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ جِئْتُ بِسَيْفٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ شَفَى صَدْرِي مِنَ الْمُشْرِكِينَ، أَوْ نَحْوَ هَذَا، هَبْ لِي هَذَا السَّيْفَ، فَقَالَ: هَذَا لَيْسَ لِي وَلاَ لَكَ فَقُلْتُ: عَسَى أَنْ يُعْطَى هَذَا مَنْ لاَ يُبْلِي بَلاَئِي، فَجَاءَنِي الرَّسُولُ فَقَالَ: إِنَّكَ سَأَلْتَنِي وَلِيسَ لِي، وَإِنَّهُ قَدْ صَارَ لِي وَهُوَ لَكَ، قَالَ: فَنَزَلَتْ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنْفَالِ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ سِمَاكُ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ مُصْعَبٍ، أَيْضًا. وَفِي البَابِ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ.

واتــە: لــە موصــعەبی کــوڕی ســەعدەوە، لــە باوکیــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەرۆژی غەزای بەدردا بەشمشێرێکی دەستکەوتەکەوە چومە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم! ئەمرۆ خوای گەورە شیفای دڵ و دەروونی دام کە بینیم هاوبەش بـۆ خوا دانەران ئەو شکستە گەورەیان هێنـا – حـەفتا کـەس لـە گـەورەکانی قـورەیش کــوژران - ئــەم شمشــێرەم بــە دیــاری پــێ ببەخشــە، فــەرمووی: (ئــەو شمشــێرە لەدەستکەوتی جەنگـە نـە هـی منـە هـەتا بیـدەم بـە تـۆ وە نـە هـی تۆشـە هـەتا ببیەیت)، منیش رۆشتم دەموت: ئەمرۆ دەیبەخشێت بەکەسێ ئەو کارەی کـە مـن لەجەنگەکـەدا کردومـە ئـەو نـەیکردوە، واتــە مــن شایســتەترم ئــەو وەك مــن نەجەنگاوە، لەکاتێکدا کە من سەرقاڵی کاری خۆم بووم فروستادەیەك هـات وتـی: پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم بانگـت دەکـات وەرە بـەدەم بانگەکەیـەوە،

منیش ترسام ئایەت لەبارەی قسەکەمەوە دابەزێت، جا چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (تۆ داوای ئەو شمشێرەت لێ کردم، ئەو شمشێرە لەدەستکەوتی جەنگە نە هی منەو نە هی تۆشە، بەڵام خوای گەورە بەخشی بەمن، ئەوا منیش بەخشیم بە تۆ)، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنفَالِ قُلِ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ)**. سورة الأنفال: ١. واتە: (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە دەسکەوتەکان(ی جەنگی بەدر)، تۆش بڵێ: ئەو دەستکەوتانە هەر بۆ خواو پێغەمبەرن، کەواتە خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن، وە پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بکەنەوە وگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن ئەگەرئێوە بڕوادارن.

٣٠٨٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَدْرٍ قِيلَ لَهُ: عَلَيْكَ العِيرَ لَيْسَ دُونَهَا شَيْءٌ، قَالَ: فَنَادَاهُ العَبَّاسُ وَهُوَ فِي وَثَاقِهِ: لاَ يَصْلُحُ، وَقَالَ: لأَنَّ اللَّهَ وَعَدَكَ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ وَقَدْ أَعْطَاكَ مَا وَعَدَكَ، قَالَ: صَدَقْتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە غەزای بەدر بووە و خوای گەورە سەری خست بەسەر هاوبەش بۆ خوا دانەراندا، پێی وترا: بابڕۆین دەست بگرین بەسەر کاروانیەکەی قورەیشدا، لەوکاتەدا عەباس ڕەزای خوای لێ بێ کۆت و زنجیر کرا بوو چونکە لە جەنگی بەدردا بەدیل گیرا بوو، پێغەمبەری صلی الله علیه

وسلم بانگ کردو وتی: شتی وا نەکەی تۆ خوای گەورە بەڵێنی یەکێکیانی پێ داوی، ئەوەتە سەری خستوویت و بەڵێنەکەی بەجێهێناوە بۆت، فەرمووی: (تۆ راست دەکەیت).

٣٠٨١ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ يُونُسَ الْيَمَامِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُمَيْلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، قَالَ: نَظَرَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ وَأَصْحَابُهُ ثَلاَثُ مِائَةٍ وَبِضْعَةُ عَشَرَ رَجُلاً، فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْقِبْلَةَ، ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ وَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ: اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ إِنَّكَ إِنْ تُهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةَ مِنْ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ تُعْبَدُ فِي الأَرْضِ، فَمَا زَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ، مَادًّا يَدَيْهِ، مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ مِنْ مَنْكِبَيْهِ، فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ كَفَاكَ مُنَاشَدَتَكَ رَبَّكَ، إِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ مُرْدِفِينَ) فَأَمَدَّهُمُ اللَّهُ بِالْمَلاَئِكَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عُمَرَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِكْرِمَةَ بْنِ عَمَّارٍ عَنْ أَبِي زُمَيْلٍ. وَأَبُو زُمَيْلٍ: اسْمُهُ سِمَاكٌ الْحَنَفِيُّ، وَإِنَّمَا كَانَ هَذَا يَوْمَ بَدْرٍ.

واتە: لە پێشەوا عومەر کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەجەنگی بەدردا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سەیری سوپای هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرانی کرد، هەزار کەسێ دەبوون، هاوەڵەکانی خۆشی سێ سەدو دەو ئەوەندە بوون، رووی کردە قیبلە و هەردوو دەستی بەرزکردنەوەو بەدەنگی بەرز لە خوا دەپاڕایەوە و هاواری دەکرد: (خودایە ئەو گفت و بەڵێنەی

داوتە پێم جێبەجێی بكە بۆم، خودایە ئەگەر ئەم كۆمەڵە موسوڵمانە لەناوبچن ئیتر لەسەر رووی زەوی كەسێ تۆ ناپەرستێ)، بەردەوام رووی لە قیبلە بوو هەردوو دەستی بەرزكردبوونەوەو بەدەنگی بەرز لە خوا دەپاڕایەوە و هاواری دەكرد، هەتا عەباكەی لەسەرشانی كەوتەخوارەوە، پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ عەباكەی هەڵگرتەوە و دایەوە بەسەر شانیدا، لە پشتەوە باوەشی پێدا كرد و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەسە زۆر پاڕایتەوە، بەڕاستی خوا ئەو گفت و بەڵێنەی كە پێی داوی بۆت جێبەجێی دەكات، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ)**. سورة الأنفال: ٩. واتە: (بیربكەنەوە) كاتێ (لە جەنگی بەدردا) هاناتان بۆ پەروەردگارتان دەبرد، خواش هات بە هاناتانەوە، فەرمووی: هەزار مەلائیكە بەدوای یەكدا دەنێرم بۆ یارمەتیتان. ئەوەبوو مەلائیكەی نارد بۆ یارمەتیدانیان.

٣٠٨٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُهَاجِرٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ يُوسُفَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيَّ أَمَانَيْنِ لأُمَّتِي: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ). فَإِذَا مَضَيْتُ تَرَكْتُ فِيهِمُ الاِسْتِغْفَارَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُهَاجِرٍ يُضَعَّفُ فِي الْحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو موساوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لەم ئایەتەدا دوو

ئەمانی بۆ ئوممەتم بۆ من ناردووە: (**وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ**). سورة الأنفال: ٣٣. واتـە: بەڕاسـتی خـوا سـزایان نـادات لەكاتێكدا تۆ لەناویاندا بیت، هەروەها خوا تووشی سزایان ناكات لەكاتێكدا ئـەوان داوای لێ بووردن بكەن. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فـەرمووی: (كـاتێ خۆشـم مردم و لەناویاندا نەمام داوای لێ بووردن كردن هەر دەمێنێ).

٣٠٨٣ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ رَجُلٍ لَمْ يُسَمِّهِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ عَلَى الْمِنْبَرِ: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ) قَالَ: أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، أَلاَ إِنَّ اللَّهَ سَيَفْتَحُ لَكُمُ الأَرْضَ، وَسَتُكْفَوْنَ الْمُؤْنَةَ، فَلاَ يَعْجِزَنَّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَحَدِيثُ وَكِيعٍ أَصَحُّ، وَصَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ لَمْ يُدْرِكْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ وَقَدْ أَدْرَكَ ابْنَ عُمَرَ.

واتە: لە عوقبەی كوڕی عـامیری جوهەنیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كـە پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم لەسـەر مینبـەر ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: (**وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ**). سورة الأنفال: ٦٠. واتە: ئەی ئیمانداران ئامـادەی بكەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز و، ئەسپی دامەزراو.

سێ جار لەسەریەك فەرمووی: (ئاگـادارین كـە بێگومـان ئـەو هێـزە - ی كـە خوای گەورە لە ئایەتەكەدا داوای دەكات — ڕەمـی و تیرهاویشتنە، ئاگـادارین كـە بێگومـان ئـەو هێـزە ڕەمـی و تیرهاویشـتنە، ئاگـادارین كـە بێگومـان ئـەو هێـزە تیرهاویشتنە. - ئەمە بۆ ئەو سەردەمە بووە، بێگومـان ئـەو هێـزە بـەپێی كـات و سـەردەم دەگۆڕێـت، بـۆ سـەردەمێكی وەك ئێسـتا بـەكارهێنانی هـەموو جـۆرە

کەرەسەیەکی جەنگی دەگرێتەوە وەك تۆپ و تەیارەو -، ئاگاداربن خوا بەم نزیکانە زەویتان بۆ رام دەکات، شیوی تەواتان دەبێت و برسی نابن، دەی با هیچ کەسێکتان ئەوەندە بێ دەسەڵات نەبێ یاری بە تیرەکانی بکات).

٣٠٨٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ وَجِيءَ بِالأُسَارَى، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَؤُلاَءِ الأَسَارَى، فَذَكَرَ فِي الحَدِيثِ قِصَّةً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَنْفَلِتَنَّ مِنْهُمْ أَحَدٌ إِلاَّ بِفِدَاءٍ أَوْ ضَرْبِ عُنُقٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِلاَّ سُهَيْلَ ابْنَ بَيْضَاءَ فَإِنِّي قَدْ سَمِعْتُهُ يَذْكُرُ الإِسْلاَمَ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُنِي فِي يَوْمٍ أَخْوَفَ أَنْ تَقَعَ عَلَيَّ حِجَارَةٌ مِنَ السَّمَاءِ مِنِّي فِي ذَلِكَ اليَوْمِ، حَتَّى قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِلاَّ سُهَيْلَ ابْنَ البَيْضَاءِ، قَالَ: وَنَزَلَ القُرْآنُ بِقَوْلِ عُمَرَ: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ) إِلَى آخِرِ الآيَاتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەپاش ئەوەی جەنگی بەدر بە سەرکەوتنی موسوڵمانان کۆتایی هات، دیلەکانیان هێنا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئێوە سەبارەت بەم دیلانە راتان چۆنەو دەڵێن چی؟) جا راوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە وەك لە فەرموودەدا هاتووە - پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ رای لەسەر فدیە بوو، پێشەوا عومەریش ڕەزای خوای لێ بێ رای لەسەر ئەوە بوو لە ملیان بدرێت - ...پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هیچ کام لەم دیلانە رزگاریان نابێ یان ئەوەتا دەبێ سەرانە فدیە بدەن یان دەدرێت لە ملیان). (عبد

الله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جگە لە سوهەیلی کوڕی (بیضاء)، لەبەرئەوەی من بۆ خۆم گوێم لێی بوو باسی موسوڵمان بوونی خۆی دەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێ دەنگ بوو، لەبەر ئەو ئەو قسە ئەو ڕۆژە ترسام لە ئاسمانەوە بەرد ببارێ بەسەرمدا، هەتا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (جگە لە سوهەیلی کوڕی (بیضاء))، فەرمووی: لەسەر وتەکەی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ رای کە فەرمووی: لە ملیان بدرێت، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٦٧) لَوْلَا كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾. سورة الأنفال: ٦٧- ٦٨. واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نی یە کە دیلی (لە دوژمنان) هەبێ، هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات لەزەویدا، ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێ (بە وەرگرتنی فیدیە)، وە خواش (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێ (بۆ ئێوە)، وە خوا توانا و زاڵی کار دروستە. ئەگەر نووسراو (و بڕیار)ێك لەلایەن خواوە پێش نەکەوتایە (کە حەلاڵ بوونی دەستکەوت و غەنیمەتی جەنگە)، بێگومان لەبەر ئەو (فیدیە)ی کە وەرتان گرت تووشتان دەبوو سزایەکی گەورە. لەپاشدا خوای گەورە حەلاڵ بوونی دەستکەوت و غەنیمەتی جەنگی بۆ حەلاڵ کردن.

٣٠٨٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ وَجِيءَ بِالأُسَارَى، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَؤُلاَءِ الأَسَارَى، فَذَكَرَ فِي الحَدِيثِ قِصَّةً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَنْفَلِتَنَّ مِنْهُمْ أَحَدٌ إِلاَّ بِفِدَاءٍ أَوْ ضَرْبِ عُنُقٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِلاَّ سُهَيْلَ

ابْنَ بَيْضَاءَ فَإِنِّي قَدْ سَمِعْتُهُ يَذْكُرُ الإِسْلاَمَ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُنِي فِي يَوْمٍ أَخْوَفَ أَنْ تَقَعَ عَلَيَّ حِجَارَةٌ مِنَ السَّمَاءِ مِنِّي فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ، حَتَّى قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِلاَّ سُهَيْلَ ابْنَ الْبَيْضَاءِ، قَالَ: وَنَزَلَ الْقُرْآنُ بِقَوْلِ عُمَرَ: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ) إِلَى آخِرِ الآيَاتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەپاش ئەوەی جەنگی بەدر بە سەرکەوتنی موسوڵمانان کۆتایی هات، دیلەکانیان هێنا، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووی: (ئێوە سەبارەت بەم دیلانە راتان چۆنەو دەڵێن چی؟) جا راوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە وەك لە فەرموودەدا هاتووە - پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ رای لەسەر فدیە بوو، پێشەوا عومەریش ڕەزای خوای لێ بێ رای لەسەر ئەوە بوو لە ملیان بدرێت - ...پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووی: (هیچ کام لەم دیلانە رزگاریان نابێ یان ئەوەتا دەبێ سەرانە فدیە بدەن یان دەدرێت لە ملیان). (عبد الله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، جگە لە سوهەیلی کوڕی (بیضاء)، لەبەرئەوەی من بۆ خۆم گوێم لێی بوو باسی موسوڵمان بوونی خۆی دەکرد، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بێ دەنگ بوو، لەبەر ئەو ئەو قسە ئەو ڕۆژە ترسام لە ئاسمانەوە بەرد ببارێ بەسەرمدا، هەتا پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووی: (جگە لە سوهەیلی کوڕی (بیضاء))، فەرمووی: لەسەر وتەکەی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ رای کە فەرمووی: لە ملیان بدرێت، ئەم ئایەتە دابەزی: **(مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ وَاللَّهُ**

**عَزِيزٌ حَكِيمٌ**). سورة الأنفال: ٦٧. واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نی یە کە دیلی (لە دوژمنان) هەبێ، هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات لەزەویدا، ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێ (بە وەرگرتنی فیدیە)، وە خواش (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێ (بۆ ئێوە)، وە خوا توانا و زاڵی کار دروستە.

٣٠٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ زَائِدَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَمْ تَحِلَّ الغَنَائِمُ لأَحَدٍ سُودِ الرُّءُوسِ مِنْ قَبْلِكُمْ، كَانَتْ تَنْزِلُ نَارٌ مِنَ السَّمَاءِ فَتَأْكُلُهَا قَالَ سُلَيْمَانُ الأَعْمَشُ: فَمَنْ يَقُولُ هَذَا إِلاَّ أَبُو هُرَيْرَةَ، الآنَ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ وَقَعُوا فِي الغَنَائِمِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ لَهُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (لَوْلاَ كِتَابٌ مِنَ اللهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ مِنْ حَدِيثِ الأَعْمَشِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەپێش ئێوەدا غەنیمەت بۆ کەس حەڵاڵ نەبووە، کۆدەکرایەوە و لە ئاسمانەوە ئاگرێ دادەبەزی و دەیخوارد، بەلاّم کاتێ جەنگی بەدر ڕویدا پێش ئەوەی حەلاّڵ بکرێ بۆیان خێرا پەلاماریاندا، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**لَوْلَا كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ**). سورة الأنفال: ٦٨. واتە: ئەگەر نووسراو (و بڕیار)ێك لەلایەن خواوە پێش نەکەوتایە (کە حەلاّڵ بوونی دەستکەوتو غەنیمەتی جەنگە)، بێگومان لەبەر ئەو (فیدیە)ی کە وەرتان گرت تووشتان دەبوو سزایەکی گەورە. لەپاشدا خوای گەورە حەلاّڵ بوونی دەستکەوت و غەنیمەتی جەنگی بۆ حەلاّڵ کردن.

## دەربارەی سورەتی (التَّوبَةِ).

### ١٠ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ التَّوْبَةِ

٣٠٨٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، وَسَهْلُ بْنُ يُوسُفَ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَوْفُ بْنُ أَبِي جَمِيلَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ الفَارِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ: مَا حَمَلَكُمْ أَنْ عَمَدْتُمْ إِلَى الأَنْفَالِ وَهِيَ مِنَ الْمَثَانِي وَإِلَى بَرَاءَةٌ وَهِيَ مِنَ الْمِئِينَ فَقَرَنْتُمْ بَيْنَهُمَا وَلَمْ تَكْتُبُوا بَيْنَهُمَا سَطْرَ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ وَوَضَعْتُمُوهَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ، مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ؟ فَقَالَ عُثْمَانُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِمَّا يَأْتِي عَلَيْهِ الزَّمَانُ وَهُوَ يُنْزَلُ عَلَيْهِ السُّوَرُ ذَوَاتُ الْعَدَدِ، فَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الشَّيْءُ دَعَا بَعْضَ مَنْ كَانَ يَكْتُبُ فَيَقُولُ: ضَعُوا هَؤُلَاءِ الآيَاتِ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا وَإِذَا نَزَلَتْ عَلَيْهِ الآيَةَ فَيَقُولُ: ضَعُوا هَذِهِ الآيَةَ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا، وَكَانَتِ الأَنْفَالُ مِنْ أَوَائِلِ مَا نَزَلَتْ بِالْمَدِينَةِ وَكَانَتْ بَرَاءَةٌ مِنْ آخِرِ القُرْآنِ وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهَةً بِقِصَّتِهَا فَظَنَنْتُ أَنَّهَا مِنْهَا، فَقُبِضَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَنَا أَنَّهَا مِنْهَا، فَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ قَرَنْتُ بَيْنَهُمَا وَلَمْ أَكْتُبْ بَيْنَهُمَا سَطْرَ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، فَوَضَعْتُهَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَوْفٍ، عَنْ يَزِيدَ الفَارِسِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَيَزِيدُ الفَارِسِيُّ قَدْ رَوَى عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، غَيْرَ حَدِيثٍ، وَيُقَالُ هُوَ: يَزِيدُ بْنُ هُرْمُزَ، وَيَزِيدُ الرَّقَاشِيُّ هُوَ: يَزِيدُ بْنُ أَبَانَ الرَّقَاشِيُّ وَلَمْ يُدْرِكْ ابْنَ عَبَّاسٍ إِنَّمَا رَوَى عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَكِلاَهُمَا مِنْ أَهْلِ البَصْرَةِ، وَيَزِيدُ الفَارِسِيُّ أَقْدَمُ مِنْ يَزِيدَ الرَّقَاشِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم بە پێشەوا (عُثْمَان)ی كوڕی عەففان رەزای خوای لێ بێ: هۆی چییە كە

سورەتی(بَرَاءَة) لە سەد ئایەتەکانە، وە سورەتی(الأَنْفَال) لە سەد ئایەتەکان کەمترە کەچی لەریزبەندی حەوت سورەتە درێژەکەی قورئاندا دانراون و لەنێوانیاندا: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). نەنوسراوە؟ پێشەوا (عُثْمَان) رەزای خوای لێ بێ وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایەتەکانی بۆ دادەبەزی: هەندێ لەوانەی کە وەحیان بۆ دەنوسیەوە بانگی دەکردن و پێی دەفەرموون: (ئەم ئایەتە لەو سورەتەدا دابنێن کە باسی ئەوەو ئەوە دەکات). هەروەها ئەگەر ئایەتێ یان دوو ئایەتی بۆ دابەزێنرایە هەمان شتی پێ دەفەرموون، بێگومان سورەتی (الأَنْفَال) یەکەم سورەت بوو کە لە مەدینە بۆی دابەزی، وە سورەتی (بَرَاءَة)ش دوایین سورەتی قورئان، بەسەرهاتەکانیان چون یەك بوو بۆیە وام دەزانی ئەمیش سەربە هەمان سورەتە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەفاتی کرد بۆی رون نەکردینەوە کە سورەتی (التوبة) لە (الأنفال)ە، ئا لێرەدا بوو کە لەریزبەندی حەوت سورەتە درێژەکەی قورئاندا دانراون و لەنێوانیاندا: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). نەنوسراوە.

٣٠٨٧ – (حسن) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ الجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ شَبِيبِ بْنِ غَرْقَدَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، أَنَّهُ شَهِدَ حَجَّةَ الوَدَاعِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَذَكَّرَ وَوَعَظَ ثُمَّ قَالَ: أَيُّ يَوْمٍ أَحْرَمُ، أَيُّ يَوْمٍ أَحْرَمُ، أَيُّ يَوْمٍ أَحْرَمُ؟ قَالَ: فَقَالَ النَّاسُ: يَوْمُ الحَجِّ الأَكْبَرِ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، أَلاَ لاَ يَجْنِي جَانٍ إِلاَّ عَلَى نَفْسِهِ، وَلاَ يَجْنِي وَالِدٌ عَلَى وَلَدِهِ، وَلاَ وَلَدٌ عَلَى وَالِدِهِ، أَلاَ إِنَّ الْمُسْلِمَ أَخُو الْمُسْلِمِ، فَلَيْسَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ إِلاَّ مَا أَحَلَّ مِنْ نَفْسِهِ، أَلاَ وَإِنَّ كُلَّ رِبًا فِي الجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، لَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ غَيْرَ رِبَا العَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ

الْمُطَّلِبِ فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ، أَلاَ وَإِنَّ كُلَّ دَمٍ كَانَ فِي الجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ دَمٍ وُضِعَ مِنْ دَمِ الْجَاهِلِيَّةِ دَمُ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، كَانَ مُسْتَرْضَعًا فِي بَنِي لَيْثٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ، أَلاَ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٍ عِنْدَكُمْ لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئًا غَيْرَ ذَلِكَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ فَإِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ، وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً، أَلاَ وَإِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقًّا، وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا، فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ، فَلاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ، وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ، أَلاَ وَإِنَّ حَقَّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ شَبِيبِ بْنِ غَرْقَدَةَ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: باوکم بۆی باسکردم کە خۆی بەشداری حەجی مالآوایی کردووە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، لەپاش سوپاس و ستایشی خوای گەورە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەسی کرد بە ئامۆژگاری کردن و وەبیر هێنانەوە، ئینجا سێ جار فەرمووی: (چ ڕۆژێ زۆر گەورە و بە قەدرە شکاندنی ڕێز و حورمەتی تاوانێکی گەورەیە؟) خەلکەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ڕۆژی حەجی گەورە واتە ڕۆژی عەرەفە یان ڕۆژی قوربانی، فەرمووی: (دەی بێگومان خوێن و ماڵ و سامان و شەرەف و ئابرووتان بە یەکتری حەرام و ناڕەوایە، وەك چۆن ئەم ڕۆژەتان گەلێ گەورە و بە قەدرە و شکاندنی ڕێز و حورمەتی تاوانێکی گەورەیە ئەوانیش ئاوەها، لەم شوێنەتان واتە شاری مەککە، لەم مانگەتان واتە مانگی (ذي الحجة)، ئاگاداربن هەرکەسێ تاوان بکات بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە و ناتەنێتەوە بۆ کەسوکاری،

تاوانی باوك و دایك پەیوەندی بە منداڵیانەوە نیە، بەپێچەوانەشەوە تاوانی منداڵ پەیوەندی بە دایك و باوكەوە نیە، هۆشیاربن بێگومان موسوڵمان برای موسوڵمانە، سەر وماڵی موسوڵمان لە برای موسوڵمانی حەرام و ناڕەوایە، مەگەر شتێ بەڕەزامەندی خۆی بێ، ئاگاداربن هەموو سوویەكی سەردەمی نەفامی پوچ و بەتاڵە، سەرمایەكانتان بۆ خۆتانە نە زوڵم و ستەم بكەن، نە زوڵم و ستەمتان لێ بكرێت، بەبێ زیاد و كەم وەریبگرنەوە، جگە لە سووی عەباسی كوڕی (عبد المطلب) كە هەمووی پوچ و بەتاڵە، هۆشیاربن بێگومان هەموو خوێنێ كە ڕژرابێ لەسەردەمی نەفامیدا پوچ و بەتاڵە، یەكەم خوێنیش كە بەتاڵی دەكەمەوە خوێنی (حارث)ی كوڕی (عبد المطلب)ە كە مامی خۆمە لەسەردەمی نەفامیدا خوێنی ڕژرا، شیرەخۆر بوو درابوو بە دایەن بە هۆزی بنی (لیث)، هۆزی (هذیل) كوشتیان، هۆشیاربن سەبارەت بە ئافرەتانیش لە خوا بترسن و ستەمیان لێ مەكەن و رەفتارتان چاك و جوان بێ لەگەڵیان، چونكە وەك دیلن لەلای ئێوە، هیچتان نیە بەسەریانەوە لەوە زیاتر مەگەر خراپەیەكی ئاشكرا بكەن، جا ئەگەر كارێكی لەوجۆرەیان ئەنجامدا جێگەیان لێ جیا بكەنەوە و بە لێدانێكی سوك لێیان بدەن و برینداریان مەكەن، جا ئەگەر گوێڕایەڵییان كردن ەوە ئیتر هیچ ڕێگەیەك لەدژیان مەگرنەبەر و ستەمیان لێ مەكەن،

مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە هەیە، ئێوە مافی ئەوەتان لەسەریانە كە ڕێگە نەدەن بە هیچ كەسێ كە ئێوە رقتان لێیانە بێنە ماڵەكانتان، ئاگاداربن بێگومان هەقی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە كە رەفتارتان چاك و جوان بێ لەگەڵیان و بژێوی رۆژانەیان بۆ دابین بكەن و پۆشاكی شەرعییان بۆ بكەن).

٣٠٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ بْنِ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ يَوْمِ الحَجِّ الأَكْبَرِ فَقَالَ: يَوْمُ النَّحْرِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: دەربارەی حەجی گەورە پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ڕۆژی قوربانی كردنە).

٣٠٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: يَوْمُ الحَجِّ الأَكْبَرِ يَوْمُ النَّحْرِ قَالَ: هَذَا الحَدِيثُ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، لأَنَّهُ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ مَوْقُوفًا، وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَفَعَهُ إِلاَّ مَا رُوِيَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ. وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، مَوْقُوفًا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: دەربارەی حەجی گەورە پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ڕۆژی قوربانی كردنە).

٣٠٩٠ - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، وَعَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالاَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَرَاءَةٌ مَعَ أَبِي بَكْرٍ، ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ: لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يُبَلِّغَ هَذَا إِلاَّ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِي فَدَعَا عَلِيًّا فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كاتێ كە

چەند ئایەتێ لەسورەتی (براءة) هاتەخوارەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پێشەوا ئەبو بەکردا رەزای خوای لێ بێ ناردی بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە بۆ خەڵکی مەککە، لەپاشدا بانگی کردەوە، فەرمووی: (بۆ هیچ کەسێ نیە ئەمە بگەیەنێ جگە لە پیاوێ لەکەسوکاری خۆم)، جا پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ بانگ کردو دای بەو بیبات بۆیان بخوێنێتەوە.

٣٠٩١ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ العَوَّامِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ حُسَيْنٍ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَا بَكْرٍ وَأَمَرَهُ أَنْ يُنَادِيَ بِهَؤُلَاءِ الكَلِمَاتِ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ عَلِيًّا، فَبَيْنَا أَبُو بَكْرٍ فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ إِذْ سَمِعَ رُغَاءَ نَاقَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ القَصْوَاءِ، فَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فَزِعًا فَظَنَّ أَنَّهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا هُوَ عَلِيٌّ، فَدَفَعَ إِلَيْهِ كِتَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يُنَادِيَ بِهَؤُلَاءِ الكَلِمَاتِ فَانْطَلَقَا فَحَجَّا، فَقَامَ عَلِيٌّ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ، فَنَادَى: ذِمَّةُ اللهِ وَرَسُولِهِ بَرِيئَةٌ مِنْ كُلِّ مُشْرِكٍ، فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، وَلاَ يَحُجَّنَّ بَعْدَ العَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَنَّ بِالبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَلاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلاَّ مُؤْمِنٌ. وَكَانَ عَلِيٌّ يُنَادِي، فَإِذَا عَيِيَ قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَنَادَى بِهَا. وهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشەوا ئەبو بەکری رەزای خوای لێ بێ کرد بە فەرمانڕەوای حەج، فەرمانیشی پێ کرد بە چەند وشەیە جاڕ بدا بەناو حاجیەکاندا، لەپاشدا پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ نارد بەدوایدا، کاتێ رێی دەکرد لەپڕ گوێی لەدەنگی وشترەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە

ناوی (قصواء) بوو، پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ هاتەدەرێ و راچەنی وایزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خۆیەتی، بەڵام سەیری كرد پێشەوا عەلیە رەزای خوای لێ بێ، نامەی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پێ بوو، نامەكەی دا بەپێشەوا ئەبو بەكر، نامەكە ئەمەی تێدا بوو: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی داوە بە پێشەوا عەلی بە چەند وشەیە جارِ بدا بەناو حاجیەكاندا، جا هەردووكیان حەجیان كرد، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ رۆژانی جەژن جارِی دەدا بەناو خەڵكدا: خواو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرین لە هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرێ، با بۆ ماوەی شوار مانگ بە ئاسودەیی و بە هێمنی بەبێ هیچ ترسێك بۆ خۆیان بەسەربەستی بێن و بچن هیچ كەس بە نیازی خراپەوە سەیریان نەكات، لەم ساڵ بەدواوە هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەرێ بۆی نیە بێ بۆ حەج، وە نابێ كەس بەرووت و قووتی تەوافی ماڵی خوا بكات، ئەو كەسەش برِوادار نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ بەو شێوەیە جارِی دەدا، كاتێ كە شەكەت و ماندوو دەبوو پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ هەڵئەسا بە هەمان شێوە جارِی دەدا.

٣٠٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ يُثَيْعٍ، قَالَ: سَأَلْنَا عَلِيًّا، بِأَيِّ شَيْءٍ بُعِثْتَ فِي الحَجَّةِ؟ قَالَ: بُعِثْتُ بِأَرْبَعٍ: أَنْ لاَ يَطُوفَ بِالبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَهْدٌ فَهُوَ إِلَى مُدَّتِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ عَهْدٌ فَأَجَلُهُ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ، وَلاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ، وَلاَ يَجْتَمِعُ الْمُشْرِكُونَ وَالمسْلِمُونَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَهُوَ حَدِيثُ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ. وَرَوَاهُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِهِ، عَنْ عَلِيٍّ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ وَغَيْرُ وَاحِدٍ،

قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ يُثَيْعٍ، عَنْ عَلِيٍّ، نَحْوَهُ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أُثَيْعٍ، عَنْ عَلِيٍّ، نَحْوَهُ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ كِلْتَا الرِّوَايَتَيْنِ، يُقَالُ عَنْهُ: عَنِ ابْنِ أُثَيْعٍ وَعَنِ ابْنِ يُثَيْعٍ، وَالصَّحِيحُ هُوَ: زَيْدُ بْنُ أُثَيْعٍ، وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدٍ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ، فَوَهِمَ فِيهِ. وَقَالَ: زَيْدُ بْنُ أُثَيْلٍ، وَلاَ يُتَابَعُ عَلَيْهِ.

واتە: زەید فەرمووی: لە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ پرسیارمان کرد: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە تۆی نارد بۆ حەج بەچی فەرمانی پێ کردی؟ فەرمووی: بە چوار شت: یەکەم: کەس بەرووت و قووتی تەوافی ماڵی خوا نەکات، دووەم: ئەوانەی پەیمانیان هەیە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئەوە هەتا ماوەی ئەو پەیمانە تەواو دەبێ مۆڵەت دەدرێن، سێیەم: ناچێتە بەهەشتەوە جگە لە کەسی باوەڕدار، چوارەم: لەم ساڵ بەدواوە نابێ موسوڵمانان و هاوبەش بۆ خوا دانەران پێکەوە حەج بکەن.

٣٠٩٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسْجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالإِيمَانِ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ). حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: يَتَعَاهَدُ الْمَسْجِدَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو الهَيْثَمِ اسْمُهُ: سُلَيْمَانُ بْنُ عَمْرِو بْنِ عَبْدٍ العُتْوَارِيُّ، وَكَانَ يَتِيمًا فِي حِجْرِ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی

الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر پیاوێکتان دی زۆر هاتوچۆی مزگەوتی دەکرد و مزگەوتی ئاوەدان دەکردەوە شایەتی باوەڕداری بۆ بدەن). خوای گەورە دەفەرموێت: (**إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ**). سورة التّوْبَة: ١٨. واتە: بەڕاستی هەر بەو کەسە دەکەوێ مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکاتەوە کە بڕوای بە خواو بە رۆژی دوایی هەیە.

٣٠٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ ثَوْبَانَ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالفِضَّةَ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: أُنْزِلَتْ فِي الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ، لَوْ عَلِمْنَا أَيُّ الْمَالِ خَيْرٌ فَنَتَّخِذَهُ؟ فَقَالَ: أَفْضَلُهُ لِسَانٌ ذَاكِرٌ، وَقَلْبٌ شَاكِرٌ، وَزَوْجَةٌ مُؤْمِنَةٌ تُعِينُهُ عَلَى إِيمَانِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ سَأَلْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، فَقُلْتُ لَهُ: سَالِمُ بْنُ أَبِي الجَعْدِ سَمِعَ مِنْ ثَوْبَانَ؟ فَقَالَ: لاَ، فَقُلْتُ لَهُ: مِمَّنْ سَمِعَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: سَمِعَ مِنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَذَكَرَ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە دابەزی: (**وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالفِضَّةَ**). سورة التّوْبَة: ٣٤. واتە: وە ئەوانەی ئالتونو زیوو سەریەك دەنێن و کۆدەکەنەوە. فەرمووی: لەسەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا خوا صلی الله علیه وسلم بووین، هەندێ لە هاوەڵانی وتیان: خۆت باش دەزانی خوای گەورە چ هەڕەشەیە دەکات لەو کەسانەی ئالتونو زیوو کۆدەکەنەوە، خۆزگە بمانزانیایە چ ماڵ و سامانێ باشە هەڵیگرین و پاشەکەوتی بکەین؟ فەرمووی: (باشترینی: زمانێ بە زیکر و یادی خوا پاراو بێ، دڵێ غافڵ

نەبێ لە سوپاس و ستایشی خوای گەورە، هاوسەرێکی باوەڕدار یارمەتی بدات لەسەر باوەڕەکەی).

٣٠٩٥ - (حسن) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ يَزِيدَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ غُطَيْفِ بْنِ أَعْيَنَ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ: يَا عَدِيُّ اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الوَثَنَ، وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةٌ: (اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ)، قَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ السَّلاَمِ بْنِ حَرْبٍ، وَغُطَيْفُ بْنُ أَعْيَنَ لَيْسَ بِمَعْرُوفٍ فِي الحَدِيثِ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خاچێکی ناڵتونم لە ملدا بوو، فەرمووی: (ئەی عەدی، ئەم بتە فڕێ بدە).گوێم لێی بوو ئەم ئایەتە دەخوێندەوە: **(اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ)**. سورة التَّوْبَة: ٣١. واتە: زاناو عابیدەکانیان کردوە بە پەروەردگار لە جیاتی خوا. منیش وتم: خۆ نەیاندەپەرستن، فەرمووی: (بێگومان نەیاندەپەرستن، بەڵام حەڵاڵیان بۆ حەرام دەکردن ئەوانیش بە حەرامیان دەزانی، حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکردن ئەوانیش بە حەڵاڵیان دەزانی).

٣٠٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ حَدَّثَهُ، قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ فِي الغَارِ: لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَنْظُرُ إِلَى قَدَمَيْهِ لأَبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ

غَرِيبٌ. إِنَّمَا يُرْوَى مِنْ حَدِيثِ هَمَّامٍ تَفَرَّدَ بِهِ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ هَمَّامٍ، نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕاوەتەوە، کاتێ لە ئەشکەوتەکەدا بووین بە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم وت: ئەگەر کەسێکیان سەیری ژێر پێی خۆی بکات دەمانبینێ، فەرمووی: (بێدەنگ ئەی ئەبو بەکر، خوای گەورە بۆ خۆی لەگەڵمانە و پشتیوانمانە).

٣٠٩٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، يَقُولُ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ دُعِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلصَّلاَةِ عَلَيْهِ، فَقَامَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا وَقَفَ عَلَيْهِ يُرِيدُ الصَّلاَةَ تَحَوَّلْتُ حَتَّى قُمْتُ فِي صَدْرِهِ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَعَلَى عَدُوِّ اللهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ القَائِلِ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا؟، يَعُدُّ أَيَّامَهُ، قَالَ: وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَبَسَّمُ، حَتَّى إِذَا أَكْثَرْتُ عَلَيْهِ قَالَ: أَخِّرْ عَنِّي يَا عُمَرُ إِنِّي قَدْ خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ، قَدْ قِيلَ لِي: (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ) لَوْ أَعْلَمُ أَنِّي لَوْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ غُفِرَ لَهُ لَزِدْتُ، قَالَ: ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهِ وَمَشَى مَعَهُ، فَقَامَ عَلَى قَبْرِهِ حَتَّى فُرِغَ مِنْهُ، قَالَ: فَعُجِبَ لِي وَجُرْأَتِي عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَوَاللَّهِ مَا كَانَ إِلاَّ يَسِيرًا حَتَّى نَزَلَتْ هَاتَانِ الآيَتَانِ: (وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قَالَ: فَمَا صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَهُ عَلَى مُنَافِقٍ وَلاَ قَامَ عَلَى قَبْرِهِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عومەر رەزای خوای لیٚ بیٚ بوو دەیفەرموو: كاتێ (عبد الله)ی كوڕی ئوبەی مرد، پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم بانگ كرد نوێژی لەسەر بكات، هەستا ویستی نوێژی لەسەر بكات، منیشت رۆشتم هەتا چوومە بەردەم سنگی بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر نەكات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوە نوێژ لەسەر (عبد الله)ی كوڕی ئوبەی دوژمنی خوا دەكەی، فلاّن رۆژ و فلاّن رۆژ ئاواو ئاوای دەوت رۆژەكانی ژمارد، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەر زەردەخەنەی دەكرد منیش زۆرم بۆ هێنا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر نەكات، فەرمووی: (بیٚ دەنگ بەو خۆت لادە ئەی عومەر، من سەرپشككراوم، پێم وتراوە منیش ئەویانم هەڵبژاردووە: **(اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ)**. سورة التَّوْبَةِ: ٨٠. واتە: داوای لێبوردنیان بۆ بكەیت یان بۆیان نەكەیت (یەكسانە)، ئەگەر حەفتا جار داوای لێبوردنیان بۆ بكەیت ئەوە خوا هەرگیز لێیان نابوورێت. فەرمووی: (ئەگەر بمزانیایە لە حەفتا جار زیاتر داوای لێبوردنی بۆ بكەم خوا لێی دەبوورێت ئەوە بێگومان بۆم دەكرد). فەرمووی: لەپاشدا نوێژی لەسەر كرد و لەگەڵی رۆشت بۆ سەر گۆڕستان، لەسەری گۆڕەكەی وەستا هەتا لیٚ بوونەوە و ئەسپەردە كرا، عومەر فەرمووی: لەپاشدا بەلامەوە سەیر بوو جورئەتی ئەوەم كرد بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خواو پێغەمبەرەكەی چاكتر دەزانن، سوێند بە (الله) هێندەی پیٚ نەچوو هەتا ئەم دوو ئایەتە هاتەخوارەوە: **(وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ)**. سورة التَّوْبَةِ: ٨٤. واتە: تۆ نوێژ مەكە لەسەر هیچ كەس لەوانە كەمرد هەتا هەتایە، وە رامەوەستە لەسەر گۆڕەكەی، بێگومان ئەوانە بێباوەڕبوون بە خواو پێغەمبەرەكەی و مردن لەكاتێكدا ئەوانە بەردەوام سنورشكێن بوون.

٣٠٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: جَاءَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ مَاتَ أَبُوهُ فَقَالَ: أَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ، وَصَلِّ عَلَيْهِ، وَاسْتَغْفِرْ لَهُ، فَأَعْطَاهُ قَمِيصَهُ وَقَالَ: إِذَا فَرَغْتُمْ فَآذِنُونِي، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ جَذَبَهُ عُمَرُ وَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ نَهَى اللَّهُ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ؟ فَقَالَ: أَنَا بَيْنَ خِيرَتَيْنِ (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ) فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ) فَتَرَكَ الصَّلاَةَ عَلَيْهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (عبد الله)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کاتێ باوکی مرد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: کراسێکی خۆتم بدەرێ تا بیکەم بە کفن بۆی، نوێژی لەسەر بکە و داوای لێخۆشبوونی بۆ بکە، ئەویش کراسەکەی خۆی دایە و فەرمووی: (کاتێ لێبوونەوە ئاگادارم بکەنەوە). کاتێ ویستی نوێژی لەسەر بکات پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ گرتی و فەرمووی: مەگەر خوای گەورە رێگری لێ نەکردوویت نوێژ لەسەر دووڕووەکان نەکەیت؟ فەرمووی: (من سەرپشککراوم): (**اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ**). سورة التوبة: ٨٠. واتە: داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت یان بۆیان نەکەیت (یەکسانە). نوێژی لەسەر کرد، ئەم ئایەتە دابەزی: (**وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ**). سورة التوبة: ٨٤. واتە: تۆ نوێژ مەکە لەسەر هیچ کەس لەوانە کەمرد هەتا هەتایە، وە رامەوەستە لەسەر گۆڕەکەی. لەپاش دابەزینی ئەم ئایەتەوە ئیتر نوێژی لەسەر دووڕووەکان نەدەکرد.

٣٠٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: تَمَارَى رَجُلَانِ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: هُوَ مَسْجِدُ قُبَاءَ، وَقَالَ الآخَرُ: هُوَ مَسْجِدُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هُوَ مَسْجِدِي هَذَا.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ مِنْ حَدِيثِ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي أَنَسٍ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا عَنْ أَبِي سَعِيدٍ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ، وَرَوَاهُ أُنَيْسُ بْنُ أَبِي يَحْيَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: (**لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ**). سورة التَوْبَة: ١٠٨. واتە: بێگومان مزگەوتێ لەسەر بناغەی تەقواو لەخوا ترسان دامەزرابێ لەیەکەم رۆژەوە.

لەسەر ئەو مزگەوتە کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێداوە دوو کەس لە مزگەوت بوو بە دەمەقاڵەیان، یەکێکیان وتی: مزگەوتی قوبایە، ئەوی تریان وتی: نەخێر مزگەوتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیە وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە ئەم مزگەوتەی منە).

٣١٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلَاءِ أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي أَهْلِ قُبَاءَ (فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ) قَالَ: كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالمَاءِ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِيهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَمُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَامٍ.

واتە: ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله

علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە ئەم ئایەتەی دەربارەی خەڵکی قوبا ناردە خوارەوە: **(فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ)**. سورة التَّوْبَةِ: ١٠٨. واتە: پیاوانێکی تێدایە پێیان خۆشە خۆیان خاوێن و پاك بکەنەوە، خوای گەورەش زۆر پاك و خاوێنانی خۆش دەوێ.

فەرمووی: (لەبەر ئەوەی بە ئاو تارەتیان دەگرت و خۆیان پاك دەکردەوە، ئەم ئایەتە دەربارەیان دابەزی).

٣١٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الخَلِيلِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يَسْتَغْفِرُ لأَبَوَيْهِ وَهُمَا مُشْرِكَانِ، فَقُلْتُ لَهُ: أَتَسْتَغْفِرُ لأَبَوَيْكَ وَهُمَا مُشْرِكَانِ؟ فَقَالَ: أَوَلَيْسَ اسْتَغْفَرَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ وَهُوَ مُشْرِكٌ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلَتْ: (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: گوێم لە پیاوێ بوو داوای لێخۆشوونی بۆ باوك و دایکی دەکرد لەکاتێکدا کە هاوبەش بۆ خوا دانەربوون، وتم: ئەوە داوای لێخۆشوون بۆ باوك و دایکت دەکەی لەکاتێکدا کە هاوبەش بۆ خوا دانەربوون؟ وتی: ئەی بۆ نا مەگەر ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێ داوای لێخۆشوونی نەکرد بۆ باوکی لەکاتێکدا کە بت پەرست و هاوبەش بۆ خوا دانەر بوو، ئەم بەسەرهاتەم بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە، جا ئەم ئایەتە دابەزی: **(مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ)**. سورة التَّوْبَةِ: ١١٣. واتە: ڕەواو شایستە نیە بۆ پێغەمبەر و باوەڕداران داوای لێخۆشوون بکەن بۆ هاوبەش دانەران.

٣١٠٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا حَتَّى كَانَتْ غَزْوَةُ تَبُوكَ إِلاَّ بَدْرًا، وَلَمْ يُعَاتِبِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدًا تَخَلَّفَ عَنْ بَدْرٍ، إِنَّمَا خَرَجَ يُرِيدُ العِيرَ فَخَرَجَتْ قُرَيْشٌ مُغِيثِينَ لِعِيرِهِمْ فَالتَقَوْا عَنْ غَيْرِ مَوْعِدٍ كَمَا قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، وَلَعَمْرِي إِنَّ أَشْرَفَ مَشَاهِدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّاسِ لَبَدْرٌ، وَمَا أُحِبُّ أَنِّي كُنْتُ شَهِدْتُهَا، مَكَانَ بَيْعَتِي لَيْلَةَ العَقَبَةِ حَيْثُ تَوَاثَقْنَا عَلَى الإِسْلاَمِ، ثُمَّ لَمْ أَتَخَلَّفْ بَعْدُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى كَانَتْ غَزْوَةُ تَبُوكَ، وَهِيَ آخِرُ غَزْوَةٍ غَزَاهَا، وَآذَنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ بِالرَّحِيلِ، فَذَكَرَ الحَدِيثَ بِطُولِهِ، قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَحَوْلَهُ الْمُسْلِمُونَ وَهُوَ يَسْتَنِيرُ كَاسْتِنَارَةِ القَمَرِ، وَكَانَ إِذَا سُرَّ بِالأَمْرِ اسْتَنَارَ، فَجِئْتُ فَجَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَقَالَ: أَبْشِرْ يَا كَعْبُ بْنَ مَالِكٍ بِخَيْرِ يَوْمٍ أَتَى عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، أَمِنْ عِنْدِ اللهِ أَمْ مِنْ عِنْدِكَ؟ قَالَ: بَلْ مِنْ عِنْدِ اللهِ ثُمَّ تَلاَ هَؤُلاَءِ الآيَاتِ: (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ) قَالَ: وَفِينَا أُنْزِلَتْ أَيْضًا: (اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ) قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ لاَ أُحَدِّثَ إِلاَّ صِدْقًا، وَأَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي كُلِّهِ صَدَقَةً إِلَى اللهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، فَقُلْتُ: فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِيَ الَّذِي بِخَيْبَرَ، قَالَ: فَمَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ نِعْمَةً بَعْدَ الإِسْلاَمِ أَعْظَمَ فِي نَفْسِي مِنْ صِدْقِي رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ صَدَقْتُهُ أَنَا وَصَاحِبَايَ، وَلاَ نَكُونُ كَذَبْنَا فَهَلَكْنَا كَمَا هَلَكُوا، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ لاَ يَكُونَ اللَّهُ أَبْلَى أَحَدًا فِي الصِّدْقِ مِثْلَ الَّذِي أَبْلاَنِي مَا

تَعَمَّدْتُ لِكَذِبَةٍ بَعْدُ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَحْفَظَنِي اللَّهُ فِيمَا بَقِيَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ الزُّهْرِيِّ هَذَا الحَدِيثُ بِخِلاَفِ هَذَا الإِسْنَادِ فَقَدْ قِيلَ: عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ كَعْبٍ، وَقَدْ قِيلَ غَيْرُ هَذَا. وَرَوَى يُونُسُ هَذَا الحَدِيثَ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی كوڕی كەعبی كوڕی مالیكەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جگە غەزای بەدر لە هیچ غەزایەكدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دوانەكەوتووم لەهەموو غەزاكاندا لە خزمەتیدا بەشداربووم، هەتا غەزای تەبووك، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەرزەنشتی هیچ كەس لەوانەی نەكرد كە لە غەزای بەدر بەشداریان نەكردو گلەیی لێ نەكردن، چونكە ئەوان بەمەبەستی دەست بەسەراگرتنی كاروانیە بازرگانیەكەی قورەیش دەرچوون نەك بۆ جەنگ، قورەیشیش هەربەدەم كاروانیەكەوە دەرچوون بۆ ئەوەی ڕزگاری بكەن، جا بەبێ وادە بەرەنگاری یەكتربوونەوە، هەروەك خوای گەورە ئاماژەی بۆ كردووە، گەورەترین غەزا غەزای بەدر بووە، من لەشەوی پەیمانی عەقەبەدا بەشداربووم، هەرچەندە غەزای بەدر لەناوخەڵكدا بەناوبانگترە بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم خێر و گەورەیی ئەو شەوە ناگۆڕمەوە بە فەزڵی ئامادەبوونی جەنگی بەدر، چونكە سەرەتای ئیسلام بوو پەیمانماندا بە یەك كە تێبكۆشین بۆ سەرخستنی ئیسلام، جا لەپاش ئەوە ئیتر لە هیچ غەزایەكدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دوانەكەوتم هەتا غەزای تەبووك ، كە ئەوەش دواهەمین غەزای بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەڵكی ئاگادار كردەوە و هەواڵی دەرچوونی بۆ غەزای تەبوك پێ ڕاگەیاندن، جا ڕاوی بەدرێژی بەسەرهاتەكەی گێڕایەوە.

كەعبی كوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: كاتێ كە مووژدەی لێخۆشبوونمان بۆ دەرچوو، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەمزگەوت دانیشتبوو، موسوڵمانانیش لەدەووری دانیشتبوون، ڕووی وەك مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، ڕۆشتم لەبەردەمیدا دانیشتم، فەرمووی: (موژدە بێ لە تۆ ئەی كەعبی كوڕی مالیك لەوەتی لەدایك بوویت ڕۆژی وەك ئەمڕۆ پڕ خێر و بەرەكەتت بەسەردا نەهاتووە). وتم: لەلایەنی تۆوەیە یان لەلایەنی خوداوەیە؟ فەرمووی: (لەلایەنی خوداوەیە) لەپاشدا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: **(لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ(١١٧) وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لَا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (١١٨) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ).**

ئوبەی وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، لەبەرئەوەی خوای گەورە تەوبەی لێ قبوڵ كردووم هەتا ماوم قسەی ڕاست نەبێ نایكەم، هەموو ماڵ و سامانەكەشم لە ڕێی خوا و پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (هەندێ لە ماڵ و سامانەكەت بهێڵەرەوە بۆ خۆت باشترە). وتم: باشە ئەو پشكەم كە لەخەیبەردا هەیە دایدەنێم بۆ خۆم، فەرمووی: لەدوای ئیسلام هیچ بەهرەو نیعمەتێكم ئەوەندەی ئەو ڕاستگۆییە پێ خۆش نیە كە من و دوو هاوڕێكەم عەرزی پێغەمبەری خوامان صلی الله علیە وسلم كرد، درۆمان نەكرد هەتا تیابچین، وەك ئەوانەی درۆیان كردوو تیاچوون، پێ نازانم هیچ كەس وەك من خوای گەورە بەهرەی گوتاری ڕاستی پێ بەخشی بێ، لەوڕۆژەوە هەتا ئەمڕۆ

بەقەستی درۆم نەکردووە، هیوادارم لەمەولاش خوای گەورە بمپارێزێ.

٣١٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ السَّبَّاقِ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، حَدَّثَهُ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ مَقْتَلَ أَهْلِ اليَمَامَةِ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ عِنْدَهُ فَقَالَ: إِنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ قَدْ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ القَتْلَ قَدْ اسْتَحَرَّ بِقُرَّاءِ القُرْآنِ يَوْمَ اليَمَامَةِ، وَإِنِّي لأَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ القَتْلُ بِالقُرَّاءِ فِي الْمَوَاطِنِ كُلِّهَا فَيَذْهَبَ قُرْآنٌ كَثِيرٌ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ القُرْآنِ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ يُرَاجِعُنِي فِي ذَلِكَ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ صَدْرَ عُمَرَ، وَرَأَيْتُ فِيهِ الَّذِي رَأَى، قَالَ زَيْدٌ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّكَ شَابٌّ عَاقِلٌ لاَ نَتَّهِمُكَ، قَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الوَحْيَ فَتَتَبَّعِ القُرْآنَ، قَالَ: فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفُونِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلُونَ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ يُرَاجِعُنِي فِي ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ صَدْرَهُمَا: صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَتَتَبَّعْتُ القُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الرِّقَاعِ وَالعُسُبِ وَاللِّخَافِ، يَعْنِي الْحِجَارَةَ الرِّقَاقَ، وَصُدُورِ الرِّجَالِ، فَوَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ بَرَاءَةٌ مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ (لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالمؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ العَرْشِ العَظِيمِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: زەیدی کوڕی (ثابت) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەدوای شەهیدکردنی کۆمەڵێ لە هاوەڵان و هەندێ لەوانەی قورئانیان لەبەربوو لەجەنگی یەمامەدا دژی موسەیلەمەی درۆزن کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، پێشەوا ئەبو بەکر

ڕەزای خوای لێ بێ ناردی بەدواما، کە چووم پێشەوا عومەری ڕەزای خوای لێ بێ لێ بوو، پێشەوا ئەبو بەکر فەرمووی: پێشەوا عومەر هاتووە بۆلام دەفەرموێت: بە کوشتنی هەندێ لەوانەی کە قورئانیان لەبەربوو جەنگ گەرم بووە، منیش ئەترسم لەزۆر شوێنی جەنگەکاندا زۆرتریان لێ شەهید ببێ بەوەش قورئان زۆری لەناوبچێ، بۆیە من پێم وایە فەرمان بکەی قورئان کۆبکرێتەوە، پێشەوا ئەبو بەکر فەرمووی: چۆن کارێ بکەم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیکردبێ؟ پێشەوا عومەر فەرمووی: سوێند بە (الله) ئەم کارە کارێکی چاکە و خێری تێدایە، بەردەوام سەردانی دەکردم بۆ ئەو مەبەستە، هەتا خوای گەورە سنگمی گوشاد و فروان کرد وەك چۆن پێشتر سنگی پێشەوا عومەری گوشاد و فروان کرد، منیش وەك ئەو پێم باش بوو قورئان کۆبکرێتەوە، زەید فەرمووی: پێشەوا ئەبو بەکر فەرمووی: تۆ گەنجێکی فامیدە و ئاقڵی و ڕاستگۆی و گومانت لێ ناکەین، بێگومان تۆ وەحیت بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەنووسیەوە واتە تۆ نووسەری وەحی بوویت و شارەزایی باشت هەیە لەو بارەوە، بۆیە پێم باشە بەدوای ئایەتەکاندا بگەڕێی و یەك بەیەك کۆیان بکەیتەوە، فەرمووی: سوێند بە (الله) ئەگەر تەکلیفی گواستنەوەی کێوێ لە کێوەکانم لێ بکەن، قورستر نیە بەلامەوە لەم کارە، وتی: وتم: چۆن کارێ دەکەن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیکردووە؟ پێشەوا ئەبو بەکر فەرمووی: سوێند بە (الله) ئەم کارە کارێکی چاکە و خێری تێدایە، پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر بەردەوام سەردانیان دەکردم بۆ ئەو مەبەستە، هەتا خوای گەورە سنگی منیشی گوشاد و فروان کرد وەك چۆن پێشتر سنگی ئەوانی گوشاد و فروان کرد، جا منیش کەوتمە گەڕان بەدوای ئایەتەکاندا و یەك بەیەك کۆم دەکردنەوە، لەسەر چەرم و وەرەقە و کاغەز و پەلکی دارخورما و بەردی سپی و ساف و سنگی پیاوان واتە ئەوانەی لەبەریان بوو، کۆتایی سورەتی (براءة)م لەلای

خوزەیمەی كوڕی (ثابت) دەستكەوت: (لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ). سورة التَّوْبَة: ١٢٨ – ١٢٩.

٣١٠٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ حُذَيْفَةَ قَدِمَ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، وَكَانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّامِ فِي فَتْحِ أَرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ العِرَاقِ، فَرَأَى حُذَيْفَةُ اخْتِلاَفَهُمْ فِي القُرْآنِ، فَقَالَ لِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَدْرِكْ هَذِهِ الأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الكِتَابِ كَمَا اخْتَلَفَتِ اليَهُودُ وَالنَّصَارَى، فَأَرْسَلَ إِلَى حَفْصَةَ أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي الْمَصَاحِفِ ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ، فَأَرْسَلَتْ حَفْصَةُ إِلَى عُثْمَانَ بِالصُّحُفِ، فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ وَسَعِيدِ بْنِ العَاصِ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنِ انْسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ، وَقَالَ لِلرَّهْطِ القُرَشِيِّينَ الثَّلاَثَةِ: مَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ، فَإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ، حَتَّى نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ، بَعَثَ عُثْمَانُ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِنْ تِلْكَ الْمَصَاحِفِ الَّتِي نَسَخُوا قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَحَدَّثَنِي خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، قَالَ: فَقَدْتُ آيَةً مِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَؤُهَا (مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ) فَالتَمَسْتُهَا فَوَجَدْتُهَا مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ أَوْ أَبِي خُزَيْمَةَ فَأَلْحَقْتُهَا فِي سُورَتِهَا قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَاخْتَلَفُوا يَوْمَئِذٍ فِي التَّابُوتِ وَالتَّابُوهِ، فَقَالَ القُرَشِيُّونَ: التَّابُوتُ، وَقَالَ زَيْدٌ: التَّابُوهُ فَرُفِعَ اخْتِلاَفُهُمْ إِلَى عُثْمَانَ، فَقَالَ: اكْتُبُوهُ التَّابُوتُ فَإِنَّهُ نَزَلَ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَأَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ، كَرِهَ لِزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ نَسْخَ الْمَصَاحِفِ وَقَالَ: يَا مَعْشَرَ

الْمُسْلِمِينَ أُعْزَلُ عَنْ نَسْخِ كِتَابَةِ الْمُصْحَفِ وَيَتَوَلاَّهَا رَجُلٌ وَاللهِ لَقَدْ أَسْلَمْتُ وَإِنَّهُ لَفِي صُلْبِ رَجُلٍ كَافِرٍ، يُرِيدُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وَلِذَلِكَ قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ: يَا أَهْلَ العِرَاقِ اكْتُمُوا الْمَصَاحِفَ الَّتِي عِنْدَكُمْ وَغُلُّوهَا فَإِنَّ اللهَ يَقُولُ: (وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ القِيَامَةِ) فَالقُوا اللهَ بِالمَصَاحِفِ قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَبَلَغَنِي أَنَّ ذَلِكَ كَرِهَهُ مِنْ مَقَالَةِ ابْنِ مَسْعُودٍ رِجَالٌ مِنْ أَفَاضِلِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ حَدِيثُ الزُّهْرِيِّ وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِهِ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ خـەڵکی عێـراق و شـامی سـاز و تەیار کرد بۆ ڕزگارکردنی ئەرمینیاو ئازربایجـان، (حذيفـة)ش ڕەزای خـوای لـێ بـێ لەگەڵ خەڵکی شام بوو بۆ ئەو غەزایە، سەیری کرد خەڵکەکـە لەسـەر خوێندنـەوەی قورئان ڕایان جیاوازە، کاتێ هاتەوە بۆ مەدینـە و چـووە خزمـەت پێشـەوا عوسمـان ڕەزای خوای لێ بێ، پێی فەرموو: ئـەی پێشـەوای بـاوەڕداران، فریـای ئـەم ئوممەتـە بکەوە پێش ئەوەی جیاوازی بکەوێتە نێوانیانـەوە سـەبارەت بـە قورئـان، وەك چـۆن جولەکە و گاورەکان جیاوازی و دووبەرەکی کەوتە نێوانیانەوە، جا پێشـەوا عوسمـان ڕەزای خوای لێ بـێ نـاردی بـۆ لای حەفصـە کـە موصـحەفەکەی بـۆ بنێـرێ هـەتا چەندەها موصحەفی لەبەر بنوسنەوە، لەپاشـدا بـۆی بنێرنـەوە، ئـەویش بـۆی نـارد، پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ ناردی بۆ لای زەیدی کوڕی (ثابـت) و سـەعیدی کوڕی عاصـی و (عبـد الـرحمن)ی کـوڕی (حـارث)ی کـوڕی هیشـام و (عبـد الله)ی کوڕی زوبێر ڕەزای خوایان لێ بێ، کە چەندەها موصحەفی لەبەر بگرنـەوە، سـەعید ئەمەوی بوو بە سێ قورەیشیەکەی فەرموو: ئەگەر ئێـوەو زەیـد ڕاتـان جیـاواز بـوو لەسەر هەر شتێ ئەوە بە زمانی قورەیش بینوسن، چونکە قورئان بەزمانی قورەیش

دابەزیوە، ژمارەیەکی زۆر زۆر قورئانیان لەبەر نوسیەوە، پێشەوا عوسمان رەزای خوای لێ بێ بۆ هەر وڵات و ناوچەیە لە ناوچەکان موصحەفێکی لەو موصحەفانە نارد، پێشەوا زوهری فەرمووی: لەوکاتەدا رایان جیابوو لەسەر (التَّابُوتِ) و (التَّابُوهِ)، قورەیشیەکان فەرموویان: (التَّابُوتِ)، زەید فەرمووی: (التَّابُوهِ)، رایان جیاییەکەیان بەرزکردەوە بۆ لای پێشەوا عوسمان رەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: بنوسن: (التَّابُوتِ)، چونکە قورئان بەزمانی قورەیش دابەزیوە.

### دەربارەی سورەتی (یُونُس).

### ١١ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ يُونُسَ

٣١٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ البُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ صُهَيْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنَى وَزِيَادَةٌ) قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ نَادَى مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللهِ مَوْعِدًا يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ، قَالُوا: أَلَمْ يُبَيِّضْ وُجُوهَنَا وَيُنْجِنَا مِنَ النَّارِ وَيُدْخِلْنَا الجَنَّةَ؟ قَالَ: فَيُكْشَفُ الحِجَابُ قَالَ: فَوَاللهِ مَا أَعْطَاهُمُ اللَّهُ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَيْهِ. حَدِيثُ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ هَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ مَرْفُوعًا وَرَوَى سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، قَوْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ صُهَيْبٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە صوهەیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: **(لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنَى وَزِيَادَةٌ)**. واتە: کاتێك بەهەشتیەکان سەرجەم دەچنە بەهەشت، خوای گەورە پێیان

دەفەرموێت: ئەریٚ شتێکی ترتـان دەویٚ بۆتـان زیـاد بکـەم؟ ئـەوانیش دەڵـێن: چـی ماوە تا پێمان بدەیت، ئەوەتانیٚ رووت سپی کردووین و لەناو بەهەشتدا داتنـاوین و لە ئاگری دۆزەخ رزگارت کردووین! جا خوا پەردەی نێوانی خۆی و بەنـدەکانی هـەڵ دەماڵیٚ و بەندەکان بەچاوی سەر تەماشای زاتی پەروەردگاری خۆیـان دەکـەن، ئـیتر هەرگیز شتی وا خۆش و خۆشەویست لەوەو پێش خەڵات نەکراوە پێیـان، وەك ئـەوە بەچاوی سەر تەماشای زاتی پـەروەردگاری خۆیـان بکـەن). فـەرمووی: (سـوێند بـە (الله)، خوای گەورە هیچ شتێکی پیٚ نەبەخشـیوون خۆشەویسـتر بـیٚ بەلایانـەوە لـە سەیرکردنی).

٣١٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَهْلِ مِصْرَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، عَنْ هَذِهِ الآيَةِ (لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا) قَالَ: مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ مُنْذُ سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْهَا فَقَالَ: مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ غَيْرُكَ مُنْذُ أُنْزِلَتْ، فَهِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ. حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَهْلِ مِصْرَ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَاصِمِ ابْنِ بَهْدَلَةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَلَيْسَ فِيهِ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ.

پیاوێکی میسری وتی: دەربارەی ئەم ئایەتە لە ئەبو دەردائم رەزای خوای لیٚ بیٚ پرسی: **(لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا)**. واتە: دۆستانی خوا مزگێنی گـەورەیان پـیٚ دراوە کـە سـەربەرز و سـەرفرازی هـەردوو جیهـانن. فـەرمووی: لـەو کاتـەوە ئـەم پرسیارەم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردووە، جگە لەتۆ هـیچ کەسـیٚ

ئەم پرسیارەی لـێ نـەکردووم، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فـەرمووی: (لەوکاتەوە ئەم ئایەتە دابەزیوە جگە لەتۆ هیچ کەسێ ئەم پرسیارەی لێ نەکردووم، ئەوە خەوی باشە موسوڵمان دەیبینێ، یان خەوی باشی پێوە دەبینن).

٣١٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مِهْرَانَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَمَّا أَغْرَقَ اللَّهُ فِرْعَوْنَ قَالَ: (آمَنْتُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ) فَقَالَ جِبْرِيلُ: يَا مُحَمَّدُ فَلَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا آخُذُ مِنْ حَالِ البَحْرِ فَأَدُسُّهُ فِي فِيهِ مَخَافَةَ أَنْ تُدْرِكَهُ الرَّحْمَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ خوای گـەورە فیرعـەونی لەدەریای نیلدا نغرۆ کرد خەریك بوو بخنکێ وتی: (**آمَنْتُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ**). سورة يونس: ٩٠. واتە: بڕوام هێنا جگە لە (الله) هیچ پەرسـتراوێکی بەهەق نیە، کە بڕوایان پێ هێناوە نەوەی ئیسرائیل. جبریل وتـی: ئـەی موحەممـەد! ئەگەر منت دەدی چۆن قوڕە رەشەکەی دەریام دەکردە دەمی فیرعەون بۆ ئەوەی بەر سۆز و میهرەبانی نەکەوێ.

٣١٠٨ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ، وَعَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، ذَكَرَ أَحَدُهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ ذَكَرَ أَنَّ جِبْرِيلَ جَعَلَ يَدُسُّ فِي فِي فِرْعَوْنَ الطِّينَ خَشْيَةَ أَنْ يَقُولَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَيَرْحَمَهُ اللَّهُ، أَوْ خَشْيَةَ أَنْ يَرْحَمَهُ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر و ئیبنـو عەباسـەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ،

یەكێكیان گێڕایەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە، جبریل لە قوڕە ڕەشەكەی دەریای دەكردە دەمی فیرعەون لەترسی ئەوەی نەوەكا بڵێ: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ)، یان لەترسی ئەوەی نەوەكا خوای گەورە ڕوحمی پێ بكات و بەر سۆز و میهرەبانی ئەو بكەوێ.

## دەربارەی سورەتی (هُود).

## ١٢ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ هُودٍ

٣١٠٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ وَكِيعِ بْنِ حُدُسٍ، عَنْ عَمِّهِ أَبِي رَزِينٍ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيْنَ كَانَ رَبُّنَا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ خَلْقَهُ؟ قَالَ: كَانَ فِي عَمَاءٍ مَا تَحْتَهُ هَوَاءٌ وَمَا فَوْقَهُ هَوَاءٌ، وَخَلَقَ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ: قَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ: العَمَاءُ: أَيْ لَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ. هَكَذَا يَقُولُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ: وَكِيعُ بْنُ حُدُسٍ، وَيَقُولُ شُعْبَةُ وَأَبُو عَوَانَةَ وَهُشَيْمٌ: وَكِيعُ بْنُ عُدُسٍ: وَهُوَ أَصَحُّ، وَأَبُو رَزِينٍ اسْمُهُ: لَقِيطُ بْنُ عَامِرٍ .. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: ئەبی ڕەزین فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پەروەردگارمان لەكوێ بوو پێش ئەوەی دروستكراوەكانی دروست بكات؟ فەرمووی: (خوای گەورە هەر بووە و هەر خۆی بووە و بەس جگە لە خۆی هیچ شتێ نەبوو، هیچیشی لەگەڵ نەبووە، لەپاشدا عەرشی خۆی دروستكردووە و لەسەر ئاو دایناوە).

٣١١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ

وَتَعَالَى يُمْلِي، وَرُبَّمَا قَالَ: يُمْهِلُ، لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ، ثُمَّ قَرَأَ: (وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ القُرَى) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَاهُ أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، نَحْوَهُ، وَقَالَ: يُمْلِي. حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ جَدِّهِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَقَالَ: يُمْلِي، وَلَمْ يَشُكَّ فِيهِ.

واتە: لە ئەبی موساوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەراستیدا خوای (تبارك وتعالى) تا ماوەیە مۆڵەتی ستەمکار دەدات کە گرتی و لەناوی برد ئیتر قوتاری نابێ و رزگاربوونی شتێکی مەحاڵە، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ القُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ)**. سورة هود: ١٠٢. واتە: سزار و قاری پەروەردگارت ئاوایە کاتێ ویستی خەڵکانی ستەمکاری شار و گوندنشینەکان لەناوبەرێت کە بەڕاستی سزاو قارێکی سەخت و ئێش پێ گەیەنەرە.

٣١١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ) سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، فَعَلَى مَا نَعْمَلُ؟ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، أَوْ عَلَى شَيْءٍ لَمْ يُفْرَغْ مِنْهُ؟ قَالَ: بَلْ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ وَجَرَتْ بِهِ الأَقْلَامُ يَا عُمَرُ، وَلَكِنْ كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: **(فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ)**. سورة هود: ١٠٥. واتە: ئەو

خەڵكە دەبنـە دوو بـەش هەیانـە بەدبختـە و چارەڕەشـە، هەشـیانە بەختـەوەر و ڕوو سـپیـیە. پرسـیارم كـرد لـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم، وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم دەی ئـیتر بۆچـی كـار بكـەین لەكاتێكـدا بڕیارەكە لای خوا بڕاوەتەوە، فەرمووی: (بەڵێ، ئەی عومەر لەسەر شـتێ كـار بكـە لای خوا بڕاوەتەوە، بەڵام هەموو كەسێ بۆچـی دروسـتكراوە بـەرەو ئـەو ئاڕاسـتەیە دەچـێت، ئـەهلی بەهەشـت ڕێگـەی بەهەشـت دەگـرێ و ئـەهلی دۆزەخـیش ڕێگـای دۆزەخ دەگرێ).

٣١١٢ - (حسن صحیح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، وَالأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنِّي عَالَجْتُ امْرَأَةً فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَإِنِّي أَصَبْتُ مِنْهَا مَا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا وَأَنَا هَذَا فَاقْضِ فِيَّ مَا شِئْتَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ سَتَرَكَ اللَّهُ لَوْ سَتَرْتَ عَلَى نَفْسِكَ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا، فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ فَأَتْبَعَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً، فَدَعَاهُ فَتَلاَ عَلَيْهِ (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ: هَذَا لَهُ خَاصَّةً؟ قَالَ: لاَ، بَلْ لِلنَّاسِ كَافَّةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَكَذَا رَوَى إِسْرَائِيلُ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، وَالأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ، وَرِوَايَةُ هَؤُلاَءِ أَصَحُّ مِنْ رِوَايَةِ الثَّوْرِيِّ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَسِمَاكٌ،

عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ الأَعْمَشَ. وَقَدْ رَوَى سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: لەوپەڕی مەدینەوە یاری و دەستبازیم لەتەك ئافرەتێکدا کردووە بەلاّم لەگەڵی جوت نەبووم، فەرموو ئەوە من ئامادەم و ملکەچم بۆ حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەر بەویستی خۆت حەدم بەسەردا جێبەجێ بکە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: خوای گەورە بۆی دەپۆشیت ئەگەر خۆت ئەو نهێنیەت بپۆشیایە ئەوەش چاکتر بوو بۆت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەلاّمی نەدایەوە، پیاوەکە ڕۆشت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پیاوێکی نارد بەدوایا، بانگی کردو، ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: (**وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّاكِرِينَ**). سورة الهود: ١١٤. واتە: هەستە بە ئەرکی ڕاگرتنی نوێژ لەهەر دوو سەری ڕۆژەوەو لە بەشێك لە شەویشدا، بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردارە ناپەسەندەکانتان لادەبەن و دەبنە کەفارەت و شۆردنەوەی گوناهەکانتان، ئەوە ئامۆژگاری و بیر خەرەوەیە بۆ ئەوانەی زیکرو یادی خوا دەکەن.

پیاوێ لە ئامادەبون وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەم ئایەتە تایبەتە بەوەوە یان بۆ سەرجەم خەڵکە؟ فەرمووی: (بۆ هەموو خەڵکە بە گشتی).

٣١١٣ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ مُعَاذٍ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً لَقِيَ امْرَأَةً وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا مَعْرِفَةٌ فَلَيْسَ يَأْتِي الرَّجُلُ شَيْئًا إِلَى امْرَأَتِهِ إِلاَّ قَدْ أَتَى هُوَ إِلَيْهَا إِلاَّ أَنَّهُ لَمْ يُجَامِعْهَا؟ قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ) فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ وَيُصَلِّيَ. قَالَ مُعَاذٌ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَهِيَ لَهُ خَاصَّةً أَمْ لِلْمُؤْمِنِينَ عَامَّةً؟ قَالَ: بَلْ لِلْمُؤْمِنِينَ عَامَّةً. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى لَمْ يَسْمَعْ مِنْ مُعَاذٍ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ مَاتَ فِي خِلاَفَةِ عُمَرَ، وَقُتِلَ عُمَرُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى غُلاَمٌ صَغِيرٌ ابْنُ سِتِّ سِنِينَ، وَقَدْ رَوَى عَنْ عُمَرَ. وَرَوَى شُعْبَةُ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتە: لە (معاذ)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێم بڵێ ئەگەر پیاوێ بگات بە ئافرەتێکی نەناسراو دەستبازی و ماچ و مووچی لەگەڵ بکات و بیگرێتە ئامێزی بەڵام لەگەڵی جوت نەبێ و زینای لەگەڵ نەکات حوکمی چییە؟ ئەم ئایەتە دابەزی: (**وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّاكِرِينَ**). سورة الهود: ١١٤. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد دەستنوێژبگرێ و نوێژ بکات، (معاذ) رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەم ئایەتە تایبەتە بەمەوە یان بۆ سەرجەم باوەڕدارانە؟ فەرمووی: (بۆ هەموو باوەڕدارانە بە گشتی).

٣١١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ رَجُلاً أَصَابَ مِنْ امْرَأَةٍ قُبْلَةَ حَرَامٍ فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ عَنْ كَفَّارَتِهَا، فَنَزَلَتْ (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ) فَقَالَ الرَّجُلُ: أَلِي هَذِهِ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: لَكَ وَلِمَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ ئافرەتێکی ماچ کرد بە حەرامی، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پرسیاری کەفارەتەکەی کرد، ئەم ئایەتە دابەزی: (**وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ**). سورة الهود: ١١٤. پیاوەکە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەمە بەتایبەت بۆ منە؟ فەرمووی: (بۆ تۆ و بۆ هەرکەسێکە لە ئوممەتم کە کاری وا بکات).

٣١١٥ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا قَيْسُ بْنُ الرَّبِيعِ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي اليَسَرِ، قَالَ: أَتَتْنِي امْرَأَةٌ تَبْتَاعُ تَمْرًا، فَقُلْتُ: إِنَّ فِي البَيْتِ تَمْرًا أَطْيَبَ مِنْهُ، فَدَخَلَتْ مَعِي فِي البَيْتِ، فَأَهْوَيْتُ إِلَيْهَا فَتَقَبَّلْتُهَا، فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ قَالَ: اسْتُرْ عَلَى نَفْسِكَ وَتُبْ وَلاَ تُخْبِرْ أَحَدًا، فَلَمْ أَصْبِرْ فَأَتَيْتُ عُمَرَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: اسْتُرْ عَلَى نَفْسِكَ وَتُبْ وَلاَ تُخْبِرْ أَحَدًا، فَلَمْ أَصْبِرْ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: أَخَلَفْتَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ فِي أَهْلِهِ بِمِثْلِ هَذَا حَتَّى تَمَنَّى أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ أَسْلَمَ إِلاَّ تِلْكَ السَّاعَةَ حَتَّى ظَنَّ أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ. قَالَ: وَأَطْرَقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَوِيلاً حَتَّى أَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ)، إِلَى قَوْلِهِ: (ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ). قَالَ أَبُو اليَسَرِ: فَأَتَيْتُهُ فَقَرَأَهَا عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَصْحَابُهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِهَذَا خَاصَّةً أَمْ لِلنَّاسِ عَامَّةً؟ قَالَ: بَلْ لِلنَّاسِ عَامَّةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَيْسُ بْنُ الرَّبِيعِ ضَعَّفَهُ وَكِيعٌ وَغَيْرُهُ. وَأَبُو الْيَسَرِ هُوَ: كَعْبُ بْنُ عَمْرٍو. وَرَوَى شَرِيكٌ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، هَذَا الْحَدِيثَ مِثْلَ رِوَايَةِ قَيْسِ بْنِ الرَّبِيعِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، وَوَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ.

واتە: لە ئەبی یەسرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ژنێ هات بۆ لام خورما بکڕێ وتم: لەژوورەوە خورمای چاکتری لێیە، لەگەڵم هاتەژوورەوە، دەستم بۆ بردو ماچم کرد، چووم بۆ خزمەت پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ بەسەرهاتەکەم بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: تەوبە بکە و بیپۆشە و لای کەس باسی مەکە، ئارامم لێ بڕا و ئۆقرەم نەگرت و چووم بۆ خزمەت پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ بەسەرهاتەکەم بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: تەوبە بکە و بیپۆشە و لای کەس باسی مەکە، ئۆقرەم نەگرت و چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم خوا بەسەرهاتەکەم بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: (ئاوا چاودێری شەرەف و ناموسی جەنگاوەری رێی خوا دەکەی؟). ئەوەندە پەشیمان بوومە هەتا خۆزگەم دەخواست ئەو ساتە موسوڵمان بوومایە، گومانم وابوو ئەهلی ئاگری دۆزەخم، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ماوەیەکی راما هەتا ئەم ئایەتەی بۆ هاتەخوارەوە: (**وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ**). سورة الهود: ١١٤. واتە: هەستە بە ئەرکی راگرتنی نوێژ لەهەر دوو سەری رۆژەوەو لە بەشێك لە شەویشدا، بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردارەناپەسەندەکانتان لادەبەن و دەبنە کەفارەت و شۆردنەوەی گوناهەکانتان، ئەوە ئامۆژگاری و بیر خەرەوەیە بۆ ئەوانەی زیکرو یادی خوا دەکەن.

ئەبو یوسر فەرمووی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئایەتەكەی بۆ خوێندمەوە، هاوەڵانی فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەم ئایەتە تایبەتە بەوەوە یان بۆ سەرجەم خەڵكە؟ فەرمووی: (بۆ هەموو خەڵكە بە گشتی).

**دەربارەی سورەتی (یوسف).**

**١٣ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ يُوسُفَ**

٣١١٦ - (حسن بلفظ (ثروة)) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ الخُزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْكَرِيمَ ابْنَ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ مَا لَبِثَ يُوسُفُ ثُمَّ جَاءَنِي الرَّسُولُ أَجَبْتُ ثُمَّ قَرَأَ (فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ) قَالَ وَرَحْمَةُ اللهِ عَلَى لُوطٍ إِنْ كَانَ لَيَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، إِذْ قَالَ: (قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ) فَمَا بَعَثَ اللهُ مِنْ بَعْدِهِ نَبِيًّا إِلاَّ فِي ذِرْوَةٍ مِنْ قَوْمِهِ. حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، وَعَبْدُ الرَّحِيمِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، نَحْوَ حَدِيثِ الفَضْلِ بْنِ مُوسَى، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: مَا بَعَثَ اللهُ بَعْدَهُ نَبِيًّا إِلاَّ فِي ثَرْوَةٍ مِنْ قَوْمِهِ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو: الثَّرْوَةُ: الكَثْرَةُ وَالمَنَعَةُ. وهَذَا أَصَحُّ مِنْ رِوَايَةِ الفَضْلِ بْنِ مُوسَى. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان خانەدان و ڕەسەنی كوڕی خانەدان و ڕەسەنی كوڕی خانەدان و ڕەسەنی كوڕی خانەدان و ڕەسەن یوسفی

کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمەسەلامی خوایان لەسەر بێ)، فەرمووی: (ئەگەر من لەجێی ئەو بوومایە ئەوەندە لە زینداندا بمامایەتەوە هەرکە دەهاتن بەدوامدا خێرا بەبێ چەند و چوون دەچووم لەگەڵیان بۆلای پادشا، بەلاّم ئەو خۆڕاگربوو نەڕۆشت بۆئەوەی بیسەلمێنێ کە بێ تاوانە)، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللاَّتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ**). سورة يوسف: ٥٠. واتە: نوێنەری پادشا گەڕایەوەو مانای خەوەکەی بۆ گێڕایەوە چووە دڵیەوە، بۆی دەرکەوت پیاوی ئاوا حەیفە لەزینداندا بێ، بۆیە وتی: ئادەی هەر ئێستا بچن بیهێنن، با خۆم وتوێژی لەگەڵ بکەم، جا کە راسپاردەکە هاتە لای یوسف قسە و باسەکەی پادشای بۆ گێڕایەوە و بڕیاری ئازادبوونەکەشی پێ وت،یوسف فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ لای پاشا و گەورەکەت لێی بپرسە: هۆی چی بوو ئەو ژنانە دەستی خۆیانیان بڕی، واتە بپرسێ بزانێ من لەسەرچی گیراووم. فەرمووی: (رەحمەتی خوا لە پێغەمبەر (لوط) کاتێ لەپەنای زاتێکی خاوەن توانا و بەهێزدا بوو کە خوایە، کەچی ئەو دەیفەرموو: ئەگەر لەبەرامبەر ئێوەوە هیزێکم دەبوو دەمزانی چیم دەکرد، وە یان پەنایەکی خاوەن دەسەلاّت و لێهاتووم دەستدەکەوت و بەرگری لێ دەکردم، ئەوسا ئێوە نەتان دەتوانی بەو شێوەیە بێنە سەر میوانەکانم، (**قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ**). سورة هود: ٨٠. لەپاش پێغەمبەر (لوط) خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە لە چلەپۆپەی خانەدانی قەومەکەی ئەو نەبووبێ).

هِمَّةٌ إِلاَّ أَنْ أَسْمَعَ مِنْ سُفْيَانَ يَذْكُرُ فِي هَذَا الحَدِيثِ الخَبَرَ حَتَّى سَمِعْتُهُ يَقُولُ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، وَقَدْ كُنْتُ سَمِعْتُ هَذَا مِنْ سُفْيَانَ مِنْ قَبْلِ ذَلِكَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ الخَبَرَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم بە ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ: نەوفی بەکالی پێی وایە موسای بەنی ئیسرائیل ئەو موسایە نیە کە خوای گەورە بەسەرهاتەکەی لەگەڵ (خضر) — لە سورەتی (الکهف)دا - باس دەکات، ئیبنو عەباس فەرمووی: درۆدەکات دوژمنی خوا، بیستم لە ئوبەی کوڕی کەعب ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆ خۆم گویم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (جارێ موسا هەستا وتاری دەخوێندەوە بۆ نەوەی ئیسرائیل، یەکێ پرسیاری لێ کرا: چ کەسێ زاناترین کەسە؟ فەرمووی: من، خوای گەورە گلەیی لێ کرد لەبەرئەوەی حەواڵەی نەکرد بە زانیاری خودا، وەحی بۆ نارد، کە بێگومان یەکێ لە بەندە کانم لەتۆ شارەزاترە، ئێستا ئەوەتا لەو شوێنەی کە دوو دەریاکە یەکدەگرن، موسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! جا چۆن پێی بگەم؟ خوای گەورە پێی فەرموو: ماسیەك ببرژێنە لەگەڵ خۆت ببە لە زەمیلەیەکدا لەکوێ ونت کرد ئەو بەندە لەوێدایە، لەپاشدا موسا لەگەڵ گەنجێکا کە یوشەعی کوڕی نون بوو بە ماسیە برژاوەکەوە ڕۆشتن بەرەو ئەو شوێنە، هەتا گەیشتنە تاوێرە بەردەکەی قەراخ دەریاکە، لەوێ لێی ڕاکشان ماسیەکە لە زەمیلەکەدا ڕاپەڕی هاتەدەرەوە و کەوتە ناو دەریاکەوە، بەناو ئاوی دەریاکەدا خەندەکێکی بۆ خۆی دروست کردوو ڕێگەی خۆی گرتەبەر و کەوتەڕێ، خوای گەورە شڵپاوی ئاوەکەی کە بە ڕۆشتنی ماسیەکە شەق دەبوو کرد وەك تاقی سەر دەرگاو پەنجەرە کرد بە کون و خەندەك لەژێر ئاوەکەوە، بۆ موساو گەنجەکەی لەگەڵی بوو شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو، جا ماوەی ئەو ڕۆژەو شەوێکی تەواو هەتا بەیانی دەڕۆن، هاوەڵەکەی ڕێکەی موسا بیری نابێ هەواڵەکە رابگەیەنێ بە موسا، کاتێ ڕۆژ بوویەوە موسا فەرمووی: **(قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا**

**غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا)**. سورة الكهف: ٦٢. واتە: موسا بە هاوەڵەکەی فەرموو: ئادەی خواردنەکەمان بۆ بهێنە بەڕاستی لەم سەفەرەماندا زۆر هیلاك و ماندوو بووین. فەرمووی: (هەتا لەو شوێنە تێپەڕیان نەکرد کە خودا کردبووی بە نیشانە بۆی هەستی بە شکەتی و ماندووبوون نەکرد)، **(قَالَ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا)**. سورة الكهف: ٦٣. واتە: لاوەکە وتی: ئەگەر لەبیرت بێ کاتێ چووینە سەر بەردەکە بۆ حەوانەوە من بیرم چوو باسی ماسیەکەت بۆ بکەم، کەسیش لەبیری نەبردمەوە کە بۆت باس بکەم شەیتان نەبێت، بەڕاستی ئەو ماسیە زیندووبووە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر خۆی کرد بەناو دەریادا، موسا فەرمووی: **(ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا)**. سورة الكهف: ٦٤. واتە: هەر ئەوە بوو کە ئێمە دەمانویست و بۆی دەگەڕێین، ئیتر بە ناچاری گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە بەجێیان هێشتبوو، سوفیان دەڵێ: خەڵك پێیان وایە لەبن ئەو بەردەدا ئاوی ژیانەوە هەیە کە بەناوبانگە بە ئاوی حەیات، بەر هەر مردوویەك بکەوێ زیندوو دەبێتەوە. فەرمووی: ماسیەکە لە دڵۆپەی ئەو ئاوەی بەرکەوت زیندووبوویەوە، فەرمووی: بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە هەتا گەیشتنەوە بە بەردە گەورەکە، پیاوێکیان دی بە پۆشاکێ خۆی داپۆشی بوو، موسا سەلامی لێ کرد، فەمووی: لەکوێ لە وڵاتی ئێوە سڵاوی لەم شێوەیە هەیە، فەرمووی: من موسام، ئەویش فەرمووی: موسای نەوەی ئیسرائیل؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی موسا تۆ خوا زانست و زانیاریەکی فێرکردوویت من نایزانم، منیش خوا هەروەها خوا زانست و زانیاریەکی فێرکردووم تۆ نایزانی، موسا فەرمووی: **(هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا قَالَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا قَالَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلاَ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا)**. سورة الكهف: ٦٦- ٦٩. واتە: ئاخۆ مۆڵەتم دەدەی شوێنت بکەوم؟ تا لەو زانستەی لەلایەن پەروەردگارتەوە فێرکراویت،

منیش فێربکەیت و نیشانمی بدەیت، بەڵکو کەڵکی لێ وەرگرم لە کاروباردا. ئەویش بە موسای فەرموو: **(فَإِنْ اتَّبَعْتَنِي فَلاَ تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا)**. سورة الكهف: ٧٠. واتە: جا ئەگەر شوێنم کەوتی ئەوە دەربارەی هیچ شتێك پرسیارم لێ مەکە هەتا خۆم لە نهێنیەکەی ئاگادارت نەکەم. موسا فەرمووی: باشە، جا هەردووکیان بە کەنار دەریاکەدا کەوتنەڕێ هەتا پاپۆڕێ هات قسەیان لەتەکدا کردن تا هەڵیان بگرن، پیاوە چاکەکەیان دەناسی بە خۆڕایی هەڵیان گرتن، موسا سەیری کرد تەختەیە لە تەختەکانی پاپۆڕەکەی هەڵکەند، موسا پێی فەرموو: ئەوە چیت کرد لای خۆی ئەمانە بە خۆڕایی ئێمەیان هەڵگرت کەچی تۆ پاپۆڕەکەیان کون تێ دەکەیت: **(لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا قَالَ لاَ تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلاَ تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا)**. سورة الكهف: ٧١ - ٧٣. واتە: دەتەوێ هەرچی سەرنشینەکانی هەیە نوقمی بکەیت، سوێند بە خوا بەڕاستی کارێکی ناشایستەی گەورەت کرد. جا لە پاپۆڕەکە هاتنەدەرەوە و بە کەناری دەریاکەدا کەوتنەڕێ، چاوی کەوت بە کوڕێکی منداڵکار لەناو منداڵاندا یاری دەکرد، سەری گرت و ملی لەجەستەی کردەوە و کوشتی، موسا پێی فەرموو: **(أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا)** . سورة الكهف: ٧٤ - ٧٥. واتە: ئەوە بۆچی کەسێکی بێ گوناهت کوشت بێ ئەوەی ئەو تاوانێکی وای کردبێ شایستەی کوشتن بێ، سوێند بە خوا بەڕاستی کارێکی ناپەسەند و ناڕەوات ئەنجامدا. ڕەددی ئەمجارەی توندتر بوو لە جاری یەکەم، موسا فەرمووی: **(قَالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلاَ تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْرًا فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ)**. سورة الكهف: ٧٦ - ٧٧. واتە: ئەگەر دوای ئەمە پرسیاری هەر شتێکی ترم لێ کردی، ئەوە هاوڕێیەتیم مەکە، بەڕاستی بەڕای من ئەوە مافی خۆتە لەلایەن منەوە لێ

بوردراویت، پاشـان دەرچـوون و رۆشـتن هـەتا گەیشـتنە نـاو خـەڵكی شارۆچـكەیەك داوای خۆراكیان لە خەڵكەكە كرد، كەچی دەستیان نا بەڕویانەوە و میوانداریان لـێ نەكردن، دیوارێكیان بەدی كـرد خـەریك بـوو دەڕوخـا، زاناكـە دیـوارە روخاوەكـەی هەڵچنیەوە و چاكی كردەوە و بـەرزی كـردەوە، موسـا فـەرمووی: ئەوانـە قـەومێك بوون دەستیان نا بەڕومانەوە و میوانداریان لێ نەكردین و خۆراكیـان نـەداینێ: (**لَـوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا**). واتە: ئەگەر بتویسـتایە ئـەوە كرێیـەكت بەرامبـەر بـەم كارە وەردەگرت (دەماندا بە خۆراك و پێی تێر دەبووین، زاناكەش فـەرمووی: (**قَـالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا**) . سورة الكهف: ٧٧-٧٨. ئیتر ئالێرە بەدواوە جیابوونەوەی نێوان من و تۆیە، من تـۆ ئاگـادار دەكـەم لـە حەقیقەت و سەرەنجامی ئەو شتانەی كە نەتتوانی ئارامبگری لـە بەرامبەریانـەوە).
پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم فـەرمووی: (رەحمـەتی خـوا لـە موسـا بـێ خۆزگە زیاتر ئارامی بگرتایە هەتا خوای گەورە بەسـەرهاتی زیـاتری هـەردووكیانی باس بكردایە بۆمان). فەرمووی: هەروەها پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرمووی: (ئەم جاری یەكەمەیان موسا لەیادی نەبوو). فەرمووی: چۆلەكەیە هـات لەسەر لێواری پاپۆڕەكە نیشتەوە و دەنوكێكی ژەنـد بـە ئـاوی دەریاكـەدا، (خضـر) پێی فەرموو: زانیاری من و تۆ لەچاو زانیاری خـوای گـەورەدا وەك دەنـوك ژەنـدنی ئەو چۆلەكە وایە بە ئاوی دەریاكەدا.

٣١٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْجَبَّارِ بْنُ الْعَبَّاسِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْغُلَامُ الَّذِي قَتَلَهُ الْخَضِرُ طُبِعَ يَوْمَ طُبِعَ كَافِرًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتــە: لــە ئوبــەی کــوڕی کەعبــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویــەتی: (ئــەو منداڵــەی کە (خضـر) کوشتی ئـەو ڕۆژەی کـە خـوای گـەورە دروسـتی کـردو مـۆری پێـدانا، بەکافری دروستی کردو مۆری پێدانا - ئەگـەر بـژیایا ئەوەنـدە خراپـەکاری دەکـرد باوك و دایکیشی گومڕاو کافر و بێ باوەڕ دەکرد - ).

٣١٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا سُمِّيَ الْخَضِرَ لأَنَّهُ جَلَسَ عَلَى فَرْوَةٍ بَيْضَاءَ فَاهْتَزَّتْ تَحْتَهُ خَضْرَاءَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆیە ناو نـراوە (خضـر) کـاتێ دادەنیشت لەسەر زەوی سافی سپی گیای لێ دەڕواو سەوز دەبوو).

٣١٥٢ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ فُضَيْلٍ الجَزَرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا صَفْوَانُ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ يُوسُفَ الصَّنْعَانِيِّ، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: (وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا) قَالَ: ذَهَبٌ وَفِضَّةٌ. حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَفْوَانُ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ يُوسُفَ الصَّنْعَانِيِّ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، عَنْ مَكْحُولٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ.

واتە: لـە ئـەبو دەردائـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((**وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا**) لەژێر كەلاوە و دیوارە روخاوەكەدا ئاڵتون و زیو هەبوو).

٣١٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ الْمَعْنَى وَاحِدٌ وَاللَّفْظُ لِابْنِ بَشَّارٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي السَّدِّ قَالَ: يَحْفِرُونَهُ كُلَّ يَوْمٍ، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَخْرِقُونَهُ قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا فَسَتَخْرِقُونَهُ غَدًا، فَيُعِيدُهُ اللَّهُ كَأَشَدِّ مَا كَانَ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ مُدَّتَهُمْ وَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَهُمْ عَلَى النَّاسِ. قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا فَسَتَخْرِقُونَهُ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ وَاسْتَثْنَى، قَالَ: فَيَرْجِعُونَ فَيَجِدُونَهُ كَهَيْئَتِهِ حِينَ تَرَكُوهُ فَيَخْرِقُونَهُ، فَيَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ، فَيَسْتَقُونَ الْمِيَاهَ، وَيَفِرُّ النَّاسُ مِنْهُمْ، فَيَرْمُونَ بِسِهَامِهِمْ فِي السَّمَاءِ فَتَرْجِعُ مُخَضَّبَةً بِالدِّمَاءِ، فَيَقُولُونَ: قَهَرْنَا مَنْ فِي الأَرْضِ وَعَلَوْنَا مَنْ فِي السَّمَاءِ، قَسْوَةً وَعُلُوًّا، فَيَبْعَثُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ نَغَفًا فِي أَقْفَائِهِمْ فَيَهْلِكُونَ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّ دَوَابَّ الأَرْضِ تَسْمَنُ وَتَبْطَرُ وَتَشْكَرُ شَكَرًا مِنْ لُحُومِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِثْلَ هَذَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی بەربەستەكە فەرموویەتی: (هەموو رۆژێ هەوڵیان دەدا بەربەستەكە كون بكەن هەتا ئەوەندەیان نەدەما كوناودەری بكەن، سەركارەكەیان دەڵێ: بگەڕێنەوە ئەوەندەی نەماوە سبەینێ كونی دەكەین، بۆ رۆژی دواتر خوای گەورە ئەو بەربەستە لە جاران مەحكەمتر و قایم تر دەكاتەوە، ئەم حاڵە هەروا بەردەوام دەبێ هەتا ئەو كاتەی خوای گەورە دەیەوێ بەرەڵایان بكاتە گیانی ئەو خەڵكەی لەودیو بەربەستەكەوەن، ئەو كاتە سەركارەكەیان دەڵێ: بگەڕێنەوە ئەوەندەی نەماوە سبەینێ كونی دەكەین ئەگەر خوا بیەوێ و حەز

دەکات، بۆ سبەینیێ کە دێنەوە سەیر دەکەن چۆن بە جێیان هێشتووە وەك خۆی ماوەتەوە، جا بەربەستەکە کون دەکەن و پەلاماری خەڵکەکە دەدەن، ئاوی سەرزەوی دەخۆن، خەڵك لەترسان هەڵدێن، تیر دەنێن بە ئاسمانەوە، تیرەکان خوێناوی دەبن و دەکەونە خوارەوە، ئیتر دەڵێن: بە زەبروزەنگ بە زۆری زۆرداری هەرچی لەسەر زەویدا بوو کپمان کردن و لەناومان بردن، هەرچیش لە ئاسمان بوو بەزاندمان و سەرکەوتین بەسەریاندا، خوای گەورە کرمێکیان بۆ دەنێرێ دادەتە ملیان و لەناویان دەبات، سوێند بەوەی نەفسی موحەممەدی بەدەستە هەرچی دەعباو جانەوەری سەرزەوی هەیە لە گۆشتی ئەوانە تێر دەبن و قەڵەو دەبن و چالاك دەبن.

٣١٥٤ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ الْبُرْسَانِيُّ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنِ ابْنِ مِينَاءَ، عَنْ أَبِي سَعْدِ بْنِ أَبِي فَضَالَةَ الأَنْصَارِيِّ، وَكَانَ مِنَ الصَّحَابَةِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِذَا جَمَعَ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ القِيَامَةِ لِيَوْمٍ لاَ رَيْبَ فِيهِ، نَادَى مُنَادٍ: مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ لِلَّهِ أَحَدًا فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللهِ فَإِنَّ اللَّهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ بَكْرٍ.

واتە: لە ئەبی سەعدی کوڕی ئەبی (فضالة)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەتدا کاتێ خوای گەورە سەرجەم خەڵکانی سەرەتاو کۆتایی کۆدەکاتەوە بۆئەوەی پاداشتیان بداتەوە، ئەو ڕۆژەش هیچ شك و گومانێکی تێدا نیە، جارچیە جاڕ دەدات: هەرکەسێ لەو کردەوەیەی کە کردوویەتی کەسێکی تری کردووە بە هاوبەشی خوا، با داوای پاداشتەکەی لە غەیری خوا بکات، بێگومان خوای گەوە زۆر بێنیازترە لەوەی هاوبەشی هەبێت).

دەربارەی سورەتی (مریم).

## ٢٠ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ مَرْيَمَ

٣١٥٥ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ: حَدَّثَنَا ابْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى نَجْرَانَ، فَقَالُوا لِي: أَلَسْتُمْ تَقْرَءُونَ: (يَا أُخْتَ هَارُونَ) وَقَدْ كَانَ بَيْنَ عِيسَى وَمُوسَى مَا كَانَ، فَلَمْ أَدْرِ مَا أُجِيبُهُمْ. فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: أَلاَ أَخْبَرْتَهُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُسَمُّونَ بِأَنْبِيَائِهِمْ وَالصَّالِحِينَ قَبْلَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ إِدْرِيسَ.

واتــە: لــە مــوغیرەی کــوڕی شــوعبەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردمی بۆ نەجران، گاورەکـانی نەجران ڕەخنەیان گرت و پێیان وتم: ئایا ئێوە ئەم ئایەتە ناخوێننەوە کە بە مەریـەم دەفەرمووێت: **(يَا أُخْتَ هَارُونَ)**. سورة مريم: ٢٨. واتــە: ئــەی خوشـکی هـارون - لــە پاکیدا لە هاروون دەچـیت - ، دەی ئەگـەر بـەپێی ئـەم ئایەتـەبێ دەبـێ مەریـەم و هارونی برای موسا براو خوشـك بـن، لەکاتێکـدا موسـاو عیسـای کـوڕی مەریـەك سەردەمیان زۆر لەیەکەوە دوورەو ئەوەندە ساڵ بەینیان هەیە، منیش نەمزانی چۆن وەڵامیان بدەمەوە، هەتا گەڕامەوە بۆ خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاند، ئەویش فەرمووی: (بۆچـی پێـت ڕانەگەیانـدن ئەوانـە ناوی پێغەمبەران و پیاوچاکانی پێش خۆیان لەخۆیان دەنا).

٣١٥٦ - (صحيح دون قوله: (فلو أن الله.....) ) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ أَبُو الْمُغِيرَةِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الحَسْرَةِ) قَالَ: يُؤْتَى بِالمَوْتِ كَأَنَّهُ كَبْشٌ أَمْلَحُ حَتَّى يُوقَفَ عَلَى السُّورِ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقَالُ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ فَيَشْرَئِبُّونَ، وَيُقَالُ: يَا أَهْلَ النَّارِ فَيَشْرَئِبُّونَ، فَيُقَالُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، هَذَا الْمَوْتُ، فَيُضْجَعُ فَيُذْبَحُ، فَلَوْلاَ أَنَّ اللَّهَ قَضَى لأَهْلِ الجَنَّةِ الحَيَاةَ وَالبَقَاءَ، لَمَاتُوا فَرَحًا، وَلَوْلاَ أَنَّ اللَّهَ قَضَى لأَهْلِ النَّارِ الحَيَاةَ فِيهَا وَالبَقَاءَ، لَمَاتُوا تَرَحًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئـەبی سـەعیدی خودریـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: **(وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الحَسْرَةِ)** سورة مريم: ٣٩. واتـە: سـتەمکاران ئاگـادار بکـە لـەڕۆژی ئـاهو ناڵەو پەشیمانی.

فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتـدا مـردن دێـنن لەشـێوەی بـەرانێکی سـپی دا هـەتا لەسەر شورەی نێوان بەهەشت و دۆزەخ رایدەگرن، دەوترێ: ئەی خەڵکی بەهەشـت و سەر بەرزدەکەنەوە و گوێ ڕادێرن، دەوتـرێ: ئـەی خـەڵکی دۆزەخ سـەرزدەکەنەوە و گوێ ڕادێرن، دەوترێ: ئەمە دەناسـن؟ دەڵـێن: بـەڵێ، ئـەوە مردنـە، پـاڵ دەخـرێ و سـەردەبڕدرێت، ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە کـە خـوا بڕیاریـداوە ژیـان و مـانی بەهەشـتیەکان لـە بەهەشـتدا هـەتا هەتاییـە ئـەوا لـەخۆش و شـادیدا دەمـردن، هەروەها ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خوا بڕیاریداوە ژیان و مانی دۆزەخیەکان لە دۆزەخدا هەتا هەتاییە ئەوا لەداخ و خەفەتدا شەقیان دەبرد و دەمردن).

٣١٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ قَتَادَةَ، فِي قَوْلِهِ: (وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا)، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَمَّا عُرِجَ بِي رَأَيْتُ إِدْرِيسَ فِي السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، وَهَمَّامٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثَ الْمِعْرَاجِ بِطُولِهِ، وَهَذَا عِنْدِي مُخْتَصَرٌ مِنْ ذَاكَ.

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا)**. فەرموویەتی: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە شەوڕەوییان پێ کردم لە ئاسمانی چوارەم چاوم کەوت بە ئیدریس سەلامی خوای لەسەر بێ).

٣١٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْلَى بْنُ عُبَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ ذَرٍّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِجِبْرِيلَ: مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا؟ قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا) إِلَى آخِرِ الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عُمَرَ بْنِ ذَرٍّ، نَحْوَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە جبریلی فەرموو: (چی ڕێگری ئەوەی لێ کردووی کە زیاتر سەردانمان بکەیت؟). فەرمووی: جا ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا)**.

سورة مريم: ٦٤. واتە: ئێمە بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ دانابەزین، هەرچی داهاتوو رابردوومان هەیە و ئەوەش لەنێوانیاندا هەیە بۆ ئەو پەروەردگارەیە، وە نەبێت پەروەردگارەی تۆ هیچ شتێ فەرامۆش بکات).

٣١٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ السُّدِّيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ مُرَّةَ الهَمْدَانِيَّ، عَنْ قَوْلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا) فَحَدَّثَنِي أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ، حَدَّثَهُمْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ ثُمَّ يَصْدُرُونَ مِنْهَا بِأَعْمَالِهِمْ، فَأَوَّلُهُمْ كَلَمْحِ البَرْقِ، ثُمَّ كَالرِّيحِ، ثُمَّ كَحُضْرِ الفَرَسِ، ثُمَّ كَالرَّاكِبِ فِي رَحْلِهِ، ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ، ثُمَّ كَمَشْيِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَرَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنِ السُّدِّيِّ فَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە سەدییەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا)**. سورة مريم: ٧١. واتە: ئەی خەڵکینە! ئیللا دەبێ هەموو نزیکی ئاگری دۆزەخ ببنەوە و بەسەر پردەکەی سیراتدا تێپەڕن، پرسیارم کرد لە موڕەی هەمەدانی، ئەم فەرموودەی لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ بۆ گێڕامەوە فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵك هەموو نزیکی ئاگری دۆزەخ دەبنەوەو بەسەر پردەکەی سیراتدا دەپەڕنەوە، لەپاشدا بەپێی کردەوەکانیان رزگاریان دەبێ، یەکەمەکانیان وەك بروسکە دەپەڕنەوە، لەپاشدا هەیانە وەك با بە خێرایی، ئینجا هەیانە وەك سواری ئەسپ لەتاوی غاردا، جا هەیانە وەك سوار بە ڕەوت و نەرمەغار، پاشان هەیانە وەك کەسێ بە هەڕاکردن، ئینجا هەیانە وەك کەسی پیادە بە ڕۆشتنی ئاسایی).

٣١٦٠ - (صحيح موقوف وهو في حكم المرفوع) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا) قَالَ: يَرِدُونَهَا ثُمَّ يَصْدُرُونَ بِأَعْمَالِهِمْ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ السُّدِّيِّ، بِمِثْلِهِ، قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، قُلْتُ لِشُعْبَةَ: إِنَّ إِسْرَائِيلَ، حَدَّثَنِي عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ شُعْبَةُ: وَقَدْ سَمِعْتُهُ مِنَ السُّدِّيِّ مَرْفُوعًا وَلَكِنِّي أَدَعُهُ عَمْدًا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا)**. فەرموویەتی: (خەڵك هەموو نزیکی ئاگری دۆزەخ دەبنەوەو بەسەر پردەکەی سیراتدا دەپەڕنەوە، لەپاشدا بەپێی کردەوەکانیان ڕزگاریان دەبێ).

٣١٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ: إِنِّي قَدْ أَحْبَبْتُ فُلاَنًا فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ، ثُمَّ تَنْزِلُ لَهُ الْمَحَبَّةُ فِي أَهْلِ الأَرْضِ، فَذَلِكَ قَوْلُ اللهِ: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا)، وَإِذَا أَبْغَضَ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ: إِنِّي قَدْ أَبْغَضْتُ فُلاَنًا، فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ ثُمَّ تَنْزِلُ لَهُ البَغْضَاءُ فِي الأَرْضِ.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە بەندەیەکی خۆشویست جبریل بانگ دەکات، دەفەرموێت: بێگومان من فلانە کەسم خۆشدەوێ تۆش

خۆشت بوێت)، فەرمووی: (جا جبریل ئەو بەندەی خۆشدەوێ و لە ئاسماندا جارِ دەدات و دەڵێ: خوای گەورە فلانە کەسی خۆشدەوێ، ئەوکاتە خەڵکی سەر زەویش خۆشیان دەوێ)، ئەمەش دەقی ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە: **(إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا)**. سورة مريم: ٩٦. واتە: بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامدا خوای میهرەبان دەیانکاتە خۆشەویست و خۆشەویستیان دەخاتە دڵی بەندەکانی خۆیەوە تا گشت خۆشیان بوێ.

کاتێ خوای گەورە رقی لە بەندەیەك بێ جبریل بانگ دەکات، دەفەرموێت: بێگومان من رقم لە فلانە کەسە، جا جبریل رقی لەو بەندەیە دەبێ، لە ئاسماندا جارِ دەدات و دەڵێ: خوای گەورە رقی لە فلانە کەسە، ئەوکاتە خەڵکی سەر زەویش رقیان لێی دەبێ).

٣١٦٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: سَمِعْتُ خَبَّابَ بْنَ الأَرَتِّ، يَقُولُ: جِئْتُ العَاصَ بْنَ وَائِلٍ السَّهْمِيَّ أَتَقَاضَاهُ حَقًّا لِي عِنْدَهُ، فَقَالَ: لاَ أُعْطِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ فَقُلْتُ: لاَ، حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ، قَالَ: وَإِنِّي لَمَيِّتٌ ثُمَّ مَبْعُوثٌ فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ: إِنَّ لِي هُنَاكَ مَالاً وَوَلَدًا فَأَقْضِيكَ. فَنَزَلَتْ: (أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالاً وَوَلَدًا) الآيَةَ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە مەسروقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە خەبابی کوڕی ئەرەت بوو رەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: هەقێکم لەلای عاصی کوڕی وائیل بوو چووم بۆی، وتی: هەقەکەت نادەمێ هەتا بێ باوەڕ نەبی بە موحەممەد و لێی پاشگەزنەبیتەوە، وتم: نا هەرگیز، نە بە زیندویی و نە بە مردوویش، من

دەمرم و زیندویش دەبمەوە، عاصی کوڕی وائیل وتی: منیش دەمرم و زیندویش دەبمەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: دەی ئەوکاتە ماڵ و سامان و منداڵێکی زۆرم دەبێ و هەقەکەی تۆ دەدەمەوە، جا ئەم ئایەتە دابەزی: **(أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالاً وَوَلَداً)**. سورة مريم: ٧٧. واتە: ئایا ئەو کەسانەت دی کە ئینکاری ئایەتەکانی ئێمەیان دەکرد، گوتیشی: من لەڕۆژی قیامەتدا ماڵ و سامان و منداڵێکی زۆرم دەدرێتێ.

### دەربارەی سورەتی (طه).

### ٢١ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ طه

٣١٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا صَالِحُ بْنُ أَبِي الأَخْضَرِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: لَمَّا قَفَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ خَيْبَرَ أَسْرَى لَيْلَةً حَتَّى أَدْرَكَهُ الكَرَى أَنَاخَ فَعَرَّسَ، ثُمَّ قَالَ: يَا بِلاَلُ اكْلأْ لَنَا اللَّيْلَةَ، قَالَ: فَصَلَّى بِلاَلٌ، ثُمَّ تَسَانَدَ إِلَى رَاحِلَتِهِ مُسْتَقْبِلَ الفَجْرِ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ فَنَامَ، فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ أَحَدٌ مِنْهُمْ، وَكَانَ أَوَّلَهُمْ اسْتِيقَاظًا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: أَيْ بِلاَلُ، فَقَالَ بِلاَلٌ: بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ، أَخَذَ بِنَفْسِي الَّذِي أَخَذَ بِنَفْسِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْتَادُوا، ثُمَّ أَنَاخَ فَتَوَضَّأَ فَأَقَامَ الصَّلاَةَ. ثُمَّ صَلَّى مِثْلَ صَلاَتِهِ لِلْوَقْتِ فِي تَمَكُّثٍ، ثُمَّ قَالَ: (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِي). هَذَا حَدِيثٌ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الحُفَّاظِ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَصَالِحُ بْنُ أَبِي الأَخْضَرِ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ، ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ وَغَيْرُهُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتیّ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە غەزای خەیبەر گەڕایەوە بەشەو رێیان دەكرد هەتا خەو زۆری بۆهێناو خەودەیبردنەوە لەكۆتایی شەودا لایاندا بۆ حەوانەوە و خەوتن، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی بیلال! ئەمشەو تۆ ئاگاداربە نەخەوی بۆئەوەی نوێژی بەیانیمان نەڕوات)، فەرمووی: جا بیلال نوێژ دەكات و پاڵ دەدات بە وڵاخەكەیەوە ڕوو بە كەنارەی ئاسمان ئەو شوێنەی كە لەوێوە دەردەكەوێ بەیان دەدات چاودێری دەكات بزانیّ كەی كاتی نوێژی بەیانیە، ئەویش خەو زۆری بۆدێنیّ و خەوی لیّ دەكەوێت، هیچ كام لەوان خەبەری نابێتەوە بۆ نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەكەم كەس خەبەری دەبێتەوەو هەڵەسیّ لەخەو دەفەرمووێت: (ئەی بیلال)، بیلال وتی: دایك و باوكم بە فیدات بیّ، منیش وەك ئێوە خەو زۆری بۆهێنام خەوتم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وڵاخەكانتان لێخوڕن و لەم شوێنە بگوێزنەوە)، لەپاشدا وشترەكانیان یخ داو دەستنوێژی گرت و فەرمانی دا قامەتكرا بۆ نوێژی بەیانی و بە كۆمەڵ نوێژیان كرد، لەپاشدا فەرمووی: **(وَأَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِي)**. سورة طه: ١٤. واتە: نوێژەكانت بەچاكی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لەیاد بیّ.

**دەربارەی تەفسیری سورەتی (الأنبياء).**

**٢٢ – بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الأَنْبِيَاءِ**

٣١٦٤ – (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الوَيْلُ وَادٍ فِي جَهَنَّمَ يَهْوِي فِيهِ الكَافِرُ أَرْبَعِينَ خَرِيفًا قَبْلَ أَنْ يَبْلُغَ قَعْرَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (وەیل شیوێکە لە دۆزەخدایە کافر فڕێ دەدەنە ناوی بە حەفتا ساڵ ناگاتە بنی).

٣١٦٥ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مُجَاهِدُ بْنُ مُوسَى البَغْدَادِيُّ، وَالفَضْلُ بْنُ سَهْلٍ الأَعْرَجُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ غَزْوَانَ أَبُو نُوحٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا لَيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَجُلاً قَعَدَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي مَمْلُوكِينَ يُكَذِّبُونَنِي وَيَخُونُونَنِي وَيَعْصُونَنِي، وَأَشْتُمُهُمْ وَأَضْرِبُهُمْ فَكَيْفَ أَنَا مِنْهُمْ؟ قَالَ: يُحْسَبُ مَا خَانُوكَ وَعَصَوْكَ وَكَذَّبُوكَ وَعِقَابُكَ إِيَّاهُمْ، فَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِمْ كَانَ كَفَافًا، لاَ لَكَ وَلاَ عَلَيْكَ، وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ دُونَ ذُنُوبِهِمْ كَانَ فَضْلاً لَكَ، وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ فَوْقَ ذُنُوبِهِمْ اقْتُصَّ لَهُمْ مِنْكَ الفَضْلُ. قَالَ: فَتَنَحَّى الرَّجُلُ فَجَعَلَ يَبْكِي وَيَهْتِفُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا تَقْرَأُ كِتَابَ اللهِ (وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ القِسْطَ لِيَوْمِ القِيَامَةِ فَلاَ تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ) الآيَةَ. فَقَالَ الرَّجُلُ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَهُمْ شَيْئًا خَيْرًا مِنْ مُفَارَقَتِهِمْ، أُشْهِدُكَ أَنَّهُمْ أَحْرَارٌ كُلُّهُمْ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَزْوَانَ وَقَدْ رَوَى أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَزْوَانَ، هَذَا الحَدِيثَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ لەبەرەم پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دانیشت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! دوو خزمەتکارم هەن بەدرۆم دەخەنەوە و ناپاکیم لێ دەکەن و لێم یاخی دەبن، منیش جنێویان پێ دەدەم و لێیان دەدەم حوکمی من و ئەوان چۆنە؟ فەرمووی: (بەگوێرەی ناپاکی و یاخی بوون و بەدرۆخستنەوەیان بۆت هەیە

سزایان بدەی، ئەگەر بەو پێی تاوانەكە بوو ئەوە سەر بەسەرە، ئەگەر سزاكەت كەمتر بوو بۆیان ئەوە فەزڵ و چاكەیە بۆ تۆ، خۆ ئەگەر سزاكەت زیاتر بوو لە تاوانەكانیان ئەوا تۆڵەی ئەوان لەتۆ دەكرێتەوە). فەرمووی: پیاوەكە چووە ئەولاتر دەستی گریان و هاوار، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەگەر تۆ ئەم ئایەتەت نەخوێندۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا: **(وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ)**. سورة الانبیاء: ٤٧. واتە: ئێمە پێوەر و تەرازووەكانی دادپەروەری لەرۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا هیچ كەس بە هیچ شێوەیە ستەمی لێ ناكرێت، ئەگەر بە قەدەر تۆوە خەرتەلەیەك (كە زۆر بچوك و وردە كارێكی چاك یان خراپی ئەنجام دابێ) دەیهێنینەوە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە كە ئاوا بەوردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین.

پیاوەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! سوێند بە (الله) ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من هیچ شتێ شك نابەم چاكتر بێ بۆیان جگە لە ئازادكردنیان، تۆ بە شایەت بە ئەوا ئازادم كردن.

٣١٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى الأُمَوِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ: قَوْلِهِ: (إِنِّي سَقِيمٌ) وَلَمْ يَكُنْ سَقِيمًا، وَقَوْلُهُ: لِسَارَّةَ أُخْتِي، وَقَوْلِهِ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئیبراهیم سەلامی خوای

لەسەربێ هەرگیز درۆی نەکردووە جگە لە سێ جار: فەرمووی: من نەخۆشم، نەخۆش نەبوو، فەرمووی: سارا خاتوون خوشکمە لەکاتێکدا کە هاوسەری بوو، فەرمووی: بتە گەورەکە ئەم بتانەی شکاندووە).

٣١٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَوَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، وَأَبُو دَاوُدَ، قَالُوا: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَوْعِظَةِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إِلَى اللهِ عُرَاةً غُرْلاً، ثُمَّ قَرَأَ (كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. قَالَ: أَوَّلُ مَنْ يُكْسَى يَوْمَ القِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ، وَإِنَّهُ سَيُؤْتَى بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ، فَأَقُولُ: رَبِّ أَصْحَابِي، فَيُقَالُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ كَمَا قَالَ العَبْدُ الصَّالِحُ: (وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنْتَ أَنْتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَيُقَالُ: هَؤُلاَءِ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ، نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ، نَحْوَهُ. كَأَنَّهُ تَأَوَّلَهُ عَلَى أَهْلِ الرِّدَّةِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا ئامۆژگاری کردین فەرمووی: (خەڵك لە رۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوە بەپێی پەتی و، بەرووتی و خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن)، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ)** سورة الأنبياء: ١٠٤. واتە: پاشان سەرلەنوێ بەدی دەهێنینەوە، بەڵێنێکەو جێبەجێی دەکەین.

فەرمووی: یەکەمین کەس لەڕۆژی قیامەتدا پۆشاکی لەبەردەکرێت ئیبراهیمە سەلامی خوای لەسەر بێ، خەلکانێ لە ئوممەتی من دەهێنرێن بەرەو لای چەپ پەلکێش دەکرێن واتە بەرەو دۆزەخ، منیش دەڵێم: پەروەردگارا هاوەڵەکانم، دەوترێت: تۆ نازانی لەدوای تۆ چیان کردووەو چیان داهێناوە، منیش وەك بەندە چاك و خوناسەکە دەڵێم: (**وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنْتَ أَنْتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ**). سورة المائدة: ١١٧. واتە: پێم وتون: کە تەنها هەر (الله) بپەرستن، کە پەروەردگاری من و ئێوەیە هەتا لە ناویشیاندا بوم ئاگاداریان بووم کە مردیشم بەفەرمانی خۆت، ئیتر تۆ بۆ خۆت چاودێرو ئاگاداریان بوویت، دیاریشە کە تۆ بۆخۆت بەسەر هەمووشتێکا بە ئاگای، ئێستایش ئەگەر تۆ سزایان بدەیت، بێگومانە کە بەندەی خۆتن و، کەسیش بۆی نییە هیچ بلێت، ئەگەر لێشیان ببوریت، ئەوە خۆت چاك دەزانی و، بۆ خۆشت دەسەڵاتدارو کارجوانی.

جا دەوترێت: ئەوانە هەرکە تۆ وەفاتت کردو لێیان جیابیتەوە پاشگەزبوونەوە لەدین.

### دەربارەی سورەتی (الحج).

### ٢٣ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الحَجِّ

٣١٦٨ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ جُدْعَانَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا نَزَلَتْ (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ)، إِلَى قَوْلِهِ: (وَلَكِنَّ

عَذَابَ اللهِ شَدِيدٌ)، قَالَ: أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ وَهُوَ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ: أَتَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ ذَلِكَ؟ فَقَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ذَلِكَ يَوْمَ يَقُولُ اللَّهُ لِآدَمَ: ابْعَثْ بَعْثَ النَّارِ، فَقَالَ: يَا رَبِّ وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: تِسْعُ مِائَةٍ وَتِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ إِلَى النَّارِ وَوَاحِدٌ إِلَى الجَنَّةِ، قَالَ: فَأَنْشَأَ الْمُسْلِمُونَ يَبْكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، فَإِنَّهَا لَمْ تَكُنْ نُبُوَّةٌ قَطُّ إِلاَّ كَانَ بَيْنَ يَدَيْهَا جَاهِلِيَّةٌ، قَالَ: فَيُؤْخَذُ العَدَدُ مِنَ الجَاهِلِيَّةِ فَإِنْ تَمَّتْ وَإِلاَّ كَمُلَتْ مِنَ الْمُنَافِقِينَ وَمَا مَثَلُكُمْ وَالأُمَمِ إِلاَّ كَمَثَلِ الرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الدَّابَّةِ أَوْ كَالشَّامَةِ فِي جَنْبِ البَعِيرِ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا رُبْعَ أَهْلِ الجَنَّةِ فَكَبَّرُوا، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ فَكَبَّرُوا، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الجَنَّةِ فَكَبَّرُوا قَالَ: وَلاَ أَدْرِي؟ قَالَ: الثُّلُثَيْنِ أَمْ لاَ؟. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتــە: لــە عیمـرای کـوڕی حوصـەینەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسلم لەسـەفەردا بـوو ئـەم ئایەتـە دابەزی: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ (١) يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ)**. سورە الحج: ١-٢. واتــە: ئـەی خەڵکینـە! بەردەوام لە پەروەردگارتان بترسن و خۆ بپارێزن لە خەشم و ڕکی ئەو، فەرمانـەکانی بەچـاکی جێبـەجێ بکـەن، چـونکە بەڕاسـتیی بوومەلـەرزەو شـۆکەی هـاتنی ڕۆژی قیامەت و کاولبوونی دنیا، کارێکی زۆر سامناك و گەورەیـە، هـەر کـە کارەسـاتی ئەو ڕۆژە پێشهات، ئەبینن هەر ژنێکی شیردەر منداڵە شیرەخۆرەکەی خۆی لـەکاتی شیر پێدانیدا فەرامۆش دەکاو لێی غافڵ دەبێ و لە باوەشی بەر دەبێتەوە و هەرچی

مێینەی دووگیان و زکپڕیشە، لە ترس و لە هەیبەتا زکەکەی دادەنێ و لەباری دەچێت و هەموو خەڵکیش وەك مەست و سەرخۆش دەبینێ، خۆ لەڕاستییدا مەست و سەرخۆش نین، بەڵکو سزای خوا زۆر توندو سەختە، بۆیە ئاوا بیرو هۆشیان نەماوەو، وەك سەرخۆشیان لێ هاتووە.

فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەو رۆژە چ رۆژێکە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باش دەیزانن، فەرمووی: (ئەو رۆژەیە کە خوای گەورە بە ئادەم دەفەرموێت: بەشی دۆزەخ لەنەوەی خۆت جیاکەرەوە با بڕۆن بۆ ناوی، ئادەم دەڵێ: ئەی پەروەردگار! بەشی دۆزەخ لەنەوەی من چەند لە چەندە؟ دەفەرموێت: لەنێو یەك هەزار کەسدا نۆ سەد و نەوەد و نۆ کەسیان بەشی ئاگرە، لە هەزار کەس تەنیا یەك کەس بەشی بەهەشتە)، موسوڵمانان دەستیان کرد بە گریان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (میانڕەوبن و کار دروست بن، هیچ پەیامێکی پێغەمبەرایەتی نەبووە ئیللا خەڵکانێکی نەفام باوەڕیان پێی نەهێناوە ئەو لە سەدا نەوەدو نۆیە لەوانە خۆ ئەگەر تەواوی نەکرد ئەوا لە دووڕووەکان تەواو دەکرێت، رێژەی ئێوە لەچاو ئومەتانی تردا وەك خاڵێ یان پولەکەیە یان هەرشتێکی وەك نیشانە وایە بەدەستی ولاخێکەوە، یان وەك خاڵێکە بە تەنیشتی وشترێکەوە)، لەپاشدا فەرمووی: (هیوام وایە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن)، هاوەڵان لەخۆشیاندا دەستیان کرد بە (الله أکبر) کردن، ئینجا فەرمووی: (هیوام وایە ئێوە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن)، هاوەڵان لەخۆشیاندا دەستیان کرد بە (الله أکبر) کردن، پاشان فەرمووی: (هیوام وایە ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن)، هاوەڵان لەخۆشیاندا دەستیان کر بە (الله أکبر) کردن، راوی فەرمووی: نازانم فەرمووی: (دوو بەش لە سێ بەش) یان نا؟

٣١٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ أَبِي عَبْدِ اللهِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَتَفَاوَتَ بَيْنَ أَصْحَابِهِ فِي السَّيْرِ فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَوْتَهُ بِهَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ، إِلَى قَوْلِهِ: (وَلَكِنَّ عَذَابَ اللهِ شَدِيدٌ) فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ أَصْحَابُهُ حَثُّوا الْمَطِيَّ وَعَرَفُوا أَنَّهُ عِنْدَ قَوْلٍ يَقُولُهُ، فَقَالَ: هَلْ تَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ذَلِكَ يَوْمٌ يُنَادِي اللَّهُ فِيهِ آدَمَ فَيُنَادِيهِ رَبُّهُ فَيَقُولُ: يَا آدَمُ ابْعَثْ بَعْثَ النَّارِ، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ، وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ فَيَقُولُ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعُ مِائَةٍ وَتِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ إِلَى النَّارِ وَوَاحِدٌ فِي الجَنَّةِ فَيَئِسَ القَوْمُ، حَتَّى مَا أَبْدَوْا بِضَاحِكَةٍ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِي بِأَصْحَابِهِ قَالَ: اعْمَلُوا وَأَبْشِرُوا فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لَمَعَ خَلِيقَتَيْنِ مَا كَانَتَا مَعَ شَيْءٍ إِلاَّ كَثَّرَتَاهُ، يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، وَمَنْ مَاتَ مِنْ بَنِي آدَمَ وَبَنِي إِبْلِيسَ قَالَ: فَسُرِّيَ عَنِ القَوْمِ بَعْضُ الَّذِي يَجِدُونَ، فَقَالَ: اعْمَلُوا وَأَبْشِرُوا فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلاَّ كَالشَّامَةِ فِي جَنْبِ البَعِيرِ أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الدَّابَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عیمرای کوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بووین لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بە نۆبە سواری وڵاخ دەبوون، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەدەنگی بەرز ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ(١) يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ)**. سورە الحج: ١-٢.

کاتێ کە هاوەڵان بیستیان پەلەیان کرد لە وڵاخەکانیان و لێخوڕین زانیان کە

دەیەوێ فەرمایشتێ رابگەیەنێ، فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەو رۆژە چ رۆژێکە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باش دەیزانن، فەرمووی: (ئەو رۆژەیە کە خوای گەورە ئادەم بانگ دەکات دەفەرموێت: (بەشی دۆزەخ لەنەوەی خۆت جیاکەرەوە با برۆن بۆ ناوی)، ئادەم دەڵێ: ئەی پەروەردگار! بەشی دۆزەخ لەنەوەی من چەند لە چەندە؟ دەفەرموێت: (لەنێو یەك هەزار کەسدا نۆ سەد و نەوەد و نۆ کەسیان بۆ ئاگرە، لە هەزار کەس تەنیا یەك کەس بۆ بەهەشتە)، موسوڵمانان زۆر سەخڵەت و بێ تاقەت بوون و زەردەخەنەو پێکەنیان نەما، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە بەو شێوەیە هاوەڵانی بینی، فەرمووی: (کاری چاك بکەن وە موژدتان لێ بێ، بەوەی رۆحی موحەممەدی بەدەستە لە ئێوە یەك کەس بۆ بەهەشت و لە یەئجوج و مەئجوج هەزار کەس بۆ دۆزەخ دەبێ)، راوی فەرمووی: خەڵکەکە خەمیان رەویەوە و کەمێ هاتنەوە سەرخۆ ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کاری چاك بکەن وە موژدتان لێ بێ، بەوەی رۆحی موحەممەدی بەدەستە رێژەی ئێوە لەچاو خەڵکانی تردا وەك خاڵێکە بە تەنیشتی وشترێکەوە یان پولەکەیە یا هەرشتێکی وەك نیشانە وایە بەدەستی وڵاخێکەوە).

٣١٧٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا سُمِّيَ البَيْتَ العَتِيقَ لأَنَّهُ لَمْ يَظْهَرْ عَلَيْهِ جَبَّارٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتـە: لـە (عبـد الله)ی کـوڕی زوبێـرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەعبە بۆیە ناو نراوە (البَيْتَ العَتِيقَ) ماڵی ئازادکراو چونکە ئازادکراوە لە دەسـەڵاتی سـتەمکاران و هیچ زاڵم و زۆرداری زاڵ نەبووە بەسەریدا).

٣١٧١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، وَإِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ البَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا أُخْرِجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ مَكَّةَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ لَيَهْلِكُنَّ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ) الآيَةَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّهُ سَيَكُونُ قِتَالٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ البَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ مُرْسَلاً، وَلَيْسَ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم لـە مەککـە دەرچـوو کۆچـی کـرد بـۆ مەدینە، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەرەکـەی خۆیـان دەرکرد ئەمە نیشانەی لەناوچوونیانە، خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: **(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ)**. سورة الحج: ٣٩. واتە: بڕیـارو مۆڵەتی تۆڵەکردنەوە دراوە بەرامبەر بەو ئیماندارانەی شەڕیان بەسەردا سـەپێنراوەو جـەنگیان لەگـەڵکراوە - لەلایـەن بـێ بڕواکانـەوە - چـونکە ناهـەقیی و سـتەمیان لێکراوە. (ئیبن عەبباس) دەڵێت: ئەم ئایەتەی **(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ)**. یەکەم ئایەتێك بوو بە ڕێدان بەجیهاد، گەلێ جار یـاران و هاوەڵان بەسەر شکاویی و دەست شکاوی دەهاتنـە لای پێغەمبـەر صـلی الله علیـە

وسلم، ئەویش ئەیفەرموو: خۆتان ڕابگرن، تا ئێستاش فەرمان بەجیهاد نەهاتووە، ئەوسا لەناچارییدا کۆچیان کرد، پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو مۆڵەتی جەنگیان پێدراو دڵنیاشی کردن کە هەمیشە لە ژێر حیمایەت و پارێزگاری خوادا دەبن، بەڕاستی خواش بۆ کۆمەك و یارمەتیدانیان زۆر بەتواناو بەهێزە.

پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بێگومان زانیم کە جەنگ بەرپا دەبێ.

٣١٧٢ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ الْبَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: لَمَّا أُخْرِجَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم مِنْ مَكَّةَ قَالَ رَجُلٌ: أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ، فَنَزَلَتْ: (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا، وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ) النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم وَأَصْحَابُهُ.

**دەربارەی سورەتی (المؤمنون).**

**٢٤ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْمُؤْمِنُونَ**

٣١٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ سُمِعَ عِنْدَ وَجْهِهِ كَدَوِيِّ النَّحْلِ فَأُنْزِلَ عَلَيْهِ يَوْمًا فَمَكَثْنَا سَاعَةً فَسُرِّيَ عَنْهُ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ زِدْنَا وَلاَ تَنْقُصْنَا، وَأَكْرِمْنَا وَلاَ تُهِنَّا، وَأَعْطِنَا وَلاَ تَحْرِمْنَا، وَآثِرْنَا وَلاَ تُؤْثِرْ عَلَيْنَا، وَارْضِنَا وَارْضَ عَنَّا،

ثُمَّ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُنْزِلَ عَلَيَّ عَشْرُ آيَاتٍ، مَنْ أَقَامَهُنَّ دَخَلَ الجَنَّةَ، ثُمَّ قَرَأَ: (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ) حَتَّى خَتَمَ عَشْرَ آيَاتٍ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ سَمِعْت إِسْحَاقَ بْنَ مَنْصُورٍ، يَقُولُ: رَوَى أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَعَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَإِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّزَّاقِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، هَذَا الحَدِيثَ. وَمَنْ سَمِعَ مِنْ عَبْدِ الرَّزَّاقِ قَدِيمًا فَإِنَّهُمْ إِنَّمَا يَذْكُرُونَ فِيهِ عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، وَبَعْضُهُمْ لاَ يَذْكُرُ فِيهِ عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، وَمَنْ ذَكَرَ فِيهِ يُونُسَ بْنَ يَزِيدَ فَهُوَ أَصَحُّ، وَكَانَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ رُبَّمَا ذَكَرَ فِي هَذَا الحَدِيثِ يُونُسَ بْنَ يَزِيدَ وَرُبَّمَا لَمْ يَذْكُرْهُ، وَإِذَا لَمْ يَذْكُرْ فِيهِ يُونُسَ، فَهُوَ مُرْسَلٌ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی (عَبْدٍ القَارِيِّ)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) بوو دەیفەرموو: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەحی بۆ دەهات لەدەوری روخسار و دەم و چاوی گیزەیە دەبیسترا وەك گیزەی هەنگ، رۆژێ لەخزمەتیدا بووین ئایەتی بۆ هات ماوەیە بێدەنگ لەدەوری بووین هەتا هێوربووەوە رووی کردە قیبلە و هەردوو دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی: (خوایە ئەم رەحمەت و بەرەکەتە زیاد بکە و کەمی مەکەرەوە، قەدر و رێزمان بگرە و سوك و ریسوامان مەکە، بەشی باشمان پێ ببەخشەو بێ بەشمان مەکە، نازمان بگرە و نازی کەس مەدە بەسەرماندا، رازیمان بکەو لێمان رازی بە)، لەپاشدا فەرمووی: (دە ئایەتم بۆ هاتووە هەرکەس کاریان پێ بکات دەچێتە بەهەشتەوە)، ئینجا ئەم دە ئایەتەی خوێندەوە: (**قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (٢) وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ (٣) وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ (٤) وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَى**

أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ (٧) وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ (٨) وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ (٩) أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ (١٠)). سورة المؤمنون: ١ - ١٠. واتە: بەڕاستی خەڵکانی خاوەن ئیمان و بڕوادار سەرکەوتوو ڕزگارن، چونکە خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزانەن کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا خۆشکێن و ملکەچن و، هەردەم بە ترسەوە نوێژ دەکەن و بەرامبەر بە خوا ئەهلی شەرمن، ئەوانەشن کە لە بەرامبەر کاروکرداری پڕوو پووچ و، شتی بێ ماناو بێ سوود، ڕوو هەڵدەسووڕێنن و پشت هەڵدەکەن، ئەوانەشن وا بەهەژارو بێ نەوایان زەکات دەدەن، ئەوانەشن پارێزەری داوێنیانن، خۆیان لە هەموو ڕێگەیەکی یاساغ و ناشەرعیی دەپارێزن، وە لە جێبەجێکردنی ئارەزووەکانیان خۆراگرن، مەگەر لەگەڵ هاوسەری خۆیان، یان لەگەڵ کەنیزانیان (ئەوانەی مولکی خۆیانن)، جا بێگومان لەو ڕێیەوە لۆمە کراو نابن و لێیان ناگیرێ، ئینجا هەر کەسێ لە غەیری ئەو ڕێگایەوە هەوڵ بدا بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووی خۆی، وەك زیناو نێربازیی و.. ئەو جۆرە کەسانە ئەوە ڕەفتاریان بێت، دەست درێژکارو سنوور بەزێنێکی لەئەندازە بەدەرن. ئەوانەشن کە چاودێرو ڕاگری سپاردەو بەڵێن و پەیمانی خۆیانن، بۆ هەر سپاردەو، ئیمزاو مۆرو نووسین و بەڵێن و قسەیەکی خۆیان بایەخ دادەنێن و ئەوانەشن کە لەسەر نوێژەکانیان دەوامکارن و دەیانپارێزن و، تەمەڵییان تێدا ناکەن و نایان فەوتێنن، وە لەکاتی خۆیاندا بە تەواوی پایەو مەرجەکانیانەوە جێبەجێیان دەکەن.

٣١٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ الرُّبَيِّعَ بِنْتَ النَّضْرِ أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

وَكَانَ ابْنُهَا حَارِثَةُ بْنُ سُرَاقَةَ أُصِيبَ يَوْمَ بَدْرٍ، أَصَابَهُ سَهْمٌ غَرَبٌ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَارِثَةَ لَئِنْ كَانَ أَصَابَ خَيْرًا احْتَسَبْتُ وَصَبَرْتُ، وَإِنْ لَمْ يُصِبِ الخَيْرَ اجْتَهَدْتُ فِي الدُّعَاءِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا أُمَّ حَارِثَةَ إِنَّهَا جِنَانٌ فِي جَنَّةٍ، وَإِنَّ ابْنَكِ أَصَابَ الْفِرْدَوْسَ الأَعْلَى وَالْفِرْدَوْسُ رَبْوَةُ الْجَنَّةِ وَأَوْسَطُهَا وَأَفْضَلُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە روبەیعی كچی (نضر) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، كوڕەكەی (حارثە)ی كوڕی سوراقە لەجەنگی بەدردا تیری وێڵ بەری كەوتبوو كوژرا بوو، وتی: هەواڵی (حارثە)م بدەنێ ئەگەر تووشی خێر بووە خۆڕاگر دەبم، ئەگینا زۆر بۆی دەپاڕێمەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی دایكی (حارثە)! كوڕەكەت لە فیلادەوس دایە كە چڵەپۆپە و بەرزترین شوێنی بەهەشتەو خۆشترین جێگەیەتی).

٣١٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ مِغْوَلٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ وَهْبٍ الهَمْدَانِيِّ، أَنَّ عَائِشَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ) قَالَتْ عَائِشَةُ: أَهُمُ الَّذِينَ يَشْرَبُونَ الخَمْرَ وَيَسْرِقُونَ؟ قَالَ: لاَ يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ، وَلَكِنَّهُمُ الَّذِينَ يَصُومُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَتَصَدَّقُونَ، وَهُمْ يَخَافُونَ أَنْ لاَ تُقْبَلَ مِنْهُمْ (أُولَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ). وَرُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: دەربارەی ئەم ئایەتە لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم پرسی: **(وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ)**. سورة المؤمنون: ٦٠. واتە: وە ئەوانەش وا هەقە ببەخشن لەو ماڵەی خوا پێیداون، دەبەخشن كەچی هێشتا دڵیان دەلەرزێ.

وتم: ئەوانەن كە شەراب دەخۆنەوە و دزی دەكەن؟ فەرمووی: (نا ئەی كچی صدیق، بەڵكو ئەوانەن كە ڕۆژوو دەگرن و نوێژ دەكەن و دەبەخشن، هێشتا دەترسن لێیان وەرنەگیرێ: **(أُولَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ)**. سورة المؤمنون: ٦١. واتە: ئەوانەی ئەو وەسفانەیان تێدایە، كەسانێكن لە ئەنجامدانی كارە چاكەكاندا - لەبەر ڕەزامەندی خوا - هەمیشە بە تالووكەن و پەلە دەكەن، وە بۆ ئەنجامدانی كارە چاكەكان ، لە خەڵكی تر لە پێشترن.

٣١٧٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ أَبِي شُجَاعٍ، عَنْ أَبِي السَّمْحِ، عَنْ أَبِي الْهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ) قَالَ: تَشْوِيهِ النَّارُ فَتَقَلَّصُ شَفَتُهُ العَالِيَةُ حَتَّى تَبْلُغَ وَسَطَ رَأْسِهِ، وَتَسْتَرْخِي شَفَتُهُ السُّفْلَى حَتَّى تَضْرِبَ سُرَّتَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: **(وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ)** سورة المؤمنون: ١٠٤. واتە: لێوەكانیشیان هەڵدەچرچی. فەرمووی: بڵێسەی ئاگر ڕوخساریان دەسوتێنێ لێوی سەرەوەی هەڵئەقرچێ و گرژ دەبێ هەتا دەگاتە ناوەڕاستی سەری، بەشی خوارەوەشی شۆڕدەبێتەوە هەتا دەدات لەناوكی).

دەربارەی سورەتی (النور).

## ٢٥ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ النُّورِ

٣١٧٧ - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ الأَخْنَسِ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: مَرْثَدُ بْنُ أَبِي مَرْثَدٍ، وَكَانَ رَجُلاً يَحْمِلُ الأَسْرَى مِنْ مَكَّةَ حَتَّى يَأْتِيَ بِهِمُ الْمَدِينَةَ، قَالَ: وَكَانَتْ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ بِمَكَّةَ يُقَالُ لَهَا: عَنَاقٌ وَكَانَتْ صَدِيقَةً لَهُ، وَإِنَّهُ كَانَ وَعَدَ رَجُلاً مِنْ أُسَارَى مَكَّةَ يَحْمِلُهُ، قَالَ: فَجِئْتُ حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى ظِلِّ حَائِطٍ مِنْ حَوَائِطِ مَكَّةَ فِي لَيْلَةٍ مُقْمِرَةٍ، قَالَ: فَجَاءَتْ عَنَاقٌ فَأَبْصَرَتْ سَوَادَ ظِلِّي بِجَنْبِ الحَائِطِ فَلَمَّا انْتَهَتْ إِلَيَّ عَرَفَتْ، فَقَالَتْ: مَرْثَدٌ؟ فَقُلْتُ: مَرْثَدٌ. فَقَالَتْ: مَرْحَبًا وَأَهْلاً هَلُمَّ فَبِتْ عِنْدَنَا اللَّيْلَةَ. قَالَ: قُلْتُ: يَا عَنَاقُ حَرَّمَ اللَّهُ الزِّنَا، قَالَتْ: يَا أَهْلَ الخِيَامِ، هَذَا الرَّجُلُ يَحْمِلُ أُسَرَاءَكُمْ، قَالَ: فَتَبِعَنِي ثَمَانِيَةٌ وَسَلَكْتُ الخَنْدَمَةَ فَانْتَهَيْتُ إِلَى كَهْفٍ أَوْ غَارٍ فَدَخَلْتُ، فَجَاءُوا حَتَّى قَامُوا عَلَى رَأْسِي فَبَالُوا فَظَلَّ بَوْلُهُمْ عَلَى رَأْسِي وَعَمَّاهُمُ اللَّهُ عَنِّي، قَالَ: ثُمَّ رَجَعُوا وَرَجَعْتُ إِلَى صَاحِبِي فَحَمَلْتُهُ وَكَانَ رَجُلاً ثَقِيلاً حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى الإِذْخِرِ، فَفَكَكْتُ عَنْهُ أَكْبُلَهُ فَجَعَلْتُ أَحْمِلُهُ وَيُعْيِينِي حَتَّى قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْكِحُ عَنَاقًا؟ فَأَمْسَكَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئًا حَتَّى نَزَلَتْ: (الزَّانِي لاَ يَنْكِحُ إِلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لاَ يَنْكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ)، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا مَرْثَدُ الزَّانِي لاَ يَنْكِحُ إِلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لاَ يَنْكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ، فَلاَ تَنْكِحْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە (مَرْثَد)ی کوڕی (أَبی مَرْثَد)ی غەنەوی بە نهێنی دیلی لە مەککەوە دەهێنا بۆ

مەدینە، لە مەککە ئافرەتێکی بەرەڵای داوێن پیس هەبوو ناوی: عەناق بوو، لەسەردەمی نەفامی دا دۆست و خۆشەویستی (مَرْثَد) بوو، جا (مَرْثَد) بەڵێنی دابوو بە یەکێ لە دیلەکانی مەککە بیبات بۆ مەدینە، فەرمووی: لەشەوێکی زۆرتاریك و شەوەزەنگدا ڕۆشتم هەتا گەیشتمە سێبەری یەکێ لە باخەکانی مەدینە، عەناق هات چاوی کەوت بە سێبەرەکەم هات بەرەو رووم هەتا ناسیمیەوە، وتی: تۆ(مَرْثَد)ی؟ وتم: بەڵێ، وتی: مەرحەبا وەرە با ئەمشەو پێکەوە رابوێرین، وتم: ئەی عەناق خوای گەورە زینای حەرام کردووە، ئەویش وتی: ئەی خەڵکی ناو دەوار و رەشماڵەکان ئاگاداربن ئەم پیاوە دیلەکانتان دەبات بۆ مەدینە، وتی: هەشت کەس شوێنم کەوتن منیش رێی کێوی خەندەمەم گرتە بەرو هەڵاتم هەتا گەیشمە ئەشکەوتێ چوومە ناوی هاتن لەسەرەوە میزیان کرد بەسەرمدا بەڵام خوای گەور کوێری کردن و منیان نەبینی، ئەوان رۆشتن و منیش گەڕامەوە بەدەم دیلەکەوە هەڵمگرت پیاوێکی قورس بوو گەیاندمە ئیزخەر، لەوێ لە کۆت و زنجیرەکەی رزگارم کرد و بە هەرحاڵێ بوو گەیاندمە مەدینە، چوومە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دووجار وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم عەناق مارە بکەم؟ وتی: قسەی نەکردو بێ دەنگ بوو هیچ وەڵامی نەدامەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: **(الزَّانِي لاَ يَنْكِحُ إِلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لاَ يَنْكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ)**. سورة النور: ٣. واتە: پیاوی زیناکارو شەرواڵ پیس هەر دەبێ ژنی زیناکارو داوێن تەڕ، وە یان موشریك و بتپەرست مارە بکات بۆخۆی، چونکە ئافرەتی شەریفەو داوێن پاك هەرگیز هاوشانی ئەو نییە، کەواتە زیناکاران لە کۆڕی بڕواداران دەچنە دەرەوە، وە ئافرەتی زیناکەر و داوێن پیس مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یان پیاوی موشریك نەبێ.

(مَرْثَد) فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بانگی كردم ئایەتەكەی بۆ خوێندمەوەو فەرمووی: (ئەی(مَرْثَد) پیاوی زیناكارو شەروالّ پیس هەر دەبێ ژنی زیناكارو داوێن تەڕ، وە یان موشریك و بتپەرست مارە بكات بۆخۆی،، وە ئافرەتی زیناكەر و داوێن پیس مارەی ناكات پیاوی زیناكەر یان پیاوی موشریك نەبێ، كەواتە مارەی مەكە).

٣١٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: سُئِلْتُ عَنِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ فِي إِمَارَةِ مُصْعَبِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا فَمَا دَرَيْتُ مَا أَقُولُ، فَقُمْتُ مِنْ مَكَانِي إِلَى مَنْزِلِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ، فَقِيلَ لِي إِنَّهُ قَائِلٌ فَسَمِعَ كَلاَمِي فَقَالَ لِيَ: ابْنَ جُبَيْرٍ؟ ادْخُلْ، مَا جَاءَ بِكَ إِلاَّ حَاجَةٌ، قَالَ: فَدَخَلْتُ فَإِذَا هُوَ مُفْتَرِشٌ بَرْدَعَةَ رَحْلٍ لَهُ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، الْمُتَلاَعِنَانِ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ فَقَالَ: سُبْحَانَ اللهِ نَعَمْ، إِنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ فُلاَنُ ابْنُ فُلاَنٍ، أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ أَحَدَنَا رَأَى امْرَأَتَهُ عَلَى فَاحِشَةٍ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ إِنْ تَكَلَّمَ تَكَلَّمَ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، وَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى أَمْرٍ عَظِيمٍ، قَالَ: فَسَكَتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ الَّذِي سَأَلْتُكَ عَنْهُ قَدْ ابْتُلِيتُ بِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الآيَاتِ فِي سُورَةِ النُّورِ: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنْفُسُهُمْ) حَتَّى خَتَمَ الآيَاتِ قَالَ: فَدَعَا الرَّجُلَ فَتَلاَهُنَّ عَلَيْهِ وَوَعَظَهُ، وَذَكَّرَهُ وَأَخْبَرَهُ: أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ، فَقَالَ: لاَ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا، ثُمَّ ثَنَّى بِالمرْأَةِ وَوَعَظَهَا وَذَكَّرَهَا، وَأَخْبَرَهَا: أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ، فَقَالَتْ: لاَ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا صَدَقَ، فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالخَامِسَةَ أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الكَاذِبِينَ، ثُمَّ ثَنَّى بِالمرْأَةِ

فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الكَاذِبِينَ، وَالخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ، ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا. وَفِي البَابِ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی فەرمانڕوایەتی موصعەبی کوڕی زوبێردا پرسیاریان لێ کردم دەربارەی ژن و مێردێ نەفرین لەیەکتر بکەن ئایا لەیەکتر جیادەکرێنەوە یان نا؟ منیش نەمزانی چی بڵێم، لەشوێنی خۆم هەستام و چووم بۆ مەنزڵی (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ، داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەم کرد، وتیان: خەوتوە (خەوی قەیلولە) گوێی لەدەنگم بوو پێی فەرمووم: تۆ ئیبنو جوبەیری؟ وەرە ژوورەوە، دیارە کارێکی زەرور و پێویستت هەیە بۆیە لەم کاتەدا هاتویت، منیش چوومەژوورەوە شانی دادابوو، وتم: ئەی باوکی (عبد الرحمن)! ژن و مێردێ نەفرین لەیەکتر بکەن ئایا لەیەکتر جیادەکرێنەوە یان نا؟ فەرمووی: (سبحان الله) بەڵێ، بێگومان یەکەم کەس ئەم پرسیارەی کرد فلانی کوڕی فلان بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەگەر کەسێ لە ئێمە هاوسەرەکەی بینی خەریکی داوێن پیسی بوو زینای دەکرد چی بکات؟ ئەگەر قسە بکات ئەوە قسە لە کارێکی گەورە دەکات، ئەگەر بێدەنگیش بێت ئەوە لە کارێکی گەورە بێدەنگ دەبێت، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێدەنگ بوو وەڵامی نەدایەوە، پاش ماوەیە هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەوەی پرسیارم لێ کردی ئەوا بەسەرخۆم هاتووە و تووش بووم، خوای گەورە ئەم ئایەتانەی سورەتی (النور)ی لەوبارەوە دابەزاند: **(وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ**

لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾. سورة النور: ٦-٧. واتە: ئەو كەسانەی كە تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرانیان، لەهەمان كاتدا بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نیە شایەتییان بۆ بدەن كە ئەو ژنە زینای كردوە، چونكە چوار شایەت پێویستە بۆ ئیسپاتی زینا، جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەی لەكۆڵ بكەوێت – ئەگەر شایەد نەبوو – دەبێت هەر یەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بە ناوی خواوە شایەتی بدات و سوێند بخوات بە خوا بڵێت: بەڕاستی من لە لەڕاستگۆیانم " كە دەڵێم ئەم ژنەم زینای كردووە " وە بەچاوی خۆم تاوانەكەیم بینیوە، پێنجەم جاریش بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێ ئەگەر لە درۆزنان بم.

جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوەكەی بانگ كردوو ئایەتەكانی بۆ خوێندەوە و وتی: نا، بەوەی تۆی بەهەق ناردووە بەڕاستمەو درۆی بە دەمەوە ناكەم، پاشان ژنەكەشی بانگ كردو ئامۆژگاری كردو بیری خستەوە و پێی ڕاگەیاند كە سزاو ئازاری دونیا سوكتر و ئەهوەن ترە لەسزاو ئازاری دوارۆژ، وتی: نا، بەوەی تۆی بەهەق ناردووە ڕاست ناكات، جا لەپیاوەكەوە دەستی پێ كرد چوارجار خوای گەورەی كرد بە شایەت كە راست دەكات، لەجاری پێنجەمدا وتی: نەفرەتی خوام لێ بێ ئەگەر بوختانی بۆ بكەم و درۆبكەم، لەپاشدا ژنەكەی بانگ كرد، ئەویش چوارجار خوای گەورەی كرد بە شایەت كە راست دەكات و مێردەكەی درۆ دەكات، لەجاری پێنجەمدا وتی: نەفرەتی خوام لێ بێ ئەگەر مێردەكەم راست بكات، پاشان جیای كردنەوە لەیەك.

٣١٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ حَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ، قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَرِيكِ ابْنِ السَّحْمَاءِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: البَيِّنَةَ وَإِلاَّ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ، قَالَ: فَقَالَ هِلاَلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِذَا رَأَى أَحَدُنَا رَجُلاً عَلَى امْرَأَتِهِ أَيَلْتَمِسُ البَيِّنَةَ؟ فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: البَيِّنَةَ وَإِلاَّ فَحَدٌّ فِي ظَهْرِكَ، قَالَ: فَقَالَ هِلاَلٌ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ إِنِّي لَصَادِقٌ، وَلَيَنْزِلَنَّ فِي أَمْرِي مَا يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الحَدِّ، فَنَزَلَ (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنْفُسُهُمْ)، فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ، (وَالخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ) قَالَ: فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمَا فَجَاءَا، فَقَامَ هِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ فَشَهِدَ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟ ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَمَّا كَانَتْ عِنْدَ الخَامِسَةِ (أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ) قَالُوا لَهَا: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ وَنَكَسَتْ حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ سَتَرْجِعُ، فَقَالَتْ: لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ اليَوْمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَبْصِرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ العَيْنَيْنِ سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ ابْنِ السَّحْمَاءِ، فَجَاءَتْ بِهِ كَذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْلاَ مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ لَكَانَ لَنَا وَلَهَا شَأْنٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَهَكَذَا رَوَى عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَوَاهُ أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ مُرْسَلاً، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە هیلالی کوڕی ئومەییە تاوانی زینای دایە پاڵ ژنەکەی خۆی لەگەڵ پیاوێ کە ناوی (شریك)ی کوڕی (سَحْمَاء) بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڵگەو

شایەت بێنە ئەگەر نا داری حەد دەدرێت لە پشتت)، وتی: هیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! کەسێ پیاوێ بگرێت بەسەر ژنەکەیەوە بەلگەو شایەتی دەوێت؟ فەرمووی: (بەلگەو شایەت بێنە ئەگەر نا داری حەد دەدرێت لە پشتت). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوێند بەوەی تۆی بە هەق رەوانەکردوە راست دەکەم و، دڵنیام کە خوای گەورە ئایەت دەنێرێتەخوارەوەو پشتم لە داری حەد دەپارێزێت، جا ئەم دوو ئایەتە هاتەخوارەوە: **(وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٧) وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (٨) وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ)**. سورة النور: ٦- ٩. واتە: ئەو کەسانەش کە تۆمەتی زیناو شەرواڵ پیسیی دەدەنە پاڵ هاوسەرانیان، لە هەمان کاتدا بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نییە شایەتییان بۆ بدەن کە ئەو ژنە زینای کردووە، چونکە چوار شایەت پێویستە بۆ ئیسپاتی زینا، جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەی لە کۆڵ بکەوێ - ئەگەر شایەد نەبوو- ئەبێ هەریەك لەو جۆرە پیاوانە چوارجار بەناوی خواوە شایەتی بدات و سوێند بخوات بەخوا بلێت: بەڕاستیی من لە راستگۆیانم کە ئەلێم ئەم ژنەم زینای کردووە، وە بەچاوی خۆم تاوانەکەیم بینیوە، پێنجەم جاریش بلێت: نەفرینی خوام لەسەر بێت ئەگەر لە درۆزنانیش بم، بەکورتی: هەرکات کابرایەك لە ژنەکەی خۆی خانەگومان کەوت و تۆمەتباری کرد بەزینا، ئەبێ بیبات بۆلای دادوەری ئیسلام، ئەوجا دادوەریش چوار ئەشهەدو بیللای پیا بکێشێ کە لەو قسانەدا راست دەکات، جا بۆ جاری پێنجەم نەفرین لەخۆی بکات، ئەگەر بوختان بکاو درۆ بکات، جا ئەگەر ژنەکە بێدەنگبوو بەردە باران دەکرێت. ئینجا ئەوکاتە بەلای ئیمامی شافیعی و زۆرێکی تر لە زانایانەوە ئەو ژنەی بەهەتا هەتایی لێ حەرام دەبێت و، دەبێ مارەییەکەشی

بەتەواوی بداتێ، لە پاشان ژنەكە بەردە باران دەكرێ و، پیاوەكەش رزگاری ئەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا خوای دلۆڤان دەرفەتیشی بۆ ژنەكە هێشتۆتەوە، كە پاش سوێندی ئەو پیاوە دەتوانێ دیفاع لە خۆی بكات، وەك ئەفەرموێ: سزا لەسەر ئافرەتە قەزف كراوەكەش لا دەبرێت و سزا نادرێ، كە ئەویش چوارجار شایەتی بداو سوێند بە خوا بخوات و ئەشهەدوبیللا بكێشێ كە مێردەكەی لە درۆزنانەو درۆش ئەكات زینای داوەتە پاڵم و بۆ جاری پێنجەمین ژنەكە بڵێت: خەشم و قینی خوام لەسەر بێت ئەگەر ئەو مێردەم لە راستگۆیان بێت و منیش زینام كردبێت، وە لە دوای ئەمە دادوەری ئیسلام لێكیان جیا دەكاتەوەو بۆ هەتا هەتایی لێك حەرام دەبن لە وتەی ئیمامی شافعیی و زۆرترینی زانایاندا، وە ژنەكە هەموو مارەیەكەشی دەكەوێ.

جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەڕایەوەو ناردی بەدوایاندا، ئەوانیش هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هیلالی كوڕی ئومەییە هەستا شایەتی دا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە دەزانێ كە یەكێكتان درۆ دەكەن، ئایا كەسێ هەیە لەهەردوكتان كە تەوبە بكات؟). لەپاشدا ئافرەتەكە هەستا شایەتی دا، كاتێ كە گەیشتە پێنجەم جار: رق و تووڕەیی خوای گەورە لەسەر نەفسی من بێت ئەگەر پیاوەكەم راست بكات، وەستاندیان وتیان: بەڕاستی ئیتر ئەمە سزات بۆ پێویست دەكات، ئیبنو عەباس وتی: كەمێ زمانی گیری كردو بەرەو پشت كەمێ هاتەوە، وامان زانی كە پەشیمان دەبێتەوە، لەپاشدا وتی: من هەرگیز تیرەی خۆم سەرشۆڕ و بەدناو ناكەم بە درێژایی رۆژگار، جا سوێندی پێنجەم جاری خوارد كاتێ كە تەواو بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چاوەڕوانی ئەوە بكەن ئەگەر منداڵەكە چاو ڕەش و سمت قەڵەو و قاچ ئەستور بوو، ئەوە هی شەریكی كوڕی سەحمایە) واتە هیلال

راستی کردوە، ئافرەتەکە منداڵێکی لەو شێوەیەی بوو، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە رابورد لە کتێبی خوادا، ئەوە من لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا شتێکی ترم دەبوو).

٣١٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ لَمَّا ذُكِرَ مِنْ شَأْنِي الَّذِي ذُكِرَ وَمَا عَلِمْتُ بِهِ، قَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيَّ خَطِيبًا فَتَشَهَّدَ وَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ: أَشِيرُوا عَلَيَّ فِي أُنَاسٍ أَبَنُوا أَهْلِي وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي مِنْ سُوءٍ قَطُّ وَأَبَنُوا بِمَنْ وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ مِنْ سُوءٍ قَطُّ وَلاَ دَخَلَ بَيْتِي قَطُّ إِلاَّ وَأَنَا حَاضِرٌ وَلاَ غِبْتُ فِي سَفَرٍ إِلاَّ غَابَ مَعِي، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَالَ: ائْذَنْ لِي يَا رَسُولَ اللهِ أَنْ أَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ، وَقَامَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي الْخَزْرَجِ وَكَانَتْ أُمُّ حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ مِنْ رَهْطِ ذَلِكَ الرَّجُلِ، فَقَالَ: كَذَبْتَ، أَمَا وَاللَّهِ أَنْ لَوْ كَانُوا مِنَ الأَوْسِ مَا أَحْبَبْتَ أَنْ تُضْرَبَ أَعْنَاقُهُمْ حَتَّى كَادَ أَنْ يَكُونَ بَيْنَ الأَوْسِ وَالْخَزْرَجِ شَرٌّ فِي الْمَسْجِدِ وَمَا عَلِمْتُ بِهِ، فَلَمَّا كَانَ مَسَاءُ ذَلِكَ الْيَوْمِ خَرَجْتُ لِبَعْضِ حَاجَتِي وَمَعِي أُمُّ مِسْطَحٍ فَعَثَرَتْ، فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ أُمُّ تَسُبِّينَ ابْنَكِ؟ فَسَكَتَتْ، ثُمَّ عَثَرَتِ الثَّانِيَةَ فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ أُمُّ تَسُبِّينَ ابْنَكِ؟ فَسَكَتَتْ، ثُمَّ عَثَرَتِ الثَّالِثَةَ فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ فَانْتَهَرْتُهَا، فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ أُمُّ تَسُبِّينَ ابْنَكِ؟ فَقَالَتْ: وَاللَّهِ مَا أَسُبُّهُ إِلاَّ فِيكِ، فَقُلْتُ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَتْ: فَبَقَرَتْ لِي الْحَدِيثَ، قُلْتُ: وَقَدْ كَانَ هَذَا؟ قَالَتْ: نَعَمْ، وَاللَّهِ لَقَدْ رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي وَكَأَنَّ الَّذِي خَرَجْتُ لَهُ لَمْ أَخْرُجْ. لاَ أَجِدُ مِنْهُ قَلِيلاً وَلاَ كَثِيرًا، وَوُعِكْتُ، فَقُلْتُ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَرْسِلْنِي إِلَى بَيْتِ أَبِي، فَأَرْسَلَ مَعِي الْغُلاَمَ، فَدَخَلْتُ الدَّارَ، فَوَجَدْتُ أُمَّ رُومَانَ فِي السُّفْلِ وَأَبُو بَكْرٍ فَوْقَ الْبَيْتِ يَقْرَأُ، فَقَالَتْ أُمِّي: مَا جَاءَ بِكِ يَا بُنَيَّةُ؟ قَالَتْ: فَأَخْبَرْتُهَا، وَذَكَرْتُ لَهَا

الحَدِيثَ، فَإِذَا هُوَ لَمْ يَبْلُغْ مِنْهَا مَا بَلَغَ مِنِّي، قَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ خَفِّفِي عَلَيْكِ الشَّأْنَ، فَإِنَّهُ وَاللَّهِ لَقَلَّمَا كَانَتْ امْرَأَةٌ حَسْنَاءُ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا، لَهَا ضَرَائِرُ إِلاَّ حَسَدْنَهَا وَقِيلَ فِيهَا، فَإِذَا هِيَ لَمْ يَبْلُغْ مِنْهَا مَا بَلَغَ مِنِّي، قَالَتْ: قُلْتُ: وَقَدْ عَلِمَ بِهِ أَبِي؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قُلْتُ: وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، وَاسْتَعْبَرْتُ وَبَكَيْتُ، فَسَمِعَ أَبُو بَكْرٍ صَوْتِي وَهُوَ فَوْقَ البَيْتِ يَقْرَأُ فَنَزَلَ فَقَالَ لأُمِّي: مَا شَأْنُهَا؟ قَالَتْ: بَلَغَهَا الَّذِي ذُكِرَ مِنْ شَأْنِهَا، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكِ يَا بُنَيَّةُ إِلاَّ رَجَعْتِ إِلَى بَيْتِكِ، فَرَجَعْتُ، وَلَقَدْ جَاءَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى بَيْتِي فَسَأَلَ عَنِّي خَادِمَتِي فَقَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا عَيْبًا إِلاَّ أَنَّهَا كَانَتْ تَرْقُدُ حَتَّى تَدْخُلَ الشَّاةُ فَتَأْكُلَ خَمِيرَتَهَا أَوْ عَجِينَتَهَا، وَانْتَهَرَهَا بَعْضُ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَصْدِقِي رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَسْقَطُوا لَهَا بِهِ، فَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللهِ وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا إِلاَّ مَا يَعْلَمُ الصَّائِغُ عَلَى تِبْرِ الذَّهَبِ الأَحْمَرِ، فَبَلَغَ الأَمْرُ ذَلِكَ الرَّجُلَ الَّذِي قِيلَ لَهُ، فَقَالَ: سُبْحَانَ اللهِ، وَاللَّهِ مَا كَشَفْتُ كَنَفَ أُنْثَى قَطُّ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُتِلَ شَهِيدًا فِي سَبِيلِ اللهِ، قَالَتْ: وَأَصْبَحَ أَبَوَايَ عِنْدِي فَلَمْ يَزَالاَ حَتَّى دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ صَلَّى العَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ وَقَدْ اكْتَنَفَ أَبَوَايَ عَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي، فَتَشَهَّدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ، إِنْ كُنْتِ قَارَفْتِ سُوءًا أَوْ ظَلَمْتِ فَتُوبِي إِلَى اللهِ، فَإِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ، قَالَتْ: وَقَدْ جَاءَتْ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ وَهِيَ جَالِسَةٌ بِالبَابِ، فَقُلْتُ: أَلاَ تَسْتَحْيِي مِنْ هَذِهِ الْمَرْأَةِ أَنْ تَذْكُرَ شَيْئًا، فَوَعَظَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَالتَفَتُّ إِلَى أَبِي فَقُلْتُ: أَجِبْهُ، قَالَ: فَمَاذَا أَقُولُ؟ فَالتَفَتُّ إِلَى أُمِّي فَقُلْتُ: أَجِيبِيهِ، قَالَتْ: أَقُولُ مَاذَا؟ قَالَتْ: فَلَمَّا لَمْ يُجِيبَا تَشَهَّدْتُ فَحَمِدْتُ اللَّهَ وَأَثْنَيْتُ عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي لَمْ أَفْعَلْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنِّي لَصَادِقَةٌ مَا ذَاكَ بِنَافِعِي عِنْدَكُمْ لِي لَقَدْ تَكَلَّمْتُمْ

وَأُشْرِبَتْ قُلُوبُكُمْ، وَلَئِنْ قُلْتُ إِنِّي قَدْ فَعَلْتُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي لَمْ أَفْعَلْ لَتَقُولُنَّ إِنَّهَا قَدْ بَاءَتْ بِهِ عَلَى نَفْسِهَا، وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلاً. قَالَتْ: وَالتَمَسْتُ اسْمَ يَعْقُوبَ فَلَمْ أَقْدِرْ عَلَيْهِ إِلاَّ أَبَا يُوسُفَ حِينَ قَالَ: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ). قَالَتْ: وَأُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ سَاعَتِهِ، فَسَكَتْنَا، فَرُفِعَ عَنْهُ وَإِنِّي لأَتَبَيَّنُ السُّرُورَ فِي وَجْهِهِ وَهُوَ يَمْسَحُ جَبِينَهُ وَيَقُولُ: أَبْشِرِي يَا عَائِشَةُ، فَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ بَرَاءَتَكِ قَالَتْ: وَكُنْتُ أَشَدَّ مَا كُنْتُ غَضَبًا، فَقَالَ لِي أَبَوَايَ، قُومِي إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: لاَ وَاللَّهِ لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ وَلاَ أَحْمَدُهُ وَلاَ أَحْمَدُكُمَا، وَلَكِنْ أَحْمَدُ اللَّهَ الَّذِي أَنْزَلَ بَرَاءَتِي، لَقَدْ سَمِعْتُمُوهُ فَمَا أَنْكَرْتُمُوهُ وَلاَ غَيَّرْتُمُوهُ، وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: أَمَّا زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِدِينِهَا فَلَمْ تَقُلْ إِلاَّ خَيْرًا، وَأَمَّا أُخْتُهَا حَمْنَةُ فَهَلَكَتْ فِيمَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِي يَتَكَلَّمُ فِيهِ مِسْطَحٌ وَحَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ وَالْمُنَافِقُ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ، وَهُوَ الَّذِي كَانَ يَسْتَوْشِيهِ وَيَجْمَعُهُ، وَهُوَ الَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ هُوَ وَحَمْنَةُ، قَالَتْ: فَحَلَفَ أَبُو بَكْرٍ أَنْ لاَ يَنْفَعَ مِسْطَحًا بِنَافِعَةٍ أَبَدًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ وَلاَ يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ إِلَى آخِرِ الآيَةِ، يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ، (أَنْ يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)، يَعْنِي مِسْطَحًا، إِلَى قَوْلِهِ (أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) قَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلَى وَاللَّهِ يَا رَبَّنَا، إِنَّا لَنُحِبُّ أَنْ تَغْفِرَ لَنَا، وَعَادَ لَهُ بِمَا كَانَ يَصْنَعُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ. وَقَدْ رَوَاهُ يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، وَمَعْمَرٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيِّ، وَعُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَائِشَةَ، هَذَا الْحَدِيثَ أَطْوَلَ مِنْ حَدِيثِ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ وَأَتَمَّ.

**واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە بوختانەکەم بۆ کرا، من ئاگام لەهیچ نەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستایەوە سەبارەت بەمن وتارێکی خوێندەوە، لەپێشدا شایەتومانی هێنا، ئینجا**

سوپاسی خوای کرد بە شێوەیە کە شایستەی بێ، لەپاشدا فەرمووی: (لەپاش ئەمە: لەبارەی کەسانێکەوە کە بوختانیان بۆ هاوسەرەکەی من کردووە پرس و راوێژتان پێ دەکەم، سوێند بە (الله) هەرگیز هیچ شتێکی خراپم لێ نەدیوە، ئەبێ دابێتیانە پاڵ کێ، سوێند بە (الله) هیچ شتێکی خراپ لەو پیاوەدا شك نابەم، هەرگیز نەهاتۆتە ماڵی من مەگەر لەکاتێکدا کە خۆم لەماڵەوە ئامادەبووبم، کاتێ دەردەچووم بۆ سەفەرێ ئەویش لەگەڵ مندا دەهات)، سەعدی کوڕی (معاذ) رەزای خوای لێ بێ هەستایەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگەم بدە با بە شمشێر بدەم لەملی ئەو کەسانەی ئەو بوختانەیان کردووە، پیاوێ لە خەزرەج هەستایەوە دایکی حەسانی کوڕی (ثابت) لە تیرەو هۆزی ئەوان پیاوە بوو، وتی: درۆت کرد، سوێند بە (الله) ئەگەر لە هۆزی خەزرەج بوونایە پێت خۆش نەبوو بدەی لەگەردنیان، هەتا کار گەیشتە ئەوەی لەمزگەوتدا خەریك بوو لەنێوان هۆزی ئەوس و خەزرەجدا جەنگ بەرپا ببێت، منیش ئاگام لە هیچ شتێ نیە، - نەخۆش بووم - لەئێوارەی ئەو رۆژەدا لەگەڵ دایکی (مسطح) بۆ سەرئاو چووینەدەرەوە پێی هەڵکەوت دوعای شەڕی لە (مسطح) کرد وتی: (مسطح) لەناوچێ، منیش پیایا هەڵشاخام و پێم وت: دایە گیان ئەوە قسە بە کوڕەکەت دەڵێی؟ بێدەنگ بووو بۆ جاری دووەم پێی هەڵکەوت وتی: (مسطح) لەناوچێ، منیش پێم وت: دایە گیان ئەوە قسە بە کوڕەکەت دەڵێی؟ بێدەنگ بوو، بۆ جاری سێیەم پێی هەڵکەوت، منیش پێم وت: دایە گیان ئەوە قسە بە کوڕەکەت دەڵێی؟ وتی: سوێند بە (الله) لەسەر تۆ قسەی پێ دەڵێم، وتم: لەسەر چی بۆ چی رویداوە؟ جا عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئیتر بەوردی و بەدوورودرێژی بەسەرهاتی بوختانەکەی بۆ گێڕامەوە، وتم: بوختانم بۆ کراوە و شتی وا وتراوە؟ وتی: بەڵێ، سوێند بە (الله) ئەوەندە پێی تێك چووم گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و

نەمزانی بۆچی لەماڵ دەرچووم سەرئاوەكەم نەكرد، لەرزم لێ هات، بە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم وت: بمنێرە بۆ ماڵی باوكم، غولامێكی لەگەڵ ناردم، چوومە ماڵەوە، دیم ئوم رومان لە خوارەوە بوو، پێشەوا ئەبو بەكریش رەزای خوای لێ بێ لەسەرەوە قورئانی دەخوێند، دایكم وتی: كچی خۆم چۆن هاتویتەتەوە؟ منیش بەسەرهاتەكەم بۆ گێڕایەوە، ئەو بوختانە ئەوەندەی كاریگەری لەسەر من بوو، ئەوەندە كاریگەری لەسەر ئەو نەبوو، دایكم وتی: كچی خۆم لەسەرخۆبەو گوێی مەدەرێ، سوێند بە (الله)، كەم ئافرەتی جوان هەیە لای پیاوەكەی خۆشەویست بێ لەپلار و توانج و زمانی هاوڕێكانی پارێزراو بێ و حەسودی پێ نەبەن، بۆیە ئەوەندە كاریگەری لەسەر تۆ هەیە، ئەوەندە كاریگەری لەسەر من نیە، وتی: وتم: باوكم ئاگادارە؟ وتی: بەڵێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاگادارە؟ وتی: بەڵێ، ئیتر فرمیسك لەچاوم هاتەخوارەوە و دەستم كرد بە گریان، پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ گوێی لەدەنگم بوو هاتەخوارەوە و بە دایكمی فەرموو: ئەوە چیەتی؟ بوختانەكەی پێ راگەیەنراوە، ئەویش فرمێسك بە چاوەكانیدا هاتەخوارەوەو فەرمووی: سوێندت لێ دەخۆم دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ ماڵی خۆت، منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ ماڵی من لەبارەی منەوە لە خزمەتكارەكەم (بەریرە) دەپرسێت، بەریرەش دەڵێت: سوێند بە (الله) شتی وا نیە ئەوەی نەنگی و عەیبە بێ لەو ژنەدا نیە، ئەوە نەبێ جار جارێ لەكاتی هەویر شێلاندا خەوی لێ دەكەوێ مەڕ مالآت دەچێ هەویرەكەی دەخوات، هەندێ لەهاوەڵان پیایا هەڵشاخان و قسەیان پێ وت، پێی وت: قسەی راست بكە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە و درۆ مەكە، ئەویش وتی: پاك و بێ عەیبی بۆ خوا! شتی وا چۆن دەبێ، سوێند بە (الله)، چۆن زەڕنگەر ئەوەی نەنگی و عەیبە بێ لەزێڕی ساغدا

شکی نابات منیش بەو شێوەیە هیچ شتێ لەو عائیشەدا شك نابەم، باسەکە دەگاتەوە بە کابرای بوختان بۆ کراو، دەڵێ: پاك و بێ عەیبی بۆ خوا! سوێند بە (الله)، لەوەتی هەم داوێنی ئافرەتم هەڵنەداوەتەوە، عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەو پیاوە لەغەزایەکدا لەپێناوی خوای گەورەدا شەهید بوو.

عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بەردەوام دایك و باوکم لەلام بوون هەتا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هات بۆلام، نوێژی عەسری کرد، دایك و باوکم چواردەوریان دابووم لەلای راست و چەپەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم شایەتومانی هێنا، سوپاسی خوای کرد بە شێوەیە کە شایستەی بێ، لەپاشدا فەرمووی: (لەپاش ئەمە: ئەی عائیشە! ئەگەر تۆ کارێکی خراپت کردووە یان ستەمت لەخۆت کردووە بگەرێرەوە بۆ لای خوا و تەوبە بکە، بێگومان خوای گەورە تەوبەو پەشیمانی بەندەی خۆی قبوڵ دەکات، عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئافرەتێکی ئەنصاری هات لەبەردەم دەرگا دانیشت، وتم: ئەوە ناترسی ئەو ئافرەتە بەپێی تێگەیشتنی خۆی شتێ بڵێ شایستەی شکۆ و رێزی تۆ نەبێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئامۆژگاری کرد، رووم کردە باوکم وتم: تۆ لەجیاتی من وەڵامی بدەرەوە، فەرمووی: چی بڵێم؟ رووم کردە دایکم وتم: تۆ لەجیاتی من وەڵامی بدەرەوە، فەرمووی: چی بڵێم؟ فەرمووی: کاتێ وەڵامیان نەدایەوە، شایەتومانم هێنا، سوپاسی خوای گەورەم کرد بە شێوەیە کە شایستەی بێ، لەپاشدا وتم: سوێند بە (الله)، ئەگەر پێتان بڵێم من ئەو کارەم نەکردووە، خوا شاهیدە کە من راستگۆم و ئەو کارەشم نەکردووە، هیچ سوودی بۆ من نابێ و باوەڕم پێ ناکەن چونکە ئەو قسە ئەوەندە باسکراوە و چووە بە گوێتاندا ئێوە باوەڕتان پێ کردووە، ئەگەر بشڵێم: بێگومان من ئەو کارەم کردووە، کە سوێند بە (الله)، نەمکردووە، ئێوە دەڵێن: بێگومان خۆی دانی ناوە بە ئەنجامدانی کارەکەدا،

سوێند بە (الله)، بەڕاستی لەناوا هەڵوێستێكدا باشترین داستان بیكەمە سەرمەشق بۆ خۆم فەرمایشتەكەی یەعقوبی باوكی یوسفە لەكاتێكدا كە فەرمووی: (**فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ**). سورة يوسف: ١٨. واتە: چارەی من "لە بەرامبەر ئەو رووداوە تاڵەوە" هەر صەبرو ئارامێكی جوان و بێ سكاڵاو بێ قەرارییە، سەبرێكی وا شایستەی پلەو پایەی پێغەمبەرێتی بێت، هەر خواش داوای یارمەتی لێدەكرێ بۆ هەڵگرتنی ئەو بەڵایەی ئێوە وەسفی دەكەن و دەیڵێن.

عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەو كاتەدا وەحی هات بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئێمە هەموومان بێدەنگ بووین، هەتا وەحی لەسەر هەڵگیرا، بەڵام من خۆشی و شادیم دی بەڕووخساریەوەو بۆم دەركەوت دەربارەی بەرائەتی من ئایەت دابەزی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، كە وەحی بۆ دەهات ئارەقی دەكرد، ئارەقی نێوچاوانی دەسڕی و دەیفەرموو: ئەی عائیشە موژدەت لێ بێ، خوای گەورە بەرائەتی تۆی پێ راگەیاندم كە تۆ پاكی و دووری لەو تاوانە، عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەو كاتەدا زیاتر رقم هەستا هەتا پێشتر، باوك و دایكم وتیان: هەستە بچۆ بۆلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتم: نەخێر، سوێند بە (الله)، ناچم بۆلای و سوپاسی ئەویش و ئێوەش ناكەم، بەڵكو سوپاسی ئەوە دەكەم كە پاكی منی راگەیاند و ئایەتی لەسەر بەرائەت و پاكێتیم دابەزاند، بێگومان ئێوە ئەو هەواڵەتان بیستوو ئینكاریتان نەكرد و بە پەرچی ئەوانەتان نەدایەوە كە بوختانیان بۆ كردم، نەشتان گۆڕی.

عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: زەینەبی كچی جەحش بەهۆی ئیمانەكەیەوە خوا پاراستی، جگە لە خێر و چاكە هیچی تری نەوت، بەڵام حەمنەی خوشكی گوناهباربوو تێداچوو لەگەڵ ئەوانەی كە تیاچوون و گوناهباربوون،

ئەوانەی کە برویان دا بەو بوختانە (مسطح) و حەسانی کوڕی (ثابت) بوون، لەگەڵ (عبد الله)ی کوڕی سەلول سەرۆکی دووڕووەکان، کە ئەو لەهەموو کەس زیاتر بەشداری ئەو بوختانەی دەکردو بڵاوی دەکردەوە، ئەو کەسەش بەشداری زۆری ئەو تاوانەی کرد حەمنە بوو، - (مسطح) کەسێکی هەژار بوو پورزای پێشەوا ئەبو بەکریش رەزای خوای لێ بێ بوو پێشتر یارمەتی دەدا — سوێندی خوارد کە چی تر یارمەتی نەدا و هیچ سودێکی پێ نەگەیەنێ، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ**). سورة النور: ٢٢. واتە: ئەی خەڵکینە! با ئەوانەتان دەوڵەمەندن و خاوەنی فەزڵ و سامان و ماڵن، سوێند نەخۆن کە بەخشش و کەرەمی خۆیان لە نزیکان و خزم و بێنەوایان و کۆچکەرانی رێگەی خوا بگرنەوە لەبەر ئەو بوختانەی بەرامبەریان کرا، ئەڵبەتە یەکێ لەوانە دەستی خستبووە ناو مەسەلەکەی خاتوو عائیشەوە، (مسطح)ی پورزای پێشەوا (ئەبوبەکر) بوو، ئەو پیاوێکی زۆر لات و بێ دەسەڵات و هەژار بوو، ئەبوبەکر دەستگیرۆیی ئەکرد، کەچی کاتێ ئەو بوختانە پێش هات، ئەویش بەشی خۆی تێخست!! جا ئەبوبەکر سوێندی لێ خوارد ئیتر هیچی نەداتێ.. ئەوسا خوایش ئەم ئایەتەی دابەزاندو نەهی کرد لە پیاوانی مەردو جوامێرو دەهەندە کە سوێند بخۆن دەست بگرنەوە لە دەستگرۆیی خزمان و هەژاران و کۆچکەرانی رێگەی خوا. دەبا ئەو جۆرە مەردانە عەفویان بکەن و چاویان لێ بپۆشن لەوەی بەسەریاندا دێت ببوورن و پشتگوێی بخەن و بڕۆنەوە سەر پیاوەتییەکەی جارانی خۆیان، مەگەر ئێوە - خاوەن بەخششان — پێتان خۆش نیە کە خوا لێتان ببوورێت!! جا کاتێ پێشەوا (ئەبوبەکر) ئەو ئایەتەی بیست، وتی: (بلى أحب أن يغفر الله لي) بەڵێ، بەڵێ، پێم خۆشە خوا لێم خۆشبێ، ئیتر پاش

ئەوە جیرەکەی "مستەح"ی ناردەوە بۆیی و، لێی خۆش بوو، جا دوای ئەوەش (حەسان و، حیمنەو، میستەح) شەلاقی ئەو بوختانەیان لێ درا، دیارە ئەم ئایەتە رێزو پلەو جێگایەکی ئێجگار مەزنی پێشەوا ئەبوبەکر نیشان ئەدات. (تەفسیری (ابن کثیر)، چونکە خوا زۆر لێبوردەیە، زۆریش بەسۆزو میهرەبانە.

﴿**وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ**﴾. تا کۆتایی ئایەتەکە، واتە: پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ: ﴿**أَنْ يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ**﴾. واتە: (مسطح) هەتا دەگاتە: ﴿**أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ**﴾. پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بەڵێ، سوێند بە (الله)، ئەی پەروەردگارم، ئێمە پێمان خۆشە لێمان خۆش بیت، ئیتر ئەو یارمەتیەی گێراوە بۆ (مسطح) دەستگیرۆیی دەکرد.

٣١٨١ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَ عُذْرِي قَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ وَتَلاَ الْقُرْآنَ، فَلَمَّا نَزَلَ، أَمَرَ بِرَجُلَيْنِ وَامْرَأَةٍ فَضُرِبُوا حَدَّهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئایەت دابەزی و بەرائەت و پاکێتی منی راگەیاند، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا لەسەر مینبەر، ئایەتەکانی خوێندەوە، کە لەسەر مینبەر دابەزی فەرمانی دا دوو پیاو و ئافرەتێ سزا بدرێن و داری حەدیان لێ بدرێ لەسەر ئەو بوختانەی کە کردیان، کە بریتی بوون لە (مسطح) و حەسانی کوڕی (ثابت) و حەمنەی کچی جەحش.

دەربارەی سورەتی (الفرقان).

## ٢٦ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الفُرْقَانِ

٣١٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: أَنْ تَزْنِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، وَالأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ گوناهێ گەورەترین گوناهە لەلای خوا؟ فەرمووی: (هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت لەکاتێکدا کە دروستی کردویت). فەرمووی: وتم: ئەی لەدوای ئەوە؟ فەرمووی: (منداڵەکەت بکوژی لەترسی ئەوەی خواردنت لەگەڵ بخوات). وتی: وتم: ئەی لەپاش ئەوە چی تر؟ فەرمووی: (زینا لەگەڵ هاوسەری دراوسێکەت بکەیت).

٣١٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ أَبُو زَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاصِلٍ الأَحْدَبِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ، وَأَنْ

تَقْتُلَ وَلَدَكَ مِنْ أَجْلِ أَنْ يَأْكُلَ مَعَكَ أَوْ مِنْ طَعَامِكَ، وَأَنْ تَزْنِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ. قَالَ: وَتَلاَ هَذِهِ الآيَةَ (وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا يُضَاعَفْ لَهُ العَذَابُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا). حَدِيثُ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، وَالأَعْمَشِ، أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ شُعْبَةَ، عَنْ وَاصِلٍ، لأَنَّهُ زَادَ فِي إِسْنَادِهِ رَجُلاً. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. هَكَذَا رَوَى شُعْبَةُ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَمْرَو بْنَ شُرَحْبِيلَ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ گوناهێ گەورەترین گوناهە لەلای خوا؟ فەرمووی: (هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت لەكاتێكدا كە دروستی كردویت). فەرمووی: وتم: ئەی لەدوای ئەوە؟ فەرمووی: (منداڵەكەت بكوژی لەترسی ئەوەی خواردنت لەگەڵ بخوات). وتی: وتم: ئەی لەپاش ئەوە چی تر؟ فەرمووی: (زینا لەگەڵ هاوسەری دراوسێكەت بكەیت). فەرمووی: ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا (٦٨) يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا)**. سورة الفرقان: ٦٨ - ٦٩. واتە: وە ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەكی تر لەگەڵ (الله)خوادا ناپەرستن، كەسیش ناكوژن كەخوا كوشتنی ئەوی یاساغ(حەرام) كردبێت بەهەقو ڕەوا نەبێ، وە زیناو داوێن پیسی ناكەن و نزیكی ناكەون، جا ئەوەی ئەو كارە خراپانە بكات ئەوە تووشی سزاو ئازار و ڕیسوایی دەبێت، لەقیامەتیشدا ئازار و سزای بۆ چەند بەرابەر دەكرێت و بە زەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزاریەوە دەبێ ژیانی تێدا بەرێتەسەر.

**دەربارەی سورەتی (الشعراء).**

**٢٧ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الشُّعَرَاءِ**

٣١٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الأَشْعَثِ أَحْمَدُ بْنُ الْمِقْدَامِ العِجْلِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الطُّفَاوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ) قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا صَفِيَّةُ بِنْتَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ إِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئًا، سَلُونِي مِنْ مَالِي مَا شِئْتُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَهَكَذَا رَوَى وَكِيعٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، نَحْوَ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الطُّفَاوِيِّ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَائِشَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ)**. سورة الشعراء: ٢١٤. واتە: سەرەتا عەشرەت و خزمە نزیكەكانت زۆر بترسێنە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی صەفیەی كچی (عبد المطلب)، ئەی (فاطمة)ی كچی موحەممەد، ئەی نەوەی (عبد المطلب)، من لەلای خوا هیچم پێ ناكرێ بۆ ئێوە، هەرچیتان دەوێ لە ماڵ و سامانم داوام لێ بكەن).

٣١٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا بْنُ عَدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو الرَّقِّيُّ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ) جَمَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

قُرَيْشًا فَخَصَّ وَعَمَّ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ فَإِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللهِ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا، يَا مَعْشَرَ بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ فَإِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللهِ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا، يَا مَعْشَرَ بَنِي قُصَيٍّ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ فَإِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا، يَا مَعْشَرَ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ فَإِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ فَإِنِّي لاَ أَمْلِكُ لَكِ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا، إِنَّ لَكِ رَحِمًا سَأَبُلُّهَا بِبَلاَلِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعَيْبُ بْنُ صَفْوَانَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ)**. سورة الشعراء: ٢١٤. واتە: سەرەتا عەشرەت و خزمە نزیکەکانت زۆر بترسێنە. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قورەیشی بانگ کرد کە کۆبونەوە، هەم بەشێوەی بەگشتی هەم بەشێوەی تایبەتی مەترسی نانە بەرو هۆشیاری کردنەوە، یەکە بە یەکە ناوی هێنان و فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی قورەیش خۆتان لە ئاگری دۆزەخ رزگارکەن، بێگومان من لەلای خوا دەسەڵاتی هیچم نیە بۆتان ناتوانم قازانج و زیانتان پێ بگەیەنم، ئەی کۆمەڵی نەوەی (عبد مناف)، خۆتان لە ئاگری دۆزەخ رزگارکەن، بێگومان من لەلای خوا دەسەڵاتی هیچم نیە بۆتان ناتوانم قازانج و زیانتان پێ بگەیەنم، ئەی کۆمەڵی نەوەی قوصەی، خۆتان لە ئاگری دۆزەخ رزگارکەن، بێگومان من لەلای خوا دەسەڵاتی هیچم نیە بۆتان ناتوانم قازانج و زیانتان پێ بگەیەنم، ئەی کۆمەڵی نەوەی (عبد المطلب)، خۆتان لە ئاگری دۆزەخ رزگارکەن، بێگومان من لەلای خوا دەسەڵاتی هیچم نیە بۆتان ناتوانم قازانج و زیانتان پێ بگەیەنم، ئەی (فاطمة)ی

کچی موحەممەد! خۆت لە دۆزەخ رزگارکە، بزانە من لەلای خوا دەسەلاتی هیچم نیە بۆت ناتوانم قازانج و زیانت پێ بگەیەنم، ئەوەندە هەیە لە دنیادا مافی خزمایەتیتان بەجێ ئەهێنم).

٣١٨٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زَيْدٍ، عَنْ عَوْفٍ، عَنْ قَسَامَةَ بْنِ زُهَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَشْعَرِيُّ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَ (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ) وَضَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُصْبُعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ فَرَفَعَ مِنْ صَوْتِهِ فَقَالَ: يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ يَا صَبَاحَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مُوسَى. وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنْ عَوْفٍ، عَنْ قَسَامَةَ بْنِ زُهَيْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أَبِي مُوسَى، وَهُوَ أَصَحُّ، ذَاكَرْتُ بِهِ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ فَلَمْ يَعْرِفْهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مُوسَى.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ)**. سورة الشعراء: ٢١٤. واتە: سەرەتا عەشرەت و خزمە نزیکەکانت زۆر بترسێنە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەنجەی خستە هردوو گوێچکەیەوە و بەدەنگی بەرز هاواری کردو فەرمووی: (ئەی نەوەی (عبد مناف) (یا صباحاه) - وشەیەکە لەکاتی روودانی کارێکی گەورەدا خەلکی پێ ئاگادار دەکرێتەوە بۆ ئەوەی خۆیانی بۆ ئامادە بکەن -).

دەربارەی سورەتی (النمل).

## ٢٨ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ النَّمْلِ

٣١٨٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَوْسِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تَخْرُجُ الدَّابَّةُ مَعَهَا خَاتَمُ سُلَيْمَانَ وَعَصَا مُوسَى فَتَجْلُو وَجْهَ الْمُؤْمِنِ وَتَخْتِمُ أَنْفَ الكَافِرِ بِالخَاتَمِ، حَتَّى إِنَّ أَهْلَ الخُوَانِ لَيَجْتَمِعُونَ فَيَقُولُ: هَاهَا يَا مُؤْمِنُ، وَيُقَالُ: هَاهَا يَا كَافِرُ، وَيَقُولُ: هَذَا يَا كَافِرُ وَهَذَا يَا مُؤْمِنُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ فِي دَابَّةِ الأَرْضِ. وَفِيهِ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، وَحُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((دابة) گیاندارێکە لەمەککە یان لەهەرشوێنێکی تر پەیدا دەبێ، مۆرەکەی سولەیمان و داردەستەکەی موسای پێیە، رووخساری باوەڕدار دەگەشێتەوە و شەوق دەداتەوە، بە مۆرەکە نیشانە دەدات لەسەر لووتی کافر، تەنانەت ئەو خەڵکانەی کە لەسەر سفرەو خوان کۆدەبنەوە، بەوەی رووخساری دەگەشێتەوە دەڵێن: ئەی باوەڕدار، بەوەش کە مۆر دراوە لەسەر لووتی دەڵێن: ئەی کافر).

دەربارەی سورەتی (القصص).

## ٢٩ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ القَصَصِ

٣١٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ كَيْسَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ الأَشْجَعِيُّ، هُوَ كُوفِيٌّ اسْمُهُ: سَلْمَانُ مَوْلَى عَزَّةَ الأَشْجَعِيَّةِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَمِّهِ: قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ القِيَامَةِ فَقَالَ: لَوْلاَ أَنْ تُعَيِّرَنِي بِهَا قُرَيْشٌ أَنَّ مَا يَحْمِلُهُ عَلَيْهِ الجَزَعُ، لأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يَزِيدَ بْنِ كَيْسَانَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە مامی واتە ئەبو (طالب) فەرموو: (بڵێ (**لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ**) با لەڕۆژی قیامەتدا بیكەمە بەڵگە و شایەت بۆت). وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە قورەیش تانەم لێ دەدەن و عەیب و عار دەدەنە پاڵم، دانم پێدا دەناو بە وتنی دڵی تۆم خۆش دەكرد و چاوەكانتم رۆشن دەكردەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ**). سورة القصص: ٥٦. واتە: بێگومان تۆ ناتوانی ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم كەسێ بخەیتە سەر رێی راست و بڕوا هێنان كە بۆ خۆت خۆشت بوێ، هەر چەندە هەوڵ و تەقالای لەگەڵ بدەیت، بەڵام خوا رێنمایی هەر كەسێ خۆی بیەوێ دەكا.

دەربارەی سورەتی (العنكبوت).

۳۰ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ العَنْكَبُوتِ

۳۱۸۹ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ مُصْعَبَ بْنَ سَعْدٍ، يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ سَعْدٍ، قَالَ: أُنْزِلَتْ فِيَّ أَرْبَعُ آيَاتٍ، فَذَكَرَ قِصَّةً، فَقَالَتْ أُمُّ سَعْدٍ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَ اللَّهُ بِالبِرِّ، وَاللَّهِ لاَ أَطْعَمُ طَعَامًا وَلاَ أَشْرَبُ شَرَابًا حَتَّى أَمُوتَ أَوْ تَكْفُرَ، قَالَ: فَكَانُوا إِذَا أَرَادُوا أَنْ يُطْعِمُوهَا شَجَرُوا فَاهَا فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەعدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: چوار ئایەت لەسەر من دابەزی، راوی بەسەرهاتەكەی گێڕایەوە، دایكی سەعد وتی: مەگەر خوای گەورە فەرمانی نەكردووە بە چاكە لەگەڵ دایك و باوك، دەی سوێند بە (الله)، نان و ئاو ناخۆم و ناخۆمەوە هەتا دەمرم یان پاشگەزدەبیتەوە لە ئیسلام و دەبیتەوە بەبێ باوەڕ، وتی: كاتێ كە خواردنیان دەدایە بە داری دەمیان دادەچەقاندو بەزۆر ئاو و خواردنیان دەكردە ناودەمیەوە، جا ئەم ئایەتە دابەزی: (وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا). سورة العنكبوت: ۸. واتە: ئێمە وەسیەتمان بە ئادەمیزاد كرد كەلەگەڵ دایك و باوكیا چاكە بكا، واتە: هەمیشە كارچاك بێت لە گەڵیانداو، خۆی ماندووبكات بۆیان.

۳۱۹۰ - (ضعيف الإسناد جدا) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ بَكْرٍ السَّهْمِيُّ، عَنْ حَاتِمِ بْنِ أَبِي صَغِيرَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (وَتَأْتُونَ فِي

نَادِيكُمُ الْمُنْكَرَ) قَالَ: كَانُوا يَخْذِفُونَ أَهْلَ الأَرْضِ وَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ حَاتِمِ بْنِ أَبِي صَغِيرَةَ عَنْ سِمَاكٍ.

واتە: لە ئوممو هانیەوە دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنْكَرَ)** سورة العنكبوت: ٢٩. واتە: وە لەیانەی کۆبوونەوەی خۆتاندا کاری زۆر خراپ و دزێوو ناحەز ئەکەن؟!

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: (پەلەپیتکەیان دەگرتە خەڵك و قەشمەری و گاڵتەیان پێ دەکردن).

## دەربارەی سورەتی (الروم).

### ٣١ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الرُّومِ

٣١٩١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ ابْنُ عَثْمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الجُمَحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأَبِي بَكْرٍ فِي مُنَاحَبَةِ: (الم غُلِبَتِ الرُّومُ) أَلاَ احْتَطْتَ يَا أَبَا بَكْرٍ، فَإِنَّ البِضْعَ مَا بَيْنَ الثَّلاَثِ إِلَى تِسْعٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

لە نێوان فارس و رۆمەکاندا جەنگێك هەڵگیرسا، ئینجا فارسەکان بەسەر رۆمەکاندا زاڵبوون، پەیامبەر صلى الله عليه وسلم خۆیی و هاوەڵانی گەلێ پێیان سەخڵەت و قورس بوو! لەولایشەوە موشریکەکان زۆر خۆشحاڵ و دڵشاد بوون، چونکە موشریکەکان بە موسڵمانەکانیان گوت: ئێوەیش وەك رۆمەکان تێکدەشکێن

و ئێمە زاڵ دەبین بەسەرتانا.

ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتانە دابەزی: (**غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ**). سورة الروم: ١ - ٢. واتە: رۆمەكان بە دەستی فارسەكان تێكشكان لە بەشێكی زۆر نزیك بە ولاتی عەرەبەكانەوە، یان لە (نزمترین شوێنی زەویدا).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پێشەوا ئەبو بەكری فەرموو: (برۆ گرەویان لەگەڵ بكە كە رۆمەكان سەردەكەون بەسەر فارسەكاندا لەنێوان سێ بۆ نۆ ساڵی تر).

٣١٩٢ - (صحيح بما بعده) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سُلَيْمَانَ الأَعْمَشِ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ ظَهَرَتِ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ فَأَعْجَبَ ذَلِكَ الْمُؤْمِنِينَ فَنَزَلَتْ: (الم غُلِبَتِ الرُّومُ)، إِلَى قَوْلِهِ: (يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ) قَالَ: فَفَرِحَ الْمُؤْمِنُونَ بِظُهُورِ الرُّومِ عَلَى فَارِسَ.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، كَذَا قَرَأَ نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ (غَلَبَتِ الرُّومُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەجەنگی بەدردا رۆمەكان سەركەوتن بەسەر فارسەكاندا، باوەڕدارەكان زۆر خۆشحاڵ بوون بەو سەرخستن و یارمەتی خوایەو بە تێكشكانی فارسەكان، جا ئەم ئایەتانە دابەزی: (**الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ**). سورة الروم: ١ - ٥. واتە: ئەم پیتانە هێماو ئاماژەن بۆ (تەحەددیی)و دەستەو سانی عەرەبەكان بەرامبەر بە قورئان و

دەرەنجامیش پەککەوتنیان و هیچ لێنەهاتنیان، رۆمەکان بە دەستی فارسەکان تێکشکان لە بەشێکی زۆر نزیك بە وڵاتی عەرەبەکانەوە، یان لە (نزمترین شوێنی زەویدا) کە دەکەوێتە نێوان (ئوردن و فەلەستین)، ئەوەش لە ساڵی (٦١٣-٦١٤)ز، لە سەردەمی (یزدجورد)، - ئاخر پاشای فارسەکان- بوو، هەر ئەو یەزدجوردەشبوو نامەکەی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دڕاند، کاتێ کە بانگی کرد بۆ ئیسلامبوون، پاشان پێغەمبەریش نزای شەڕی لێکرد، تا لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا کوژراو ئەوانیش (رۆمەکان) پاش زاڵبوونی فارسەکان بەسەریاندا زاڵ دەبنەوە.

راڤەکارانی قورئان دەڵێن: لە نێوان فارس و رۆمەکاندا جەنگێك هەڵگیرسا، ئینجا فارسەکان بەسەر ڕۆمەکاندا زاڵبوون، پەیامبەر صلی الله علیه وسلم خۆیی و هاوەڵانی گەلێ پێیان سەخڵەت و قورس بوو! لەولایشەوە موشریکەکان زۆر خۆشحاڵ و دڵشاد بوون، چونکە موشریکەکان بە موسڵمانەکانیان گوت: ئێوەیش وەك رۆمەکان تێکدەشکێن و ئێمە زاڵ دەبین بەسەرتانا.. پێشەوا (ئەبوبەکر) فەرمووی: دەك نەیبینن! لەچەند ساڵێکدا، واتە: لە نێوان (٣-٩) ساڵدا، رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ دەبنەوە، بەڵێ وابوو دوای حەوت ساڵ ئەنجامەکە وا دەرچووو فارسەکان تێکشکان. ئەمەیش گەورەترین بەڵگەیە بۆ ڕاستیی پەیامبەرو قورئان، دەتوانی سەیرێکی تەفسیری (ئیبن کەسیر) بکەیت. هەموو کارو بڕیارو دەسەڵاتێك پێش زاڵبوون و پاش زاڵبوون هەر بۆ خوایە، ئیتر لەو رۆژەدا کە رۆم بەسەر فارسدا زاڵ دەبێتەوە، باوەڕدارەکان خۆشحاڵ دەبن بەو سەرخستن و یارمەتی خوایەو بە تێکشکانی فارسەکانیش زۆر خۆشحاڵ دەبن، چونکە ئەوانیش وەك موشریکەکان بێ کتێب و بێ نامەن، دیارە هەرکەسێك خوا خۆی بییەوێ یارمەتی

دەداو سەریدەخات، هەر ئەویشە خاوەن دەسەڵاتداری دلۆڤان.

٣١٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الفَزَارِيِّ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الأَرْضِ) قَالَ: غُلِبَتْ وَغَلَبَتْ، كَانَ الْمُشْرِكُونَ يُحِبُّونَ أَنْ يَظْهَرَ أَهْلُ فَارِسَ عَلَى الرُّومِ لأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ أَهْلُ أَوْثَانٍ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ أَنْ يَظْهَرَ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ لأَنَّهُمْ أَهْلُ كِتَابٍ، فَذَكَرُوهُ لأَبِي بَكْرٍ فَذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ سَيَغْلِبُونَ، فَذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ لَهُمْ، فَقَالُوا: اجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ أَجَلاً، فَإِنْ ظَهَرْنَا كَانَ لَنَا كَذَا وَكَذَا، وَإِنْ ظَهَرْتُمْ كَانَ لَكُمْ كَذَا وَكَذَا، فَجَعَلَ أَجَلاً خَمْسَ سِنِينَ، فَلَمْ يَظْهَرُوا، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: أَلاَ جَعَلْتَهُ إِلَى دُونَ، قَالَ: أُرَاهُ العَشْرَ، قَالَ سَعِيدٌ: وَالْبِضْعُ مَا دُونَ العَشْرِ، قَالَ: ثُمَّ ظَهَرَتِ الرُّومُ بَعْدُ. قَالَ: فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: (الم غُلِبَتِ الرُّومُ)، إِلَى قَوْلِهِ: (يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ) قَالَ سُفْيَانُ: سَمِعْتُ أَنَّهُمْ ظَهَرُوا عَلَيْهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ.

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتانە **(الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ)**. سورة الروم: ١ - ٣. واتە: ئەم پیتانە هێماو ئامـاژەن بـۆ (تەحەددیی)و دەسـتەو سـانی عەرەبەکان بەرامبەر بە قورئان و دەرەنجامیش پەککەوتنیان و هیچ لێنەهاتنیان، رۆمەکان بـە دەسـتی فارسـەکان تێکشـکان لـە بەشـێکی زۆر نزیـك بـە وڵاتـی عەرەبەکانەوە، یان لە (نزمترین شوێنی زەویدا).

ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: موشریکەکان خۆشحاڵ دەبوون بە سەرکەوتنی فارسەکان بەسەر رۆمەکاندا، چونکە هەردوو لایان بت پەرست بوون،

موسوڵمانەكانیش حەزیان دەكرد ڕۆمەكان سەركەون بەسەر فارسەكاندا، چونكە ڕۆمەكان خاوەن نامەی ئاسمانی بوون، ئەمەیان باس كرد بۆ پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ، ئەویش باسەكەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: (بەڵكو ڕۆمەكان سەردەكەونەوە بەسەر فارسەكاندا). موشریكەكان بە پێشەوا ئەبو بەكریان ڕەزای خوای لێ بێ وت: ماوەیەكمان بۆ دابنێ بزانین ڕاست دەكەن ڕۆمەكان سەردەكەونەوە بەسەر فارسەكاندا، ئەگەر ڕۆمەكان سەركەوتن ئەوە ئەوەندەو ئەوەندە بۆ ئێوە، خۆ ئەگەر فارسەكانیش سەركەوتن ئەوە ئەوەندەو ئەوەندە بۆ ئێمە، جا ماوەی پێنجساڵیان دیاری كرد، ڕۆمەكان سەرنەكەوتن، باسەكەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: (با تا نزیكەی دە ساڵێكتان دیاری بكردایە)، فەرمووی: لەپاشدا ڕۆمەكان سەركەوتن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) بِنَصْرِ اللَّهِ)**. سورة الروم: ١ – ٥. سوفیان فەرمووی: بیستوومە لەكاتی جەنگی بەدردا ڕۆمەكان سەركەوتوون بەسەر فارسەكاندا.

٣١٩٤ – (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ نِيَارِ بْنِ مُكْرَمٍ الأَسْلَمِيِّ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ) فَكَانَتْ فَارِسُ يَوْمَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ قَاهِرِينَ لِلرُّومِ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ ظُهُورَ الرُّومِ عَلَيْهِمْ لأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ أَهْلُ كِتَابٍ، وَفِي ذَلِكَ قَوْلُ اللهِ تَعَالَى: (وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ) فَكَانَتْ

قُرَيْشٌ تُحِبُّ ظُهُورَ فَارِسَ لأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ لَيْسُوا بِأَهْلِ كِتَابٍ وَلاَ إِيمَانٍ بِبَعْثٍ، فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ، خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ يَصِيحُ فِي نَوَاحِي مَكَّةَ (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ) قَالَ نَاسٌ مِنْ قُرَيْشٍ لأَبِي بَكْرٍ: فَذَلِكَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ، زَعَمَ صَاحِبُكَ أَنَّ الرُّومَ سَتَغْلِبُ فَارِسَ فِي بِضْعِ سِنِينَ، أَفَلاَ نُرَاهِنُكَ عَلَى ذَلِكَ، قَالَ: بَلَى، وَذَلِكَ قَبْلَ تَحْرِيمِ الرِّهَانِ، فَارْتَهَنَ أَبُو بَكْرٍ وَالمُشْرِكُونَ وَتَوَاضَعُوا الرِّهَانَ، وَقَالُوا لأَبِي بَكْرٍ: كَمْ تَجْعَلُ البِضْعُ ثَلاَثُ سِنِينَ إِلَى تِسْعِ سِنِينَ، فَسَمِّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ وَسَطًا تَنْتَهِي إِلَيْهِ، قَالَ: فَسَمَّوْا بَيْنَهُمْ سِتَّ سِنِينَ، قَالَ: فَمَضَتِ السِّتُّ سِنِينَ قَبْلَ أَنْ يَظْهَرُوا، فَأَخَذَ الْمُشْرِكُونَ رَهْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَلَمَّا دَخَلَتِ السَّنَةُ السَّابِعَةُ ظَهَرَتِ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ، فَعَابَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ تَسْمِيَةَ سِتِّ سِنِينَ، لأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ فِي بِضْعِ سِنِينَ، قَالَ: وَأَسْلَمَ عِنْدَ ذَلِكَ نَاسٌ كَثِيرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ نِيَارِ بْنِ مُكْرَمٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي الزِّنَادِ.

واتە: لە نیاری كوڕی موكەڕەمی ئەسلەمیەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ ئەم ئایەتانە دابەزی: **(الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤))**. سورة الروم: ١ - ٤.

لەوكاتەدا فارسەكان سەركەوتبون بەسەر ڕۆمەكاندا و تێكیان شكاندبوون، موسوڵمانەكانیش حەزیان دەكرد ڕۆمەكان سەركەون بەسەر فارسەكاندا، چونكە خۆیان و ڕۆمەكان خاوەن نامەی ئاسمانی بوون، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ)**. سورة الروم: ٤ - ٥. واتە: كاتێ كە ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ بوو، ئەوكاتە باوەڕدارەكان

خۆشحاڵ دەبن بەو سەرخستن و یارمەتی خوایەو بە تێکشکانی فارسەکانیش زۆر خۆشحاڵ دەبن، چونکە ئەوانیش وەك موشریکەکان بێ کتێب و بێ نامەن، دیارە هەرکەسێك خوا خۆی بییەوێ یارمەتی دەداو سەریدەخات، هەر ئەویشە خاوەن دەسەڵاتداری دلۆڤان.

قورەیش خۆشحاڵ دەبوون بە سەرکەوتنی فارسەکان بەسەر رۆمەکاندا، چونکە هەردوو لایان بێ کتێب و بێ نامە بوون و بت پەرست بوون، باوەڕیان بەزیندووبوونەوە نەبوو، کاتێ کە ئەم ئایەتانە دابەزی: (**الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ (٤)**). سورة الروم: ١ - ٤.

هەندێ لە قورەیشیەکان بە پێشەوا ئەبو بەکریان رەزای خوای لێ بێ وت: با ئەوە لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بمێنێ بزانین کاممان راست دەکەین، هاوڕێکەتان واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێی وایە لەنێوان سێ بۆ دە ساڵی تر رۆمەکان سەردەکەون بەسەر فارسەکاندا، بۆ گرەومان لەگەڵ ناکەیت لەسەر ئەوە، تا ئەو کاتە گرەوکردن لەسەر قومار حەرام نەکرابوو، ئیتر پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ و هاوبەش بۆ خوا دانەران لەسەر ماڵ و کاتی گرەوەکە رێکەوتن، وتیان: (بضع) لەنێوان سێ بۆ نۆ ساڵە، تۆ لە نێوانیاندا ساڵێ دابنێ، ئەوەبوو شەش ساڵیان دانا، بڕیاریاندا شەش ساڵ بێ، شەش ساڵەکە تەواو بوو رۆمەکان سەرنەکەوتن، هاوبەش بۆ خوا دانەران بردیانەوە و ماڵەکەی پێشەوا ئەبو بەکریان برد بۆ خۆیان، هەرکە پێیان نایە ساڵی حەوتەمەوە رۆمەکان سەرکەوتنبەسەر فارسەکاندا، موسوڵمانان سەرکۆنەی پێشەوا ئەبو بەکریان کرد کە بۆچی بڕیاری لەسەر شەش ساڵ داوە، لەبەرئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی: (**فِي بِضْعِ سِنِينَ**).

فەرمووی: لەوکاتەدا خەڵکێکی زۆر موسوڵمان بوون.

دەربارەی سورەتی (لقمان).

## ٣٢ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ لُقْمَانَ

٣١٩٥ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ زَحْرٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَبِيعُوا الْقَيْنَاتِ وَلاَ تَشْتَرُوهُنَّ وَلاَ تُعَلِّمُوهُنَّ، وَلاَ خَيْرَ فِي تِجَارَةٍ فِيهِنَّ وَثَمَنُهُنَّ حَرَامٌ، وَفِي مِثْلِ ذَلِكَ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةَ (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللهِ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا يُرْوَى مِنْ حَدِيثِ الْقَاسِمِ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ وَالْقَاسِمُ ثِقَةٌ، وَعَلِيُّ بْنُ يَزِيدَ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ، سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: الْقَاسِمُ ثِقَةٌ، وَعَلِيُّ بْنُ يَزِيدَ يُضَعَّف.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەتان گۆرانی بێژ مەفرۆشن و مەشیان کڕن و فێریان مەکەن، خێر لە بازرگانی کردن بەوانەوە نیە، نرخیان حەرامە). لەهاوشێوەی ئەوەشدا ئەم ئایەتانە دابەزیوە: (**وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ**). سورة لقمان: ٦. واتە: لە نێو خەڵکدا هەیە، وتەی بێهودە: شا نامەی عەجەم، یان هەر فیکرەیەکی رووخێنەر، لە تۆی کتێبێکدا، یان لە ناو (سیدی)یەکدا دەکڕێ، یان بۆ خۆی دەینووسێ و، بۆ چەواشەکردنی خەڵك بڵاوی دەکاتەوە. تا خەڵکی لە ڕێگەی خوا چەواشەو گومڕا بکات، مەبەستی ئەوەیە کە مەردوم سەرگەرم بکات بە گۆرانیی و ڕابواردنەوە. بەڵێ.. هەر گۆرانییەك ئارەزوو بورووژێنێی و بەرەو فەسادو بێ ڕەوشتی مرۆڤ هەڵنێت، وەك گۆرانی بە بەژن و

بالآی ئافرەتانداو جوانکردنی عـارەق و.. هتـد، ئـەوە یـەك دەنگـی زانایـان هەیـە لەسەر قەدەغەو حەرامێتیی.. دەشڵێن مۆسیقایەکیش لەگەڵ ئەوانەدا بـێ حـوکمی هەروایە، ئەو کارەش لە ڕووی نەفامیی و نەزانینـەوە دەکـا. واتـە: بـێ ئـەوە گـوێ بداو بزانێ بە مەترسی کارەکـەی، وە ئایەتـەکانی قورئـانیش دەکاتـە گاڵتـە جـاڕی خۆی، ئەوانە ئەو کارانە دەکەن سزایەکی ئابڕوو بەریان بۆ هەیە.

**دەربارەی سورەتی (السجدة).**

**٣٣ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ السَّجْدَةِ**

٣١٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأُوَيْسِيُّ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلاَلٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ) نَزَلَتْ فِي انْتِظَارِ هَذِهِ الصَّلاَةِ الَّتِي تُدْعَى العَتَمَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی :ئەم ئایەتە لەسەر چاوەڕوانی نوێژی عیشا دابەزی: **(تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ)**. سورة السجدة: ١٦. واتە: کەلەکەو تەنیشـتیان، بـەجێ و نوێنەکانیانـەوە دوورە، واتە: لەبەر عیبادەت و شەو نوێژ، سەر لە سەرین نانێن و خەویان نیە.

٣١٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ

بَشَرٍ، وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ (فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەيرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموويـەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويـەتی: (خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ئەو بـەهرەو نـاز و نیعمەتـەی خـۆم ئامـادەم كـردووە بـۆ بەنـدە سـاڵح و چـاكەكانم ئەوەندە باش و نایابن نە بەچاو بینراون، نە بە گوێ بیسـتراون، نـە بـەدڵ و خـەیاڵی كەسدا هاتوون). ئەم ئایەتەش ئەوە دەسەلمێنێ: **(فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)**. سورة السجدة: ١٧. واتە: ئیتر هیچ كەسێك نازانێ چ پاداشـتێكی گرنگیـان بـۆ داشـاراوە لـە هۆیـەكانی خۆشـیی و شـادی چـاوان و دڵئارامیی، لە پاداشی ئەو كارانەدا ئەنجامیانداون و، خۆیانیان بۆ ماندووكردووە.

٣١٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ طَرِيفٍ، وَعَبْدِ الْمَلِكِ وَهُوَ ابْنُ أَبْجَرَ، سَمِعَا الشَّعْبِيَّ، يَقُولُ: سَمِعْتُ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ، عَلَى الْمِنْبَرِ يَرْفَعُهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ مُوسَى سَأَلَ رَبَّهُ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ أَيُّ أَهْلِ الجَنَّةِ أَدْنَى مَنْزِلَةً؟ قَالَ: رَجُلٌ يَأْتِي بَعْدَمَا يَدْخُلُ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ فَيُقَالُ لَهُ: ادْخُلِ الجَنَّةَ، فَيَقُولُ: كَيْفَ أَدْخُلُ وَقَدْ نَزَلُوا مَنَازِلَهُمْ وَأَخَذُوا أَخَذَاتِهِمْ. قَالَ: فَيُقَالُ لَهُ أَتَرْضَى أَنْ يَكُونَ لَكَ مَا كَانَ لِمَلِكٍ مِنْ مُلُوكِ الدُّنْيَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، أَيْ رَبِّ قَدْ رَضِيتُ، فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ هَذَا وَمِثْلَهُ وَمِثْلَهُ وَمِثْلَهُ، فَيَقُولُ: قَدْ رَضِيتُ أَيْ رَبِّ، فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ هَذَا وَعَشْرَةَ أَمْثَالِهِ، فَيَقُولُ: رَضِيتُ أَيْ رَبِّ، فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ مَعَ هَذَا مَا اشْتَهَتْ نَفْسُكَ وَلَذَّتْ عَيْنُكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الْمُغِيرَةِ وَلَمْ يَرْفَعْهُ ، وَالمَرْفُوعُ أَصَحُّ.

واتە: موغیرەی كوڕی شوعبە رەزای خـوای لـێ بـێ لەسـەر مینبـەر فـەرمووی:

پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: موسا سڵاوی خوای لەسەر بێ جارێك لە گفت و گۆیەکدا لە پەروەردگاری دەپرسێت: ئەی پەروەردگار، خاوەنی نزمترین پلە لە بەهەشتدا پلەو پایەیان چۆنە؟ ئەوە پیاوێکە کە دێ، دەبینێ بەهەشتیەکان چوونەتە بەهەشتەوە، پێی دەڵێن: بچۆرە ناو بەهەشتەوە ئەویش دەڵێ: ئەی خودای خۆم بچمە کوێوە ئەو خەڵکە هەرکەسە جێگای خۆی گرتووە، جێگای کەسی تریان نەهێشتۆتەوە، پێی دەگوترێ: ئایا رازی دەبیت بە ئەندازەی موڵکی پاشایەك لە پاشاکانی جیهان موڵك و سامانت بدرێتێ؟ دەڵێ: ئا رازیم ئەی پەروەردگارم! جا دەفەرموێت: دەی ئەوا بەقەد موڵك و سامانی پاشایەك لە پاشاکانی جیهان درا بە تۆ، واتە بەقەد هەموو دنیا، وە ئەوەندەی تریش، ئەوەندەی تریش، ئەوەندەی تریش، جا بەندەکە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، بەڕاستی رازیم، دەفەرموێت: دەی ئەوەو دە ئەوەندەی تریش بۆ تۆ، واتە: پەنجا ئەوەندەی دنیا، ئەوا سەرەڕای ئەوەش دام بەتۆ، هەرچی دڵت حەزی پێ دەکات و چاوت خۆشی لێ وەردەگرێت.

### دەربارەی سورەتی (الاحزاب).

### ٣٤ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ

٣١٩٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا صَاعِدٌ الحَرَّانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا قَابُوسُ بْنُ أَبِي ظَبْيَانَ، أَنَّ أَبَاهُ، حَدَّثَهُ قَالَ: قُلْنَا لِابْنِ عَبَّاسٍ: أَرَأَيْتَ قَوْلَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ (مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ) مَا عَنَى بِذَلِكَ؟ قَالَ: قَامَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا يُصَلِّي فَخَطَرَ خَطْرَةً، فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ الَّذِينَ يُصَلُّونَ مَعَهُ: أَلاَ تَرَى أَنَّ لَهُ قَلْبَيْنِ، قَلْبًا مَعَكُمْ وَقَلْبًا مَعَهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ:

(مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ). حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لەبارەی مانای ئەم ئایەتە: **(مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ)**. سورة السجدة: ٤. لە ئیبنو عەباسیان رەزای خوایان لێ بێ پرسی؟ ئەویش فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا نوێژی کرد، لە نوێژکەیدا بەهەڵەدا چوو، ئەو دووڕووانەی نوێژیان لەگەڵ کرد وتیان: سەیرکەن موحەممەد دوو دڵی هەیە، دڵێکی لەگەڵ ئێمەیە و دڵێکی لەگەڵ ئەوانە، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ)**. سورة السجدة: ٤. واتە: خوا لەناو هەناوو دەروونی هیچ مرۆڤێکدا دوو دڵی دانەناوە، کەوایە نابێ دوو بیروباوەڕیش لە تاکە دڵێکدا جێی بکرێتەوە.

٣٢٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ عَمِّي أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ، سُمِّيتُ بِهِ، لَمْ يَشْهَدْ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَبُرَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: أَوَّلُ مَشْهَدٍ قَدْ شَهِدَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غِبْتُ عَنْهُ، أَمَا وَاللَّهِ لَئِنْ أَرَانِي اللَّهُ مَشْهَدًا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَرَيَنَّ اللَّهُ مَا أَصْنَعُ، قَالَ: فَهَابَ أَنْ يَقُولَ غَيْرَهَا، فَشَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ مِنَ العَامِ القَابِلِ فَاسْتَقْبَلَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَمْرٍو أَيْنَ؟ قَالَ: وَاهًا لِرِيحِ الجَنَّةِ أَجِدُهَا دُونَ أُحُدٍ، فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَوُجِدَ فِي جَسَدِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ بَيْنِ ضَرْبَةٍ وَطَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ، فَقَالَتْ عَمَّتِي الرُّبَيِّعُ بِنْتُ النَّضْرِ: فَمَا عَرَفْتُ أَخِي إِلاَّ بِبَنَانِهِ. وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: مامەم ئەنەسی کوڕی (نضر) ڕەزای خوای لـێ بـێ، کـە مـن بـەناوی ئەوەوە ناو نراوم، بەشـداری جـەنگی بـەدری نـەکرد لەخزمـەت پێغەمبـەری خـوادا صلی الله علیه وسلم، ئەوەش یەکەم ڕووداو لەگەڵی بەشداری نەکرد، بۆیە بەلایـەوە زۆر قـورس بـوو، فـەرمووی: سـوێند بـە (الله)، ئەگـەر خـوا فرسـەتی دام ئامـادەی جەنگێ تر بووم لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، ئەو کاتە خوای گەورە خۆی دەمبینێ چ جەنگێ دەکەم، فەرمووی: مامم هەر ئەوەنـدەی وت شـتی تری نەوت نەبادا بۆی نەچێتەسەر، جا سـاڵی داهـاتوو لـەرۆژی جـەنگی ئوحوحـددا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صـلی الله علیـە وسـلم ئامـادە بـوو، سـەعدی کـوڕی (معاذ) ڕەزای خوای لێ بێ پاشەو پـاش بـەرەو مـامم هـات، پێـە وت: ئـەی ئـەبا عەمر ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی بۆچی هەڵدێی؟ جا مامم فەرمووی: ئۆخـەی لـەم بـۆن و بەرامەی بەهەشتە لەلای ئوحودەوە دێ، جەنگی و دەسـتی کـرد بـە کوشـتار هـەتا کوژرا، لەپاش جەنگەکە کاتێ کە لاشـەکەیان دۆزیـەوە هەشـتاو ئەوەنـدە بـرین بـە جەستەیەوە بوو جێگەی ڕم و تیر و شمشێر، پورم روبەیعی کچـی (نضـر) فـەرمووی: بەسەری پەنجەکانی براکەمم ناسیەوە، جا ئـەم ئایەتـە دابـەزی: **(رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً)**. سورة الاحزاب: ٢٣. واتە: لە ناو ئەو بڕوادارانەشدا پیـاوانی وایـان هـەبوو، ئـەو پەیمانـەی بـە خوایاندا بوو، ڕاستیان لەگەڵکردو، زۆر بەباشی پا بەندیشبوون پێیەوەو، کـاتێکیش کەوتنە جەنگەوە مەردانە جەنگیان کرد، ئینجا بووشیان نەزرو پـەیمانی خـۆی بـردە سەرو، جەنگاوەرانە جەنگی کرد تـا شـەهیدکرا، هەشـیان بـوو هـەردەم چـاوەڕوانی شەهیدی بوو لـە ڕێـی خـوادا، بـە هـیچ جـۆرێکیش کـلا نـەبوون و پـەیمانی خۆیـان نەگۆڕی.

٣٢٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عَمَّهُ غَابَ عَنْ قِتَالِ بَدْرٍ فَقَالَ: غِبْتُ عَنْ أَوَّلِ قِتَالٍ قَاتَلَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُشْرِكِينَ لَئِنِ اللَّهُ أَشْهَدَنِي قِتَالاً لَلْمُشْرِكِينَ لَيَرَيَنَّ اللَّهُ كَيْفَ أَصْنَعُ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْكَشَفَ الْمُسْلِمُونَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا جَاءَ بِهِ هَؤُلاَءِ، يَعْنِي الْمُشْرِكِينَ، وَأَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاَءِ، يَعْنِي أَصْحَابَهُ، ثُمَّ تَقَدَّمَ فَلَقِيَهُ سَعْدٌ فَقَالَ: يَا أَخِي، مَا فَعَلْتَ أَنَا مَعَكَ، فَلَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ أَصْنَعَ مَا صَنَعَ، فَوُجِدَ فِيهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ بَيْنَ ضَرْبَةٍ بِسَيْفٍ وَطَعْنَةٍ بِرُمْحٍ وَرَمْيَةٍ بِسَهْمٍ، فَكُنَّا نَقُولُ فِيهِ وَفِي أَصْحَابِهِ نَزَلَتْ (فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ). قَالَ يَزِيدُ يَعْنِي هَذِهِ الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَاسْمُ عَمِّهِ أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە مامی ئەنەسی کوڕی (نضر) ڕەزای خوای لێ بێ، لەجەنگی بەدردا ئامادە نەبوو بەشداری نەکرد کە یەکەم جەنگ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرامبەر بە هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەران کردی، فەرمووی: ئەگەر خوا فرسەتی دام ئامادەی جەنگێ تر بووم بەرامبەر بە هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەران، ئەو کاتە خوای گەورە خۆی دەمبینێ چ جەنگێ دەکەم، لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا موسوڵمانان شکان، فەرمووی: خودایە من بەریم لە هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەران، داوای لێبووردنیش دەکەم لەوەی کە هاوڕێکانم لە جەنگ هەڵدێن، لەپاشدا چووە پێشەوە بۆ جەنگ و کوشتار، سەعدی بینی خەریکی پاشەکشە بوو، پێی وت: براکەم بۆ کوێ من لەگەڵتم با پێکەوە بجەنگین، سەعد فەرمووی: ئەوەی تۆ دەیکەی لەتوانای مندا نیە و ناتوانم وەك تۆ بجەنگم، لەپاش جەنگەکە کاتێ کە لاشەکەیان دۆزیەوە هەشتاو ئەوەندە برین بە جەستەیەوە بوو جێگەی ڕم و تیر و شمشێر، ئێمە دەمانوت ئەم

ئایەتە لەسەر ئەو و هاورێكانی دابەزی: (**فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً**). سورة الاحزاب: ٢٣.

٣٢٠٢ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ القُدُّوسِ بْنُ مُحَمَّدٍ العَطَّارُ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ يَحْيَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ: أَلاَ أُبَشِّرُكَ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: طَلْحَةُ مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ مُعَاوِيَةَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَإِنَّمَا رُوِيَ هَذَا عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە موسای كوڕی (طلحة)وە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: چوومە خزمەت موعاویە وتم: ئەرێ موژدەیەكت نەدەمێ، فەرمووی: بۆ نا، وتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: ((طلحة) یەكێكە لەوانەی لە پێناوی خوا شەهید دەبێ).

٣٢٠٣ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ مُوسَى، وَعِيسَى، ابْنَيْ طَلْحَةَ عَنْ أَبِيهِمَا طَلْحَةَ، أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا لأَعْرَابِيٍّ جَاهِلٍ: سَلْهُ عَمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ مَنْ هُوَ؟ وَكَانُوا لاَ يَجْتَرِئُونَ عَلَى مَسْأَلَتِهِ يُوَقِّرُونَهُ وَيَهَابُونَهُ، فَسَأَلَهُ الأَعْرَابِيُّ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ إِنِّي اطَّلَعْتُ مِنْ بَابِ الْمَسْجِدِ وَعَلَيَّ ثِيَابٌ خُضْرٌ، فَلَمَّا رَآنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ عَمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ؟ قَالَ الأَعْرَابِيُّ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَذَا مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يُونُسَ بْنِ بُكَيْرٍ.

واتە: لە (طلحة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: عەرەبێكی دەشتەكی نەزان پرسیارێكی هەبوو، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم وتیان: پرسیار لەو کەسە بکە کە یەکێکە لەوانەی لە پێناوی خوا شەهید دەبێ، کێیە؟ ئەوان ڕێزیان لێ دەگرت و نەیاندەوێرا پرسیاری لێ بکەن، دەشتەکیەکە پرسیاری لێ کرد، ڕووی لێ وەرگێڕا، لەپاشدا پرسیاری لێ کرد، ڕووی لێ وەرگێڕا، سەیرم کرد لەبەردەرگای مزگەوت پۆشاکێکی سەوزی لەبەردا بوو، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینیمی، فەرمووی: (کوا ئەو کەسەی پرسیاری کرد لەو کەسەی کە لە پێناوی خوا شەهید دەبێ؟) دەشتەکیەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من بووم، فەرمووی: (ئەوە ئەو کەسەیە کە لە پێناوی خوا شەهید دەبێ؟).

٣٢٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: لَمَّا أُمِرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِتَخْيِيرِ أَزْوَاجِهِ بَدَأَ بِي فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا فَلاَ عَلَيْكِ أَنْ لاَ تَسْتَعْجِلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ، قَالَتْ: وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ أَبَوَايَ لَمْ يَكُونَا لِيَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ، قَالَتْ: ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ)، حَتَّى بَلَغَ، (لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا). فَقُلْتُ: فِي أَيِّ هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ؟ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ. وَفَعَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَ مَا فَعَلْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا أَيْضًا عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کرا هاوسەرکانی سەرپشک بکات لەنێوان هەڵبژاردنی ژیانی دونیا و ژیانی دواڕۆژدا، کە ئەگەر حەزیا ژیانی دونیا بوو تەڵاقیان بدات، لە منەوە دەستی پێ کرد، فەرمووی: (شتێکت بۆ باس

دەكەم بەڵام پەلەی لیّ مەكە هەتا پرس و را بە دایك و باوكت دەكەیت و رایان لیّ وەرئەگریت). عائیشە رەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاك دەیزانی دایك و باوكم فەرمانی جابوونەوەم پیّ ناكەن، فەرمووی: لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرمویّت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا (٢٨) وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا (٢٩)). سورة الاحزاب: ٢٨ - ٢٩.

واتە: ئەی پەیامبەر! ﷺ بە ژنەكانت بڵێ: ئەر ئێوە ژین و جوانی ئەم دنیایەتان دەویّ دەسا وەرنە پێش، با مارەیی و هەندیّ شتومەكتان بدەمیّ و بە خوا پەسەندانەو جوانی دەستتان لیّبەر بدەم و بەرێتانكەم، واتە: بیّ هیچ رەنجە دڵ و گازندەو دەردی سەرییەك، وە ئەگەر خواو پەیامبەرەكەیی و، پاداشی دوا رۆژتان دەویّ و، رازی دەبن بەو ژیانەی ئێستاتان، ئەوە بەراستی خوا بۆ چاكە كارانتان - ئەوانەتان رازی دەبن بەم ژیانە- پاداشتێكی گەورەی ئامادە كردووە.

وتم: ئیتر پرس و رای چی بە دایك و باوكم بكەم لەكاتێكدا كە من خواو پێغەمبەرم دویّ و ژیانی دوارۆژ هەڵدەبژێرم بۆ خۆم، هاوسەرەكانی تریشی هەمان كاریان كردوو رازی بوون بە ژیانی دوارۆژ.

٣٢٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سُلَيْمَانَ بْنِ الأَصْبَهَانِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، رَبِيبِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ البَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا) فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، فَدَعَا فَاطِمَةَ وَحَسَنًا وَحُسَيْنًا فَجَلَّلَهُمْ بِكِسَاءٍ، وَعَلِيٌّ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَجَلَّلَهُ بِكِسَاءٍ ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلاَءِ أَهْلُ بَيْتِي فَأَذْهِبْ عَنْهُمُ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تَطْهِيرًا. قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: وَأَنَا مَعَهُمْ يَا

نَبِيَّ اللهِ، قَالَ: أَنْتِ عَلَى مَكَانِكِ وَأَنْتِ عَلَى خَيْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ عَطَاءٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ.

واتە: لە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمەوە، کە لە ماڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەروەردەکراو گەورەبوو دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لە ماڵی ئوممو سەلەمە بوو: (**إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا**) سورة الاحزاب: ٣٣. واتە: بەڕاستی لەم – ئاراستانەدا- خوا هەر دەیەوێ هەموو چڵك و چەپەڵی و، گشت کارێکی نارەواو نادروستان لێ دوور بخاتەوە (ئەی خانەوادەی پێغەمبەر!)، وە بە پوختیی و پاکی بتانهێڵێتەوەو راتان بگرێ.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (فاطمة) و حەسەن و حوسەینی بانگ کرد، ب پۆشاکێ داپۆشین و پێشەوا عەلی لەدوایوە بوو ئەویشی بە پۆشاکێ داپۆشی، لەپاشدا فەرمووی: (خودایە، ئەمانە خانەوادە و کەسوکاری منن، لە هەموو چڵك و چەپەڵی و، گشت کارێکی نارەواو نادروست دووریان بخەرەوە و بە پوختیی و پاکی بیانهێڵەوە). ئوممو سەلەمە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئایا منیش لەگەڵ ئەوانم؟ فەرمووی: (بەڵێ، تۆ لەسەر بەش و بارەی خۆتی، تۆ لەسەر خێر و چاکەی).

٣٢٠٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمُرُّ بِبَابِ فَاطِمَةَ سِتَّةَ أَشْهُرٍ إِذَا خَرَجَ إِلَى صَلاَةِ الفَجْرِ يَقُولُ: الصَّلاَةَ يَا أَهْلَ البَيْتِ (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ البَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ

تَطْهِيرًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي الحَمْرَاءِ، وَمَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ وَأُمِّ سَلَمَةَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەش مانگ کە لە ماڵ دەردەچوو بۆ نوێژی بەیانی بەبەردەمی ماڵی (فاطمة)دا دەڕۆشت، دەیفەرموو: (ئەی خانەوادە و کەسوکاری من هەستن بۆ نوێژ: **(إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا)**.

٣٢٠٧ - (ضعيف الإسناد جدا) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا دَاوُدُ بْنُ الزِّبْرِقَانِ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: لَوْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَاتِمًا شَيْئًا مِنَ الوَحْيِ لَكَتَمَ هَذِهِ الآيَةَ (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ) بِالْعِتْقِ فَأَعْتَقْتَهُ، (أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ)، إِلَى قَوْلِهِ: (وَكَانَ أَمْرُ اللهِ مَفْعُولاً) وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا تَزَوَّجَهَا قَالُوا: تَزَوَّجَ حَلِيلَةَ ابْنِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ) وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَبَنَّاهُ وَهُوَ صَغِيرٌ فَلَبِثَ حَتَّى صَارَ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ: زَيْدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ) فُلاَنٌ مَوْلَى فُلاَنٍ، وَفُلاَنٌ أَخُو فُلاَنٍ (هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ) يَعْنِي أَعْدَلُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ قَدْ رُوِيَ عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: لَوْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَاتِمًا شَيْئًا مِنَ الوَحْيِ لَكَتَمَ هَذِهِ الآيَةَ (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ) الآيَةَ، هَذَا الحَرْفُ لَمْ يُرْوَ بِطُولِهِ.

حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ وَضَّاحٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شتێکی لە وەحی بشاردایەتەوە ئەوا ئەم ئایەتەی دەشاردەوە: (**وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا**). سورة الاحزاب: ٣٧. واتە: تۆ ئەی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم! وەبیر بێنە کاتێ بە (زەید)ت - ئەوەی خوا چاکەی لەگەڵ کرد بەهێنانی بەرەو ئیمان و ئیسلام، خۆیشت چاکەت لەگەڵ کرد بە پەروەردەکردنیی و ئازادکردنی لە کۆیلایەتی،- دەگوت: ژنی خۆت ڕاگرە کە (زەینەبە)، لە خوا بترسەو، لای خۆت بیهێڵەرەوەو تەڵاقی مەدە، شتێکیش تۆ لە دڵ و دەرونی خۆتا دەشاریتەوە کە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات، لەخەڵك دەترسیت (کە دەنگ و باست بۆ دروست بکەن ژنی بەناو کوڕەکەت مارە دەکەیت)، بەڵام خوا لەپێشترە کە لێی بترسیت، جا کاتێ زەید بێزار بوو لە زەینەب جیابوونەوە و تەڵاق کەوتە نێوانیان، ئێمە زەینەبمان لەتۆ مارەکرد، بۆ ئەوەی هیچ شەرمەزاری و دڵتەنگیەك بۆ ئیمانداران دروست نەبێ، لەهێنانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان، کاتێك بێزار دەبن و پێویستیان بەیەك نامێنێ، هەیشە فەرمانی خوا جێبەجێ کراوە.

کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، زەینەبی مارەکرد، وتیان: ژنی کوڕەکەی خۆی مارەکرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا**). سورة

الاحزاب: ٤٠. واتە: موحەممەد صلى الله علیه وسلم باوکی هیچ پیاوێکتان نییە، نە زەیدو نە کەسی دیکەتان هەتا حەرام بێت ژنی بە کوڕکراوی خۆی- پاش تەلاقدانی- مارەبکات، چونکە کچ و کوڕی ئەو ئاشکران و بێ لەوان کەسیتر نابێتە کچ و کوڕی، بۆیە دەتوانێ ژنەکەی زەید مارە بکات، بەڵکو ئەو پەیامبەری خوایەو دوا هەمینی پەیامبەرانە، کۆتایی زنجیرەی پەیامبەرانی پێهاتووە.

پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم زیدی کردبوو بە کوڕی خۆی کاتێ کە منداڵ بوو هەتا بوو بە پیاوی ناو پیاوان، بۆیە پێیان دەوت: زەیدی کوڕی موحەممەد، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ)**. سورة الاحزاب: ٥. واتە: هەر بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن و نێویان بەرن، واتە: مەڵێن: (زەیدی کوڕی موحەممەد)، بەڵکو بڵێن: (زەیدی کوڕی حاریس)ـە، چونکە لای خوا هەر ئەوە پەسەندو دادگەرانەیە، خۆ ئەگەر باوکیشیانتان نە دەزانی هەتا بە ناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن، ئەوە برای ئایینی و دۆستانن، ئەگەر موسڵمان بن، وە خۆشەویست و مەولاتانن، واتە: پاش ئازادبوونی لە کۆیلەیی دەبێ بڵێن: فلانەکەسی مەولام!، بۆیە بۆ دوایی پەیامبەر صلى الله علیه وسلم بە زەیدی دەگوت: تۆ براو مەولای ئێمەی: (أنت أخونا ومولانا) (فتح الباري: ٧/٥٧٠).

٣٢٠٨ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَوْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَاتِمًا شَيْئًا مِنَ الوَحْيِ لَكَتَمَ هَذِهِ الآيَةَ (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم شتێکی لە وەحی بشاردایەتەوە ئەوا ئەم

ئایەتەی دەشاردەوە: (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ). سورة الاحزاب: ٣٧.

٣٢٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: مَا كُنَّا نَدْعُو زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ إِلاَّ زَيْدَ ابْنَ مُحَمَّدٍ حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە هەرگیز بە زەیدی کوڕی (حارثة) بانگمان نەدەکرد بەڵکو هەر بە زەیدی کوڕی موحەممەد بانگمان دەکرد هەتا قورئان دابەزی: (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ). سورة الاحزاب: ٥. واتە: بە ناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن، چونکە لای خوا هەر ئەوە پەسەندو دادگەرانەیە.

٣٢١٠ - (ضعيف مقطوع) حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ قَزَعَةَ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَسْلَمَةُ بْنُ عَلْقَمَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ، فِي قَوْلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ) قَالَ: مَا كَانَ لِيَعِيشَ لَهُ فِيكُمْ وَلَدٌ ذَكَرٌ.

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە (مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ). سورة الاحزاب: ٤٠. واتە: موحەممەد صلی الله علیه وسلم باوکی هیچ پیاوێکتان نییە، بەڵکو ئەو پەیامبەری خوایەو دوا هەمینی پەیامبەرانە.

عامیری شەعبی فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کوڕی نەبوو بگاتە تەمەنی لاوی و پێگەیشتن هەتا بەناوی ئەوەوە بانگ بکرێ، بەڵکو کوڕەکانی هەر بە منداڵی مردن.

٣٢١١ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ الأَنْصَارِيَّةِ، أَنَّهَا أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: مَا أَرَى كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ لِلرِّجَالِ وَمَا أَرَى النِّسَاءَ

يُذْكَرْنَ بِشَيْءٍ؟ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالمسْلِمَاتِ وَالمؤْمِنِينَ وَالمؤْمِنَاتِ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَإِنَّمَا نَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئوموو عەعیمارە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: بۆچی لە قورئاندا هەر باسی پیاوان دەبیسم، بۆ ژنان نێو نابرێن و باسیان نیە..؟! خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی: **(إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ)** سورة الاحزاب: ٣٥. واتە: بەڕاستیی پیاوانی موسڵمان و، ژنانی موسڵمان و پیاوانی بڕوادارو ژنانی بڕوادار.

٣٢١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ) فِي شَأْنِ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، جَاءَ زَيْدٌ يَشْكُو فَهَمَّ بِطَلاَقِهَا فَاسْتَأْمَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی دەربارەی زەینەبی کچی جەحش: **(وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ)**. سورة الاحزاب: ٣٧. واتە: تۆ لە دڵ و دەرونی خۆتا دەیشاریتەوە! کە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات، لەخەڵك دەترسیت.

زەید هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ویستی تەڵاقی بدات، جا لەوبارەوە پرس و ڕای پێ کرد، ئەویش فەرمووی: **(أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ)**. سورة الاحزاب: ٣٧. واتە: ژنی خۆت ڕاگرەو لە خوا بترسەو، لای خۆت بیهێڵەرەوەو تەڵاقی مەدە.

٣٢١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفَضْلِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ (فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا) قَالَ: فَكَانَتْ تَفْخَرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَقُولُ: زَوَّجَكُنَّ أَهْلُكُنَّ وَزَوَّجَنِي اللَّهُ مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَاوَاتٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتـە دابـەزی دەربـارەی زەینـەبی کچـی جـەحش: **(فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا)**. سورة الاحزاب: ٣٧. واتە: جا کاتێ زەید بێزار بـوو لـە زەینەب جیابوونەوە و تەڵاق کەوتە نێوانیان، ئێمە زەینەبمان لەتۆ مارەکرد.

لـەپاش ئـەوە زەینـەب لـەناو هاوسـەرانی پێغەمبـەردا صـلی الله علیـە وسـلم شانازی بەوەوە دەکرد، دەیفەرموو: ئێوە خزم و کەسـوکارتان مـارەی کـردوون لـە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، بەڵام من لەسـەرووی حـەوت ئاسمانەکانـەوە خـوای گەورە مارەی بڕیوم لێی.

٣٢١٤ - (ضعيف الإسناد جدا) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَتْ: خَطَبَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاعْتَذَرْتُ إِلَيْهِ فَعَذَرَنِي، ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللاَّتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالاَتِكَ اللاَّتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ) الآيَةَ قَالَتْ: فَلَمْ أَكُنْ أَحِلُّ لَهُ لأَنِّي لَمْ أُهَاجِرْ، كُنْتُ مِنَ الطُّلَقَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ أَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ السُّدِّيِّ.

واتە: لە ئوممو هانی کچی ئەبی (طالب)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم داوای کردم بۆ خۆی، منیش عوزرم بۆ هێنایەوە کە خاوەنی منداڵی وردم، ئەویش عوزرەکەی پەسەند کردم، لەپاشدا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللاَّتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالاَتِكَ اللاَّتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ﴾. سورة الاحزاب: ٥٠. واتە: ئەی پەیامبەر صلى الله عليه وسلم! ئێمە ئەو ژنانەمان بۆ حەڵاڵ کردوویت مارەییت پێداون، وە ئەو کەنیزانەش کە لە ڕێی (فەیئ)ەوە بوویتە خاوەنیان. واتە: کەنیزەمان بۆ حەڵاڵ کردویت کە مارەی بکەیت، ئیتر لە جەنگدا دەستت بکەوێت، یان بە هەر جۆرێکی تر، وەك (صەفیە)و (جوەیرییە) ئەوە بوو هەردووکیانی ئازاد کردو پاشان مارەی کردن، وە هەروەها خاتوو (مارییە)ش خوا لە هەموویان رازی بێت. هەروەها کچانی مامت و، کچانی پورت (خوشکەزای باوکت)و کچانی خاڵت و کچانی پوورت (خوشکەزای دایکت) ئەوانەیان کە لەگەڵ تۆدا کۆچیان کردووە، هەروەها هەر ژنێکی بڕواداریش ئەگەر خۆی پێشکەش بە پەیامبەر صلى الله عليه وسلم کرد، تەنها مەبەستی خۆشەویستی خواو پەیامبەرەکەی خوایە صلى الله عليه وسلم.

ئوممو هانی وتی: ئیتر من بۆ ئەو مەرجانەم تێدا نەبوو حەڵاڵ نەبووم بۆ ئەو، چونکە کۆچم نەکردبوو بۆ مەدینە، لەئازادکراوانی دوای رزگارکردنی مەککەش بووم.

٣٢١٥ – (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحٌ، عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ بَهْرَامَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نُهِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَصْنَافِ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا كَانَ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ الْمُهَاجِرَاتِ قَالَ: (لاَ يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِنْ

بَعْدُ وَلاَ أَنْ تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ) ، فَأَحَلَّ اللَّهُ فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ (وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ)، وَحَرَّمَ كُلَّ ذَاتِ دِينٍ غَيْرِ الإِسْلاَمِ، ثُمَّ قَالَ: (وَمَنْ يَكْفُرْ بِالإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الخَاسِرِينَ) وَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللاَّتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ) إِلَى قَوْلِهِ: (خَالِصَةً لَكَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ) وَحَرَّمَ مَا سِوَى ذَلِكَ مِنْ أَصْنَافِ النِّسَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ بَهْرَامَ سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ الحَسَنِ يَذْكُرُ عَنْ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ، قَالَ: لاَ بَأْسَ بِحَدِيثِ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ بَهْرَامَ عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مارەکردنی چەند جۆرە ئافرەتێکی لێ قەدەغەکرا، جگە لەو ئافرەتانەی کە باوەڕداربون و کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە، فەرمووی: **(لاَ يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِنْ بَعْدُ وَلاَ أَنْ تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ)** سورة الاحزاب: ٥٢. واتە: ئیتر لە دوای ئەمانە هێنانی ژنانی تر بۆ تۆ حەڵاڵ نییە، واتە: بۆت نییە ژنی تریان بەسەردا بێنی، وە ناتوانی وازیشیان لێ بێنیت، یەکێکیان تەڵاق بدەیت و یەکێکی تر مارە بکەیت، چونکە ئەوان خواو پەیامبەریان هەڵبژاردووە، خوای گەورەش ئاوا پاداشتیان ئەداتەوە، ئەگەرچی ئەو ئافرەتانەی کە تۆ دەتەوێ بیانخەیتە جێگای هاوسەرەکانت، جوانییان سەر سامت بکات جگە لە کەنیزەك. بەڵێ خوای گەورە چوار جۆرە ژنی حەڵاڵ کرد بۆ پەیامبەر صلی الله علیه وسلم:

یەکەم: ئەوانە مارەیی پێبەخشیون و مارەی کردون.

دووەم: ئەو کەنیزانەی لە جەنگدا دەستی دەکەون، وە یان دەیانکرێت.

سێیەم: ئەوانەی کۆچیان لەگەڵ کردووەو هاتوونەتە مەدینە.

چوارەم: ئەوانەی کە خۆیان بە پەیامبەر صلی الله علیه وسلم بەخشیی و مارەییان لێ نەویست، ئەوەیش بۆ ئەوە بوو تا پەیامبەر صلی الله علیه وسلم بەهۆی زۆری خێزانەکانیەوە بتوانێت بە ئاسانتر بانگەکەی بگەیەنێت بە هەموو ماڵێك، جا پاش ئەوەش کە ئایەتی تەخییر: (**يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا..**). هات و ئەوانیش خواو پەیامبەریان صلی الله علیه وسلم هەڵبژارد لە باتی دونیا، ئیتر خوای گەورەش ڕێزی لێنان بەم دوو شتە:

یەکەم: نابێ پەیامبەر صلی الله علیه وسلم ژنی تریان بەسەرا بێنێ.

دووەم: نابێ هیچ کامێکیان تەڵاق بدات و بیانگۆڕێ بە ژنانێ تر.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جگە لە مارەکردنی جگە لە ئافرەتانی موسوڵمان هەموو ئافرەتێکی تری خاوەن ئایینی لێ قەدەغەکرا، لەپاشدا فەرمووی: (**وَمَنْ يَكْفُرْ بِالإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الخَاسِرِينَ**). سورة المائدة: ٥. بێگومان هەرکەس بڕوای بەبەرنامەی ئیسلام نەبێ و پاشگەز بوویەوە، ئەوە بەراستیی هەمووکاروکردەوە چاکەکانیشی پووچەڵ دەبنەوەو لە دوارۆژیشدا یەکێکە لەریزی زیانمەنداندان. بەڵێ بەپێی ئەم ئایەتە مرۆڤی (مورتەد)و لەدین وەرگەڕاوە هەر کردەوەیەکی چاکیشی هەبێ باتڵ و پووچەڵ دەبێتەوە، بەڵام لە جێی تردا ئاماژە دەکات کە: کاتێ کردەوەکانی پووچەڵ دەبنەوە کە ئەوکەسە بەبێ باوەڕیی‌و کافریی سەر بنێتەوەو بمرێ، وەك لەسوورەتی (البقرة: ٢١٧)یشدا هاتووەو دەفەرموێ: (وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ..).

هەروەها فەرمووی: (**يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللَّاتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ اللَّاتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ**

النَّبِيُّ أَنْ يَسْتَنْكِحَهَا خَالِصَةً لَكَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ). سورة الاحزاب: ٥٠. واتە: ئەی پەیامبەر صلى الله عليه وسلم! ئێمە ئەو ژنانەمان بۆ حەڵاڵ كردوویت مارەییت پێداون، وە ئەو كەنیزانەش كە لە رێی (فەیئ)ەوە بوویتە خاوەنیان. واتە: كەنیزەمان بۆ حەڵاڵ كردویت كە مارەی بكەیت، ئیتر لە جەنگدا دەستت بكەوێت، یان بە هەر جۆرێكی تر، وەك (صەفیە)و (جوەیرییە) ئەوە بوو هەردووكیانی ئازاد كردو پاشان مارەی كردن، وە هەروەها خاتوو (مارییە)ش خوا لە هەموویان رازی بێت. هەروەها كچانی مامت و، كچانی پورت (خوشكەزای باوكت)و كچانی خاڵت و كچانی پوورت (خوشكەزای دایكت) ئەوانەیان كە لەگەڵ تۆدا كۆچیان كردووە، هەروەها هەر ژنێكی بڕواداریش ئەگەر خۆی پێشكەش بە پەیامبەر صلى الله عليه وسلم كرد، تەنها مەبەستی خۆشەویستی خواو پەیامبەرەكەی خوایە صلى الله عليه وسلم، وەك (خەولە). ئەگەر پەیامبەر صلى الله عليه وسلم ویستی مارەی بكات، مارەكردنی خۆبەخش بەبێ مارەیی بۆ دانان و وەلیی و شایەد تایبەتە بە تۆوە ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، واتە: جگە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ، لە بڕواداران نیە نیكاحی هیچ ژنێكی ئیمانداری خۆبەخش بكا بە بێ مارەیی و وەلیی و شایەت.

٣٢١٦ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ، مَا مَاتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أُحِلَّ لَهُ النِّسَاءُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەمرد هەتا ئافرەتانی بۆ حەڵاڵ كرا.

٣٢١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَشْهَلُ بْنُ حَاتِمٍ، قَالَ: ابْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَاهُ عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَى بَابَ امْرَأَةٍ عَرَّسَ بِهَا فَإِذَا عِنْدَهَا قَوْمٌ فَانْطَلَقَ فَقَضَى حَاجَتَهُ فَاحْتُبِسَ، ثُمَّ رَجَعَ وَعِنْدَهَا قَوْمٌ فَانْطَلَقَ فَقَضَى حَاجَتَهُ فَرَجَعَ وَقَدْ خَرَجُوا قَالَ: فَدَخَلَ وَأَرْخَى بَيْنِي وَبَيْنَهُ سِتْرًا قَالَ: فَذَكَرْتُهُ لأَبِي طَلْحَةَ، قَالَ: فَقَالَ: لَئِنْ كَانَ كَمَا تَقُولُ لَيَنْزِلَنَّ فِي هَذَا شَيْءٌ قَالَ: فَنَزَلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووم، ژنێکی تازە هێنابوو چووە بەردەم دەرگای بۆ ئەوەی بچێتە لای کۆمەڵێ لای دانیشتبوون، چوو کاری خۆی بە ئەنجام گەیاند، کاتێ گەڕایەوە خەڵکەکە ڕۆشتبوون، ئەنەس فەرمووی: چووەژوورەو و لەنێوان من خۆیدا پەردەی دادایەوە، ئەمەم بۆ ئەبو (طلحة) گێڕایەوە، فەرمووی: ئەگەر وابێ شتێ لەبارەیەوە دادەبەزێ، ئەوەبوو ئایەتی حیجاب دابەزی.

٣٢١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الضُّبَعِيُّ، عَنِ الْجَعْدِ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ بِأَهْلِهِ، قَالَ: فَصَنَعَتْ أُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ حَيْسًا فَجَعَلَتْهُ فِي تَوْرٍ فَقَالَتْ: يَا أَنَسُ، اذْهَبْ بِهَذَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْ لَهُ: بَعَثَتْ بِهَذَا إِلَيْكَ أُمِّي وَهِيَ تُقْرِئُكَ السَّلاَمَ وَتَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَذَهَبْتُ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّي تُقْرِئُكَ السَّلاَمَ وَتَقُولُ: إِنَّ هَذَا مِنَّا لَكَ قَلِيلٌ، فَقَالَ: ضَعْهُ، ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَادْعُ لِي فُلاَنًا وَفُلاَنًا وَفُلاَنًا وَمَنْ لَقِيتَ، فَسَمَّى رِجَالاً،

قَالَ: فَدَعَوْتُ مَنْ سَمَّى وَمَنْ لَقِيتُ، قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: عَدَدُ كَمْ كَانُوا؟ قَالَ: زُهَاءَ ثَلاَثِ مِائَةٍ قَالَ: وَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا أَنَسُ هَاتِ بِالتَّوْرِ قَالَ: فَدَخَلُوا حَتَّى امْتَلأَتِ الصُّفَّةُ وَالحُجْرَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِيَتَحَلَّقْ عَشَرَةٌ عَشَرَةٌ وَلْيَأْكُلْ كُلُّ إِنْسَانٍ مِمَّا يَلِيهِ، قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، قَالَ: فَخَرَجَتْ طَائِفَةٌ وَدَخَلَتْ طَائِفَةٌ حَتَّى أَكَلُوا كُلُّهُمْ، قَالَ: فَقَالَ لِي: يَا أَنَسُ ارْفَعْ قَالَ: فَرَفَعْتُ فَمَا أَدْرِي حِينَ وَضَعْتُ كَانَ أَكْثَرَ أَمْ حِينَ رَفَعْتُ، قَالَ: وَجَلَسَ طَوَائِفُ مِنْهُمْ يَتَحَدَّثُونَ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ وَزَوْجَتُهُ مُوَلِّيَةٌ وَجْهَهَا إِلَى الحَائِطِ، فَثَقُلُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمَ عَلَى نِسَائِهِ ثُمَّ رَجَعَ، فَلَمَّا رَأَوْا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ رَجَعَ ظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ ثَقُلُوا عَلَيْهِ، فَابْتَدَرُوا الْبَابَ فَخَرَجُوا كُلُّهُمْ، وَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَرْخَى السِّتْرَ وَدَخَلَ وَأَنَا جَالِسٌ فِي الحُجْرَةِ فَلَمْ يَلْبَثْ إِلاَّ يَسِيرًا حَتَّى خَرَجَ عَلَيَّ وَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَاتُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَرَأَهُنَّ عَلَى النَّاسِ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلاَ مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ. قَالَ الجَعْدُ، قَالَ أَنَسٌ: أَنَا أَحْدَثُ النَّاسِ عَهْدًا بِهَذِهِ الآيَاتِ وَحُجِبْنَ نِسَاءُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالجَعْدُ هُوَ ابْنُ عُثْمَانَ، وَيُقَالُ هُوَ: ابْنُ دِينَارٍ وَيُكْنَى: أَبَا عُثْمَانَ، بَصْرِيٌّ، وَهُوَ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ رَوَى عَنْهُ يُونُسُ بْنُ عُبَيْدٍ وَشُعْبَةُ وَحَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ.

واتــە: لــە ئەنەســی كــوڕی مالیكــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: كاتێ پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم زەینـەبی هێنـا، ئوممـو

سولەیی دایکم دۆ و کەشك و رۆنی بە قاوتەوە دروستکرد و کردیە مەنجەڵێکەوە و وتی: ئەی ئەنەس ئەمە بەرە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سەلامی منی پێ بگەیەنە پێی بڵێ: دایکم دەیوت: ئەمە لە منەوە بۆ تۆ هەرچەندە شتێکی کەمە، ئەنەس فەرمووی: منیش بۆم برد، دایکم چی پێ وتم، پێم وت، فەرمووی: (داینێ)، لەپاشدا فەرمووی: (برۆ فلان و فلان و فلانم بۆ بانگ بکە بەکێی تریش گەیشتی)، ناوی کەسانێکی برد، ئەنەس فەرمووی: ئەوانەی ئەو ناوی بردن و ئەوەشی پێی گەیشتم بانگم کردن بۆ سەر سفرەو خوانەکە، وتی: بە ئەنەسم وت: ژمارەیان چەند کەس دەبوو؟ فەرمووی: سێ سەد کەس دەبوون، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئی ئەنەس! مەنجەڵەکە بێنە)، فەرمووی: ئەوەندە خەڵك هاتە ژوورەوە بۆ نانخواردن هەتا ماڵکە و هەیوانەکە پڕ بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دە کەس دە کەس ئەڵقە ببەستن و هەرکەس لەبەردەمی خۆیەوە بخوات)، فەرمووی: ئەوەندەیان خوارد هەتا تێر بوون، فەرمووی: کۆمەڵێکیان دەهاتنەدەرەوە، کۆمەڵێکیان دەچونەوە هەتا هەموویان تێریان خوارد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەنەس! مەنجەڵەکە هەڵگرەو لایبە)، ئەنەس فەرمووی: کاتێ مەنجەڵەکەم هەڵگرت نەمزانی پێشتر قورستر بوو یان ئەو کاتەی لامبرد، فەرمووی: جا کەسانێ لەوانە لە ماڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتن و دەستیان کرد بە قسەکردن، هاوسەرەکەی کە تازە بووك بوو رووی کردبووە دیوارەکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قورس بوو بەلایەوە و سەغڵەت بوو، بۆیە دەرچوو سەردانی هاوسەرەکانی تری کردو سڵاوی لێ کردن، لەپاشدا گەڕایەوە، پیاوەکان ئوەیان دی هەستیان کرد پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم سەغڵەت کردووە، پەلاماری دەرگاکەیان دا و هەموویان رۆشتنەدەرەوە بڵاوەیان لێ کرد، ئینجا

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات پەردەی دادایەوەو چووە ژوورەوە، لەوكاتەدا منیش لە هۆدەكەدا دانیشتبووم، زۆری نەبرد هاتەدەرەوە بۆلای من، جا ئەم ئایەتانە دابەزی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە و خوێندنیەوە بەسەر خلكدا: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلاَ مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ﴾. سورة الاحزاب: ٥٣. واتە: ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵەكانی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم مەگەر لە حاڵێكدا مۆڵەتتان بدرێت بۆ نان خواردنێك بە بێ چاوەڕوانی پێگەیشتنی، واتە: ئەگەر دەعوەتكران بۆ نان خواردنێك زوو مەچن لەوێ چاوەڕوانی بكەن تا نان و خواردنەكە پێ دەگا، بەڵام كاتێ بانگكران و فەرموتان لێكرا بچنە ژوورەوە، ئینجا كە نانیشتان خوارد، زوو بلاوەی لێبكەن و مەمێننەوە بە هۆگرییتان بۆ قسەو باس و داستانگێڕانەوە بۆ یەكترو دەمە تەقێ، چونكە ئەو جۆرە كارانەتان پەیامبەر صلی الله علیه وسلم ئەزیەت دەدات، جا پێغەمبەریش شەرمتان لێ ئەكات داوای چوونە دەرەوەتان لێ بكات، بێگومان خوا هەرگیز شەرم لە دەرخستنی هەق و راستیی ناكات، هەرشتێك هەق بێت بەیانی دەكات، ئەگەرچی هەندێ كەسیش پێیان ناخۆش بێت. خۆ ئەگەر داوای شتێكتان لە ژنانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم كرد، لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بكەن، واتە: ئەدەب لە ماڵی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم و تێكەڵ نەبوون لەگەڵ خانەوادەكەیدا یاسایەكی خواییەو، دەبێ هەموو كات پێش چاو بگیرێ ئا بەو شێوەیە پاكترە بۆ دڵی ئێوەو، دڵی ئەوانیش "نەك تێكەڵی ژن و پیاو كە دەرەنجام گەلێ شتی خراپی لێ ئەوەشێتەوە".

موحەممەد ئەمین (شنقیطي) دەڵێت: ئایەتی: (وإذا سألتموهن متاعا..) ئەگەرچی هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەو یاسایە تایبەتە بە خێزانەكانی پەیامبەرەوە صلی الله

علیه وسلم، بەڵام ئەگەر سەیری هۆو عیللەتەکەی بکرێت: (ذلكم أطهر لقلوبكم وقلوبهن..) بە ڕاشکاوی ئەوە دەگەیەنێت کە حوکمەکەی گشتگیرەو بۆ تەواوی موسڵمانانیشە، چونکە هیچ کەسێك نیە بتوانێت بڵێ: ژنانی تر جگە لە ژنانی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم پێویستیان بە ئاسوودەیی و پاکی دڵ نییە، جگە لەوەش لە (ئوصول)یشدا هاتووە: (إن العلة قد تعمم معلولها..) لەولایشەوە ئەگەر بە وردی سەیرێکی قورئان بکرێت، بە ئاسانی دەردەکەوێت کە حیجاب لەسەر تەواوی ژنە موسڵمانەکان واجبە: (**ذلكم أطهر لقلوبكم**..) یان دەفەرموێ: (**يا أيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن**.. ٥٩/٣٣. بۆ ئەم ئایەتەش دەڵێت: (فقد قال غير واحد من أهل العلم: إن معنى: (**يدنين عليهن من جلابيبهن**..) أنهن يسترن بها جميع وجوههن، ولا يظهرن شيئا إلا عين واحدة تبصر بها، وممن قال به: ابن مسعود، وابن عباس، وعبيدة السلماني، وغيرهم). بەڵێ.. موحەممەد ئەمین (شنقيطي) بۆچوونی ئەوەبووە بەڵگەیەکی زۆریشی هێناوەتەوە بۆ ئەوە کە دەست و دەم و چاویش عەورەتەو واجبە داپۆشرێ، جگە کاتی نوێژ کردن و کاتی حەج. بێگومان هەرگیز بۆ ئێوە ناشێ و نابێت ئازارو ئەزیەتی پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم بدەن، ئیدی بە زمان بێ، یان بە کردار، هەرگیزیش بۆتان نییە ژنەکانی دوای خۆی بە هیچ جۆرێك مارە بکەن، چونکە وەکو دایکتانن، چونکە ئەزیەتدانیی و مارەکردنی ژنەکانی ئەو، لای خوا کارێکی زۆر گەورەیەو چاوپۆشی لێناکرێ.

جەعد وتی: ئەنەس فەرمووی: من یەکەم کەس بووم دەربارەی ئەو ئایەتانە زانیاریم هەبوو، خۆم فێر بووم و خەڵکیشم فێرکرد، ئیتر هاوسەرانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حیجابیان کرد و خۆیان دادەپۆشی.

٣٢١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُجَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ بَيَانٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: بَنَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِامْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ فَأَرْسَلَنِي فَدَعَوْتُ قَوْمًا إِلَى الطَّعَامِ فَلَمَّا أَكَلُوا وَخَرَجُوا قَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنْطَلِقًا قِبَلَ بَيْتِ عَائِشَةَ فَرَأَى رَجُلَيْنِ جَالِسَيْنِ، فَانْصَرَفَ رَاجِعًا، فَقَامَ الرَّجُلاَنِ فَخَرَجَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ) وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ بَيَانٍ وَرَوَى ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ، هَذَا الحَدِيثَ بِطُولِهِ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەینەبی گواستەوە، منی نارد، خەڵکانێکم بانگ کرد بۆ نانخواردنی زەماوەند، کاتێ نانیان خـواردوو ڕۆشـتن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا ڕۆشت بۆ مـاڵی عائیشـە، بینـی دوو کەس لەوێ دانیشتوون لەدوای نـانخواردن نەڕۆشـتبوون گەڕایـەوە، جـا دوو پیاوەکـە هەستان ڕۆشتن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ)**. سورة الاحزاب: ٥٣.

٣٢٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُجْمِرِ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ الأَنْصَارِيَّ،، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ زَيْدٍ الَّذِي كَانَ أُرِيَ النِّدَاءَ بِالصَّلاَةِ، أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ: أَمَرَنَا اللَّهُ أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى

إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي العَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَالسَّلاَمُ كَمَا قَدْ عُلِّمْتُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي حُمَيْدٍ، وَكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، وَطَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَزَيْدِ بْنِ خَارِجَةَ وَيُقَالُ: ابْنُ جَارِيَةَ، وَبُرَيْدَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبی مەسعودی ئەنصاریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە كۆڕی سەعدی كوڕی عوبادەدا رەزای خوای لێ بێ دانیشتبووین، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆ لامان، بەشیری كوڕی سەعد رەزای خوای لێ بێ پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خوای گەورە فەرمانی پێ كردووین كە سڵاوات لەسەر تۆ بدەین، چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین؟ ئەویش ئەوەندە بێدەنگ بوو هەتا وتمان خۆزگە ئەم پرسیارەی لێ نەدەكرد، پاشان فەرمووی: (بڵێن: (**اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي العَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ**). واتە: ئەی خوایە بەرەكەتی خۆت برژێنە بەسەر موحەممەد و ئالی موحەممەد دا، وەك چۆن رژاندووتە بەسەر ئالی ئیبراهیم دا، ئەی خوایە خەیر و بەرەكەتی خۆت بۆ سەر موحەممەد و ئالی موحەممەد زیاد بكە، وەك چۆنت كردووە بۆ ئالی ئیبراهیم، بەڕاستی تۆ سوپاسكراو و گەورەیت، سەلامدانەوەش وەك چۆن پێشتر فێركراون هەر بەو شێوەیە سەلام بدەنەوە).

٣٢٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ عَوْفٍ، عَنِ الحَسَنِ، وَمُحَمَّدٍ، وَخِلاَسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ كَانَ رَجُلاً حَيِيًّا سَتِيرًا مَا يُرَى مِنْ جِلْدِهِ شَيْءٌ اسْتِحْيَاءً مِنْهُ فَآذَاهُ

مَنْ آذَاهُ مِنْ بني إسرائيل فَقَالُوا: مَا يَسْتَتِرُ هَذَا التَّسَتُّرَ إلاَّ مِنْ عَيْبٍ بِجِلْدِهِ إِمَّا بَرَصٌ وَإِمَّا أُدْرَةٌ وَإِمَّا آفَةٌ، وَإِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أَرَادَ أَنْ يُبَرِّئَهُ مِمَّا قَالُوا، وَإِنَّ مُوسَى خَلاَ يَوْمًا وَحْدَهُ فَوَضَعَ ثِيَابَهُ عَلَى حَجَرٍ ثُمَّ اغْتَسَلَ فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ إِلَى ثِيَابِهِ لِيَأْخُذَهَا وَإِنَّ الحَجَرَ عَدَا بِثَوْبِهِ فَأَخَذَ مُوسَى عَصَاهُ فَطَلَبَ الحَجَرَ فَجَعَلَ يَقُولُ: ثَوْبِي حَجَرُ ثَوْبِي حَجَرُ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى مَلَإٍ مِنْ بني إسرائيل فَرَأَوْهُ عُرْيَانًا أَحْسَنَ النَّاسِ خَلْقًا، وَأَبْرَأَهُ مِمَّا كَانُوا يَقُولُونَ قَالَ: وَقَامَ الحَجَرُ فَأَخَذَ ثَوْبَهُ وَلَبِسَهُ وَطَفِقَ بِالحَجَرِ ضَرْبًا بِعَصَاهُ، فَوَاللهِ إِنَّ بِالحَجَرِ لَنَدَبًا مِنْ أَثَرِ عَصَاهُ ثَلاَثًا أَوْ أَرْبَعًا أَوْ خَمْسًا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللهِ وَجِيهًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی موسا سەلامی خوای لەسەر بێ پیاوێکی زۆر بە شەرم و خۆ داپۆشەر بوو، لەبەر شەرم و شکۆی هیچ شوێنێ لەپێستی نەدەبینرا، بەنی ئیسرائیل وتیان: ببێ و نەبێ، موسا یا توشی نەخۆشی بەڵەکی بووە، یا قۆڕە، یا گرفتێکی تری هەیە! بۆیە ئەوەندە سوورە بۆ خۆ داپۆشین! جا خوای گەورە ویستی پاکانەی بۆ بکات لەو بوختانە، بۆیە ڕۆژێ مووسا بە تەنیا لە چۆڵییەکدا خۆی دەشۆرێ و جل و بەرگەکەی لەسەر بەردێ دادەنێ، جا کاتێ لێ بوویەوەو چوو جلەکانی لەبەر بکاتەوە، بینی بەردەکە دەڕوا، مووساش دار دەستەکەی بەدەستەوە گرت و دوای کەوت و هەر ئەی وت: بەردەکە! جلەکانم، هەتا گەیشتە لای کۆمەڵێ لە بەنی ئیسرائیل، ئەوانیش بە ڕووت و قووتی دیتیان وەك جوانترین دروستکراوی خوا و بۆیان دەرکەوت کە هیچ

عەیب و نەنگێکی پێوە نییە، خوای گەورە پاکێتی موسای دەرخست و بەدرۆی خستنەوە پێی سەلماندن کە ئەوەی ئەوان دەیڵێن هیچ بنەمایەکی نیە، بەردەکە وەستا، موساش جلەکانی لەبەرکردەوە، ئینجا بە داردەستەکەی دەستی کرد بە لێدانی بەردەکە، سوێند بە (الله) شوێنەواری لێدانی بەردەکە لە سێ یان چوار یا پێنج شوێن دیار بوو، خوای گەورەش دەفەرموویت: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللهِ وَجِيهًا)**. سورة الاحزاب: ٦٩.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەکو ئەو کەسانە مەبن کە ئازاری موسایانداو تۆمەتیان بۆ هەڵبەست، خواش موسای تەبریە کرد لەو بوختانەی بۆیان کرد، چونکە موسا لای خوا، گەورەو خاوەن (جاه)و ڕێز بوو.

## دەربارەی سورەتی (سَبَأ).

## ٣٥ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ سَبَأٍ

٣٢٢٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالاَ: أَخْبَرَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ الحَكَمِ النَّخَعِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَبْرَةَ النَّخَعِيُّ، عَنْ فَرْوَةَ بْنِ مُسَيْكٍ الْمُرَادِيِّ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلاَ أُقَاتِلُ مَنْ أَدْبَرَ مِنْ قَوْمِي بِمَنْ أَقْبَلَ مِنْهُمْ؟ فَأَذِنَ لِي فِي قِتَالِهِمْ وَأَمَّرَنِي، فَلَمَّا خَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ سَأَلَ عَنِّي، مَا فَعَلَ الغُطَيْفِيُّ؟ فَأُخْبِرَ أَنِّي قَدْ سِرْتُ، قَالَ: فَأَرْسَلَ فِي أَثَرِي فَرَدَّنِي فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: ادْعُ القَوْمَ فَمَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمْ فَاقْبَلْ مِنْهُ، وَمَنْ لَمْ يُسْلِمْ فَلاَ تَعْجَلْ حَتَّى أُحْدِثَ إِلَيْكَ قَالَ: وَأُنْزِلَ فِي سَبَإٍ مَا أُنْزِلَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا سَبَأٌ، أَرْضٌ أَوْ امْرَأَةٌ؟ قَالَ: لَيْسَ بِأَرْضٍ وَلاَ امْرَأَةٍ، وَلَكِنَّهُ رَجُلٌ وَلَدَ عَشَرَةً مِنَ العَرَبِ فَتَيَامَنَ مِنْهُمْ سِتَّةٌ، وَتَشَاءَمَ مِنْهُمْ أَرْبَعَةٌ. فَأَمَّا الَّذِينَ تَشَاءَمُوا فَلَخْمٌ، وَجُذَامُ،

وَغَسَّانُ، وَعَامِلَةُ، وَأَمَّا الَّذِينَ تَيَامَنُوا: فَالأُزْدُ، وَالأَشْعَرِيُّونَ، وَحِمْيَرٌ، وَمَذْحِجٌ، وَأَنْمَارٌ، وَكِنْدَةُ. فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا أَنْمَارٌ؟ قَالَ: الَّذِينَ مِنْهُمْ خَثْعَمُ، وَبَجِيلَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە فەروەی کوڕی موسەیکی موڕادیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ڕێگەم دەدەی لەگەڵ ئەوانەی موسوڵمان بوون لە هۆزەکەم بجەنگێن لەدژی ئەوانەی کە هێشتا موسوڵمان نەبوون، ئەویش ڕێگەی پێ دام و کردمی بە فەرماندە، کاتێ من لەلای دەرچووم، دەربارەی من پرسیار دەکات و دەفەرمووێ: (فەروەی (قطیفي) چی بەسەرهات)، ئەوانیش وتیان: ڕۆشتەوە، ئەویش دەنێرێ بە شوێنمدا کە بمگەڕێننەوە، کاتێ گەڕامەوە لەناو کۆمەڵێ لە هاوەڵانیدا بوو، فەرمووی: (هۆزەکەت بانگ بکە بۆ ئیسلام ئەوەی موسوڵمان بوو ئەوە زۆر باشە، ئەوەشی موسوڵمان نەبوو پەلەی لێ مەکە هەتا پەیامت بۆ دەنێرم و فەرمانت پێ دەکەم بە شتێکی تازە)، فەرمووی: کاتێ ئایەت هاتەخوارەوە لەبارەی سەبەئەوە، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، (سبأ) چیە؟ وڵاتە یان ئافرەتە؟ فەرمووی: (نە وڵاتەو نە ئافرەتە، ناوی پیاوێکی عەرەب بووە دە کوڕی هەبووە شەشیان لەلای ڕاستەوە نیشتەجێ بوون واتە لە شام، چوارەکەی تریشیان لەلای چەپەوە نیشتەجێ بوون واتە لە یەمەن، چوارەکەی لای چەپ بریتی بوون لە: (لَخْم، جُذَام، غَسَّان، عَامِلَة)، شەشەکەی لای ڕاستیش بریتی بوون لە: (أُزْد،أَشْعَرِيُّون، حِمْيَر، مَذْحِج، أَنْمَار، كِنْدَة)، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، (أَنْمَار) چیە؟ فەرمووی: (ئەو هۆزەیە کە هەردوو تیرەی (خَثْعَم) و (بَجِيلَة) دەچنەوە سەری).

٣٢٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا قَضَى اللَّهُ فِي السَّمَاءِ أَمْرًا ضَرَبَتِ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ كَأَنَّهَا سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ فَـ (إِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا الحَقَّ وَهُوَ العَلِيُّ الكَبِيرُ) قَالَ: وَالشَّيَاطِينُ بَعْضُهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە بڕیارێکی دەرکرد و فەرمایشێکی فەرموو، مەلائیکەکان باڵ دەدەن بە یەکدا و ملکەچ دەکەن بۆ فەرمایشتەکەی، وەك دەنگی زرەی زنجیری سەرتاوێر وایە، **(إِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا الحَقَّ وَهُوَ العَلِيُّ الكَبِيرُ)**. سورة سبأ: ٢٣. واتە: تا ئەو دەمەی کە سام و ترس لە دڵیاندا دادەمرکێ بە مۆڵەتدان بە شەفاعەت بۆیان، ئەوجا دەمیان ئەکرێتەوەو لەناو یەکتردا دەڵێن: ئاخۆ پەروەردگاری ئێوە چ بڕیارێکی دا، چی وت سەبارەت بە تکاکردن؟ لە وەڵامدا ئەڵێن: خوا هەق و راستی فەرموو، واتە: ئیزنی شەفاعەتی دا بۆ کەسێك خۆی لێی رازیی بێت، هەر ئەویشە زۆر بڵندو پایە بەرزی گەورە، هیچ کەسێك بۆی نیە دەست بخاتە کاریەوە.

فەرمووی: (شەیتانەکان هەندێکیان لەسەرووی هەندێکی تریانەوەن) — یەك دەیگەیەنن بەیەك لەسەرەوە بۆ خوارەوە - .

٣٢٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ إِذْ رُمِيَ بِنَجْمٍ فَاسْتَنَارَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ لِمِثْلِ هَذَا فِي الجَاهِلِيَّةِ إِذَا رَأَيْتُمُوهُ؟

قَالُوا: كُنَّا نَقُولُ: يَمُوتُ عَظِيمٌ أَوْ يُولَدُ عَظِيمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَإِنَّهُ لاَ يُرْمَى بِهِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ وَلَكِنَّ رَبَّنَا عَزَّ وَجَلَّ إِذَا قَضَى أَمْرًا سَبَّحَ لَهُ حَمَلَةُ العَرْشِ ثُمَّ سَبَّحَ أَهْلُ السَّمَاءِ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ التَّسْبِيحُ إِلَى هَذِهِ السَّمَاءِ، ثُمَّ سَأَلَ أَهْلُ السَّمَاءِ السَّادِسَةِ أَهْلَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالَ: فَيُخْبِرُونَهُمْ ثُمَّ يَسْتَخْبِرُ أَهْلُ كُلِّ سَمَاءٍ حَتَّى يَبْلُغَ الخَبَرُ أَهْلَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا وَتَخْتَطِفُ الشَّيَاطِينُ السَّمْعَ فَيَرْمَوْنَ فَيَقْذِفُونَهُ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ فَمَا جَاءُوا بِهِ عَلَى وَجْهِهِ فَهُوَ حَقٌّ، وَلَكِنَّهُمْ يُحَرِّفُونَهُ وَيَزِيدُونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الحُسَيْنِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ رِجَالٍ مِنَ الأَنْصَارِ قَالُوا: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناو چەند کەسێ لەهاوەڵەکانیدا دانیشتبوو، لەوکاتەدا ئەستێرەیە کشاو شوقی دایەوە، فەرمووی: (لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر ئەستێرەیە بکشایە دەتانوت چیە؟) وتیان: ئێمە دەمانوت: پیاوێکی گەورە دەمرێ یان پیاوێکی گەورە لەدایك دەبێ، فەرمووی: (هیچیان نیە، بەڵکو خوای گەورە کە بڕیارێ دەدا هەڵگرانی عەرش دەست دەکەن بە تەسبیحات کردن، لەپاشدا خەڵکی ئاسمان، جا ئەوانەی دوای ئەوان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، هەتا دەنگیان دەگاتە ئاسمانی دونیا، ئەوەی خوای گەورە فەرموویێتی پێیان رادەگەیەنن، شەیاتینەکان گوێیان هەڵدەخەن و هەواڵەکە دەفڕێنن و دەیگەیەنن بە کوڵەنانی و کاهینەکان، جا هەر قسە و هەواڵێ کە بەشێوەی خۆی دەیهێنن ئەوە ڕاست و دروستە، بەڵام خۆیان درۆی تری پێوە دەنێن و لێی زیاد دەکەن).

## دەربارەی سورەتی (الْمَلاَئِكَة).

٣٦ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْمَلاَئِكَةِ

٣٢٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، وَمُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْوَلِيدِ بْنِ عَيْزَارٍ، أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً، مِنْ ثَقِيفٍ يُحَدِّثُ عَنْ رَجُلٍ، مِنْ كِنَانَةَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ فِي هَذِهِ الآيَةِ: (ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ) قَالَ: هَؤُلاَءِ كُلُّهُمْ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ، وَكُلُّهُمْ فِي الْجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەربارەی ئەم ئایەتەوە: **(ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ)** سورة فاطر: ٣٢. واتە: لە پاشان ئەم قورئانەمان کردە میرات و کەلەپوور بۆ ئەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردن، بەڵێ... ئەم ئوممەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم چاکترین گەلی هەڵبژێرراوە، هەر بۆیەش ئەم قورئانە دوای پەیامبەر صلی الله علیه وسلم دراوەتە دەستی ئەوان، ئینجا ئەوانە سەبارەت بە قورئان دەبنە سێ بەشەوە: هەندێکیان — بە قسوورو کەمتەرخەمی کردن لەکارپێکردنیدا- ستەم لە خۆ دەکەن. قسەی ڕاستیش ئەوەیە کە ئەوانە لەم ئوممەتەن. بڕێکیشیان مامناوەندین، واتە: نە کەمتەرخەمی دەکەن و نە زیادەڕەویش هەندێکیشیان — بەفەرمانی خوا- لە ئەنجامدانی کارە چاکەکاندا پێشکەوتوون. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر سێ جۆرەکە لە ئوممەتی منن و ئەهلی بەهەشتن).

دەربارەی سورەتی (یس).

## ٣٧ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ يس

٣٢٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ وَزِيرٍ الوَاسِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: كَانَتْ بَنُو سَلِمَةَ فِي نَاحِيَةِ الْمَدِينَةِ فَأَرَادُوا النُّقْلَةَ إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ) فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ آثَارَكُمْ تُكْتَبُ فَلاَ تَنْتَقِلُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ وَأَبُو سُفْيَانَ هُوَ طَرِيفٌ السَّعْدِيُّ.

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بەنو سەلەمە ویستیان بگوێزنەوە بۆ نزیکی مزگەوتی بینەوە، ئەم ئایەتە دابەزی: **(إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ)**. سورة یس: ١٢.
واتە: بێگومان تەنها ئێمەین هەموو مردووان زیندوو دەکەینەوە و هەر کارێکیان پێشخۆ خستبێ تۆماری دەکەین و تەنانەتی ئاسەواریشیان گشت دەنووسین، واتە: هەر رێ و رەوشتێکیان بەجێ هێشتبێ چاك و خراپ بۆیان حسێب دەکەین. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی هۆزی بەنو سەلەمە مەگوێزنەوە هەنگاو بە هەنگاو پاداشتان بۆ دەنوسرێت). ئیتر لەشوێنی خۆیان مانەوە.

٣٢٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا أَبَا ذَرٍّ، أَتَدْرِي أَيْنَ تَذْهَبُ

هَذِهِ؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّهَا تَذْهَبُ فَتَسْتَأْذِنُ فِي السُّجُودِ فَيُؤْذَنُ لَهَا، وَكَأَنَّهَا قَدْ قِيلَ لَهَا: اطْلُعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَطْلُعُ مِنْ مَغْرِبِهَا، قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ وَذَلِكَ مُسْتَقَرٌّ لَهَا قَالَ: وَذَلِكَ فِي قِرَاءَةِ عَبْدِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (أبو ذر)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتی خۆر ئاوابوون بوو چوومە مزگەوتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوو فەرمووی: (ئایا دەزانێ ئەمە بۆ کوێ دەڕواو لەکوێ ئاوا دەبێت؟ واتە خۆر). وتم: خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (بێگومان خۆر دەڕوات داوای مۆڵەتی سەجدەبردن دەکات، جا مۆڵەتی پێ دەدرێت سەجدە دەبات - وەك عادەتی خۆی هەموو ڕۆژێ لەخۆرهەڵاتەوە هەڵدێ — سەرەنجام وەك ئەوەی پێی بوترێت لەکوێوە هاتی هەر لەوێشەوە هەڵبێرەوە، ئەویش لە خۆرئاواوە هەڵدێ، فەرمووی: لەپاشدا ئەمەی خوێندەوە: (**وَذَلِكَ مُسْتَقَرٌّ لَهَا**) ئەمەش ئارامگای خۆیەتی). خوێندنەوەی (عبد الله)ی کوڕی مەسعودە ڕەزای خوای لێ بێ.

## دەربارەی سورەتی (الصَّافَّاتِ).

### ٣٨ – بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الصَّافَّاتِ

٣٢٢٨ – (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا لَيْثُ بْنُ أَبِي سُلَيْمٍ، عَنْ بِشْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ دَاعٍ دَعَا إِلَى شَيْءٍ إِلاَّ كَانَ مَوْقُوفًا يَوْمَ القِيَامَةِ لاَزِمًا لَهُ لاَ يُفَارِقُهُ، وَإِنْ دَعَا رَجُلٌ رَجُلاً، ثُمَّ قَرَأَ قَوْلَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ مَا لَكُمْ لاَ تَنَاصَرُونَ). هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتــە: لــە ئەنەســی كــوڕی مالیكــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر بانگكـەرێ خەڵك بانگ بكات بۆ پەرستنی هەرشتێ، لـەڕۆژی قیامەتـدا ئـەو شـتە پەرسـتراوە رادەوەستێنرێ و ئەو بانگكەرە پێوەی دەنوسێ و لێی جیانابێتەوە، تەنانەت ئەگـەر پیاوێ پیـاوێ بپەرسـتێ لـەرۆژی قیامەتـدا پێـوەی دەنوسـێ و لێـی جیانابێتــەوە). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ مَا لَكُمْ لاَ تَنَاصَرُونَ)**. سورة الصافات: ٢٤ - ٢٥. واتــە: رایــانگرن! چــونكە بەراســتیی لــە وتــەو كردەوەكانیــان بەرپرسیارن، پێیان دەوترێ: چیتانە؟ بۆ یارمەتی یەكتر نادەن؟!.

٣٢٢٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ زُهَيْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: (وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ) قَالَ: عِشْرُونَ أَلْفًا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتــە: لــە ئوبــەی كــوڕی كەعبــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: لەبارەی ئەم ئایەتەوە: **(وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ)**. سـورة الصافات: ١٤٧. واتە: پاشان ناردمانەوە بـۆلای سـەد هـەزار كەسـیی واتـە یـونس، یـان زیاتر. لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیـه وسـلم پرسـی ئـەو زیادەیـە چـەند بـوو، فەرمووی: (بیست هەزار كەس).

٣٢٣٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ ابْنُ عَثْمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: (وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ البَاقِينَ) قَالَ: حَامٌ، وَسَامٌ،

وَيَافِثُ بِالثَّاءِ. يُقَالُ: يَافِتُ، وَيَافِثُ بِالتَّاءِ وَالثَّاءِ، وَيُقَالُ: يَفِثُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ بَشِيرٍ.

واتە: لە سەمورەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: لـەبارەی ئەم ئایەتەوە: (وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ). سورة الصافات: ٧٧. واتە: لە ناو ئـەو هـەموو خەڵکەدا زاڕۆو نەوەکانی ئەومان هێشتەوە. دەڵێن: لە پیـاوو لـە ژن تـەنها هەشـتا کەسێك باوەڕیان هێناو دەرچوون، پاشان مرۆڤ بۆ دوایـی لـە سـیّ کوڕەکـەی نـووح: (سام، حام، یافیس)، زاوزێیانکردووەو پەیدابوونەوە.

لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پرسی ئەوانە کـێ بـوون هێشـتنیەوە، فەرمووی: (سام، حام، یافث).

٣٢٣١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: سَامٌ أَبُو العَرَبِ، وَحَامٌ أَبُو الحَبَشِ، وَيَافِثُ أَبُو الرُّومِ.

واتە: لە سەمورەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سام باوکی عەرەبە، حـام بـاوکی حەبەشـە، یـافیس باوکی رۆمە).

## دەربارەی سورەتی (ص).

## ٣٩ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ ص

٣٢٣٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ يَحْيَى، قَالَ عَبْدٌ: هُوَ

ابْنُ عَبَّادٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: مَرِضَ أَبُو طَالِبٍ فَجَاءَتْهُ قُرَيْشٌ، وَجَاءَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدَ أَبِي طَالِبٍ مَجْلِسُ رَجُلٍ، فَقَامَ أَبُو جَهْلٍ كَيْ يَمْنَعَهُ قَالَ: وَشَكَوْهُ إِلَى أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي مَا تُرِيدُ مِنْ قَوْمِكَ؟ قَالَ: إِنِّي أُرِيدُ مِنْهُمْ كَلِمَةً وَاحِدَةً تَدِينُ لَهُمْ بِهَا العَرَبُ، وَتُؤَدِّي إِلَيْهِمُ العَجَمُ الجِزْيَةَ. قَالَ: كَلِمَةً وَاحِدَةً؟ قَالَ: كَلِمَةً وَاحِدَةً قَالَ: يَا عَمِّ يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ فَقَالُوا: إِلَهًا وَاحِدًا مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلاَّ اخْتِلاَقٌ. قَالَ: فَنَزَلَ فِيهِمُ القُرْآنُ: (ص وَالقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ)، إِلَى قَوْلِهِ: (مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلاَّ اخْتِلاَقٌ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَ هَذَا الْحَدِيثِ، وقَالَ يَحْيَى بْنُ عُمَارَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ (أبي طالب) نەخۆش بوو، قورەیش سەردانیان دەکرد، هەروەها پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم سەردانی دەکرد، جارێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەردانی کرد لەوکاتەدا دەستەیەك لە ناودارانی قورەیش بە هاوڕێیەتی ئەبو جەهل لەلای بوون، دیتی لە تەنیشت (أبي طالب)ی مامیەوە جێی تەنها کەسێ ماوە، جا (ئەبوجەهل) لە ترسی ئەوە نەوەك موحەممەد صلی الله علیه وسلم لەوێ دانیشێ و، بە قسە شیرینەکانی ئەبوتالیب نەرم بکا، پەلاماری داو چووە پاڵی (أبي طالب)، ئیتر جێ بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەمایەوەو لەلای دەرگاکەوە دانیشت! سکاڵای کرد لەلای (أبي طالب) پێی وت: تۆ دەزانی برازاکەت چی دەکاو، چی دەڵێ بە خواکانمان؟! بەڵکو ئامۆژگاری بکەیت! ئەویش وتی برازاکەم! بۆ چ خزمان گلەییت لێ دەکەن سەبارەت بە خواکانیان؟! فەرمووی: (مامە! من تەنها یەك قسەم هەیە، ئەگەر بیڵێن و بەگوێم بکەن ئەوا هەمووعەرەب گوێڕایەڵ دەبن و،

ئەگەر عەجەمەکانیش نەیلێن سەرانەی خۆیان دەدەن). وتی: برازاکەم! وشەکەی تۆ چییە؟ فەرمووی: (لا إله إلاالله)یە واتە: جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە. وتیان: تەنیا یەك خواپەرستن: (**أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ**). واتە: بێ باوەڕەکان — لە باتی تەسلیم بوون و باوەڕهێنان- وتیان: ببێ و نەبێ ئەم موحەممەدە کە دەڵێت: من نێرراوی خوام جادووگەرێکی درۆزنە! ئەرێ هەموو خواکانی کردۆتە یەك خوا؟! بەراستیی ئەمە کە موحەممەد صلی الله علیه وسلم دەیڵێ، (واتە: یەك خواپەرستن) شتێکی سەیرو سەمەرەیە! جا قورئان دەربارەیان دابەزی: (**ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ (١) بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ (٢) كَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ قَرْنٍ فَنَادَوْا وَلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ (٣) وَعَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ (٤) أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ (٥) وَانْطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ (٦) مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ**). سورة ص: ١ - ٧.

واتە: پیتی (صاد)یش هەر وەك پیتی سوورەتەکانی تر هێمای ئیعجازی قورئانن و، ڕەمزی بە گژاچوونی قورەیشن لە بەرامبەر قورئانەوە، سوێند بەم قورئانە خاوەن شەرەفە، کە بۆکەسێ کاری پێ بکا، مایەی ناوو شۆرەتێکی چاك بەرزو پیرۆزە، واتە: ئەم قورئانە خۆی لە خۆیدا مۆعجیزەیەو، موحەممەدیش صلی الله علیه وسلم ڕاست دەکات، نەخێر، کە ئەوان بڕوا ناهێنن بە قورئان، لەبەر ئەوە نیە قورئان هەق نەبێ، لەبەر ئەوە نییە کە ناتەواوییەکیان تیا دیتبێ، بەڵکو بۆ خۆیان کافرو خوانەناس و دەمار بەرزو ئاشوبسازن، بۆیە بڕوا ناهێنن، پێش ئەوانیش خەڵکێکی زۆرمان لەناو برد، چونکە هەر ئەو وڕێنەی ئەمانەیان دەکرد، جا لە کاتی هاتنی سزاکەدا، هەر هاوار هاوارو لاڵەیان بوو و داوای کۆمەکیان دەکرد، بەڵام کات کاتی ڕزگاربوون نەبوو، ئایەتی: (فلما أحسوا بأسنا إذاهم منها يركضون) ١٢/٢١.

دووپاتی ئەو ماناو مەبەستە دەکات. سەرسامان لەوە کە هەر لە خۆیان – نەك لە مەلائیکە- پەیامبەرێکی (ترسێنەریان) بۆ هات؟!. بێ باوەڕەکان – لە باتی تەسلیم بوون و باوەڕهێنان- وتیان: بێ و نەبێ ئەم موحەممەدە کە دەڵێت: من نێرراوی خوام جادووگەرێکی درۆزنە! ئەرێ هەموو خواکانی کردۆتە یەك خوا؟! بەراستیی ئەمە کە موحەممەد صلى الله عليه وسلم دەیڵێ، (واتە: یەك خواپەرستن) شتێکی سەیرو سەمەرەیە! سەرکردەو ناو دارەکانیان کەوتنە ڕێ و کۆڕەکەی (ئەبوتالیب)یان بەجێ هێشت، پاش ئەوەی داوای ناو بژیوانیان لێکردبوو، جا بە خەڵکەکەیان وت: لەسەر پەرستنی خواکانتان بچن و سەبر بگرن و، دەستیان لێ بەر مەدەن، بەراستیی ئەمە –کە موحەممەد هێناویەتیی و داوای پەرستنی یەك خوا دەکات- شتێکی خوازراوە لە ئێمە، واتە: پیلانێکە دارێژراوە بۆ دوور خستنەوەمان لە پەرستنی خواکانمان، ئەمەی موحەممەد دەیڵێ بۆ پەرستنی یەك خوا، ئێمە لە ئاییەنی عیسادا سەلامی خوای لەسەر بێ نەمان بیستووە، ئەم یەکخواپەرستیە هەر درۆو ساختەو هەڵبەستراوە!.

٣٢٣٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَانِي اللَّيْلَةَ رَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، قَالَ أَحْسَبُهُ فِي الْمَنَامِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ أَوْ قَالَ: فِي نَحْرِي، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: نَعَمْ، فِي الكَفَّارَاتِ، وَالكَفَّارَاتُ الْمُكْثُ فِي الْمَسَاجِدِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، وَالْمَشْيُ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ، وَإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكَارِهِ، وَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ

بِخَيْرٍ، وَكَانَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِذَا صَلَّيْتَ فَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَإِذَا أَرَدْتَ بِعِبَادِكَ فِتْنَةً فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ، قَالَ: وَالدَّرَجَاتُ إِفْشَاءُ السَّلاَمِ، وَإِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَالصَّلاَةُ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ. وَقَدْ ذَكَرُوا بَيْنَ أَبِي قِلاَبَةَ، وَبَيْنَ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي هَذَا الحَدِيثِ رَجُلاً وَقَدْ رَوَاهُ قَتَادَةُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ اللَّجْلاَجِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەم شەو پەروەردگارم لە جوانترین شێوەدا هاتە لام، فەرمووی: پێم وایە فەرمووی: لەخەومدا، فەرمووی: ئەی موحەممەد، ئایا دەزانی مەلائیکە نزیکەکان لە ئاسمان لەسەرچی باس و خواسیانە؟ فەرمووی: وتم: نازانم، پەروەردگار دەستی دانا لەسەر نێوان هەردوو شانم، هەستم بە ساردی و فێکی کرد لەنیوان هەردوو مەمکمدا، هەرچی زانیاری لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە فێربووم، دووبارە فەرمووی: ئەی موحەممەد، ئایا دەزانی مەلائیکە نزیکەکان لە ئاسمان لەسەرچی باس و خواسیانە؟ وتم: بەڵێ، لەسەر (کفارات) ئەو شتانەی تاوان دەسڕنەوە، هەروەها لەسەر (درجات) ئەو شتانەی کە پلەو پایەی موسوڵمان بەرزدەکەنەوە، (کفارات) بریتییە لە: مانەوە لە مزگەوت لەدوای نوێژ، بە پێ رۆشتن بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، دەستنوێژگرتن لەکاتی سەرماو بەڵاو ناخۆشی و نەخۆشیدا، هەرکەس ئەو کارانە بکات، لەسەر خێر و چاکە دەژی و لەسەر خێر و چاکەش دەمرێت، وەك ئەو رۆژەی لەدایك دەبێ ئاوا گوناهو تاوان پاك دەبێتەوە، فەرمووی: ئەی موحەممەد، کە نوێژت کرد بڵێ: خودایە من دوات لێ دەکەم بمخەیتە سەر رێگەی خێر و چاکە، کاری خێر و چاکە بکەم، وازبهێنم لە خراپە و دوورم بخەیتەوە لە تاوان و خراپە،

هەژارانیشم خۆش بوێت، ئەگەر ویستت بەندەکانت تاقی بکەیتـەوە بـە گـومڕایی و سزای دونیایی بەر لـەوەی مـن تـووش ئـەو تاقیکردنـەوە بکـەی روحـم بکێشـە بـە سەلامەتی، (درجات)یش بریتییە لە: سڵاوکردن و بڵاوکردنەوەی ئاشتی، بەخشـینی خواردن بە هەژاران، شەونوێژ کردن لەکاتێکدا کە خەڵك خەوتوون).

٣٢٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ اللَّجْلاَجِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَتَانِي رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَبِّي وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: رَبِّ لاَ أَدْرِي، فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَعَلِمْتُ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: فِي الدَّرَجَاتِ وَالكَفَّارَاتِ، وَفِي نَقْلِ الأَقْدَامِ إِلَى الجَمَاعَاتِ، وَإِسْبَاغِ الوُضُوءِ فِي الْمَكْرُوهَاتِ، وَانْتِظَارِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، وَمَنْ يُحَافِظْ عَلَيْهِنَّ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ بِخَيْرٍ، وَكَانَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَائِشٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِطُولِهِ وَقَالَ: إِنِّي نَعَسْتُ فَاسْتَثْقَلْتُ نَوْمًا فَرَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ؟ فَقَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (ئـەم شـەو پـەروەردگارم لـە جوانترین شێوەدا هاتە لام، فەرمووی: ئەی موحەممەد، وتم: ئەی پـەروەردگارم، هـام لەخزمەتتـدا چ فـەرمانێك هەیـە هـەتا جێبـەجێی بکـەم، فـەرمووی: ئایـا دەزانـی مەلائیکە نزیکەکان لە ئاسمان لەسەرچـی بـاس و خواسـیانە؟ فـەرمووی: وتم: ئـەی

پەروەردگارم نازانم، دەستی دانا لەسەر نێوان هەردوو شانم، هەستم بە ساردی و فێكی كرد لەنیوان هەردوو مەمكمدا، هەرچی زانیاری لە نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوادا هەیە فێربووم، دووبارە فەرمووی: ئەی موحەممەد، وتم: ئەی پەروەردگارم، هام لەخزمەتتدا چ فەرمانێك هەیە هەتا جێبەجێی بكەم، فەرمووی: ئایا دەزانی مەلائیكە نزیكەكان لە ئاسمان لەسەرچی باس و خواسیانە؟ وتم: بەڵێ، لەسەر (كفارات)و، (درجات)و، هەنگاونان بەرەو مزگەوت بۆ نوێژی بەكۆمەڵ و، دەستنوێژگرتن لەكاتی سەرماو بەلاو ناخۆشی و نەخۆشی و، چاوەڕوانی نوێژ لەدوای نوێژ، هەركەس پارێزگاریان لێ بكات و ئەو كارانە بكات، لەسەر خێر و چاكە دەژی و لەسەر خێر و چاكەش دەمرێت، وەك ئەو رۆژەی لەدایك دەبێ ئاوا گوناهو تاوان پاك دەبێتەوە).

٣٢٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هَانِئٍ أَبُو هَانِئٍ الْيَشْكُرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَهْضَمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ سَلاَّمٍ، عَنْ أَبِي سَلاَّمٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَائِشٍ الحَضْرَمِيِّ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ عَنْ مَالِكِ بْنِ يَخَامِرَ السَّكْسَكِيِّ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: احْتُبِسَ عَنَّا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ غَدَاةٍ مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى كِدْنَا نَتَرَاءَى عَيْنَ الشَّمْسِ، فَخَرَجَ سَرِيعًا فَثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَجَوَّزَ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ دَعَا بِصَوْتِهِ فَقَالَ لَنَا: عَلَى مَصَافِّكُمْ كَمَا أَنْتُمْ ثُمَّ انْفَتَلَ إِلَيْنَا فَقَالَ: أَمَا إِنِّي سَأُحَدِّثُكُمْ مَا حَبَسَنِي عَنْكُمُ الغَدَاةَ: أَنِّي قُمْتُ مِنَ اللَّيْلِ فَتَوَضَّأْتُ فَصَلَّيْتُ مَا قُدِّرَ لِي فَنَعَسْتُ فِي صَلاَتِي فَاسْتَثْقَلْتُ، فَإِذَا أَنَا بِرَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَبِّ، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: لاَ أَدْرِي رَبِّ، قَالَهَا ثَلاَثًا قَالَ: فَرَأَيْتُهُ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ أَنَامِلِهِ بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَتَجَلَّى لِي كُلُّ

شَيْءٍ وَعَرَفْتُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَبِّ، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: فِي الكَفَّارَاتِ، قَالَ: مَا هُنَّ؟ قُلْتُ: مَشْيُ الأَقْدَامِ إِلَى الجَمَاعَاتِ، وَالجُلُوسُ فِي الْمَسَاجِدِ بَعْدَ الصَّلَوَاتِ، وَإِسْبَاغُ الوُضُوءِ فِي الْمَكْرُوهَاتِ، قَالَ: ثُمَّ فِيمَ؟ قُلْتُ: إِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَلِينُ الكَلاَمِ، وَالصَّلاَةُ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ. قَالَ: سَلْ. قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَأَنْ تَغْفِرَ لِي وَتَرْحَمَنِي، وَإِذَا أَرَدْتَ فِتْنَةً فِي قَوْمٍ فَتَوَفَّنِي غَيْرَ مَفْتُونٍ، وَأَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَحُبَّ عَمَلٍ يُقَرِّبُ إِلَى حُبِّكَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهَا حَقٌّ فَادْرُسُوهَا ثُمَّ تَعَلَّمُوهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. سَأَلْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. هَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ الوَلِيدِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ اللَّجْلاَجِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَائِشٍ الحَضْرَمِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ الحَدِيثَ. وَهَذَا غَيْرُ مَحْفُوظٍ. هَكَذَا ذَكَرَ الوَلِيدُ، فِي حَدِيثِهِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَائِشٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرَوَى بِشْرُ بْنُ بَكْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، هَذَا الحَدِيثَ بِهَذَا الإِسْنَادِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَائِشٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهَذَا أَصَحُّ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَائِشٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (معاذ)ی كوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ نوێژی بەیانی درەنگ هات بۆ ناومان، تەنانەت ئەوەندە درەنگ هات خەریك بوو خۆر خۆی ببینین، لەپاشدا بە پەلە هات، قامەتی نوێژ كراو بە پەلە بەرنوێژی بۆ كردین، كاتێ سەلامی دایەوە بانگی كردین، پێی فەرموویین: (كەس لەجێی خۆی نەجولێت)، لەپاشدا ڕووی تێ كردین، ئینجا فەرمووی: (با پێتان بڵێم: بۆچی درەنگ هاتم بۆ نوێژی بەیانی، ئەم شەو هەستام دەستنوێژم گرت و ئەوەندەی لەتوانامدا هەبوو

نوێـژم کـرد، بـەدەم نوێژکردنـەوە خەوبردمیـەوە، تەنانـەت جەسـتەم قـورس بـوو، پەروەردگارم لە جوانترین شێوەدا هاتە خەوم، فـەرمووی: ئـەی موحەممـەد، وتم: وتم: ئـەی پـەروەردگارم، هـام لەخزمەتتـدا چ فـەرمانێك هەیـە هـەتا جێبـەجێی بکـەم، فەرمووی: ئایا دەزانی مەلائیکە نزیکەکان لە ئاسمان لەسەرچی بـاس و خواسـیانە؟ فەرمووی: وتم: ئەی پەروەردگارم، نازانم، سێ جار ئەمەی فـەرموو، فـەرمووی: جـا دیم دەستی دانا لەسەر نێوان هەردوو شانم، فێنکایی سەر پەنجەکانی گەیشتە نیـوان هەردوو مەمکم، هەرچی زانیاری هەموو زانستێ فێربووم و هەموو شتێکم بۆ روون بویەوە، فـەرمووی: ئـەی موحەممـەد، وتم: ئـەی پـەروەردگارم، هـام لەخزمەتتـدا چ فەرمانێك هەیە هەتا جێبەجێی بکەم، فەرمووی: ئایا دەزانی مەلائیکـە نزیکـەکان لە ئاسمان لەسەرچی بـاس و خواسـیانە؟ وتم: بـەڵێ، لەسـەر (کفـارات)، فـەرمووی: کامانەن؟ وتم: بە پێ رۆشتن بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، دانیشـتن لـە مزگـەوت لـەدوای نوێـژ، دەسـتنوێژگرتن لـەکاتی سـەرماو بـەلاو ناخۆشـی و نەخۆشـیدا، فەرمووی: لەپاشدا لەسەر چی تر؟ وتم: بەخشینی خواردن بە هەژاران، قسـەی نـەرم و گفتوگۆی شیرین، شەونوێژ کردن لەکاتێکدا کە خـەڵك خـەوتوون، فـەرمووی: داوا بکە بڵێ: خودایە من دوات لێ دەکەم بمخەیتە سەر رێگەی خێر و چاکە، کاری خێر و چاکە بکەم، وازبهێنم لە خراپە و دوورم بخەیتەوە لە تـاوان و خراپـە، هەژارانیشـم خۆش بوێت، لێم خۆش بی و رەحم پـێ بکـەیت، ئەگـەر ویسـتت بەنـدەکانت تـاقی بکەیتەوە بە گومڕایی و سزای دونیـایی بـەر لـەوەی مـن تـووش ئـەو تاقیکردنـەوە بکـەی روحـم بکێشـە بـە سـەلامەتی، داوای خۆشەویسـتی خۆتـت لـێ دەکـەم، وە خۆشەویستی ئەو کەسەش کە تۆی خۆشدەوێ، هەروەها خۆشەویسـتی ئـەو کـارەش خۆشەویستی کە دەبێ بەهۆی خۆشەویستی تۆ). پێغەمبەری خـوا صـلى الله عليـه وسلم فەرمووی: (ئەمەش هەق و راستی بوون، لەبەریان بکەن و کاری پـێ بکـەن و پێیان بپارێنەوە و خەڵکیش فێربکەن).

**دەربارەی سورەتی (الزمر).**

**٤٠ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الزُّمَرِ**

٣٢٣٦ - (حسن) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَلْقَمَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَاطِبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ عِنْدَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ) قَالَ الزُّبَيْرُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَتُكَرَّرُ عَلَيْنَا الخُصُومَةُ بَعْدَ الَّذِي كَانَ بَيْنَنَا فِي الدُّنْيَا؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ الأَمْرَ إِذًا لَشَدِيدٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە، لەباوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ عِنْدَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ)** سورة الزمر: ٣١. واتە: پاشان ئێوە لە ڕۆژی قیامەتیشدا لە لای پەروەردگارتاندا دەمەقاڵێ و کێشمەکێش دەکەن.

زوبێر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئایا جارێکی تریش لە ڕۆژی قیامەتدا ناکۆکی و بەربەرەکانێ ڕوودەداتەوە لەنێوان ئێمە و ئەواندا، فەرمووی: (بەڵێ). وتی: وا دیارە کارەکە زۆر دژوار و سەختە.

٣٢٣٧ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ، وَسُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، وحَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ (يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا) وَلاَ يُبَالِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ثَابِتٍ

عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، وَشَهْرُ بْنُ حَوْشَبٍ يَرْوِي عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ الأَنْصَارِيَّةِ، وَأُمُّ سَلَمَةَ الأَنْصَارِيَّةُ هِيَ أَسْمَاءُ بِنْتُ يَزِيدَ.

واتە: لە ئەسمائی كچی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا)** سورة الزمر: ٥٣. واتە: ئەی موحەممەد! صلی الله علیه وسلم لە منەوە بڵێ: ئەی بەندەكانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە ڕۆییتان لە خۆتان كردووە! ئێوە لە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن، بەڕاستیی خوا لە هەموو گوناحێ خۆش دەبێ. لەدوای خوێندنەوەی ئایەتەكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەر باكیشی نیە).

٣٢٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ، وَسُلَيْمَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: جَاءَ يَهُودِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ وَالجِبَالَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالخَلاَئِقَ عَلَى إِصْبَعٍ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ. قَالَ: فَضَحِكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، قَالَ: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جولەكەیە هات بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی موحەممەد، خوای گەورە ئاسمانەكان دادەنێ لەسەر پەنجەیە، زەویەكان دادەنێ لەسەر پەنجەیە، شاخ و كێوەكان دادەنێ لەسەر پەنجەیە، هەموو دروستكراوەكانی تریش دادەنێ لەسەر پەنجەیە، لەپاشدا دەفەرمووێت: (من فەرمانڕەواو پادشام). پێغەمبەری خوا

صلی الله علیە وسلم ئەوەندە پێكەنی هەتا ددانەكانی پێشەوەی دەركەوتن، فەرمووی: (**وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ**). سورة الزمر: ٦٧. واتە: ئەوانە وەكو پێویست خوایان نەناسیی و ڕێزیان لێنەگرت، ئەگینا چۆن هاوەڵیان بۆ دادەنا؟ لە ڕۆژی قیامەتدا زەویی هەموو لە ناو دەستی ئەودایەو ئاسمانەكانیش پێچراونەتەوەو بە دەستی ڕاستیەوەن، گەلێ جار لە فەرموودەكاندا باسی (دەست و پەنجە بۆ خوا هاتووە) ئەڵبەتە ئەوەش هەر بەو شێوەیە كە شایستەی زاتی خۆی بێ.

٣٢٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: فَضَحِكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَعَجُّبًا وَتَصْدِيقًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

٣٢٤٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّلْتِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو كُدَيْنَةَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: مَرَّ يَهُودِيٌّ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا يَهُودِيُّ حَدِّثْنَا فَقَالَ: كَيْفَ تَقُولُ يَا أَبَا القَاسِمِ إِذَا وَضَعَ اللهُ السَّمَوَاتِ عَلَى ذِهْ، وَالأَرْضَ عَلَى ذِهْ، وَالماءَ عَلَى ذِهْ، وَالجِبَالَ عَلَى ذِهْ، وَسَائِرَ الخَلْقِ عَلَى ذِهْ، وَأَشَارَ أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ الصَّلْتِ بِخِنْصَرِهِ أَوَّلاً، ثُمَّ تَابَعَ حَتَّى بَلَغَ الإِبْهَامَ، فَأَنْزَلَ اللهُ (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَأَبُو كُدَيْنَةَ اسْمُهُ: يَحْيَى بْنُ المُهَلَّبِ رَأَيْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، رَوَى هَذَا الحَدِيثَ عَنِ الحَسَنِ بْنِ شُجَاعٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الصَّلْتِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

جولەکەیە دای بەلای پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەی جولەکە شتێکمان بۆ باس بکە) وتی: چی بڵێم ئەی ئەبا قاسیم، خوای گەورە ئاسمانەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیەکی، زەوی دادەنێ لەسەر پەنجەیەکی، ئاو دادەنێ لەسەر پەنجەیەکی، شاخ و کێوەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیەکی، هەموو دروستکراوەکانی تریش دادەنێ لەسەر پەنجەیەکی، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ**). سورة الزمر: ٦٧. واتە: ئەوانە وەکو پێویست خوایان نەناسیی و رێزیان لێنەگرت، ئەگینا چۆن هاوەڵیان بۆ دادەنا؟ لە رۆژی قیامەتدا زەویی هەموو لە ناو دەستی ئەودایەو ئاسمانەکانیش پێچراونەتەوەو بە دەستی راستیەوەن.

٣٢٤١ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَتَدْرِي مَا سَعَةُ جَهَنَّمَ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: أَجَلْ، وَاللهِ مَا تَدْرِي. حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ، أَنَّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَوْلِهِ: (وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ) قَالَتْ: قُلْتُ: فَأَيْنَ النَّاسُ يَوْمَئِذٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: عَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، کە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ فەرموویەتی: ئەزانی فراوانی دۆزەخ چەندە؟ وتم: نازانم، فەرمووی: بەڵێ، عائیشە رەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە، کە لەبارەی ئەم ئایەتەوە: (**وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ**). سورة الزمر: ٦٧. لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پرسی؟ وتم: ئەی خەڵکەکە لەوکاتەدا لە کوێن؟ فەرمووی: (بەسەر پردی دۆزەخەوەن).

٣٢٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ (وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ) فَأَيْنَ الْمُؤْمِنُونَ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: عَلَى الصِّرَاطِ يَا عَائِشَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: **(وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ)**. واتە: لە رۆژی قیامەتدا زەویی هەموو لە ناو دەستی ئەودایەو ئاسمانەكانیش پێچراونەتەوەو بە دەستی راستیەوەن. ئەی باوەڕدارن لەوكاتەدا لە كوێن؟ فەرمووی: (ئەی عائیشە، بەسەر پردەوەن).

٣٢٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ عَطِيَّةَ الْعَوْفِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَيْفَ أَنْعَمُ وَقَدِ الْتَقَمَ صَاحِبُ الْقَرْنِ الْقَرْنَ وَحَنَى جَبْهَتَهُ وَأَصْغَى سَمْعَهُ يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْمَرَ أَنْ يَنْفُخَ فَيَنْفُخَ قَالَ الْمُسْلِمُونَ: فَكَيْفَ نَقُولُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: قُولُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللهِ رَبِّنَا وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: عَلَى اللهِ تَوَكَّلْنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چۆن كەیف خۆش بم لە كاتێكدا ئیسرافیل خاوەن كەڕەنا كەڕەناكەی لەدەم ناوەو نێوچەوانی بەسەردا شۆڕكردۆتەوەو گوێی هەڵخستووە چاوەڕوانە هەر كاتێك فەرمانی پێ بكرێت دەستبەجێ فووی پێدا بكاو كۆتایی بە جیهان بێنێ! موسڵمانان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەی ئێمە چی بڵێین؟ فەرمووی: بڵێن: (حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللَّهِ رَبِّنَا). لەوانەیە سوفیان وتی: (عَلَى اللهِ تَوَكَّلْنَا).

٣٢٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَسْلَمَ العِجْلِيِّ، عَنْ بِشْرِ بْنِ شَغَافٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا الصُّورُ؟ قَالَ: قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کەڕەنا چیە؟ فەرمووی: (شەیپورێکە فووی پێدا دەکرێت).

٣٢٤٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ يَهُودِيٌّ بِسُوقِ الْمَدِينَةِ: لاَ وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَى البَشَرِ، قَالَ: فَرَفَعَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يَدَهُ فَصَكَّ بِهَا وَجْهَهُ، قَالَ: تَقُولُ هَذَا وَفِينَا نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ) فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا مُوسَى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ العَرْشِ، فَلاَ أَدْرِي أَرَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلِي، أَمْ كَانَ مِمَّنْ اسْتَثْنَى اللَّهُ؟ وَمَنْ قَالَ: أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى فَقَدْ كَذَبَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ جولەکەیە لە بازاڕی مەدینە وتی: نا بەوەی موسای هەڵبژاردووە و کردویەتەی بەسەردەستەی هەموو ئادەمیزاد، کابرایەکی ئەنصاری زللەیەکی لێ دا، فەرمووی: ئەوە چۆن وا دەڵێی لەکاتێکدا کە پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم لەناودایە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلمفەرمووی: **(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي**

**السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ)** سورة الزمر: ٦٨. واتە: کاتێ فووکرا بە کەڕەنادا دەستبەجێ ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان دەمرن، مەگەر کەسانێ خوا بیەوێت نەمرن. پاشان جارێکی تر فوو دەکرێ بە کەڕنادا جا لەپڕ هەموو راست دەبنەوەو چاوەڕێی فەرمان دەبن.

٣٢٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الثَّوْرِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِسْحَاقَ، أَنَّ الأَغَرَّ أَبَا مُسْلِمٍ، حَدَّثَهُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: يُنَادِي مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلاَ تَمُوتُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلاَ تَسْقَمُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلاَ تَهْرَمُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلاَ تَبْأَسُوا أَبَدًا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: (وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ). وَرَوَى ابْنُ الْمُبَارَكِ وَغَيْرُهُ هَذَا الْحَدِيثَ عَنِ الثَّوْرِيِّ، وَلَمْ يَرْفَعُوهُ.

واتە: لە ئەبی سەعید و ئەبو هورەیرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێك بەهەشتیەکان سەرجەم چوونە ناو بەهەشتەوە ئیتر جارچی جاڕدەدا ئەم مژدە خۆشەیان بۆ پەخش دەکاتەوە: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! ژیانی نەبڕاوەی پڕ خێر و خۆشی تاپۆیە لەسەرتان ئیتر هەتا هەتایە لەم نازو نیعمەتەدا دەژین و هەرگیز نامرن، هەتا هەتایە بە لەشی ساغ و بەبێ دەردو ئازارو نەخۆشی بە ئاسودەیی دەژین، هەمیشە جەهێڵ و لاو دەبن قەت قەت پیرو ئیختیارو کەفتەکار نابن، هەمیشەش لە نازو نیعمەتدا دەبن قەت قەت هەژار و کەساس ناکەون). خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ)**. سورة الزخرف: ٧٢. واتە: پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو بەهەشتەیە کە بەهۆی کارە چاکەکانتانەوە پێتاندراو بە میرات پێتان بڕا، واتە: مافی خۆتانەو، پیرۆزتان بێت.

دەربارەی سورەتی (المؤمن).

## ٤١ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْمُؤْمِنِ

٣٢٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، وَالأَعْمَشِ، عَنْ ذَرٍّ، عَنْ يُسَيْعٍ الحَضْرَمِيِّ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ ثُمَّ قَرَأَ: (وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (دوعاو پاڕانەوە پەرستشە). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)**. سورة غافر: ٦٠. واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: داوا لە من بكەن و لە من بپاڕێنەوە، منیش وەڵامتان دەدەمەوە، بێگومان ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن لە پەرستنم بە تەنیا، بێگومان بە سەر شۆڕیی و بە بچووكی دەچنە دۆزەخەوە.

دەربارەی سورەتی (السَّجْدَة).

## ٤٢ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ السَّجْدَةِ

٣٢٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: اخْتَصَمَ عِنْدَ البَيْتِ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ قُرَشِيَّانِ

وَثَقَفِيٌّ، أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ، قَلِيلٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ كَثِيرٌ شَحْمُ بُطُونِهِمْ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتَرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ؟ فَقَالَ الآخَرُ: يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا، وَقَالَ الآخَرُ: إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَهُوَ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلاَ أَبْصَارُكُمْ وَلاَ جُلُودُكُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەلای کەعبەدا دوو قورەیشی و سەقەفیە یان دوو سەقەفی و قورەیشیە دەبێتە موناقەشەو دەمەقاڵێیان، بە دڵ تێنەگەیشتوو نادان، بە جەستە قەڵە و ورگ زل، یەکێکیان دەڵێ: ئایا ئێوە پێتان وایە ئێمە چی دەڵێین خوا دەیبیستێ، یەکێکی تریان دەڵێ: ئەگەر بەدەنگی بەرز قسەبکەین دەیبیستێ، بەڵام ئەگەر بە پەنهانی قسەبکەین ئەوە نایبیستێ، ئەوی تریشیان دەڵێ: ئەگەر بەدەنگی بەرز قسەبکەین بیبیستێ، ئەوە بە پەنهانیش قسەبکەین هەر دەیبیستێ، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلاَ أَبْصَارُكُمْ وَلاَ جُلُودُكُمْ)**. سورة فصلت: ٢٢. واتە: لە دونیادا لەوە خۆتان نە ئەشاردەوە کە گوێ و، چاوو پێستتان شایەدیتان لەسەر بدەن.

٣٢٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: كُنْتُ مُسْتَتِرًا بِأَسْتَارِ الكَعْبَةِ فَجَاءَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ كَثِيرٌ شُحُومُ بُطُونِهِمْ، قَلِيلٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ، قُرَشِيٌّ وَخَتَنَاهُ ثَقَفِيَّانِ أَوْ ثَقَفِيٌّ وَخَتَنَاهُ قُرَشِيَّانِ، فَتَكَلَّمُوا بِكَلاَمٍ لَمْ أَفْهَمْهُ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتَرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ كَلاَمَنَا هَذَا؟ فَقَالَ الآخَرُ: إِنَّا إِذَا رَفَعْنَا أَصْوَاتَنَا سَمِعَهُ، وَإِذَا لَمْ نَرْفَعْ أَصْوَاتَنَا لَمْ يَسْمَعْهُ. فَقَالَ الآخَرُ: إِنْ سَمِعَ مِنْهُ شَيْئًا سَمِعَهُ كُلَّهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلاَ أَبْصَارُكُمْ وَلاَ جُلُودُكُمْ)، إِلَى قَوْلِهِ: (فَأَصْبَحْتُمْ مِنَ الخَاسِرِينَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ

غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ وَهْبِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، نَحْوَهُ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەنێوان دیواری كەعبەو پەردەكەیدا بووم سێ كەس هاتن، بە دڵ تێنەگەیشتوو نادان، بە جەستە قەڵە و ورگ زل، یەكێكیان دەڵێ: قسەیان دەكرد لە قسەكەیان تێنەگەیشتم، یەكێكیان وتی: ئایا ئێوە پێتان وایە ئەم قسانەی ئێمە خوا دەیبیستێ، یەكێكی تریان وتی: ئەگەر دەنگمان بەرز بكەینەوە دەیبیستێ، بەڵام ئەگەر بە پەنهانی قسەبكەین ئەوە نایبیستێ، ئەوی تریشیان وتی: ئەگەر شتێكی لێ ببیستێ، ئەوە هەمووی دەیبیستێ، (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەمەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَكِنْ ظَنَنْتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِمَّا تَعْمَلُونَ (٢٢) وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنْتُمْ بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ مِنَ الْخَاسِرِينَ**). سورة فصلت: ٢٢ - ٢٣. واتە: لە دونیادا لەوە خۆتان نە ئەشاردەوە كە گوێ و، چاوو پێستتان شایەدیتان لەسەر بدەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هێمان هەر گومانتان وابوو كە: لە زۆرێ لەو كردەوانەی ئێوە ئەنجامیان ئەدەن، بێ ئاگایە، بۆیە بێ باكانە ئەو هەموو گوناهانەتان دەكرد، هەر ئەو گومانەتان بوو، بەرامبەر بە پەروەردگارتان لە ناوی بردن و تیاچوون و جا گەڕان لە دوو ڕاوو زیانمەندان و، خۆتان و دەورو بەرەكەشتان فەوتاند.

٣٢٥٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ الفَلاَّسُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُهَيْلُ بْنُ أَبِي حَزْمٍ القُطَعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتٌ البُنَانِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ: (إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا) قَالَ: قَدْ قَالَ النَّاسُ ثُمَّ كَفَرَ أَكْثَرُهُمْ، فَمَنْ مَاتَ عَلَيْهَا فَهُوَ مِمَّنْ

اسْتَقَامَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. سَمِعْتُ أَبَا زُرْعَةَ، يَقُولُ: رَوَى عَفَّانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَلِيٍّ، حَدِيثًا، وَيُرْوَى فِي هَذِهِ الآيَةِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ مَعْنَى: اسْتَقَامُوا.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ**). سورة فصلت: ٣٠. واتــە: بێگومــان ئــەو کەســانەش گوتیــان: پەروەردگارمان خوایە، پاشان خۆیان راستکردبوویەوە، واتــە: زۆر بــە مەحکــەمی لەسەر یەکناسین وەستان و، بە هیچ لایەکدا لایان نەدا، کاتێ مردن لـە گـۆڕدا، لـە کاتی زیندووبوونەوەدا فریشتە دائەبەزنە لایـان و، پێیـان دەڵێن: لـە پاشـە ڕۆژتـان مەترسن و، بۆ ماڵ و منداڵیشتان- پاش خۆتان- دڵ زویر مـەبن، ئێمـە چـاودێریان دەبین، موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێدرا لـە دنیـادا، مزگێنـی بێـت ئەمڕۆ ئەکەونە خۆشیی و شادییەوە.

فەرمووی: (بێگومان خەڵك دەڵێن: پـەروەردگارمان خوایـە، لەپاشـدا زۆربـەیان کافربوون، ئەو کەسەی لەسەری بمرێ ئەوە لەو کەسـانە بـووە کـە بـاوەڕی هێنـاوە و بەردەوام بووە لەسەری).

## دەربارەی سورەتی (حم عسق).

## ٤٣ – بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ حم عسق

٣٢٥١ – (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ طَاوُوسًا، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ، عَنْ هَذِهِ

الآيَةِ، (قُلْ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى) فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ: قُرْبَى آلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَعَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ بَطْنٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلاَّ كَانَ لَهُ فِيهِمْ قَرَابَةٌ فَقَالَ: إِلاَّ أَنْ تَصِلُوا مَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ مِنَ الْقَرَابَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسیان رەزای خوایان لێ بێ پرسی دەربارەی ئەم ئایەتە: **(قُلْ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى)**. سورة الشورى: ٢٣. واتە: من لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی خوا، هیچ کرێ و مزەیەکم لە ئێوە ناوێت، ئەوە نەبێت کە ئێوە لەبەر خوا مافی خزمایەتی بپارێزن و وازم لێ بێنن با پەیامەکەم بگەیەنم.

سەعیدی کوڕی جوبەیر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: مەبەست لە (قربی) خزم و کەسوکاری موحەممەدە صلی الله علیه وسلم، ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: هیچ تیرەو بنەماڵەیە لەناو قورەیشدا نەبوو ئیللا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵیان خزمایەتی هەبوو، بۆیە دەیفەرموو: (هەتا ئەو خزمایەتیەی لەنێوان من و ئێوەدایە دەیهێننەجێ).

٣٢٥٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ الوَازِعِ، قَالَ: حَدَّثَنِي شَيْخٌ مِنْ بَنِي مُرَّةَ قَالَ: قَدِمْتُ الكُوفَةَ فَأُخْبِرْتُ عَنْ بِلاَلِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، فَقُلْتُ: إِنَّ فِيهِ لَمُعْتَبَرًا فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ مَحْبُوسٌ فِي دَارِهِ الَّتِي قَدْ كَانَ بَنَى قَالَ: وَإِذَا كُلُّ شَيْءٍ مِنْهُ قَدْ تَغَيَّرَ مِنَ العَذَابِ وَالضَّرْبِ، وَإِذَا هُوَ فِي قُشَاشٍ فَقُلْتُ: الحَمْدُ لِلَّهِ يَا بِلاَلُ، لَقَدْ رَأَيْتُكَ وَأَنْتَ تَمُرُّ بِنَا وَتُمْسِكُ بِأَنْفِكَ مِنْ غَيْرِ غُبَارٍ، وَأَنْتَ فِي حَالِكَ هَذِهِ اليَوْمَ. فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ: مِنْ بَنِي مُرَّةَ بْنِ عَبَّادٍ فَقَالَ: أَلاَ أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَنْفَعَكَ بِهِ؟ قُلْتُ: هَاتِ. قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي أَبُو

بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَبِي مُوسَى، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يُصِيبُ عَبْدًا نَكْبَةٌ فَمَا فَوْقَهَا أَوْ دُونَهَا إِلاَّ بِذَنْبٍ، وَمَا يَعْفُو اللَّهُ عَنْهُ أَكْثَرُ، وَقَرَأَ (وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ). هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: شێخێکی بەنی مورِە وتی: چووم بۆ کوفە، لەوێ چوومە خزمەت بیلالی کوڕی ئەبی بوردە، فەرمووی: تۆ کێیت؟ وتم: لە بەنی مورِەی کوڕی عەببادم فەرمووی: ئایا فەرموودەیەکت بۆ باس بکەم بەڵکو خوا سودێکت پێ بگەیەنێ بەهۆیەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەبی ئەبو بوردە لە باوکیەوە ئەبو موسای ئەشعەری رەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر بەندەیە تووشی بەلاو مەینەتی و ئازارێ ببێ یان زیاتر و گەورەتر یان کەمتر ئەوە بەهۆی گوناهی بەندەکە خۆیەوەتی، ئەوەشی کە خوای گەورە دەیسرێتەوە و لێی خۆش دەبێت زۆرترە). فەرمووی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ)**. سورة الشورى: ٣٠. واتە: هەر بەڵایەکتان تووش بوو ئەوە بەهۆی کردەوەی خۆتانەوەیە، لە زۆرێك لە گوناهەکانیشتان ئەبوورێ و لە سەری سزاتان نادا، ئەگەرچی شایستەی سزایش بن.

## دەربارەی سورەتی (الزخرف).

## ٤٤ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الزُّخْرُفِ

٣٢٥٣ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، وَيَعْلَى بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي غَالِبٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلاَّ أُوتُوا الجَدَلَ، ثُمَّ تَلاَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الآيَةَ: (مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلاَّ جَدَلاً بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ حَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ وَحَجَّاجٌ ثِقَةٌ مُقَارِبُ الحَدِيثِ، وَأَبُو غَالِبٍ اسْمُهُ: حَزَوَّرُ.

واتە: لە ئەبی ئومامەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر گەل و كۆمەڵێ رێی راست ون بكەن ئیللا تووشی موجادەلە و دەمبازی دەبن). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلاَّ جَدَلاً بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ)**. سورة الزخرف: ٥٨. واتە: ئەو نموونەیان هەر بۆ دەمەدەمێ هێنایەوە بەڵكو ئەوان هۆزێكن هەر دەمبازی دەكەن.

## دەربارەی سورەتی (الدخان).

## ٤٥ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الدُّخَانِ

٣٢٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الجُدِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَمَنْصُورٍ، سَمِعَا أَبَا الضُّحَى، يُحَدِّثُ عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللهِ، فَقَالَ: إِنَّ قَاصًّا يَقُصُّ يَقُولُ: إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنَ الأَرْضِ الدُّخَانُ فَيَأْخُذُ بِمَسَامِعِ الكُفَّارِ وَيَأْخُذُ الْمُؤْمِنَ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ، قَالَ: فَغَضِبَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ ثُمَّ قَالَ: إِذَا سُئِلَ أَحَدُكُمْ عَمَّا يَعْلَمُ فَلْيَقُلْ بِهِ، قَالَ مَنْصُورٌ: فَلْيُخْبِرْ بِهِ، وَإِذَا سُئِلَ عَمَّا لاَ يَعْلَمُ فَلْيَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ مِنْ عِلْمِ الرَّجُلِ إِذَا سُئِلَ عَمَّا لاَ يَعْلَمُ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ لِنَبِيِّهِ (قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ) إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا رَأَى قُرَيْشًا اسْتَعْصَوْا

عَلَيْهِ قَالَ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ، فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ فَأَحْصَتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الجُلُودَ وَالمَيْتَةَ، وَقَالَ أَحَدُهُمَا: العِظَامَ، قَالَ: وَجَعَلَ يَخْرُجُ مِنَ الأَرْضِ كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ، فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: إِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللَّهَ لَهُمْ قَالَ: فَهَذَا لِقَوْلِهِ (يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ) قَالَ مَنْصُورٌ: هَذَا لِقَوْلِهِ: (رَبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا العَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ) فَهَلْ يُكْشَفُ عَذَابُ الآخِرَةِ؟ قَالَ: مَضَى البَطْشَةُ، وَاللِّزَامُ، وَالدُّخَانُ وقَالَ أَحَدُهُمَا: الْقَمَرُ، وَقَالَ الآخَرُ: الرُّومُ. وَاللِّزَامُ يَعْنِي يَوْمَ بَدْرٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لەمەسروقەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت (عبد الله)ی كوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ، وتی: ئامۆژگاری خوێنێ دەڵێ: دوكەڵێ لە زەوی دەردەچێت، پەردەی گوێی دەدڕێ و دوكەڵ لە كونی گوێیەوە دێتەدەرەوە، بۆ موسوڵمانیش وەك هەڵامەت بگرێ وایە، ئیبنو مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ تووڕە بوو هەستا ڕێك دانیشت، لەپاشدا فەرمووی: ئەگەر كەسێ لەئێوە پیرسیارێكیان لێ كرد وەڵامەكەی زانی با وەڵام بداتەوە، خۆ ئەگەر نەیزانی با بڵێ: خوا دەیزانێ، بێگومان خوای گەورە بە پێغەمبەرەكەی صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **(قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ)**. سورة ص: ٨٦.
واتە: : ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێ: لە پێناوی ڕاگەیاندنی پەیامەكەمدا، من هیچ پاداشێكم لە ئێوە ناوێ، وە من لەوانەیش نیم كە درۆ لەسەر خوا هەڵدەبەستن.

كاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینی قورەیش مل نادەن و پشتیان تێ كردوە و لەسەر هاوبەش بۆ خوا دانان و بێ باوەڕی بەردەوامن، دوعای لێ كردن فەرمووی: (خودایە تۆ لەجیاتی من سزایان بدە، بە حەوت ساڵ وشكە ساڵی

و گرانی و قاتوقڕی وەك قاتوقڕیەکەی سەردەمی یوسف سەلامی خوای لەسەر بێ)، جا خوای گەورە سالێ تووشی وشکە سالی و گرانی و قاتوقڕی کردن، قڕی خستە هەموو شتێکیانەوە، هیچیان بەدەستەوە نەما، تەنانەت پێست و ئێسك و مردارەوەبوویان دەخوارد، ئەوەندە بەرچاویان تاریك بوو بوو لەبرسان نێوان خۆیان و ئاسمان وەك تەم و دوکەڵ دەهاتە بەرچاویان، فەرمووی: ئەبو سوفیان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، وتی: ئەی موحەممەد قەومەکەت فەوتان و تیاچوون، لە خوا بۆیان بپاڕێرەوە هەتا رزگاریان بکات، فەرمووی: خوای گەورە بەو هۆیەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: **(يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ رَبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ)**. سورة الدخان: ١٠ - ١٢. واتە: جا چاوەڕوانی رۆژێك بە ئەی موحەممەد! صلى الله علیه وسلم کە ئاسمان بە ئاشکرا دووکەڵێکی لێ پەیدا دەبێت، لە دەرەنجامیدا گرانی و قاتوقڕیی سەر لە قوڕەیش هەڵ دەداو برسیەتیەکی ترسناك دایان دەگرێ و، لەبەر برسێتیی یەکتر نابینن و ئاسمانیش وەك چڕە دووکەڵ دێتە پێش چاویان، دیارە ئەوەیش قاری خوایە، بەتایبەت کە پەیامبەر صلى الله علیه وسلم دوعای لە قوڕەیش کردو فەرمووی: (اللهم اشدد وطأتك على مضر واجعلها عليهم سنين كسني يوسف..) بوخاریی. واتە: خوایە! گرانیی و، قاتوقڕییەکی وایان بەسەر بدە، هەر وەك گرانیەکەی سالەکانی سەردەمی یوسف. ئەم تەفسیرە- کە تەفسیری (..**يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ**)مان پێکرد- ڕاوبۆچوونی (تەبەریی)و زۆرێك لە راڤەکارانی قورئان بوو، ئەوەتە (ئیبن جەریر) ئەڵێ: (والصواب في ذلك ماروى عن ابن مسعود من أن الدخان الذي أمر الله نبيه صلى الله علية وسلم أن يرتقبه، هو ما أصاب قومه من الجهد والجوع حتى أكلوا العظام والميتة). بەڵام (ئیبن عەبباس) -خوا لێیان رازی بێت- ئەڵێت: مەبەست بە (دخان)ـەکە، ئەو دووکەڵەیە، نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هاتنی

قیامەت. (ئیبن کەسیر)یش ئەمەی پەسەندکردووەو دەڵێت: هەر چەند ئەیشگونجێت ئەوەی یەکەم بێت. سزا "دووکەڵەکە" هەموو خەڵکی مەککە دەگرێتەوە، هەرکە بینیشیان ئەڵێن: ئەمە سزایەکی ئێش پێگەیەنەرە، لەبەر ناچاری هاواریان لێ بەرزدەبێتەوەو ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەم سزایەمان لەسەر لاببە، بێگومان ئێمە باوەڕ دێنین.

٣٢٥٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبَانَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلاَّ وَلَهُ بَابَانِ، بَابٌ يَصْعَدُ مِنْهُ عَمَلُهُ، وَبَابٌ يَنْزِلُ مِنْهُ رِزْقُهُ، فَإِذَا مَاتَ بَكَيَا عَلَيْهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ (فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ). هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَمُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ، وَيَزِيدُ بْنُ أَبَانَ الرَّقَاشِيُّ يُضَعَّفَانِ فِي الحَدِيثِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو باوەڕدارێ لە ئاسمان دوو دەرگای هەیە، کردەوەکانی لە دەرگایەکیانەوە سەردەکەوێ، ڕۆزیشی لە دەرگاکەی تریانەوە دێتەخوارەوە، کاتێ وەفاتی کرد هەردووکیان بۆی دەگرین، ئەمەش مانای ئەم ئایەتەیە: (**فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ**). سورة الدخان: ٢٩. واتە: ئاسمان و زەوی شین و زاری نەکردن، وە ساتێکیش مۆڵەت نەدران و دوا نەخران بۆ کاتێکی تر، بەڵکو بە پەلە سزا دران.

دەربارەی سورەتی (الأحقاف).

## ٤٦ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الأَحْقَافِ

٣٢٥٦ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ سَعِيدٍ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُحَيَّاةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ ابْنِ أَخِي عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ، قَالَ: لَمَّا أُرِيدَ عُثْمَانُ جَاءَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ، فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: مَا جَاءَ بِكَ؟ قَالَ: جِئْتُ فِي نُصْرَتِكَ، قَالَ: اخْرُجْ إِلَى النَّاسِ فَاطْرُدْهُمْ عَنِّي فَإِنَّكَ خَارِجٌ خَيْرٌ لِي مِنْكَ دَاخِلٌ، فَخَرَجَ عَبْدُ اللهِ، إِلَى النَّاسِ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ كَانَ اسْمِي فِي الجَاهِلِيَّةِ فُلاَنٌ فَسَمَّانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدَ اللهِ وَنَزَلَتْ فِيَّ: (وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) وَنَزَلَتْ فِيَّ (قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الكِتَابِ) إِنَّ لِلَّهِ سَيْفًا مَغْمُودًا عَنْكُمْ وَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ قَدْ جَاوَرَتْكُمْ فِي بَلَدِكُمْ هَذَا الَّذِي نَزَلَ فِيهِ نَبِيُّكُمْ، فَاللَّهَ اللَّهَ فِي هَذَا الرَّجُلِ أَنْ تَقْتُلُوهُ، فَوَاللَّهِ إِنْ قَتَلْتُمُوهُ لَتَطْرُدُنَّ جِيرَانَكُمُ الْمَلاَئِكَةَ، وَلَتَسُلُّنَّ سَيْفَ اللهِ الْمَغْمُودَ عَنْكُمْ فَلاَ يُغْمَدُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، قَالَ: فَقَالُوا: اقْتُلُوا اليَهُودِيَّ وَاقْتُلُوا عُثْمَانَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَاهُ شُعَيْبُ بْنُ صَفْوَانَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ ابْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ.

کاتێ پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ لەلایەن نەیارانیەوە ئابڵوقە درابوو ئەیانویست بیکوژن، (عبد الله)ی کوڕی سەلام هاتە خزمەتی، پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆچی هاتویت لەم کاتەدا؟ وتی: بۆ سەرخستنی تۆ، فەرمووی: بچۆ دەرەوە ئەو خەڵکەم لێ دووربخەرەوە، لەدەرەوە بیت ئەوە بۆ من باشترە نەك لە ژوورەوە بیت، فەرمووی: (عبد الله)ی کوڕی سەلام چووەدەرەوە بۆ ناو خەڵکە، فەرمووی: ئەی خەڵکینە، لەسەردەمی نەفامیدا ناوم فلانە کەس بوو،

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوی ناوم (عبد الله)، ئایەت دەربارەی مـن هاتەخوارەوە: (**وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ**) سورة الأحقاف: ١٠. واتـه: وە شـایەتێك، زانایـەكی پلـە بـەرز— عەبدوڵڵای كوڕی سەلام- لە نەوەی یەعقوب گەواهیی لەسەر وێنەی واتـای قورئـان دا، ئنجا بڕوای بە (موحەممەدو بە قورئان) هێنا، وە ئێوەش هەر خۆتـان بـە گـەورە زانی لە بڕواهێنان، ئایا ئێوە ستەمكار نین؟! بەراستیی خـوا هیدایـەت و ڕێنـوێنی قەومی ستەمكار، واتە: كافر ناكات، چـونكە بـە ئـارەزووی خۆیـان ئـەو ڕێگەیانـە هەڵبژاردووە. هەروەها ئەم ئایەتەش دەربارەی من هاتـەخوارەوە: (**قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ**) سورة الرعد: ٤٣. واتە: تۆیش پێیان بڵـێ: بەسە خواو ئەو كەسانەی كە زانیاری و زانسـتی كتێبـی (تـەورات) و (ئینجیل)یـان لایە، شایەد بن لەنێوان من و ئێوەدا، كە پەیامبەرم.

تۆڵەی خوای گەورە شمشێرێكی داپۆشراوە لە كالاندایـە بەرامبـەرتان، بێگومـان مەلائیكە دراوسێتانە لەم وڵاتەدا كە پێغەمبەرەكەتان صلی الله علیه وسـلم تێیـدا دابەزیوە، دەربارەی كوشتنی ئـەم پیـاوە لـە خـوا بترسـن، سـوێند بـە (الله) ئەگـەر بیكوژن ئەوە ئەو مەلائیكانە دەردەكەن كە دراوسێتانن، ئـەو شمشـێرە داپۆشـراوەی كە لە كالاندایە هەڵیدەكێشن، هەتا ڕۆژی قیامەت ناچێتەوە ناو كالانەكـەی خـۆی، فەرمووی: وتیان: ئەم جولەكە واتە (عبد الله) بكوژن و (عثمان)یش بكوژن.

٣٢٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَسْوَدِ أَبُو عَمْرٍو الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رَأَى مَخِيلَةً أَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، فَإِذَا مَطَرَتْ سُرِّيَ عَنْهُ قَالَتْ: فَقُلْتُ لَهُ، فَقَالَ: وَمَا أَدْرِي لَعَلَّهُ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى (فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: هەركاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەورێكی بە ئاسۆی ئاسمانەوە دەدی رەنگی دەگۆڕا و هەر دەهات و دەچوو، كە باران دەباری بێ تاقەتیەكەی نەدەما، عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێم وت: بۆچی لەو حاڵەتەدا بەو شێوەیە بێ تاقەت دەبی و رەنگت دەگۆڕێ؟ فەرمووی: (نازانم مەترسی ئەوەم هەیە هەوری سزاو تۆڵە بێ وەك ئەمە كە خوای گەورە دەفەرموویێت: **(فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُمْ بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ)**. سورة الأحقاف: ٢٤. واتە: جا كاتێ دیتیان لە شێوەی هەورێكدا ڕووبەڕووی دۆڵ و شیوەكانیان ئەهات، پێیان وابوو هەورێكی باراناوییە، وتیان: ئەمە هەورێكە بارانمان بۆ دەبارێنێ. ئەڵێن: بۆ ماوەیەكی زۆر گەرمایەكیان ئەوقە دەبێ و، بارانیان بۆ نابارێت، جا كاتێ هەورەكەیان دیت دڵیان پێخۆشكردو، هەموو چوون بۆ دۆڵ و شیوەكان و چاوەڕوانی بارانیان لێ ئەكرد، گوترا پێیان: نەخێر، ئەوە هەوری باران نیە، بەڵكو ئەو سزایەیە ئێوە پەلەتان بۆ ئەكرد، واتە: ئەو سزایەیە ئەتانوت ئەگەر ڕاست ئەكەیت كەی دێت؟ سزاكەش: بایەكە، جەزرەبەی ئێش پێگەیەنەری تێدایە.

٣٢٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ دَاوُدَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَلْقَمَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ مَسْعُودٍ: هَلْ صَحِبَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الجِنِّ مِنْكُمْ أَحَدٌ؟ قَالَ: مَا صَحِبَهُ مِنَّا أَحَدٌ وَلَكِنْ قَدْ افْتَقَدْنَاهُ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهُوَ بِمَكَّةَ، فَقُلْنَا اغْتِيلَ أَوْ اسْتُطِيرَ مَا فُعِلَ بِهِ؟ فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ، حَتَّى إِذَا أَصْبَحْنَا أَوْ كَانَ فِي وَجْهِ الصُّبْحِ، إِذَا نَحْنُ بِهِ يَجِيءُ مِنْ قِبَلِ حِرَاءَ، قَالَ: فَذَكَرُوا لَهُ الَّذِي كَانُوا فِيهِ، فَقَالَ: أَتَانِي دَاعِي الجِنِّ، فَأَتَيْتُهُمْ فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمْ قَالَ: فَانْطَلَقَ فَأَرَانَا

آثَارَهُمْ وَآثَارَ نِيرَانِهِمْ، قَالَ الشَّعْبِيُّ، وَسَأَلُوهُ الزَّادَ وَكَانُوا مِنْ جِنِّ الجَزِيرَةِ، فَقَالَ: كُلُّ عَظْمٍ يُذْكَرُ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ يَقَعُ فِي أَيْدِيكُمْ أَوْفَرَ مَا كَانَ لَحْمًا، وَكُلُّ بَعْرَةٍ أَوْ رَوْثَةٍ عَلَفٌ لِدَوَابِّكُمْ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَلاَ تَسْتَنْجُوا بِهِمَا فَإِنَّهُمَا زَادُ إِخْوَانِكُمْ مِنَ الجِنِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەلقەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە ئیبنو مەسعودم رەزای خوای لێ بێ وت: ئەو شەوەی جنۆکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ کەسێ لە ئێوە لەتەکی ئامادە بوو، فەرمووی: نا هیچ کەس لە ئێمە لەتەکی نەبوو، بەڵام شەوێ لە مەککە لێمان ون بوو، وتمان: بە دزیەوە کوشتویانە یان جنۆکە فڕاندویانە، ئێمەش زۆر بە پەرۆش بووین بۆی و کەوتینە کۆماڵ کردن بۆی، کاتی بەیانی بوو، لەلای حیرائەوە هاتەوە، بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (نوێنەری جنۆکە هات بۆلام، بانگی کردم بۆلای خۆیان، منیش چووم قورئانم بۆ خوێندن)، ئیبنو مەسعود رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێمەی لەگەڵ خۆی برد شوێنەواری جنۆکەکان و شوێنەواری ئاگرەکەیانی پێ نیشانداین، شەعبی فەرمووی: هەر ئەو شەوە جنۆکەکان داوای خۆراك و توێشویان لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد، لە جنۆکەکانی جەزیرە بوون، فەرمووی: (هەموو ئێسکێ ناوی خوای لەسەر نەهێنرابێ کاتێ کەوتە دەستی ئێوە ئەوە با خۆراکی ئێوە بێ هەرچەندە گۆشتی تەواویشی پێوە بێ، گشت تەپاڵە و تەرسێ بۆ ئالفی وڵاخ و ئاژەڵەکانتان)، لەپاشدا فەرمووی: (تارەتیان پێ مەگرن چونکە خۆراك و توێشوی برا جنۆکەکانتانن).

دەربارەی سورەتی (محمد).

٤٧ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ مُحَمَّدٍ.

٣٢٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، (وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالمؤْمِنَاتِ) فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي اليَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيُرْوَى عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَيْضًا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ. رَوَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئەم ئایەتە: (**وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ**) سورة محمد: ١٩. واتە: وە بۆ خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ژنان داوای لێبوردنی گوناهان بکە.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (من لە رۆژێکدا حەفتا جار داوای لێ بوردن لە خوای گەورە دەکەم).

٣٢٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَيْخٌ، مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: تَلاَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا هَذِهِ الآيَةَ (وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لاَ يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ) قَالُوا: وَمَنْ يُسْتَبْدَلُ بِنَا؟ قَالَ: فَضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى مَنْكِبِ سَلْمَانَ ثُمَّ قَالَ: هَذَا وَقَوْمُهُ هَذَا وَقَوْمُهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ فِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ، أَيْضًا هَذَا الحَدِيثَ عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: رۆژێ

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لاَ يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ﴾ سورة محمد: ٣٨. واتە: خوا شەرەفی هەڵگرتنی ئەم پەیامەی بە ئێوە داوە، ئەبێ ئێوەش لە پێناویا جیهاد بکەن و سامانتان بەخت بکەن، خۆ ئەگەر لەم دینە پشت هەڵ بکەن و ئامادە نەبن بۆ جیهاد و چرووك و پیسکە بن لە بەخشینی ماڵ لە ڕێگەی جیهاد دا، خوای گەورە ئێوە دەگۆڕێ بە قەوم و گەلێکی ترو، ئەو شەرەفەتان لێدەسێنێتەوەو ئەوسا ئەوانیش وەك ئێوە نابن.

هاوەڵانی وتیان: دەبێ ئەوانە چ کەسانێك بن — کە ئەر ئێمە لا بدرێین- ئەوانە دەخرێنە جێی ئێمەوەو، وەك ئێمەش نابن؟ واتە: ئەوان لێبڕاو تر دەبن، دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی خستە سەرشانی سەلمانی فارسیی، لەپاشدا فەرمووی: (ئەمەو قەومەکەی، ئەمەو قەومەکەی).

٣٢٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرِ بْنِ نَجِيحٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ ذَكَرَ اللَّهُ إِنْ تَوَلَّيْنَا اسْتُبْدِلُوا بِنَا ثُمَّ لاَ يَكُونُوا أَمْثَالَنَا؟ قَالَ: وَكَانَ سَلْمَانُ بِجَنْبِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخِذَ سَلْمَانَ قَالَ: هَذَا وَأَصْحَابُهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَ الإِيمَانُ مَنُوطًا بِالثُّرَيَّا لَتَنَاوَلَهُ رِجَالٌ مِنْ فَارِسَ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرِ بْنِ نَجِيحٍ هُوَ: وَالِدُ عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ. وَقَدْ رَوَى عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ الكَثِيرَ، وحَدَّثَنَا عَلِيٌّ، بِهَذَا الحَدِيثِ عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ جَعْفَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەبێ ئەوانە کێ بن — کە ئەر ئێمە لا بدرێین- ئەوانە دەخرێنە جێی ئێمەوەو، وەك ئێمەش نابن؟ واتە: ئەوان لێبڕاو تر دەبن، لەوکاتەدا سەلمانی فارسیی لە تەنیشتیەوە بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دای لە رانی سەلمان و فەرمووی: (ئەمەو هاورێکانیەتی بەوەی گیانی منی بەدەستە چونکە ئەوەندە دینییان خۆش دەوێت، ئەگەر لەلای ئەستێرەی کۆیشدابێ، دەستی پیاوانی فارسی دەگاتێ و جیهاد دەکەن، ماڵ و سامان بەخت دەکەن، تێدەکۆشن، ململانێ لەگەڵ تاغووتاندا دەکەن و سازشیان لەگەڵ ناکەن).

**دەربارەی سورەتی (الفتح).**

**٤٨ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الفَتْحِ**

٣٢٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ ابْنُ عَثْمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ يَقُولُ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَكَلَّمْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَكَتَ، ثُمَّ كَلَّمْتُهُ فَسَكَتَ، فَحَرَّكْتُ رَاحِلَتِي فَتَنَحَّيْتُ وَقُلْتُ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ، نَزَرْتَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ كُلُّ ذَلِكَ لاَ يُكَلِّمُكَ، مَا أَخْلَقَكَ بِأَنْ يَنْزِلَ فِيكَ قُرْآنٌ قَالَ: فَمَا نَشِبْتُ أَنْ سَمِعْتُ صَارِخًا يَصْرُخُ بِي، قَالَ: فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا

ابْنَ الخَطَّابِ لَقَدْ أُنْزِلَ عَلَيَّ هَذِهِ اللَّيْلَةَ سُورَةٌ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهَا مَا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عومەر کوڕی (خطاب) بوو ڕەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: لە سەفەری عومرەی حودەیبییەدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، قسەم لەگەڵ کرد، بێدەنگ بوو وەڵامی نەدامەوە، لەپاشدا قسەم لەگەڵ کرد، بێدەنگ بوو وەڵامی نەدامەوە، پاشان قسەم لەگەڵ کرد، بێدەنگ بوو وەڵامی نەدامەوە، وڵاخەکەم لێ خوڕی و دوور کەوتمەوە، وتم: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی کوڕی (خطاب)، سێ جار ئیلحاحم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد کە وەڵامم بداتەوە، بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە و بێدەنگ بوو، فەرمووی: زۆری نەبرد کەسێ هاواری تێ کردم، منیش چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی کوڕی (خطاب)، ئەم شەو سورەتێکم بۆ دابەزیوە ئەوەندەی مۆژدەی خۆشی تێدایە لە هەموو سەرزەویم پێ خۆشترە: **(إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا)**. سورة الفتح:١. واتە: بێگومان ئێمە – بە هۆی پێکهاتنەکەی حودەیبییەوە- فەتحێکی ئاشکرامان بۆ کردیت ئەی موحەممەد! صلی الله علیه وسلم واتە: بەو فەتحە دەرگای سەرکەوتنمان لێکردیتەوەو، پاشان شاری مەککەمان بۆ فەتح کردیت و، حودەیبییە بوو بە پێش قەرەوڵی ئەو فەتحە، جا کەوابوو هەر لە ئێستاوە وەکو ئەوە وایە کە وڵاتەکەمان بۆ فەتح کردبێت. جەماوەری زانایان پێیان وایە کە ئەم (فەتحە) پێکهاتنەکەی حودەیبییەیە، چونکە لە دواییدا بوو بەهۆی فەتحی مەککە، بۆیە حودەیبییە لە پلەو پایەدا لەفەتحی مەکە کەمتر نییە، بەتایبەت لەو ماوەیەدا خەڵکی تێکەڵی یەکتر بوون، وە زۆرێکی زۆرینەیان لە ماوەی سێ ساڵدا موسڵمان بوون.

٣٢٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أُنْزِلَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ) مَرْجِعَهُ مِنَ الحُدَيْبِيَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَقَدْ نَزَلَتْ عَلَيَّ آيَةٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا عَلَى الأَرْضِ، ثُمَّ قَرَأَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، فَقَالُوا: هَنِيئًا مَرِيئًا يَا نَبِيَّ اللهِ، لَقَدْ بَيَّنَ اللَّهُ لَكَ مَاذَا يُفْعَلُ بِكَ، فَمَاذَا يُفْعَلُ بِنَا، فَنَزَلَتْ عَلَيْهِ (لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالمؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ)، حَتَّى بَلَغَ، (فَوْزًا عَظِيمًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَفِيهِ عَنْ مُجَمِّعِ بْنِ جَارِيَةَ.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەكاتی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاوەڵانی پاش تەواوبوونی ڕێكەوتننامەی حودەیبیە ئەم ئایەتە دابەزی: **(لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ)**. سورة الفتح: ٢. واتە: تا خوا لەو شتانەی —كە سەبارەت بە پلەوپایەی بەرزی تۆ- وەك گوناه وانە، خۆش ببێت، چ گوناهی ڕابردوو، وە چ گوناحەكانی دوا ڕۆژو ئاییندەت، واتە: ئەو فەتحەت بۆ دەكەینە هۆی سڕینەوەی ئەو جۆرە شتانە كە وەك (حسنات الأبرار سيئات المقربين)ـن.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایەتێكم بۆ دابەزیوە لە هەرچی لەسەر زەویدایە پێم خۆشترە). لەپاشدا خوێندیەوە بەسەریاندا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، نۆشی گیانت بێ، ئەمە خەڵاتی خوایە بۆ تۆ، ئەی چی خەڵات دەكات بە ئێمە، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: **(لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَكَانَ ذَلِكَ عِنْدَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا)**. سورة الفتح: ٥. واتە: تا بڕواداران لە پیاوان و لە ئافرەتان بخاتە نێو چەندان باخ و باخاتی ئەو بەهەشتەوە، كە ئاو لە بنكی دارو

کۆشکەکانیانەوە بە هاژە دێ و دەڕوا، وە بە هەتاهەتایـیش تیایا ئەمێنـــــنەوە، وە تـا لـە تاوانـەکانیان چاوپۆشـی بکـات، وە ئـەوەش لای خـوا دەسـکەوت و سەرکەوتنێکی گەورەیە.

٣٢٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ ثَمَانِينَ هَبَطُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابِهِ مِنْ جَبَلِ التَّنْعِيمِ عِنْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَهُمْ يُرِيدُونَ أَنْ يَقْتُلُوهُ، فَأُخِذُوا أَخْذًا، فَأَعْتَقَهُمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: هەشتا پیاو لە خەڵکی مەککـە لـە کێـوی تەنعیمـەوە هاتنـەخوارەوە بۆئەوەی لەنوێژی بەیانی دا پێغەمبەری خوا صـلى الله عليـه وسـلم و هاوەڵـەکانی بکوژن، دیل کران و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەبێ بەرامبـەر بـەرەڵای کردن، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ)**. سورة الفتح: ٢٤. واتە: هەر ئەو زاتە بوو کە دەستی ئەوانی (قورەیش) لە ئێوە گرتوو نەیهێشت بێن بە گژتانـدا، وە دەستی ئێوەشی لەوان گرتەوە، دەرەنجام وێڕای سـەرکەوتنی ئێـوە لـە نێـو جەرگـەی شاری مەککەدا، لە حودەیبییەشدا نەیهێشت زیان بە یـەکتر بگەیـەنن، پـاش ئـەوە کە ئێوەی – لە رۆژی فەتحی مەککەدا- سەرخست بە سەریاندا و هەندێکیانتان لێ دیـل کـردن، ئـەوە بـوو هەشـتا کەسـیان خـەریکی جاسووسـی بـوون بەسـەر موسڵمانەکانەوە پاشان دیلکران و، بردنیان بۆلای پەیامبـەر، ئـەویش لێیـان خـۆش بوو و ئازادی کردن، دەرەنجام ئەوکارە بوو بە هۆی ڕێکەوتنیان.

٣٢٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ قَزَعَةَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ حَبِيبٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى) قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الحَسَنِ بْنِ قَزَعَةَ. وَسَأَلْتُ أَبَا زُرْعَةَ، عَنْ هَذَا الحَدِيثِ فَلَمْ يَعْرِفْهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (طفيل)ی كوڕی ئوبەی كوڕی كەعبەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى)** سورة الفتح: ٢٦. واتە: لەسەر تەقواو وشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) پابەندی كردن.

فەرمووی: **(وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى)** مەبەست لەم وشەیە وشەی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)یە. واتە: جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێكی بەهەق نیە.

## دەربارەی سورەتی (الحجرات).

## ٤٩ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الحُجُرَاتِ

٣٢٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُؤَمَّلُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ بْنِ جَمِيلٍ الجُمَحِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللهِ اسْتَعْمِلْهُ عَلَى قَوْمِهِ، فَقَالَ عُمَرُ: لاَ تَسْتَعْمِلْهُ يَا رَسُولَ اللهِ، فَتَكَلَّمَا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ: مَا أَرَدْتَ إِلاَّ خِلاَفِي، فَقَالَ عُمَرُ: مَا أَرَدْتُ خِلاَفَكَ قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ) قَالَ: فَكَانَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، بَعْدَ

ذَلِكَ إِذَا تَكَلَّمَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يُسْمِعْ كَلَامَهُ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ. قَالَ: وَمَا ذَكَرَ ابْنُ الزُّبَيْرِ جَدَّهُ، يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە عەقرەعی کوڕی حابیس هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بیکە بە گەورەی هۆزەکەی، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: مەیکە ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەبەردەم پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بوو بە مشتومڕیان هەتا دەنگیان بەرزبوویەوە، فەرمووی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: تۆ ئەتەوێ بەرپەرچی قسەکانی من بدەیتەوە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: من مەبەستم ئەوە نەبوو، ڕاوی فەرمووی: مەیکە ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەبەردەم پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بوو بە مشتومڕیان هەتا دەنگیان بەرزبوویەوە، ئەم ئایەتە دابەزی: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ)** سورة الحجرات: ٢. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکات لەگەڵ پەیامبەردا صلی الله علیه وسلم گفتوگۆتان کرد، دەنگتان بەسەر دەنگیدا بەرز مەکەنەوە، بە چ ئەندازەیە دەنگی ئێوەی ئەگاتێ، دەبێ هەر ئەوەندە دەنگ بەرز بکەنەوە.

لەپاش ئەوە ئیتر پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ کە قسەی دەکرد لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئەوەندە بە هێواشی و لەسەرخۆ قسەی دەکرد، قسەکەی نەدەبیسترا، تەنانەت بەرامبەرەکەی هەوڵی دەدا تێی بگات.

٣٢٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنِ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ) قَالَ: قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ حَمْدِي زَيْنٌ وَإِنَّ ذَمِّي شَيْنٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ذَاكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

دەربارەی ئەم ئایەتە: **(إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ)** سورة الحجرات: ٤. واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە دەرەوەی هۆدەكان (حوجرەكانە)وە بەناوی خۆتەوە: (ئەی موحەممەد! ئەی موحەممەد!) بانگت دەكەن، ئەوانە - وەك ئیمام ئەحمەد هێناویەتی- زۆربەیان تێناگەن و رێزو پلەی تۆ نازانن، ئەگەرنا وایان نەئەكرد.

بەرائی كوڕی عازیب رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پیاوێ هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بێگومان هەركەسێ مـن مەدح و ستایشی بكەم دەبێ بە سەربەرزی بۆی، زەم و سەرزەنشتی هەر كەسێكیش بكەم دەبێ بە سەرشۆڕی بۆی، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە بەس خوای گەورە وایە).

٣٢٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِسْحَاقَ الجَوْهَرِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زَيْدٍ، صَاحِبُ الهَرَوِيِّ عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي جَبِيرَةَ بْنِ الضَّحَّاكِ، قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا يَكُونُ لَهُ الاِسْمَانِ وَالثَّلاَثَةُ، فَيُدْعَى بِبَعْضِهَا فَعَسَى أَنْ يَكْرَهَ، قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ أَبُو جَبِيرَةَ هُوَ: أَخُو ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ بْنِ خَلِيفَةَ أَنْصَارِيٌّ وَأَبُو

زَيْدٍ سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ صَاحِبُ الْهَرَوِيِّ بَصْرِيٌّ ثِقَةٌ. حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي جَبِيرَةَ بْنِ الضَّحَّاكِ، نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبی جەبیرەی كوڕی (ضحاك)ەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاوی وامان تێدا هەبوو دوو سێ ناوی هەبوو، كاتێ یەكێ بە ناوو ناتۆرە بانگ دەكرا پێی ناخۆش بوو، فەرمووی: ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: **(وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ)**. سورة الحجرات: ٤. واتە: وە ناوو ناتۆرەو نیتكە لە یەكتر مەنێن، واتە: بە ناتۆرە بانگی یەكتر مەكەن.

٣٢٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، عَنِ الْمُسْتَمِرِّ بْنِ الرَّيَّانِ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، قَالَ: قَرَأَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: (وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُّمْ) قَالَ: هَذَا نَبِيُّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُوحَى إِلَيْهِ، وَخِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ لَوْ أَطَاعَهُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُوا، فَكَيْفَ بِكُمُ الْيَوْمَ؟ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: سَأَلْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ الْقَطَّانَ، عَنِ الْمُسْتَمِرِّ بْنِ الرَّيَّانِ، فَقَالَ: ثِقَةٌ.

واتە: لە ئەبی (نضرة)ەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُّمْ)**. سورة الحجرات: ٧. واتە: ئێوە بزانن كە بەراستی پەیامبەری خواتان تێدایە، ئەگەر لە بەشی زۆری ئێش و كارەكاندا بەقسەی ئێوە بكاو وەڵامتان بداتەوە، ئەزیەتبارو دووچاری كاری سەخت دەبن.

جا فەرمووی: ئەمە لەكاتێكدایە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەناوتاندایە و وەحی بۆ دێ و پێشەوا چاك و باشەكان لەدەوری جەمن و

لەخزمەتیدان ئەمە حاڵەكە بێ كە لە ئایەتەكەدا هاتووە، ئەی دەبێ ئەمڕۆ و لەمەوبەدواوە حاڵەكە چۆن بێ؟

٣٢٧٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ النَّاسَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الجَاهِلِيَّةِ وَتَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا، فَالنَّاسُ رَجُلاَنِ: بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللهِ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللهِ، وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ، وَخَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مِنْ تُرَابٍ، قَالَ اللَّهُ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ). هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ يُضَعَّفُ، ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ وَغَيْرُهُ، وَهُوَ: وَالِدُ عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا بۆ خەڵك، فەرمووی: (ئەی خەڵكینە، بەڕاستی خوای گەورە لوت بەرزی و خۆ بەزلزانینی نەفامی و شانازیكردن بە باب و باپیرانی لەسەرتان لابردووە، خەڵك دوو جۆر كەسن: كەسێكی چاكەكار و لە خوا ترس و بەڕێز لەلای خوا، یان كەسێكی خراپكاری نەگبەتی سوك و ڕیسوا لەلای خوا، سەرجەم خەڵك لەنەوەی ئادەمن ئادەمیش لە گڵە، خوای گەورە ئەم دەفەرموێت: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)**. سورة الحجرات: ١٣. واتە: ئەی خەڵكینە! بێگومان ئێوەمان لە پیاوو ژنێك دروستكردووە، واتە: لە ئادەم و حەوا، جا ئیتر ئەم هەموو سووكایەتیە چیە بە یەكتری ئەكەن؟ بۆچی ئەگەر (بیلال) بۆ سەربانی

كەعبە سەركەوێ ئێوە پێتان ناخۆشە، هەر لەبەر ئەوە كە كاتی خۆی كۆیلە بووە؟ كردوومانن بە چەند گەل و تیرەیەك تا یەكتری بناسن، نەك بۆ گاڵتە كردن و تانەو تەشەردان لە یەكترو ستەم لە یەكتر كردن، بێگومان بەرێزترتریشتان لای خوا، ئەوەتانە كە بە تەقوا ترو خۆ پارێزتر بێت، وە لە سنوورەكانی خوا نەترازێت، بەڕاستیی خوا بە بەندەكانی خۆی زانایە، بە دڵ و دەروونیان بە ئاگایە.

٣٢٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ سَهْلٍ الأَعْرَجُ البَغْدَادِيُّ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سَلاَّمِ بْنِ أَبِي مُطِيعٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: الحَسَبُ الْمَالُ، وَالكَرَمُ التَّقْوَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ سَلاَّمِ بْنِ أَبِي مُطِيعٍ.

واتە: لە سەمورەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (رەسەنایەتی بریتیە لە ماڵ و سامان و بەخشندەیی و لە خوا ترسانە).

## دەربارەی سورەتی (ق).

### ٥٠ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ ق

٣٢٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لاَ تَزَالُ جَهَنَّمُ تَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ، حَتَّى يَضَعَ فِيهَا رَبُّ العِزَّةِ قَدَمَهُ فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ وَعِزَّتِكَ، وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَفِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتـە: لـە ئەنەسـی كـوڕی مالیكـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (- پۆل پۆل خـەڵك دەنێردرێـت بـۆ دۆزەخ - بـەردەوام دۆزەخ دەڵـێ: ئـاخۆ زیـاتریش هەیـە؟ پـەروەردگاری خـاوەن عیززەت و شكۆمەند - (پێی) تێ دەخات و دێتەوە یەك و بچوك دەبێتەوە، (قەدەم - پێ) سیفەتێكی زاتی خوایە، وەك هی دروستكراوەكانی نیە -، دۆزەخیش دەڵێ: بەسمە بەسمە پڕبووم و جێگەی كەسم نەماوە).

## دەربارەی سورەتی (الذاريات).

## ٥١ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الذَّارِيَاتِ

٣٢٧٣ - (حسن) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ سَلاَّمٍ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ أَبِي النَّجُودِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ رَبِيعَةَ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ عِنْدَهُ وَافِدَ عَادٍ، فَقُلْتُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ وَافِدِ عَادٍ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَمَا وَافِدُ عَادٍ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: عَلَى الْخَبِيرِ بِهَا سَقَطْتَ، إِنَّ عَادًا لَمَّا أُقْحِطَتْ بَعَثَتْ قَيْلاً فَنَزَلَ عَلَى بَكْرِ بْنِ مُعَاوِيَةَ فَسَقَاهُ الخَمْرَ وَغَنَّتْهُ الجَرَادَتَانِ، ثُمَّ خَرَجَ يُرِيدُ جِبَالَ مَهْرَةَ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي لَمْ آتِكَ لِمَرِيضٍ فَأُدَاوِيَهُ وَلاَ لأَسِيرٍ فَأُفَادِيَهُ، فَاسْقِ عَبْدَكَ مَا كُنْتَ مُسْقِيَهُ، وَاسْقِ مَعَهُ بَكْرَ بْنَ مُعَاوِيَةَ، يَشْكُرُ لَهُ الخَمْرَ الَّتِي سَقَاهُ، فَرُفِعَ لَهُ سَحَابَاتٌ، فَقِيلَ لَهُ: اخْتَرْ إِحْدَاهُنَّ، فَاخْتَارَ السَّوْدَاءَ مِنْهُنَّ، فَقِيلَ لَهُ: خُذْهَا رَمَادًا رِمْدِدًا، لاَ تَذَرُ مِنْ عَادٍ أَحَدًا، وَذُكِرَ أَنَّهُ لَمْ يُرْسَلْ عَلَيْهِمْ مِنَ الرِّيحِ إِلاَّ قَدْرُ هَذِهِ الحَلْقَةِ، يَعْنِي حَلْقَةَ الخَاتَمِ، ثُمَّ قَرَأَ: (إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ العَقِيمَ مَا تَذَرُ مِنْ شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلاَّ جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ) الآيَةَ. وَقَدْ

رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ سَلاَّمٍ أَبِي الْمُنْذِرِ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ أَبِي النَّجُودِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ حَسَّانَ وَيُقَالُ لَهُ: الحَارِثُ بْنُ يَزِيدَ.

واتە: لە ئەبی وائیلەوە، لە پیاوێکی هۆزی ڕەبیعەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چووم بۆ مەدینە، چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، باسی نوێنەرەکەی قەومی عادم بۆ کرد، وتم: پەنا ئەگرم بە خوا کە وەك نوێنەرەکەی قەومی عادم بەسەربێ، فەرمووی: (نوێنەرەکەی قەومی عاد چی بەسەرهاتبوو؟). منیش وتم: لەکەسێکی شارەزا دەربارەی پرسیارم کرد، هۆزی عاد تووشی بێ بارانی و وشکە ساڵی و قاتوقڕی بوون، کەسێکیان کە ناوی قەیل بوو ناردیان بۆ حەرەمی مەککە بۆ ئەوەی لەوێ داوای باران و ڕزگاربوونیان بۆ بکات، ئەویش ڕۆشت بوو بە میوانی بەکری کوڕی موعاویەی کوڕی ئەبو بەکر، شەرابی دەرخوارد دەداو دوو گۆرانی بێژی دەنگ خۆش گۆرانیان بۆ دەوت، لەپاشدا بەبێ ئەوەی بچێتە حەرەم لەمەککە دەرچوو بەرەو کێوی مەهرە، وتی: خودایە، من نەهاتووم لەبەر نەخۆشی هەتا چارەسەری بکەم، یان لەبەر دیلێ فدیەی بۆ بدەم و بەرەڵای بکەم، بەڵکو هاتووم وەك جاری جاران بارانمان بۆ ببارێنە، بۆ ئەم بەندەی خۆتە و بۆ بەکری کوڕی موعاویەش، چەندد پەڵە هەورێ بۆی دەرکەوتن، پێی وترا: یەکێکیان هەڵبژێرە، ئەویش پەڵەیەکی ڕەشی هەڵبژارد، پێی وترا: ها وەری بگرە، ئەوە باران نیە بەڵکو خۆڵەمێشێکی پڕ لە ژیلەمۆیە، کەس لە هۆزی عاد قوتار ناکات، کونی ئەو بایەی کە بۆی ناردن بە قەقەد کونی ئەم ئەڵقەی دەستم بوو، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ العَقِيمَ مَا تَذَرُ مِنْ شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلاَّ جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ**) سورة الزاريات: ٤١ - ٤٢. واتە: وە لە بەسەرهاتی (عاد)یشدا بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتمان دیارەو هەیە، ئەوکاتە کە (با)یەکی زۆر

توندی گەرمی نەزۆك و بێ خێرمان ناردە سەریان، كە بەسەر هەرشتێكدا تێدەپەڕی بە جێی نەدەهێشت و وەك ئێسكی پوواوی لێدەكردو، هەپروون دەبوو بەربادی دەكرد.

٣٢٧٤ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَلاَّمُ بْنُ سُلَيْمَانَ النَّحْوِيُّ أَبُو الْمُنْذِرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ أَبِي النَّجُودِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنَ يَزِيدَ البَكْرِيِّ، قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا هُوَ غَاصٌّ بِالنَّاسِ، وَإِذَا رَايَاتٌ سُودٌ تَخْفُقُ، وَإِذَا بِلاَلٌ مُتَقَلِّدٌ السَّيْفَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْتُ: مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ قَالُوا: يُرِيدُ أَنْ يَبْعَثَ عَمْرَو بْنَ العَاصِ وَجْهًا، فَذَكَرَ الحَدِيثَ بِطُولِهِ نَحْوًا مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ بِمَعْنَاهُ. وَيُقَالُ لَهُ: الحَارِثُ بْنُ حَسَّانَ.

واتە: لە (حارث)ی كوڕی یزیدی بەكرییەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ڕۆشتم بۆ مەدینە، چوومە مزگەوت پڕبوو لە خەڵك، ئاڵا ڕەشەكان دەشەكانەوە، بلال شمشێرەكەی بەدەستەوە بوو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم، وتم: ئەو خەلكە چیانە؟ وتیان: ئەیەوێ عەمری كوڕی عاص ڕاوانە بكات بەلایەكدا بۆ غەزا.

**دەربارەی سورەتی (النجم).**

**٥٣ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ وَالنَّجْمِ**

٣٢٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، عَنْ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: لَمَّا بَلَغَ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى، قَالَ: انْتَهَى إِلَيْهَا مَا يَعْرُجُ مِنَ الأَرْضِ وَمَا يَنْزِلُ مِنْ فَوْقٍ. قَالَ: فَأَعْطَاهُ اللَّهُ عِنْدَهَا ثَلاَثًا لَمْ يُعْطِهِنَّ نَبِيًّا كَانَ قَبْلَهُ، فُرِضَتْ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ خَمْسًا، وَأُعْطِيَ خَوَاتِيمَ سُورَةِ البَقَرَةِ وَغُفِرَ لأُمَّتِهِ الْمُقْحِمَاتُ مَا لَمْ يُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا. قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: (إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى) قَالَ: السِّدْرَةُ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، قَالَ سُفْيَانُ: فَرَاشٌ مِنْ ذَهَبٍ، وَأَشَارَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ فَأَرْعَدَهَا، وقَالَ غَيْرُ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ: إِلَيْهَا يَنْتَهِي عِلْمُ الخَلْقِ لاَ عِلْمَ لَهُمْ بِمَا فَوْقَ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعوەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گەیشتە (**سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى**)، فەرمووی: گەیشتە شوێنێ هیچ شتێ لەوەزیاتر بەرزنەدەبۆوە، لەسەرووی ئەوەشەوە هیچ دانەدەبەزی، فەرمووی: خوای گەورە سێ شتی پێ بەخشی پێشتر بە هیچ پێغەمبەرێکی تری نەبەخشیبوو یەکەم: پێنج فەرزەی نوێژ، دووەم: کۆتایی سورەتی (البقرە)، سێیەم: لێخۆشبوون لە تاوانە گەورەکانی ئوممەتەکەی بەمەرجێ بە هیچ شێوەیە هاوبەشیان بۆ خوا دانەنابێ، ئیبنو مەسعود فەرمووی: (**إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى**) سورة النجم: ١٦. واتە: ئەوکاتەی دیتی، سیدرەی داپۆشی ئەو شتەی دایئەپۆشی، واتە: لەکاتی دیدارەکەدا نووری خواو، فرە زۆری فریشتەکان سیدرەیان پڕکرد. سوفیان وتی: پەپولە لەبەر ڕووناکی ئەوەندە زۆربوون سیدرەیان داپۆشی.

٣٢٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ العَوَّامِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ، قَالَ: سَأَلْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ، عَنْ قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى) فَقَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى جِبْرِيلَ وَلَهُ سِتُّ مِائَةِ جَنَاحٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: شەیبانی فەرمووی: دەربارەی ئەم ئایەتە لە زیری کوڕی حوبەیشم پرسی: **(فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى)**. سورة النجم: ١٦. واتە: جا ئەوەندە لێی نزیك بووەوە بە ئەندازەی دوو کەوان، یان کەمتر بوو، دیارە لە ناو عەرەباندا باوبووە وتویانە: ئەوەندە بە یەکەوە نزیکن ئەندازەی دووکەوان، یان کەمتر بەینیانە.

زیر فەرمووی: ئیبنو مەسعود رەزای خوای لێ بێ بۆی باسکردم، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جیبریلی دی شەش سەد باڵی هەبوو.

٣٢٧٨ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: لَقِيَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَعْبًا بِعَرَفَةَ فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ فَكَبَّرَ حَتَّى جَاوَبَتْهُ الجِبَالُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّا بَنُو هَاشِمٍ، فَقَالَ كَعْبٌ: إِنَّ اللَّهَ قَسَمَ رُؤْيَتَهُ وَكَلاَمَهُ بَيْنَ مُحَمَّدٍ وَمُوسَى، فَكَلَّمَ مُوسَى مَرَّتَيْنِ، وَرَآهُ مُحَمَّدٌ مَرَّتَيْنِ. قَالَ مَسْرُوقٌ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَقُلْتُ: هَلْ رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ؟ فَقَالَتْ: لَقَدْ تَكَلَّمْتَ بِشَيْءٍ قَفَّ لَهُ شَعْرِي، قُلْتُ: رُوَيْدًا ثُمَّ قَرَأْتُ (لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الكُبْرَى)، قَالَتْ: أَيْنَ يُذْهَبُ بِكَ؟ إِنَّمَا هُوَ جِبْرِيلُ، مَنْ أَخْبَرَكَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ، أَوْ كَتَمَ شَيْئًا مِمَّا أُمِرَ بِهِ، أَوْ يَعْلَمُ الخَمْسَ الَّتِي قَالَ اللَّهُ تَعَالَى (إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الغَيْثَ) فَقَدْ أَعْظَمَ الفِرْيَةَ، وَلَكِنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ، لَمْ يَرَهُ فِي صُورَتِهِ إِلاَّ مَرَّتَيْنِ: مَرَّةً عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَمَرَّةً فِي جِيَادٍ لَهُ سِتُّ مِائَةِ جَنَاحٍ قَدْ سَدَّ الأُفُقَ. وَقَدْ رَوَى دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ وَحَدِيثُ دَاوُدَ أَقْصَرُ مِنْ حَدِيثِ مُجَالِدٍ.

شەعبی فەرمووی: واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ لە عەرەفە گەیشت بە کەعب گەورە زانای جولەکەکان، دەربارەی شتێ لێی پرسی، ئەوەندە بەدەنگی بەرز وتی: (الله أكبر) کێوەکان دەنگیان دایەوە، ئیبنو عەباس فەرمووی:

بابزانی من لەنەوەی هاشیمم، کەعب وتی: خوای گەورە دیتنی خۆی و قسەکردنی خۆی دابەشکردووە لەنێوان موساو موحەممەددا صلی الله علیه وسلم: دووجار قسەی لەگەڵ موسا کردووە، موحەممەدیش صلی الله علیه وسلم دووجار خوای گەورەی دیوە.

مەسروق فەرمووی: چوومە خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ، وتم: ئایا موحەممەد صلی الله علیه وسلم پەروەردگاری خۆی دیوە؟ فەرمووی: بێگومان دەربارەی شتێ پرسیارت کرد مووی سەرم رێك وەستان لەترس و هەیبەتی خوا، وتم: هێواش پەلەمەکە، ئەم ئایەتەم بۆ خوێندەوە: **(لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى)** سورة النجم: ١٨. واتە: بەراستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گەلێك بەڵگەو نیشانەی گەورە گەورەی پەروەردگاری خۆی لە سەفەرەکەیدا — وەك: (سدرة المنتهى)و (بيت المعمور) و بەهەشت و دۆزەخ و.. هتد- بینیی.

عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: هەڵە تێگەیشتوویت، بێگومان مەبەست بینینی جیبریلە، کێ پێی راگەیاندیت کە موحەممەد صلی الله علیه وسلم پەروەردگاری خۆی دیوە، یان شتێکی شاردۆتەوە کە فەرمانی پێ کرابێ، یا شتێ دەزانێ لەم پێنجە کە خوای گەورە دەفەرموێت: **(إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ)** سورة لقمان: ٣٤. واتە: بەڕستی زانیاری هاتنی رۆژی قیامەت هەر لای خوایە، جگە لەو هیچ کەس نازانێ قیامەت کەی بەرپادەبێ، تەنها ئەویش باران دەبارێنێ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێ باران ببارێنێ.

بەڕاستی ئەوە گەورەترین درۆیە، بەڵکو جیبریلی دیوە، لەسەر شێوەی خۆی دووجار، جارێ لە (سدرة المنتهى)و، جارێکی تر لە جیاد شوێنێکە لەخوار مەککەوە شەش سەد باڵی هەبوو باڵەکانی بەری ئاسمانیان گرتبوو،

٣٢٧٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمْرِو بْنِ نَبْهَانَ بْنِ صَفْوَانَ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَلْمُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ أَبَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ، قُلْتُ: أَلَيْسَ اللَّهُ يَقُولُ: (لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ) قَالَ: وَيْحَكَ، ذَاكَ إِذَا تَجَلَّى بِنُورِهِ الَّذِي هُوَ نُورُهُ، وَقَدْ رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ مَرَّتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عیكریمەوە، لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: موحەممەد صلی الله علیه وسلم پەروەردگاری خۆی بەچاوی سەر دیوە، وتم: چۆن وا دەفەرمووی مەگەر خوای گەورە نافەرموێت: **(لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ)** سورة الأنعام: ١٠٣. واتە: هیچ چاوێ دەركی ناكات و بۆی نابینرێت، لەكاتێكدا ئەو هەموو چاوەكان دەرك دەكا و دەبینێ بەوردیش ئاگای لەهەموو شتێكە.

فەرمووی: ئەوە كاتێ وایە كە بەو نووره خۆی بنوێنێ كە نووری حەقیقی خۆیەتی، هەروەها فەرمووی: خوای گەورە دووجار خۆی نیشانی موحەممەد صلی الله علیه وسلم داوە.

٣٢٨٠ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأُمَوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِ اللهِ: (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى) ، (فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى) ، (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى). قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَدْ رَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: **(وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى) (فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى) (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى)**. بێگومان بەپێی ئەم سێ ئایەتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم دیویەتی.

٣٢٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، وَابْنُ أَبِي رِزْمَةَ، وَأَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، (مَا كَذَبَ الفُؤَادُ مَا رَأَى) قَالَ: رَآهُ بِقَلْبِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(مَا كَذَبَ الفُؤَادُ مَا رَأَى)** سورة النجم: ١١. واتە: ئەوەی بە چاوی سەر بینی، ناخ و دەروونی خۆی بە درۆی دەر نەکرد، واتە: کاتێ کە بە چاو جبریلی دی، دڵیشی باوەڕیکرد. ئیبنو عەباس فەرمووی: بە دڵ دیویەتی.

٣٢٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ التُّسْتَرِيِّ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي ذَرٍّ: لَوْ أَدْرَكْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: عَمَّا كُنْتَ تَسْأَلُهُ، قُلْتُ: أَسْأَلُهُ هَلْ رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ؟ فَقَالَ: قَدْ سَأَلْتُهُ فَقَالَ: نُورٌ، أَنَّى أَرَاهُ ".هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شەقیقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە ئەبو (ذر)م وت: ئەگەر گەیشتم بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پرسیاری لێ دەکەم، فەرمووی: دەربارەی چی؟ فەرمووی: من پرسیاری لێ دەکەم، ئایا موحەممەد صلى الله عليه وسلم پەروەردگاری خۆی دیوە؟ فەرمووی: من پێشتر ئەو پرسیارەم لێ کرد؟ فەرمووی: ئەوەی من دیم نور بوو.

٣٢٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، وَابْنُ أَبِي رِزْمَةَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، (مَا

كَذَبَ الفُؤَادُ مَا رَأَى) قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جِبْرِيلَ فِي حُلَّةٍ مِنْ رَفْرَفٍ قَدْ مَلأَ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، كە دەربارەی: **(مَا كَذَبَ الفُؤَادُ مَا رَأَى)** سورة النجم: ١١. واتە: ئەوەی بە چاوی سەر بینی، ناخ و دەروونی خۆی بە درۆی دەر نەكرد، واتە: كاتێ كە بە چاو جبریلی دی، دڵیشی باوەڕیكرد.

فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جبریلی دی پۆشاكێكی قەشەنگ و جوانی لەبەردا بوو لە دیباج نێوان ئاسمان و زەوی پڕ كردبوو.

٣٢٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عُثْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، (الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالفَوَاحِشَ إِلاَّ اللَّمَمَ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ تَغْفِرِ اللَّهُمَّ تَغْفِرْ جَمًّا، وَأَيُّ عَبْدٍ لَكَ لاَ أَلَمَّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ زَكَرِيَّا بْنِ إِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالفَوَاحِشَ إِلاَّ اللَّمَمَ)** سورة النجم: ٣٢. واتە: ئەوانەی كە خۆیان بەدوور دەگرن لە گوناهە گەورەكان و كارە دزێوەكان، بەڵام وردە گوناهی بچووك خوا دەیانبوورێ.

ئیبنو عەباس فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:

إِنْ تَغْفِرِ اللَّهُمَّ تَغْفِرْ جَمًّا وَأَيُّ عَبْدٍ لَكَ لاَ أَلَمَّا.

واتە: خودایە لە سەرجەم گوناهو تاوانەكانمان ببورە، چ بەندەیە هەیە بێ گوناهو تاوانە.

## دەربارەی سورەتی (القمر).

## ٥٤ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ القَمَرِ

٣٢٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى فَانْشَقَّ القَمَرُ فَلْقَتَيْنِ: فَلْقَةٌ مِنْ وَرَاءِ الجَبَلِ، وَفَلْقَةٌ دُونَهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اشْهَدُوا، يَعْنِي، (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ القَمَرُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ لە مینا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووین، مانك بوو بە دوو كەرتەوە، كەرتێكیان كەوتە پشت كێوەكەوە و كەرتەكەی تریان كەوتە ئەودیو تر، پێی فەرمووین: (سەیركەن و بە چاوی خۆتان ئەو موعجیزەیە ببینن، ئێوە بە شایەت بن). **(اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ القَمَرُ)**. سورة القمر: ١. واتە: ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوە، مانگیش لەتبوو.

٣٢٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آيَةً، فَانْشَقَّ القَمَرُ بِمَكَّةَ مَرَّتَيْنِ، فَنَزَلَتْ (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ القَمَرُ)، إِلَى قَوْلِهِ: (سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ) يَقُولُ: ذَاهِبٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: خەڵكی مەككە داوای موعجیزەیان كرد لە پێغەمبەری خوا صلى

الله علیه وسلم، لە مەککە دووجار مانگ بوو بە دوو کەرتەوە، جا ئەم ئایەتە دابەزی: (**اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ (١) وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ**). سورة القمر: ١ - ٢. واتە: ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوە، مانگیش لەتبوو، وە ئەگەر هەر بەڵگەو نیشانەیەك ببینن كە: بەڵگەبێ لەسەر ڕاستیی پێغەمبەر، پشت هەڵدەكەن و گوێی نادەنێ و ئەڵێن ئەمە جادوویەكی هەمیشەیی و هەموو كاتییە.

٣٢٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اشْهَدُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، مانك بوو بە دوو كەرتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سەیركەن و بە چاوی خۆتان ئەو موعجیزەیە ببینن، ئێوە بە شایەت بن).

٣٢٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: انْفَلَقَ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اشْهَدُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، مانك بوو بە دوو كەرتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سەیركەن و بە چاوی خۆتان ئەو موعجیزەیە ببینن، ئێوە بە شایەت بن).

٣٢٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى صَارَ فِرْقَتَيْنِ: عَلَى هَذَا الْجَبَلِ، وَعَلَى هَذَا الْجَبَلِ، فَقَالُوا: سَحَرَنَا مُحَمَّدٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَئِنْ كَانَ سَحَرَنَا فَمَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْحَرَ النَّاسَ كُلَّهُمْ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، نَحْوَهُ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووین، مانگ بوو بە دوو کەرتەوە، کەرتێکیان کەوتە سەر کێوەکەوە و کەرتەکەی تریان کەوتە سەر کێوەکەی تر، وتیان: موحەممەد سیحری لێ کردووین، هەندێکی تریان وتیان: ئەگەر سیحری لە ئێمە کردبێ خۆ ناتوانێ سیحر لەهەموو خەڵك بکات.

٣٢٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَأَبُو بَكْرٍ بُنْدَارٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ الْمَخْزُومِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: جَاءَ مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْقَدَرِ، فَنَزَلَتْ: (يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هاوبەش بۆ خوا دانەرانی قورەیش هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەربارەی قەدەر بەربەرکانێ و مشتومڕیان لەگەڵ کرد، جا ئەم ئایەتە دابەزی: **(يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ**

**بِقَدَرٍ)**. سورة القمر: ٤٨ - ٤٩. واتە: ئەو رۆژە کە لەسەر روویان بەناو ئاگردا رائەکێشرێن، پێیان ئەوترێ: دە بچێژن گەرماو سزای دۆزەخ، لە پاداشتی کارەکانتاندا، دە بزانم کەسێك هەیە قوتارتان بکات، بەڕاستی ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەیەکی دیاریکراو دروستکردووە.

**دەربارەی سورەتی (الرحمن).**

**٥٥ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الرَّحْمَنِ**

٣٢٩١ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ وَاقِدٍ أَبُو مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ زُهَيْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَصْحَابِهِ، فَقَرَأَ عَلَيْهِمْ سُورَةَ الرَّحْمَنِ مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا فَسَكَتُوا، فَقَالَ: لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الجِنِّ لَيْلَةَ الجِنِّ فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُودًا مِنْكُمْ، كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ (فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) قَالُوا: لاَ بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ فَلَكَ الحَمْدُ.

هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الوَلِيدِ بْنِ مُسْلِمٍ عَنْ زُهَيْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ. قَالَ ابْنُ حَنْبَلٍ: كَأَنَّ زُهَيْرَ بْنَ مُحَمَّدٍ الَّذِي وَقَعَ بِالشَّامِ لَيْسَ هُوَ الَّذِي يُرْوَى عَنْهُ بِالعِرَاقِ، كَأَنَّهُ رَجُلٌ آخَرُ قَلَبُوا اسْمَهُ، يَعْنِي: لِمَا يَرْوُونَ عَنْهُ مِنَ الْمَنَاكِيرِ. وَسَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ البُخَارِيَّ، يَقُولُ: أَهْلُ الشَّامِ يَرْوُونَ عَنْ زُهَيْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ مَنَاكِيرَ، وَأَهْلُ العِرَاقِ يَرْوُونَ عَنْهُ أَحَادِيثَ مُقَارِبَةً.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە بۆ ناو یارانی سورەتی (الرحمن)ی لەسەرەتاوە تا کۆتایی بەسەردا خوێندنەوە، ئەوانیش بێدەنگ بوون،

فەرمووی: (ئەو شەوەی لەگەڵ نوێنەری جنۆکەکاندا کۆبوومەوە سورەتی (الرحمن)م بەسەردا خوێندنەوە، ئەوان لەئێوە باشتر وەڵامیان دەسەندەوە، هەرکاتێ دەگەیشتمە: (فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) سورة الرحمن: ١٣. واتە: جا ئیتر بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان (ئەی گرۆی ئادەمیی و جنیی!) نا شوکری دەکەن؟ حەقتانە کە سەیری ئەو هەموو بەهرانە دەکەن بڕوا بێنن و خۆتان یەکلا بکەنەوە بۆی.

جنۆکەکان بۆیان دەسەندمەوە دەیانوت: ئەی پەروەردگاری ئێمە هیچ بەهرەو ناز و نیعمەتێکی تۆ بەدرۆ نازانین، سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە.

## دەربارەی سورەتی (الواقعة).

## ٥٦ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الوَاقِعَةِ

٣٢٩٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، وَعَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَقُولُ اللَّهُ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ) وَفِي الجَنَّةِ شَجَرَةٌ يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ، (وَظِلٍّ مَمْدُودٍ) وَمَوْضِعُ سَوْطٍ فِي الجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الغُرُورِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت:

ئەو بەهرەو ناز و نیعمەتەی خۆم ئامادەم کردووە بۆ بەندە ساڵح و چاکەکانم ئەوەندە باش و نایابن نە بەچاو بینراون، نە بە گوێ بیستراون، نە بەدڵ و خەیاڵی کەسدا هاتوون). ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: **(فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)**. سورة السجدة: ١٧. واتە: ئیتر هیچ کەسێك نازانێ چ پاداشتێکی گرنگیان بۆ داشاراوە لە هۆیەکانی خۆشیی و شادی چاوان و دڵئارامیی، لە پاداشی ئەو کارانەدا ئەنجامیانداون و، خۆیانیان بۆ ماندووکردووە.

لەبەهەشدا درەختێ هەیە سوار سەد ساڵ بە سێبەرەکەیدا دەڕوات هێشتا ناگاتە ئەوپەڕێ، ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: **(وَظِلٍّ مَمْدُودٍ)** سورة الواقعة: ٣٠. واتە: و لە ژێر سێبەری بەردەوام و دوورو درێژدان کە هەرگیز خۆر نایسڕێتەوەو هەمیشە هەر سێبەرە.

بێگومان جێگەیەکی کەمی هەریەکێ لەئێوە لە بەهەشتدا چاکترە لەدونیاو لەوەش لەناو دونیادا هەیە، گەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: **(فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الغُرُورِ)**. سورة آلِ عِمرَان: ١٨٥. واتە: هەرکەسێ دووربخرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە سەرکەوتووە، ژیانی دونیاش هیچ شتێك نیە جگە لە بەهرەو ئارەزوویەکی فریودەر.

٣٢٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا، وَاقْرَأُوا إِنْ شِئْتُمْ: (وَظِلٍّ مَمْدُودٍ وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەبەهەشتدا درەختێ هەیە سوار سەد ساڵ بە سێبەرەکەیدا دەڕوات هێشتا ناگاتە ئەوپەڕی، ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: **(وَظِلٍّ مَمْدُودٍ وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ)**. سورة الواقعة: ٣٠ - ٣١. واتە: وە لە ژێر سێبەری بەردەوام و دوورو درێژدان کە هەرگیز خۆر نایسرێتەوەو هەمیشە هەر سێبەرە. وە لە نزیکی تاڤگەو ئاوێکدان دەڕژێتە خوار.

٣٢٩٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: (وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ) قَالَ: ارْتِفَاعُهَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَمَسِيرَةُ مَا بَيْنَهُمَا خَمْسُ مِائَةِ عَامٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ رِشْدِينَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: وَارْتِفَاعُهَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ قَالَ: ارْتِفَاعُ الفُرُشِ الْمَرْفُوعَةِ فِي الدَّرَجَاتِ، وَالدَّرَجَاتُ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ)** سورة الواقعة: ٣٤. واتە: وە لەسەر ڕایەخگەلێکی بە نرخن.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەقەد نێوانی ئاسمان و زەوی بەرزەوەبوون، نێوانی ئەم دوانەش پێنج سەد ساڵ ڕێیە).

٣٢٩٥ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ) قَالَ: شُكْرَكُمْ،

تَقُولُونَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا وَبِنَجْمِ كَذَا وَكَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ. وَرَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی مەبەستی ئەم ئایەتە: **(وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ)** سورة الواقعة: ٣٤. واتە: وە ئێوە شوکرانەی ڕۆزییەکەتان دەگێڕن بە کوفرانی نیعمەت و دەڵێن بەهۆی فلانە ئەستێرەوە باران دەبارێ!

فەرمووی: (لەجیاتی ئەوەی شوکری خوا بکەن بارانتان بۆ دەبارێنێ دەبێ بەهۆی ڕۆزیتان، کەچی دەڵێن: بەهۆی فلانە بورج و فلانە ئەستێرەوە باران دەبارێ).

٣٢٩٦ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ الخُزَاعِيُّ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبَانَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: (إِنَّا أَنْشَأْنَاهُنَّ إِنْشَاءً) قَالَ: إِنَّ مِنَ الْمُنْشَآتِ اللاَّئِي كُنَّ فِي الدُّنْيَا عَجَائِزَ عُمْشًا رُمْصًا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، وَمُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ وَيَزِيدُ بْنُ أَبَانَ الرَّقَاشِيُّ يُضَعَّفَانِ فِي الحَدِيثِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً)** سورة الواقعة: ٣٥. واتە: بەڕاستیی ئێمە ژنانی بەهەشتمان دروستکردوون بە دروستکردنێکی تازە، شۆخ و شەنگ و جوان، وەك ژنانی دونیا نین، هەندێ گۆڕانیان بەسەردا بێت.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیرێژنە چاو کزو چاو ڕیپۆقاویەکانی دونیا خوای گەورە سەرلەنوێ دروستیان دەکاتەوە و دەیانکاتەوە بە کچی شۆخ و شەنگ و جوان و ناسك).

٣٢٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ شِبْتَ، قَالَ: شَيَّبَتْنِي هُودٌ، وَالوَاقِعَةُ، وَالمُرْسَلاَتُ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَ (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَرَوَى عَلِيُّ بْنُ صَالِحٍ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، نَحْوَ هَذَا. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، شَيْءٌ مِنْ هَذَا مُرْسَلاً.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڕاستی پیربوویت، ئەویش فەرمووی: (سورەتی: (**هُودٌ، الوَاقِعَةُ، المُرْسَلاَتُ، عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَ (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ)** پیریان کردم).

**دەربارەی سورەتی (الحدید).**

**٥٧ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الحَدِيدِ**

٣٢٩٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، وَالمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالُوا: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَ الحَسَنُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: بَيْنَمَا نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ وَأَصْحَابُهُ إِذْ أَتَى عَلَيْهِمْ سَحَابٌ، فَقَالَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: اللَّهُ

وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: هَذَا العَنَانُ هَذِهِ رَوَايَا الأَرْضِ يَسُوقُهُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى قَوْمٍ لاَ يَشْكُرُونَهُ وَلاَ يَدْعُونَهُ ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوْقَكُمْ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّهَا الرَّقِيعُ، سَقْفٌ مَحْفُوظٌ، وَمَوْجٌ مَكْفُوفٌ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ كَمْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا مَسِيرَةُ خَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ. ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوْقَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّ فَوْقَ ذَلِكَ سَمَاءَيْنِ، مَا بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ عَامٍ حَتَّى عَدَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ، مَا بَيْنَ كُلِّ سَمَاءَيْنِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوْقَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّ فَوْقَ ذَلِكَ العَرْشَ وَبَيْنَهُ وَبَيْنَ السَّمَاءِ بُعْدُ مَا بَيْنَ السَّمَاءَيْنِ. ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الَّذِي تَحْتَكُمْ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّهَا الأَرْضُ. ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الَّذِي تَحْتَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّ تَحْتَهَا أَرْضًا أُخْرَى، بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ خَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ حَتَّى عَدَّ سَبْعَ أَرَضِينَ، بَيْنَ كُلِّ أَرْضَيْنِ مَسِيرَةُ خَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ. ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ أَنَّكُمْ دَلَّيْتُمْ بِحَبْلٍ إِلَى الأَرْضِ السُّفْلَى لَهَبَطَ عَلَى اللهِ. ثُمَّ قَرَأَ (هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ). هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَيُرْوَى عَنْ أَيُّوبَ، وَيُونُسَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَعَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، قَالُوا: لَمْ يَسْمَعِ الحَسَنُ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَفَسَّرَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ هَذَا الحَدِيثَ، فَقَالُوا: إِنَّمَا هَبَطَ عَلَى عِلْمِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ وَسُلْطَانِهِ. عِلْمُ اللهِ وَقُدْرَتُهُ وَسُلْطَانُهُ فِي كُلِّ مَكَانٍ، وَهُوَ عَلَى العَرْشِ كَمَا وَصَفَ فِي كِتَابِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی و هاوەڵانی دانیشتبوون، لەوکاتەدا پەڵەیە هەوری هێنا، فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەمە چیە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (ئەمە هەورە، ئەمە ئاودێری زەویە، خوای گەورە دەیبا بۆ گەل و هۆزێ شوکری خوا ناکەن و ناپەرستن)، لەپاشدا

فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەمە چیە لەسەروتانەوە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (ئەمە رەقیقە ناوی ئاسمانی یەکەمە، شەپۆلێکی پەنگ خواردووە، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا دەزانن لێرە تا ئەوێ چەندە؟) وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (پێنج سەد ساڵ رێیە)، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا دەزانن لەسەرووی ئەوەشەوە چیە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (لەسەرووی ئەوەشەوە دوو ئاسمانی لێیە، نێوانیان پێنج سەد ساڵ رێیە)، هەتا حەوت ئاسمانی ژمارد، فەرمووی: (بێگومان نێوانی ئاسمانێ بۆ ئاسمانەکەی تر بەقەد نێوانی زەوی و ئاسمانە)، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا دەزانن لەسەرووی ئەوەشەوە چیە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (لەسەرووی ئەوەشەوە عەرش و ئاسمانی ژێری عەرشە بەقەد بەینی دوو ئاسمان لەیەك دوورن، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا دەزانن لەژێر ئێوەوە چیە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (زەویەکی ترە)، ئینجا فەرمووی: (ئایا دەزانن لەدوای ئەوە چی دێ؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (زەویەکی ترە، نێوانیان پێنج سەد ساڵ رێیە)، جا هەتا حەوت زەوی ژمارد، نێوانی هەر زەویە بۆ زەویەکی تر پێنج سەد ساڵ رێیە، لەپاشدا فەرمووی: (بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر ئێوە بە گوریسێ کەسێ شۆڕ بکەنەوە بۆ زەوی هەرە خواروو هەردەچێتەوە بەردەستی خوا و ئاگاداریەتی، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ)**. سورة الحديد: ٣. واتە: هەر ئەویشە یەکەم کە هیچ شتێك لە پێشیەوە نیە، دواهەمینیش هەر ئەوە کە هیچ لە دوایەوە نیە و بوونی ئاشکرا بە بەڵگەکانی هەرئەوە، واتە: لە ژوور ئەوەوە ئاشکراتر نیە، وە پەنهان بە هەقیقەت و کونهی لە دروستکراوەکانی ئەوە، کە لەو پەنهانتر نیە، هەر ئەویش زانایە بە هەموو شتێك (لە زەڕەیەکەوە تا وردتر) ئاگاداریەتی.

**دەربارەی سورەتی (المجادلة).**

**٥٨ - بَابٌ: وَمَنْ سُورَةِ الْمُجَادَلَةِ**

٣٢٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الحُلْوَانِيُّ، الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً قَدْ أُوتِيتُ مِنْ جِمَاعِ النِّسَاءِ مَا لَمْ يُؤْتَ غَيْرِي، فَلَمَّا دَخَلَ رَمَضَانُ تَظَاهَرْتُ مِنْ امْرَأَتِي حَتَّى يَنْسَلِخَ رَمَضَانُ فَرَقًا مِنْ أَنْ أُصِيبَ مِنْهَا فِي لَيْلَتِي فَأَتَتَابَعَ فِي ذَلِكَ إِلَى أَنْ يُدْرِكَنِي النَّهَارُ وَأَنَا لاَ أَقْدِرُ أَنْ أَنْزِعَ، فَبَيْنَمَا هِيَ تَخْدُمُنِي ذَاتَ لَيْلَةٍ إِذْ تَكَشَّفَ لِي مِنْهَا شَيْءٌ فَوَثَبْتُ عَلَيْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ غَدَوْتُ عَلَى قَوْمِي فَأَخْبَرْتُهُمْ خَبَرِي فَقُلْتُ: انْطَلِقُوا مَعِي إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُخْبِرَهُ بِأَمْرِي، فَقَالُوا: لاَ وَاللهِ لاَ نَفْعَلُ، نَتَخَوَّفُ أَنْ يَنْزِلَ فِينَا قُرْآنٌ أَوْ يَقُولَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقَالَةً يَبْقَى عَلَيْنَا عَارُهَا، وَلَكِنْ اذْهَبْ أَنْتَ فَاصْنَعْ مَا بَدَا لَكَ. قَالَ: فَخَرَجْتُ فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرْتُهُ خَبَرِي، فَقَالَ: أَنْتَ بِذَاكَ؟ قُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ. قَالَ: أَنْتَ بِذَاكَ؟ قُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ. قَالَ: أَنْتَ بِذَاكَ؟ قُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ، وَهَا أَنَا ذَا فَأَمْضِ فِيَّ حُكْمَ اللهِ فَإِنِّي صَابِرٌ لِذَلِكَ. قَالَ: أَعْتِقْ رَقَبَةً. قَالَ: فَضَرَبْتُ صَفْحَةَ عُنُقِي بِيَدِي، فَقُلْتُ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا أَصْبَحْتُ أَمْلِكُ غَيْرَهَا. قَالَ: فَصُمْ شَهْرَيْنِ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ وَهَلْ أَصَابَنِي مَا أَصَابَنِي إِلاَّ فِي الصِّيَامِ. قَالَ: فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا: قُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ لَقَدْ بِتْنَا لَيْلَتَنَا هَذِهِ وَحْشَى، مَا لَنَا عَشَاءٌ. قَالَ: اذْهَبْ إِلَى صَاحِبِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ، فَقُلْ لَهُ فَلْيَدْفَعْهَا إِلَيْكَ فَأَطْعِمْ عَنْكَ مِنْهَا وَسْقًا سِتِّينَ مِسْكِينًا، ثُمَّ اسْتَعِنْ بِسَائِرِهِ عَلَيْكَ وَعَلَى عِيَالِكَ قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى قَوْمِي، فَقُلْتُ: وَجَدْتُ عِنْدَكُمْ

الضِّيقَ وَسُوءَ الرَّأْيِ، وَوَجَدْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السَّعَةَ وَالبَرَكَةَ، أَمَرَ لِي بِصَدَقَتِكُمْ فَادْفَعُوهَا إِلَيَّ فَدَفَعُوهَا إِلَيَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.قَالَ مُحَمَّدٌ: سُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ لَمْ يَسْمَعْ عِنْدِي مِنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ، وَيُقَالُ: سَلَمَةُ بْنُ صَخْرٍ، وَسَلْمَانُ بْنُ صَخْرٍ. وَفِي البَابِ عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ وَهِيَ امْرَأَةُ أَوْسِ بْنِ الصَّامِتِ.

واتە: لە سەلەمەی کوری صەخرەوە دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: من پیاوێ بووم زۆر حەزم لە ئافرەت بوو زوو زوویش دەچومە لای خێزانم، پێ نازانم هیچ پیاوێکی تر وەك من بێ، جا کاتێ کە مانگی رەمەزان هات ترسام خۆم پێ رانەگیرێت و رۆژوەکەم بەتاڵ بێتەوە بۆیە (ظِّهار)م لە ژنەکەم کرد تا رەمەزان تەواو دەبێت، شەوێکیان خزمەتی دەکردم شتێکم بۆ دەرکەوت منیش خۆمم بۆ نەگیراو لەگەڵی جوت بووم، کاتێ کە رۆژ بویەوە چوم بۆلای هۆزەکەم بەسەرهات و هەواڵی خۆم پێ راگەیاندن و پێم وتن: وەرن لەگەڵم با برۆین بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیارم بۆ بکەن لەوبارەوە، ئەوانیش وتیان: نا سوێند بە (الله) ئێمە شتی وەها ناکەین، جا خۆم بە تەنیا چوم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵەکەم پێ راگەیاند، فەرمووی: (ئەی سەلەمە تۆ خۆت ئەو کارەت کردوە). وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆم ئەو کارەم کردوە، فەرمووی: (ئەی سەلەمە تۆ خۆت ئەو کارەت کردوە). وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆم ئەو کارەم کردوە، ئەوەتا ئامادەم و ئارام دەگرم لەربەدەم حوکم و بریاری خوای گەورەدا، فەرمووی: (دە کۆیلەیە رزگار بکە ئەی سەلەمە). وتم: بەو (الله)یەی کە تۆی بە حەق رەوانە کردوە تەنها خاوەنی ئەم گەردنەی خۆمم، بە دەستم کێشام بە لایەکی گەردنمدا، فەرمووی: (دە دوو مانگ رۆژوو بەسەر یەکەوە بگرە). وتم: ئەم هەموو بەلآیەی کە توشم بووە بە هۆی رۆژوەوە بوە، فەرمووی: (دە خواردنی شەست هەژار و کەمدەست بدە لە ویسقێ

خورما). وتم: بەو (اللّه)یەی کە تۆی بە حەق رەوانە کردوە خۆم و ژنەکەم ئەم شەومان بە سکی خاڵی و بەبێ خواردن بردۆتە سەر، فەرمووی: دەی بڕۆ بۆلای خاوەنی زەکاتی (بَنِی زُرَیْق) پێی بڵێ با پێتی بدات، جا خواردنی شەست هەژار و کەمدەستی لێ بدە ئەوەشی مایەوە خۆت و خێزانەکەت بیخۆن). جا منیش گەڕامەوە بۆلای هۆزەکەم پێم وتن: ئێوە دنیاتان لێ هێنامەوە یەك و راتان خراپ بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دڵ فراوان و رای زۆر چاك بوو، فەرمانی پێدام کە لە زەکاتەکەتان وەربگرم و بیدەم لە کەفارەتی (ظِّهَار)ەکەمدا هەروەها خۆم خانەوادەکەشم لێی بخۆین.

٣٣٠٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ الأَشْجَعِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ الثَّقَفِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَلْقَمَةَ الأَنْمَارِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً). قَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا تَرَى؟ دِينَارٌ؟ قُلْتُ: لاَ يُطِيقُونَهُ، قَالَ: فَنِصْفُ دِينَارٍ؟، قُلْتُ: لاَ يُطِيقُونَهُ. قَالَ: فَكَمْ؟ قُلْتُ: شَعِيرَةٌ. قَالَ: إِنَّكَ لَزَهِيدٌ. قَالَ: فَنَزَلَتْ (أَأَشْفَقْتُمْ أَنْ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ) الآيَةَ. قَالَ: فَبِي خَفَّفَ اللَّهُ عَنْ هَذِهِ الأُمَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ شَعِيرَةٌ: يَعْنِي وَزْنَ شَعِيرَةٍ مِنْ ذَهَبٍ، وَأَبُو الجَعْدِ اسْمُهُ: رَافِعٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ دەربارەی ئەم ئایەتە دابەزی: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً)**. سورة المجادلة: ١٢. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ ویستتان چپەیەك و، قسەیەکی نهێنی لەگەڵ پەیامبەردا صلى الله عليه وسلم بکەن، دەبێ پێش ئەو چپەیەتان صەدەقەیەك و خێرێك بکەن، ئەمە دانانی ڕێزو

قەدرو حورمەتە بۆ پەیامبەر صلى الله علیه وسلم و رێز لێگرتنیەتی بۆ ئەوە هەموو كەسێك خۆی نەكات بە ماڵی پەیامبەرداو كاتی زۆری لێ بگرێ. بەڵێ دەبێ موسڵمانانیش ریعایەتی ئیش و كاری یەكتر بكەن و رێگە نەدەن كات لە یەكتری بگرن.

پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم پێی فەرمووی: (پێت چۆنە ئەو خێرە دیناری بێ؟) وتم: زۆرە و لەتاقەتیاندا نیە، فەرمووی: (ئەی نیو دینار) وتم: ئەوەندەش هەر زۆرە و لەتاقەتیاندا نیە، فەرمووی: (ئەی چەند بێ باشە؟)، وتم: سەنگی دەنكە جۆیە زێڕ باشە، فەرمووی: (بەڕاستی تۆ كەم ویستی و كەمت دانا) فەرمووی: جا ئەم ئایەتە دابەزی: **(أَأَشْفَقْتُمْ أَنْ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ)** سورة المجادلة: ١٣. واتە: ئایا ترسان لە هەژاری كە صەدەقەكان پێشكەش بكەن لە پێش چپە كردنەكەتان؟ واتە: مەترسن، خوا خاوەنی هەموو شتێكە، ئێوە كاری خۆتان بكەن خوا دەوڵەمەندە.

پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: خوای گەورە بەهۆی منەوە ئەو ئەركە قورسەی سوك كرد لەسەرشانی ئەم گەلە موسوڵمانە.

٣٣٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ يَهُودِيًّا أَتَى عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابِهِ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَرَدَّ عَلَيْهِ القَوْمُ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا قَالَ هَذَا؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، سَلَّمَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ. قَالَ: لاَ وَلَكِنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا، رُدُّوهُ عَلَيَّ، فَرَدُّوهُ قَالَ: قُلْتَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ ذَلِكَ: إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ فَقُولُوا: عَلَيْكَ مَا قُلْتَ، قَالَ: (وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: جولەکەیە هاتە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم و هاوەڵانی، وتی: خوا بتانکوژێ، خەڵکەکە وڵامیان دایەوە، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیە وسلم فەرمووی: (ئایـا دەزانـن ئـەو جولەکـە وتـی چـی؟). وتیـان: خـواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، سڵاوی کرد، فەرمووی: (نەخێر، بـەڵکو ئـاواو ئـاوای وت، وتی: خوا بتانکوژێ، وەڵامی بدەنەوە)، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە، فـەرمووی: (وتـت: خـوا بتـانکوژێ؟) وتـی: بـەڵێ، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم لەوکاتەدا فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لـە خـاوەن نامـە ئاسمانیـەکان واتـە جولەکـە و گـاور سـڵاویان لـێ کـردن، ئێـوەش وەڵامـی بدەنـەوە و بڵـێن: لەسـەر ئێـوەش)، فەرمووی: **(وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ)**. سورة المجادلة: ٨. واتـە: وە کاتێکیش بێن بـۆلات، بـە جـۆرێ سـڵاوت لێ دەکـەن کـە خـوا بـەو جـۆرە سـڵاوی لێنەکردوویت.!

### دەربارەی سورەتی (الحشر).

### ٥٩ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الحَشْرِ

٣٣٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: حَرَّقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَّعَ، وَهِيَ البُوَيْرَةُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللهِ وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم دار خورمـاکـانی (بـەنی نـەزیر)ی سـوتاند و فەرمانی دا بە بڕینیان کە لە بوەیرە بوون، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزانـد: **(مَـا**

قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللهِ وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ). سورة الحشر: ٥. واتە: هەر دار خورمایەکتان لە باخەکانی (بەنی نەزیر) بڕیبی — بە هۆی هەڵوەشانەوەی پەیمانەکەیانەوە- یان لێیگەڕان بە ڕاوەستاوی لەسەر بنجی خۆی، ئەوە لە هەردوو بارەکەدا بە فەرمانی خوا بوو بۆ ئەوەی ئیمانداران بەهێز بکا، و لە سنوور دەرچووەکانیش ڕیسوا بکات. جا لە بڕینی ئەو باخ و باخاتانەوە زانایان وەریانگرتووە کە: لە کاتی ناچاریی و لە کاتی جەنگدا ڕەوایە دارو درەخت و کشت و کاڵ و گەنم و دانەوێڵەو خانووبەرەی دوژمن بڕوخێنرێ و بسووتێنرێ، تا هێزو پێزی دوژمن لە ناو ببرێت، بۆیە پەیامبەر صلی الله علیه وسلم کاتێ نزیکی باخ و باخاتەکانیان بووەوە فەرمانی بە بڕینی باخەکانیان دا، بەلاّم ئەوانی نەفام لێیان کردە هەرا!، ئینجا خوا فەرمووی: ئەو لە خۆیەوە هیچ شتێکی نەکردووە، بەڵکو هەموو بە پێی بڕیاری خوابووە، (واحدی) لە (أسباب النزول)ـەکەیدا ئەمەی هێناوە.

٣٣٠٣ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبِيبُ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا) قَالَ: اللِّينَةُ النَّخْلَةُ، وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ قَالَ: اسْتَنْزَلُوهُمْ مِنْ حُصُونِهِمْ، قَالَ: أُمِرُوا بِقَطْعِ النَّخْلِ فَحَكَّ فِي صُدُورِهِمْ. فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: قَدْ قَطَعْنَا بَعْضًا وَتَرَكْنَا بَعْضًا، فَلَنَسْأَلَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَلْ لَنَا فِيمَا قَطَعْنَا مِنْ أَجْرٍ؟ وَهَلْ عَلَيْنَا فِيمَا تَرَكْنَا مِنْ وِزْرٍ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا) " الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرْ

فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ هَارُونَ بْنِ مُعَاوِيَةَ، عَنْ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً: سَمِعَ مِنِّي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ هَذَا الحَدِيثَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە دەربـارەی ئـەم ئایەتە: (**مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللهِ وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ**). سورة الحشر: ٥.

(اللينة). واتە: دارخورما، (**وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ**). واتە: جولەکەکانیان ناچـارکرد و لـە قـەڵاکانیان هێنانیانـە خـوارەوە، فـەرمووی: فـەرمانیان پـێ کـرا بـە بڕینـی دارخورماکانیان، جولەکەکان تووشی تـرس و دڵـەڕاوکێ بـوون، جـا موسـوڵمانەکان وتیان: بێگومـان هەنـدێ لـە دار خورماکانمـان بـڕی و هەنـدێکمان نـەبڕی، پرسـیار دەکەین لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: کە ئایا بۆ ئەوانەی کە بڕیومانـە خێر و پاداشتمان بۆ هەیە؟ هەروەها بۆ ئەوانەی کە نەمانبڕیوە گوناهمـان دەگـات؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَـةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللهِ وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ**). سورة الحشر: ٥. واتە: هەر دار خورمایـەکتان لـە باخـەکانی (بـەنی نـەزیر) بڕیـی — بـە هـۆی هەڵوەشـانەوەی پەیمانەکەیانـەوە- یـان لێیگەڕان بە ڕاوەستاوی لەسەر بنجی خۆی، ئەوە لە هەردوو بارەکەدا بـە فـەرمانی خوا بوو بۆ ئەوەی ئیمانداران بەهێز بکا، و لە سنوور دەرچووەکانیش ڕیسوا بکات.

٣٣٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ غَزْوَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ بَاتَ بِهِ ضَيْفٌ فَلَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ إِلاَّ قُوتُهُ وَقُوتُ صِبْيَانِهِ، فَقَالَ لامْرَأَتِهِ: نَوِّمِي الصِّبْيَةَ، وَأَطْفِئِي السِّرَاجَ، وَقَرِّبِي لِلضَّيْفِ مَا

عِنْدَكِ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ لە ئەنصارکان تەنها قوتی خۆی و منداڵەکانی شك دەبرد بۆ نانی شێوان میوانێکی برەوە، بە هاوسەرەکەی فەرموو: منداڵەکان بخەوێنە، چراکەش بکوژێنەوە، هەرچی خواردنت لەلا هەیە بیهێنە داینێ بۆ میوانەکە با تێر بخوات، خویان بەبێ شیو سەریان نایەوە، جا ئەم ئایەتە دابەزی: (**وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ**). سورة الحشر: ٩. واتە: ئیساری کۆچەرییەکان دەکەن بەسەر خۆیاندا لە سەروەت و ساماندا، ئەگەرچی خۆیشیان نیازیان پێی هەبێ و هەژاربن، واتە: بەخشینەکەیان لەبەر دەوڵەمەندییان نیە، بەڵکو سروشتی ئیمان و باوەڕیان بەرزە.

### دەربارەی سورەتی (الممتحنة).

### ٦٠ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْمُمْتَحِنَةِ

٣٣٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ مُحَمَّدٍ هُوَ ابْنُ الحَنَفِيَّةِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ يَقُولُ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَقَالَ: انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ، فَخُذُوهُ مِنْهَا فَأْتُونِي بِهِ، فَخَرَجْنَا تَتَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ، فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ فَقُلْنَا: أَخْرِجِي الكِتَابَ، فَقَالَتْ: مَا مَعِي مِنْ كِتَابٍ، قُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الكِتَابَ أَوْ لَتُلْقِيِنَّ الثِّيَابَ، قَالَ: فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا قَالَ: فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا هُوَ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى أُنَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ بِمَكَّةَ يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَا هَذَا يَا حَاطِبُ؟ قَالَ: لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا، وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ بِهَا أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِمَكَّةَ، فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذَلِكَ مِنْ نَسَبٍ فِيهِمْ أَنْ أَتَّخِذَ فِيهِمْ يَدًا يَحْمُونَ بِهَا قَرَابَتِي، وَمَا فَعَلْتُ ذَلِكَ كُفْرًا وَارْتِدَادًا عَنْ دِينِي وَلاَ رِضًا بِالْكُفْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَدَقَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللهِ أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، فَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ، فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ. قَالَ: وَفِيهِ أُنْزِلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ) السُّورَةَ. قَالَ عَمْرٌو: وَقَدْ رَأَيْتُ ابْنَ أَبِي رَافِعٍ وَكَانَ كَاتِبًا لِعَلِيٍّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِيهِ عَنْ عُمَرَ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، هَذَا الحَدِيثَ نَحْوَ هَذَا، وَذَكَرُوا هَذَا الحَرْفَ وَقَالُوا: لَتُخْرِجِنَّ الكِتَابَ أَوْ لَتُلْقِينَّ الثِّيَابَ. وَهَذَا حَدِيثٌ قَدْ رُوِيَ أَيْضًا عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، نَحْوَ هَذَا الْحَدِيثِ. وَذَكَرَ بَعْضُهُمْ فِيهِ: لَتُخْرِجِنَّ الكِتَابَ أَوْ لَنُجَرِّدَنَّكِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من و زوبێر و میقدادی کوڕی ئەسوەدی نارد، فەرمووی: (برۆن هەتا دەگەنە (رَوْضَة خَاخ) - شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەدا - لەوێ ئافرەتێکی لێیە نامەیەکی پێیە نامەکەی لێی بسێنن و بۆمی بهێنن). ئێمەش ئەسپەکانمان تاوداو بە پەلە رۆیشتین هەتا گەیشتینە ئەوێ، لەوێ گەیشتین بە ئافرەتەکە، وتمان: نامەکەمان بدەرێ، وتی: نامەم پێ نیە، وتم: نامەکەم دەدەیتێ یان جل و بەرگەکەت لەبەر دادڕنم و دەتپشکنم و نامەکە دەدۆزمەوە، وتی: جا کە ئافرەتەکە زانی سورن لەسەر نامەکە نامەکەی لەناو گرێی پرچەکەیدا دەرهێنا، ئەوانیش نامەکەیان برد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم، نامەکە لەلایەن (حَاطِب)ی کوڕی ئەبو بەلتەعەوە نوسرابوو بۆ کۆمەڵێ لە هاوەبەش بۆ خوا دانەران، هەواڵی هەندێ کاروباری پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بۆ ناردبوون، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەم نامەیە چیەو بۆچی ناردوتە ئەی (حَاطِب)؟)، (حَاطِب) فەرمووی: پەلەم لێ مەکەو گوێ بۆ بەهانەکەم بگرە، من کەسێکی بێگانەم و لە هۆزی قورەیش نیم، کەسوکارو منداڵەکانم لەناویاندان، کەسێکم نیە پەنایان بدات و بیانپارێزێت لەدەست قورەیش، ئەوانی تر کە لەگەڵتان لە قورەیشیەکان لە هاوەڵانی تۆ کە کۆچیان کردوە کەسوکاریان هەیەو دەیانپارێزن، جا بۆیە ئەو کارەم کرد دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکەن، سوێند بە (الله) ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باوەڕم بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هەیەو نە هەڵگەڕاومەتەوەو نە دڵم گۆڕاوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (راست دەکات). پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگەم بدە با بدەم لەملی ئەم دووڕوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وازبێنە ئەی عومەر ئەمە بەشداری جەنگی بەدری کردووە، تۆ نازانی لەوانەیە خوای گەورە لوتفی لەگەڵ ئەهلی بەدر کردبێ و فەرموبێتی: (چی دەکەن بیکەن ئەوا من لێتان خۆش بووم). جا بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾ سورة الممتحنة: ١. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەگرنە دۆست و خۆشەویست، چونکە نیشانەی ئیمان و بڕوای راستەقینە ئەوەیە کە ناحەزو دوژمنانی دینی خواتان خۆش نەوێت و کە خۆشەویستییان بدەنێ بە ئاگادارکردنیان لە نهێنیی و ئەسراری خۆتان!.

٣٣٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْتَحِنُ إِلاَّ بِالآيَةِ الَّتِي قَالَ اللَّهُ: (إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ) الآيَةَ قَالَ مَعْمَرٌ: فَأَخْبَرَنِي ابْنُ طَاوُوسٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَ امْرَأَةٍ إِلاَّ امْرَأَةً يَمْلِكُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەوەی لەناو ئەم ئایەتەدا هاتووە ئەو ئافرەتانەی تاقی دەکردەوە کە دەهاتن موسوڵمان دەبوون: **(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ)**. سورة الممتحنة: ١. واتە: ئەی پەیامبەر! کاتێ ژنانی باوەڕدار هاتنە لات بەیعەتت پێ بکەن، جا تۆش لەسەر ئەم شەش خاڵە گرنگە: یەکەم: لەسەر ئەوەی هیچ شتێ نەکەنە هاوبەشی خواو بە تاك و تەنیای بزانن، دووەم: دزی نەکەن، سێیەم: زینا نەکەن، چوارەم: منداڵەکانی خۆیان نەکوژن و زیندە بە چاڵیان نەکەن وەك سەردەمی نەزانیی، پێنجەم: هیچ بوختانێك نەکەن لە نێوان دەست و پێی خۆیاندا، واتە: منداڵی خەلکی نەکەنە منداڵی خۆیان، لە سەردەمی نەفامیدا هەر ژنێك ترسی بووبا مێردەکەی -لەبەر ئەوە منداڵی نابێت دەری بکا- دەچوو منداڵی دۆزراوەی دەهێناو دەیکرد بە منداڵی خۆیی و بە مێردەکەی دەگوت ئەمە لە تۆیە.. ئینجا خوای گەورە بەو ئایەتە ئەو کارەی لێ قەدەغە کردن. شەشەم: لە هەموو کارێکی چاکەدا سەر پێچیی و نافەرمانیت نەکەن، ئەوسا تۆش بەیعەتیان لێ وەرگرە. بەڵێ.. لە ڕۆژی دووەمی ئازادکردنی مەککەدا، ژنانیش پاش هاتنی پیاوان، پۆل پۆل دەهاتنە (صەفا)و

موسڵمان دەبوون، پەیامبەریش صلی الله علیه وسلم بەزمان - نەك بەدەسخستنە ناو دەس- لەسەر ئەو خاڵ و مەرجانەی سەرەوە- پەیمانی لێ وەردەگرتن، وە لە خوای دلۆڤان داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە، بەڕاستیی خوا خوایەکی گوناهپۆشی میهرەبانە.

مەعمەر دەڵێ: (ابن طاوس) لە باوکیەوە بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە هیچ شێوەیەك دەستی لە دەستی ژنی نامەحرەم نەکەوتووە.

٣٣٠٧ – (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الشَّيْبَانِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ شَهْرَ بْنَ حَوْشَبٍ، قَالَ: حَدَّثَتْنَا أُمُّ سَلَمَةَ الأَنْصَارِيَّةُ، قَالَتْ: قَالَتْ امْرَأَةٌ مِنَ النِّسْوَةِ: مَا هَذَا الْمَعْرُوفُ الَّذِي لاَ يَنْبَغِي لَنَا أَنْ نَعْصِيَكَ فِيهِ؟ قَالَ: لاَ تَنُحْنَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ بَنِي فُلاَنٍ قَدْ أَسْعَدُونِي عَلَى عَمِّي وَلاَ بُدَّ لِي مِنْ قَضَائِهِمْ، فَأَبَى عَلَيَّ، فَعَاتَبْتُهُ مِرَارًا، فَأَذِنَ لِي فِي قَضَائِهِنَّ، فَلَمْ أَنُحْ بَعْدَ قَضَائِهِنَّ وَلاَ غَيْرِهِ حَتَّى السَّاعَةَ، وَلَمْ يَبْقَ مِنَ النِّسْوَةِ امْرَأَةٌ إِلاَّ وَقَدْ نَاحَتْ غَيْرِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَفِيهِ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ: أُمُّ سَلَمَةَ الأَنْصَارِيَّةُ هِيَ: أَسْمَاءُ بِنْتُ يَزِيدَ بْنِ السَّكَنِ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: یەکێ لە ژنەکان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەو (معروفە) چییە کە لەم ئایەتەدا: **(وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ)**. هاتووە، کە دروست نیە سەر پێچیی و نافەرمانی تۆی تێدا بکەین؟ فەرمووی: (شین و واوەیلا مەکەن لەسەر مردوو). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەنی فلان لەپرسەی ماممدا شیوەنیان بۆ گێڕاوم و پرسەکەیان بۆ بەڕێوەبردووم، هەردەبێ منیش لەگەڵ ئەوان شیوەن بگێڕم پرسەیان بۆ بەڕێوەبەرم وەك دەستەوام، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی پێ نەدام، چەند جارێ داوام لێ

کردەوە ڕێگەی پێدام، پێ دەچێ لەسەرەتاوە حەرامێتی بۆ (تەنزیە) بووبێ، ئیتر لەدوای ئەوەوە هەتا ئێستاش ئەو کارەم نەکردووە نە بۆ برایان نە بۆ کەسی تر، جگە لە من هیچ ئافرەتێ نەبووە ئەو کارەی نەکردبێ.

٣٣٠٨ - حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ الْفِرْيَابِيُّ، حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ الرَّبِيعِ، عَنِ الأَغَرِّ بْنِ الصَّبَّاحِ، عَنْ خَلِيفَةَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي نَصْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ)، قَالَ: كَانَتْ الْمَرْأَةُ إِذَا جَاءَتِ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم لِتُسْلِمَ حَلَّفَهَا بِاللَّهِ مَا خَرَجْتُ مِنْ بُغْضِ زَوْجِي، مَا خَرَجْتُ إِلاَّ حُبًّا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ. قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە: **(إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ)** سورة الممتحنة: ١٠. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ژنە باوەڕدارەکان کە لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆلای ئێوە لە مەدینە، جا بۆ خۆتان تاقییان بکەنەوە، بزانن ڕاست ئەکەن لە بڕواکەیاندا؟ لەبەر ئیسلام هاتوون، یان لە مێردو کەس و کاریان هەڵاتوون؟!.

ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرموویەتی: کاتێ ئافرەتێ دەهاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوەی موسوڵمان ببێ، سوێندی دەدا بە (الله)، کە بڵێ: لەرقی مێردەکەم نەهاتووم موسوڵمان ببم، بەڵکو لەبەر خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی لەماڵ دەرچووم و لە مەککەوە هاتووم.

دەربارەی سورەتی (الصف).

## ٦١ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الصَّفِّ

٣٣٠٩ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ، قَالَ: قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَذَاكَرْنَا، فَقُلْنَا: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الأَعْمَالِ أَحَبَّ إِلَى اللهِ لَعَمِلْنَاهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَهُوَ العَزِيزُ الحَكِيمُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفْعَلُونَ)، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا ابْنُ سَلاَمٍ قَالَ يَحْيَى: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا أَبُو سَلَمَةَ قَالَ ابْنُ كَثِيرٍ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا ابْنُ كَثِيرٍ. وَقَدْ خُولِفَ مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، فِي إِسْنَادِ هَذَا الحَدِيثِ عَنِ الأَوْزَاعِيِّ. فَرَوَى ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ، أَوْ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ. وَرَوَى الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، نَحْوَ رِوَايَةِ مُحَمَّدِ بْنِ كَثِيرٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی سەلامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوین باس و خواسمان دەکرد وتمان: ئەگەر بمانزانیایە چ کردەوەیە لای خوا خۆشەویستە ئەنجامان دەدا، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَهُوَ العَزِيزُ الحَكِيمُ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفْعَلُونَ**) سورة الصف: ١ - ٢. واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە، تەسبیحاتی خوا دەکەن، واتە: بەرزیی و بڵندیی و بێ خەوشیی خوا ئەڵێن، گەواهیی و شایەتی

بۆ تاك و تەنیایی دەدەن، هەر ئەویشە دەسەلاّتداری کار جوان و کارزان، بۆیە جێگەی خۆیەتی تەواوی بوونەوەر فەرمانبەردارو ملکەچی بن. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! بۆچی شتێ دەڵێن و ڕەفتاری پێ ناکەن؟ مەگەر ئێوە نەتانوت: ئەگەر بمانزانیبا چ کارێ بەلای خواوە زۆرباشە ئەمانکرد؟ کەچی کاتێ باسی گەورەیی و مەزنیی جیهاد کرا لای خوا، هەندێکتان قسەکەی خۆتانتان شکاندو پێتان ناخۆش بوو. (تفسير الدر المنثور: ٨/١٤٦).

(عبد الله)ی کوڕی سەلام ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئایەتەکانی خوێندەوە بەسەرماندا، ئەبو سەلەمە فەرمووی: (عبد الله)ی کوڕی سەلام خوێندیەوە بەسەرماندا، یەحیا فەرمووی: ئەبو سەلەمە خوێندیەوە بەسەرماندا، (ابن كثير) فەرمووی: ئەوزاعی خوێندیەوە بەسەرماندا.

**دەربارەی سورەتی (الجمعة).**

**٦٢ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْجُمُعَةِ**

٣٣١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ثَوْرُ بْنُ زَيْدٍ الدِّيْلِيُّ، عَنْ أَبِي الغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أُنْزِلَتْ سُورَةُ الجُمُعَةِ فَتَلاَهَا، فَلَمَّا بَلَغَ (وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ) قَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِنَا؟ فَلَمْ يُكَلِّمْهُ، قَالَ: وَسَلْمَانُ فِينَا قَالَ: فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَ الإِيمَانُ بِالثُّرَيَّا لَتَنَاوَلَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلاَءِ. ثَوْرُ بْنُ زَيْدٍ مَدَنِيٌّ، وَثَوْرُ بْنُ يَزِيدَ شَامِيٌّ، وَأَبُو الْغَيْثِ اسْمُهُ: سَالِمٌ مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ مُطِيعٍ مَدَنِيٌّ.

هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ هُوَ: وَالِدُ عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین کاتێ سورەتی (الجمعة) دابەزی، خوێندیەوە، کە گەیشتە ئەم ئایەتە: **(وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ)** سورة الجمعة: ٣. واتە: وە ئەو پەیامبەرەی نارد، بۆ خەڵکانێکی تریش کە هێشتای پێیان نەگەیشتوون، واتە: لە دوای چەرخی ئەوانەوە دێن، کەوابوو پەیامبەرێکی گشتی خەڵکانی جیهانە.

پیاوێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەبێ ئەو خەڵکانەی تر کێبن کە تۆ پێغەمبەری ئەوانیشی؟ قسەی لەگەڵ نەکرد، وتی: سەلمانی فارسی لەناوماندا بوو، پەیامبەر صلی الله علیه وسلم دەستی خستە سەر شانی، فەرمووی: (سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، ئەگەر ئیمان لە ئەستێرەی سورەییا بێ پیاوانێ لەمانە خۆیانی دەگەیەننێ).

٣٣١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ قَائِمًا إِذْ قَدِمَتْ عِيرُ الْمَدِينَةِ فَابْتَدَرَهَا أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى لَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلاَّ اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِنَحْوِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاری دەدا بە ڕاوەستاوی، كاروانی بازرگانی لەشامەوە گەیشتەوە مەدینە، هاوەڵان بە پەلە ڕۆشتن بەرەوپیری تەنها دوانزە كەس مانەوە لەوانە پێشەوایان ئەبو بەكر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ، جا ئەم ئایەتە دابەزی: (**وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا قُلْ مَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ اللَّهْوِ وَمِنَ التِّجَارَةِ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ**). سورة الجمعة: ١١. واتە: كاتێ بازرگانییەك، یان هەر سەرقاڵیەك ببینن بڵاوەی لێدەكەن و دەچن بۆلای، تۆ بە ڕاوەستاوی بەجێدێڵن!. ڕاڤەكارانی قورئان ئەڵێن: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم رۆژی هەینیی لەسەر مینبەر وتاری ئەخوێندەوە، لەو كاتەدا كاروانێكی بازرگانیی لە شامەوە گەڕایەوە، لەو كاتەیشدا مەدینەییەكان تووشی گرانیی و قات و قڕییەك ببوون، شیاوی باسە هەركات كاروان هاتبایەتەوە بە تەپڵ و دەفەوە پێشوازیان لێ ئەكرد، ئینجا كە دانیشتوانی مزگەوت و گوێگرانی وتاری هەینیی گوێیان لەو هەراو سومڕەوە بوو، ئەوانیش- بێجگە لە دوازدە كەسیان — بە پەلە هەڵسان و پەیامبەریان بەجێ هێشت!! ئەوسا ئەو ئایەتە هات و فەرمووی: پێیان بڵێ ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم ئەو پاداش و بەهرەیە لای خوایە بۆ ئیمانداران چاكترە لە گەمەو بازرگانیی، وە خوایش باشترین رۆزی بەخشە، كەوابوو جارێكیتر شتی وا نەكەن و تەنها لای خوا داوای رۆزی بكەن.

**دەربارەی سورەتی (المنافقین).**

## ٦٣ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْمُنَافِقِينَ

٣٣١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَمِّي فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ ابْنَ سَلُولَ، يَقُولُ لأَصْحَابِهِ: (لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا) وَ (لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمِّي، فَذَكَرَ ذَلِكَ عَمِّي لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَدَعَانِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَدَّثْتُهُ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ وَأَصْحَابِهِ، فَحَلَفُوا مَا قَالُوا، فَكَذَّبَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَدَّقَهُ، فَأَصَابَنِي شَيْءٌ لَمْ يُصِبْنِي شَيْءٌ قَطُّ مِثْلُهُ، فَجَلَسْتُ فِي الْبَيْتِ، فَقَالَ عَمِّي: مَا أَرَدْتَ إِلاَّ أَنْ كَذَّبَكَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَقَتَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ) فَبَعَثَ إِلَيَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَرَأَهَا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ مامم بووم، گوێم لێ بوو (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بە هاوڕێکانی وت: **(لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا)**. سورة المنافقون: ٧. واتە: هەر ئەوانن بە خەڵکی مەدینە دەڵێن: هیچ مەبەخشن بەوانەی کە لە دەوروبەری پێغەمبەری خوادان لە هەژارە کۆچکەریەکان! تا برسییان دەبێ و بلاوەی لێدەکەن!! وە **(لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ)**. سورة الجمعة: ٨. واتە: دووڕووەکان (واتە: عەبدوڵلاو شاگردەکانی) دەڵێن: سوێندبێ بە خوا، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینەو، لەم جەنگەی (بنی مصطلق) ڕزگارمان بوو، دەبێ

دەسـەڵاتدارو بـەڕێز، واتـە: ئـەوان، خەڵکـە ڕووت و لاتەکـەی لێدەرکـەن، واتـە: پێغەمبەرو هاوەڵانی لە مەدینە وەدەرنێن!

ئەمەم بۆ مامم باس کرد، مامم بۆ پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم باس کرد، پێغەمبەر صـلی الله علیـە وسـلم منـی بـانگ کـرد، منـیش ڕۆشـتم بـۆ خزمـەتی بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم نـاردی بـەدوای (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و هاوڕێکانیـدا، ئـەوانیش هـاتن لـەوبارەوە لێی پرسین، سوێندیان خوارد کـە شـتی وایـان نـەوتوە، ئـیتر منـی بەدرۆخسـتەوە و ئەوانی بەڕاست دانا، تووشی خەم و خەفەتێ بـووم هـەرگیز خـەم و خەفـەتی وەهـام تووش نەبووە، لەماڵەوە بۆ خۆم لێی دانیشتم بۆ ئەوەی کەس پێم نەڵێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەدرۆی خسـتیتەوە و ڕقـی لێـت هەسـتاوە، هـەتا خـوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ)**. سورة المنافقون: ١. واتە: کاتێ دووڕووەکان هاتن بۆلات ئـەی پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم! ئـەڵێن: شـایەتی ئەدەین کە بەڕاستیی تۆ پەیامبەری خوایت، لە حاڵێکدا خوا خـۆی دەزانـێ کـە تـۆ پەیامبەری ئەویت، وە خوا گەواهیی دەدات کە ئەو دووڕووانە درۆ دەکەن کە ئەڵێن تۆ پەیامبەری خوایت.

جـا پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم نـاردی بەدوامـدا ئایەتـەکانی بـۆ خوێندەمـەوە و فـەرمووی: (ئـەی زەیـد بەڕاسـتی خـوای گـەورە ڕاسـتگۆیی تـۆی دەرخست و ئەوانی بەدرۆخستەوە).

٣٣١٣ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الأَزْدِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ، قَالَ:

غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ مَعَنَا أُنَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ فَكُنَّا نَبْتَدِرُ الْمَاءَ، وَكَانَ الأَعْرَابُ يَسْبِقُونَا إِلَيْهِ، فَسَبَقَ أَعْرَابِيٌّ أَصْحَابَهُ، فَيَسْبِقُ الأَعْرَابِيُّ فَيَمْلأُ الحَوْضَ وَيَجْعَلُ حَوْلَهُ حِجَارَةً وَيَجْعَلُ النِّطْعَ عَلَيْهِ حَتَّى يَجِيءَ أَصْحَابُهُ. قَالَ: فَأَتَى رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ أَعْرَابِيًّا فَأَرْخَى زِمَامَ نَاقَتِهِ لِتَشْرَبَ فَأَبَى أَنْ يَدَعَهُ فَانْتَزَعَ قِبَاضَ الْمَاءِ، فَرَفَعَ الأَعْرَابِيُّ خَشَبَةً فَضَرَبَ بِهَا رَأْسَ الأَنْصَارِيِّ فَشَجَّهُ، فَأَتَى عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ رَأْسَ الْمُنَافِقِينَ فَأَخْبَرَهُ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَغَضِبَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ، ثُمَّ قَالَ: (لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا)، يَعْنِي الأَعْرَابَ، وَكَانُوا يَحْضُرُونَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ الطَّعَامِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: إِذَا انْفَضُّوا مِنْ عِنْدِ مُحَمَّدٍ فَأْتُوا مُحَمَّدًا بِالطَّعَامِ، فَلْيَأْكُلْ هُوَ وَمَنْ عِنْدَهُ، ثُمَّ قَالَ لأَصْحَابِهِ: (لَئِنْ رَجَعْتُمْ إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ)، قَالَ زَيْدٌ: وَأَنَا رِدْفُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ، فَأَخْبَرْتُ عَمِّي، فَانْطَلَقَ فَأَخْبَرَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَلَفَ وَجَحَدَ، قَالَ: فَصَدَّقَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَذَّبَنِي، قَالَ: فَجَاءَ عَمِّي إِلَيَّ، فَقَالَ: مَا أَرَدْتَ إِلاَّ أَنْ مَقَتَكَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَذَّبَكَ وَالمسْلِمُونَ. قَالَ: فَوَقَعَ عَلَيَّ مِنَ الهَمِّ مَا لَمْ يَقَعْ عَلَى أَحَدٍ. قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا أَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ قَدْ خَفَقْتُ بِرَأْسِي مِنَ الهَمِّ، إِذْ أَتَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَرَكَ أُذُنِي وَضَحِكَ فِي وَجْهِي، فَمَا كَانَ يَسُرُّنِي أَنَّ لِي بِهَا الخُلْدَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ لحِقَنِي فَقَالَ: مَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قُلْتُ: مَا قَالَ لِي شَيْئًا، إِلاَّ أَنَّهُ عَرَكَ أُذُنِي وَضَحِكَ فِي وَجْهِي. فَقَالَ: أَبْشِرْ، ثُمَّ لحِقَنِي عُمَرُ، فَقُلْتُ لَهُ مِثْلَ قَوْلِي لأَبِي بَكْرٍ فَلَمَّا أَصْبَحْنَا قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُورَةَ الْمُنَافِقِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە غەزایەکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم

بووین، هەندێ عەرەبی دەشتەکیمان لەگەڵ بوو، پێشبڕکێمان دەکرد بۆ ئاوەکە، عەرەبە دەشتەکیەکان پێشکەوتن، حەوزەکە پڕ بوو لە ئاو، بە بەرد چواردەوری حەوزەکەیان گرت هەتا هاوڕێکانیان بێن بۆ سەر حەوزەکە، زەید فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری کە یەکێ بوو لە هاوڕێکانی (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی سەرۆکی دووڕووەکان ڕەشمەی وشترەکەی گرتوو چوو بۆ سەر حەوزەکە بۆ ئەوەی وشترەکەی ئاو بدات، دەشتەکیە دارێکی هەڵگرت و کێشای بەسەریدا و سەری شکاند، کابرای ئەنصاری چوو بۆ لای (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند، (عبد الله) تووڕە بوو، لەپاشدا وتی: **(لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا)**. سورة المنافقون: ٧. واتە: هیچ مەبەخشن بەوانەی کە لە دەوروبەری پێغەمبەری خوادان لە هەژارە کۆچکەریەکان! تا برسییان دەبێ و بلاوەی لێدەکەن!! واتە: عەرەبە دەشتەکیەکان.

جا عەرەبە دەشتەکیەکان ئامادەی سفرەو خوانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوون، (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی وتی: کاتێ عەرەبە دەشتەکیەکان دەوری موحەممەدیان چۆڵ کرد ئەوکاتە نانی بۆ بهێنن، نانیان بۆ هێنا، جا خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم نانیان خوارد، پاشان بە هاوڕێکانی وت: **(لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ)**. سورة المنافقون: ٨. واتە: دووڕووەکان (واتە: عەبدوڵلاو شاگردەکانی) دەڵێن: سوێندبێ بە خوا، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینەو، لەم جەنگەی (بنی مصطلق) ڕزگارمان بوو، دەبێ دەسەڵاتدارو بەڕێز، واتە: ئەوان، خەڵکە ڕووت و لاتەکەی لێدەرکەن، واتە: پێغەمبەرو هاوەڵانی لە مەدینە وەدەرنێن!

زەید فەرمووی: لەپشتکۆی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم سواربوو بووم، گوێم لە (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو کە وای وت، بە مامم

راگەیاند، مامیشم ڕۆشت هەواڵەکەی بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم راگەیاند، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوای (عبد الله)ی کوڕی ئوبەیدا، ئەویش هات نکولی لێ کرد و سوێندی خوارد کە شتی وای نەوتوە، زەید فەرمووی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم منی بەدرۆخستەوە و ئەوی بەڕاست دانا، جا زەید فەرمووی: مامم هات بۆلام فەرمووی: چیت ویست وازت نەهێنا هەتا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رقی لێت هەستاو موسوڵمانان بەدرۆیان خستیتەوە، فەرمووی: ئیتر تووشی خەم و خەفەتێ بووم هیچ کەس بەو شێوەیە تووش نەبووە، فەرمووی: جا لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێم دەکرد لەخەفەتان سەرم دەجوڵاند، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلام گوێی شێلام و پێکەنی بە ڕوومدا، لە ماوەم بە هەمیشەیی لەدونیادا پێ خۆشتر بوو، لەپاشدا پێشەوا ئەبو بەکرم رەزای خوای لێ بێ پێ گەیشت، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی پێ فەرموویت؟ وتم: هیچی پێ نەفەرمووم، تەنها ئەوەندە نەبێ کە گوێی شێلام و پێکەنی بە ڕوومدا، فەرمووی: دی موژدەت لێ بێ، لەپاشدا پێشەوا عومەرم رەزای خوای لێ بێ پێ گەیشت، چیم بە پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ فەرموو هەر ئەوەشم بەو فەرموو، کاتێ کە ڕۆژمان لێ بوویەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سورەتی (منافقین)ی خوێندەوە.

٣٣١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ كَعْبٍ القُرَظِيَّ، مُنْذُ أَرْبَعِينَ سَنَةً يُحَدِّثُ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ، قَالَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ: (لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ) قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَحَلَفَ مَا قَالَهُ، فَلاَمَنِي قَوْمِي وَقَالُوا: مَا أَرَدْتَ إِلَى هَذِهِ، فَأَتَيْتُ البَيْتَ

وَغَمٌّ كَئِيبًا حَزِينًا، فَأَتَانِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ أَتَيْتُهُ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول لە غەزای تەبوك وتی: **(لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ)**. سورة الجمعة: ٨. واتە: دووڕووەکان (واتە: عەبدوڵڵاو شاگردەکانی) دەڵێن: سوێندبێ بە خوا، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینەو، لەم جەنگەی (بنی مصطلق) ڕزگارمان بوو، دەبێ دەسەڵاتدارو بەڕێز، واتە: ئەوان، خەڵکە ڕووت و لاتەکەی لێدەرکەن، واتە: پێغەمبەرو هاوەڵانی لە مەدینە وەدەرنێن!

ڕۆشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم باسەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوای (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولدا هاتە خزمەتی سوێندی خوارد کە شتی وای نەوتوە، خزمەکانم سەرزەنشتیان کردم، وتیان: چیت ویست وازت نەهێنا هەتا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕقی لێت هەستاو موسوڵمانان بەدرۆیان خستیتەوە، بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە چوومەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لام یان من چوومە خزمەتی، فەرمووی: (ئەی زەید بەڕاستی خوای گەورە ڕاستگۆیی تۆی دەرخست و ئەوانی بەدرۆخستەوە). زەید فەرمووی: خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا)**. سورة المنافقون: ٧. واتە: هەر ئەوانن بە خەڵکی مەدینە دەڵێن: هیچ مەبەخشن بەوانەی کە لە دەوروبەری پێغەمبەری خوادان لە هەژارە کۆچکەریەکان! تا برسییان دەبێ و بڵاوەی لێدەکەن!!

٣٣١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يَقُولُ: كُنَّا فِي غَزَاةٍ، قَالَ سُفْيَانُ: يَرَوْنَ أَنَّهَا غَزْوَةُ بَنِي الْمُصْطَلِقِ فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لِلْمُهَاجِرِينَ وَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لِلأَنْصَارِ، فَسَمِعَ ذَلِكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَا بَالُ دَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ؟ قَالُوا: رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ كَسَعَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ، فَسَمِعَ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ، فَقَالَ: أَوَقَدْ فَعَلُوهَا؟ وَاللهِ (لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ)، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: دَعْهُ لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ وَقَالَ غَيْرُ عَمْرٍو، فَقَالَ: لَهُ ابْنُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ: وَاللهِ لاَ تَنْقَلِبُ حَتَّى تُقِرَّ أَنَّكَ الذَّلِيلُ، وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ العَزِيزُ، فَفَعَلَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی دینارەوە، رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە جابیری کوڕی (عبد الله) بوو، سوفیان وتی: پێیان وابوو غەزای (بنی مصطلق) بوو، پیاوێکی کۆچەری شەقێکی هەڵدا لە پاشەڵی پیاوێکی ئەنصاری، پیاوە کۆچەریەکە وتی: ئەی کۆچەران، پیاوە ئەنصاریەکەش وتی: ئەی ئەنصارەکان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لێ بوو فەرمووی: (ئەم هات و هاواری سەردەمی نەفامیە چیە؟). وتیان: پیاوێکی کۆچەری شەقێکی هەڵداوە لە پاشەڵی پیاوێکی ئەنصاری، فەرمووی: (واز لەم جۆرە پیشە پیسە بهێنن بەراستی خویەکی بۆگەنە). (عبد الله)ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول گوێی لێ بوو وتی: ئاوای لێهات، ئەمەشیان کرد؟ سوێند بە (الله): **(لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ)**. سورة الجمعة: ٨.

پێشەوا عومەر کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی

پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم ڕێگەم بدە با بدەم لەگەردنی ئەم دووڕووە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (وازی لێ بێنە با خەڵك نەڵێن موحەممەد هاوەڵ و شوێنکەوتەکانی خۆی دەکوژێ). جگە لە عەمر دەڵێن: (عبد الله)ی کوڕی (عبد الله)ی ئوبەی کوڕی سەلول واتە کوڕەکەی خۆی پێی وت: سوێند بە (الله) ناگەڕێیتەوە بۆ مەدینە هەتا دانی پێدا نەنێی کە تۆ بێ دەسەلات و سەرشۆڕی و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەسەلاتدار و سەربەرزە، (عبد الله)ی ئوبەی دانی پێدا نا.

٣٣١٦ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو جَنَابٍ الكَلْبِيُّ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ مُزَاحِمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ مَالٌ يُبَلِّغُهُ حَجَّ بَيْتِ رَبِّهِ، أَوْ يَجِبُ عَلَيْهِ فِيهِ زَكَاةٌ، فَلَمْ يَفْعَلْ، يَسْأَلِ الرَّجْعَةَ عِنْدَ الْمَوْتِ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، اتَّقِ اللَّهَ، فَإِنَّمَا يَسْأَلُ الرَّجْعَةَ الكُفَّارُ؟ فَقَالَ: سَأَتْلُو عَلَيْكَ بِذَلِكَ قُرْآنًا: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلاَ أَوْلاَدُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الخَاسِرُونَ. وَأَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلاَ أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ)، إِلَى قَوْلِهِ: (وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) قَالَ: فَمَا يُوجِبُ الزَّكَاةَ؟ قَالَ: إِذَا بَلَغَ الْمَالُ مِائَتَيْنِ فَصَاعِدًا. قَالَ: فَمَا يُوجِبُ الحَجَّ؟ قَالَ: الزَّادُ وَالبَعِيرُ. حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي حَيَّةَ، عَنِ الضَّحَّاكِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِنَحْوِهِ. هَكَذَا رَوَى سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي جَنَابٍ، عَنِ الضَّحَّاكِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَوْلَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ رِوَايَةِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ، وَأَبُو جَنَابٍ الْقَصَّابُ، اسْمُهُ: يَحْيَى بْنُ أَبِي حَيَّةَ وَلَيْسَ هُوَ بِالقَوِيِّ فِي الْحَدِيثِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

هەرکەس ئەوەندە ماڵ و سامانی هەبوو کە بتوانێ حەجی پێ بکا حەج نەکات، یان زەکاتی بکەوێ و زەکاتەکەی دەرنەکات، ئەوە لەکاتی سەرەمەرگدا داوای گەڕانەوە لەخوا دەکات بۆ دونیا، پیاوێ وتی: ئەی کوڕی عەباس لەخوا بترسە کافر داوای گەڕانەوە لەخوا دەکات بۆ دونیا، ئیبنو عەباس فەرمووی: لەوبارەوە قورئانت بۆ دەخوێنمەوە: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ (٩) وَأَنْفِقُوا مِنْ مَا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ (١٠) وَلَنْ يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ).** سورة المنافقون: ٩ - ١١. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ماڵ و منداڵتان لە یادی خوا غافڵتان نەکەن، واتە: ئێوە وەك دووڕووەکان مەبن کە دەستیان لە جیهادو هەوڵ و تێکۆشان بەردا، هەرکەسێك کاری وا بکات! ئەوانەن زیانمەن و دۆڕاو، چونکە فەزڵ و باوی دونیایان بەسەر پاشە ڕۆژدا داوە. لەو ماڵ و سامانەی کردوومانە ڕۆزیتان ببەخشن پێش ئەوەی مردن یەخەتان پێبگرێ، ئەوسا بڵێ: ئەی پەروەردگارەکەم! خۆزگە مردنی منت بۆ ماوەیەکی نزیك دواخستباو ئینجا ماڵم دەبەخشیی و لە صالحان و چاکە خوازان دەبووم، خۆ هەرکەسێك ئاکامی تەواوبوو، هەرگیز خوا دوای ناخات، جا کەوابوو پێش ئەوە ئەو خۆزگە بێ جێگەیە بخوازن فریای خۆتان بکەون و خواش بە ئاگایە بەو کاروکردەوە ئێوە دەیکەن، وە بەپێی ئەوەش پاداش و تۆڵەتان دەدات.

پیاوەکە وتی: دەی ماڵ و سامان بگاتە چ ئەندازەیە زەکاتی دەکەوێ و فەرزە زەکاتی لێ دەرکرێ؟ فەرمووی: کاتێ بگاتە دوو سەد ردرهەم یان زیاتر، وتی: ئەی کەی حەج فەرز دەبێ؟ فەرمووی: خەرجی ڕێگەی هەبێ و وشتری سواری هەبێ حەجی لەسەر واجب دەبێ.

## دەربارەی سورەتی (التغابن).

## ٦٤ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ التَّغَابُنِ

٣٣١٧ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سِمَاكُ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَسَأَلَهُ، رَجُلٌ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلاَدِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ) قَالَ: هَؤُلاَءِ رِجَالٌ أَسْلَمُوا مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ وَأَرَادُوا أَنْ يَأْتُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَبَى أَزْوَاجُهُمْ وَأَوْلاَدُهُمْ أَنْ يَدَعُوهُمْ أَنْ يَأْتُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَوْا النَّاسَ قَدْ فَقُهُوا فِي الدِّينِ هَمُّوا أَنْ يُعَاقِبُوهُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلاَدِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێ لەبارەی ئەم ئایەتەوە لێی پرسی: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ)**. فەرمووی: ئەمانە چەند کەسێکی خەڵکی مەککە بوون موسوڵمان بوون، ویستیان کۆچ بکەن بۆ مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەڵام ژن و منداڵەکانیان رێگەیان پێ نەدەدان، جا کاتێ هاتن بۆ مەدینە و بینیان خەڵك شارەزای دین بوون ئەمان دواکەوتوون، ویستیان سزای ژن و منداڵەکانیان بدەن و تۆڵەیان لێ بسوێننەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ)**. سورة التغابن: ١٤.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بەراستیی هەندێ لە ژنان و لە منداڵتان دوژمنن بۆتان، سەرقاڵتان دەکەن لە تاعەت و کاری چاکە بەهۆی خۆشەویستیتانەوە بۆیان، جا وریابن و خۆتان بپارێزن لە خۆشەویستی ناشەرعیی بۆیان.

دەربارەی سورەتی (التحریم).

## ٦٥ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ التَّحْرِيمِ

٣٣١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: لَمْ أَزَلْ حَرِيصًا أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ عَنِ الْمَرْأَتَيْنِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّتَيْنِ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا) حَتَّى حَجَّ عُمَرُ، وَحَجَجْتُ مَعَهُ، فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ فَتَوَضَّأَ، فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَنِ الْمَرْأَتَانِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّتَانِ قَالَ اللَّهُ: (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا) فَقَالَ لِي: وَاعَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَكَرِهَ وَاللهِ مَا سَأَلَهُ عَنْهُ وَلَمْ يَكْتُمْهُ: فَقَالَ: هِيَ عَائِشَةُ، وَحَفْصَةُ، قَالَ: ثُمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّثُنِي الحَدِيثَ فَقَالَ: كُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَجَدْنَا قَوْمًا تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَتَعَلَّمْنَ مِنْ نِسَائِهِمْ، فَتَغَضَّبْتُ يَوْمًا عَلَى امْرَأَتِي، فَإِذَا هِيَ تُرَاجِعُنِي، فَأَنْكَرْتُ أَنْ تُرَاجِعَنِي، فَقَالَتْ: مَا تُنْكِرُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَوَاللهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُرَاجِعْنَهُ، وَتَهْجُرُهُ إِحْدَاهُنَّ اليَوْمَ إِلَى اللَّيْلِ. قَالَ: قُلْتُ فِي نَفْسِي: قَدْ خَابَتْ مَنْ فَعَلَتْ ذَلِكَ مِنْهُنَّ وَخَسِرَتْ، قَالَ: وَكَانَ مَنْزِلِي بِالعَوَالِي فِي بَنِي أُمَيَّةَ، وَكَانَ لِي جَارٌ مِنَ الأَنْصَارِ، كُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَيَنْزِلُ يَوْمًا فَيَأْتِينِي بِخَبَرِ الوَحْيِ وَغَيْرِهِ، وَأَنْزِلُ يَوْمًا فَآتِيهِ بِمِثْلِ ذَلِكَ. قَالَ: فَكُنَّا نُحَدِّثُ أَنَّ غَسَّانَ تُنْعِلُ الخَيْلَ لِتَغْزُوَنَا. قَالَ: فَجَاءَنِي يَوْمًا عِشَاءً فَضَرَبَ عَلَيَّ الْبَابَ، فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ. قُلْتُ: أَجَاءَتْ غَسَّانُ قَالَ: أَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ، طَلَّقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءَهُ. قَالَ: قُلْتُ فِي نَفْسِي: خَابَتْ حَفْصَةُ وَخَسِرَتْ، قَدْ كُنْتُ أَظُنُّ

هَذَا كَائِنًا، قَالَ: فَلَمَّا صَلَّيْتُ الصُّبْحَ شَدَدْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي، ثُمَّ انْطَلَقْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ، فَإِذَا هِيَ تَبْكِي، فَقُلْتُ: أَطَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: لاَ أَدْرِي، هُوَ ذَا مُعْتَزِلٌ فِي هَذِهِ الْمَشْرَبَةِ قَالَ: فَانْطَلَقْتُ فَأَتَيْتُ غُلاَمًا أَسْوَدَ، فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، قَالَ: فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَيَّ، قَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا. قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَإِذَا حَوْلَ الْمِنْبَرِ نَفَرٌ يَبْكُونَ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِمْ، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ فَأَتَيْتُ الغُلاَمَ فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَيَّ، قَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا، قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ أَيْضًا فَجَلَسْتُ، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ، فَأَتَيْتُ الغُلاَمَ، فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَيَّ فَقَالَ: ذَكَرْتُكَ لَهُ فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا. قَالَ: فَوَلَّيْتُ مُنْطَلِقًا، فَإِذَا الغُلاَمُ يَدْعُونِي، فَقَالَ: ادْخُلْ فَقَدْ أُذِنَ لَكَ، قَالَ: فَدَخَلْتُ، فَإِذَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَّكِئٌ عَلَى رَمْلِ حَصِيرٍ، فَرَأَيْتُ أَثَرَهُ فِي جَنْبِهِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: اللهُ أَكْبَرُ، لَقَدْ رَأَيْتُنَا يَا رَسُولَ اللهِ وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَجَدْنَا قَوْمًا تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَتَعَلَّمْنَ مِنْ نِسَائِهِمْ، فَتَغَضَّبْتُ يَوْمًا عَلَى امْرَأَتِي، فَإِذَا هِيَ تُرَاجِعُنِي، فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: مَا تُنْكِرُ؟ فَوَاللهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُرَاجِعْنَهُ وَتَهْجُرُهُ إِحْدَاهُنَّ اليَوْمَ إِلَى اللَّيْلِ، قَالَ: فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ: أَتُرَاجِعِينَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، وَتَهْجُرُهُ إِحْدَانَا اليَوْمَ إِلَى اللَّيْلِ، فَقُلْتُ: قَدْ خَابَتْ مَنْ فَعَلَتْ ذَلِكَ مِنْكُنَّ وَخَسِرَتْ، أَتَأْمَنُ إِحْدَاكُنَّ أَنْ يَغْضَبَ اللهُ عَلَيْهَا لِغَضَبِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا هِيَ قَدْ هَلَكَتْ؟ فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ: فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ: لاَ تُرَاجِعِي رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ تَسْأَلِيهِ شَيْئًا، وَسَلِينِي مَا بَدَا لَكِ، وَلاَ يَغُرَّنَّكِ إِنْ كَانَتْ صَاحِبَتُكِ أَوْسَمَ مِنْكِ، وَأَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ: فَتَبَسَّمَ أُخْرَى، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَسْتَأْنِسُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ:

فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَمَا رَأَيْتُ فِي البَيْتِ إِلاَّ أُهُبَةً ثَلاَثَةً. قَالَ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يُوَسِّعَ عَلَى أُمَّتِكَ، فَقَدْ وَسَّعَ عَلَى فَارِسَ وَالرُّومِ وَهُمْ لاَ يَعْبُدُونَهُ، فَاسْتَوَى جَالِسًا، فَقَالَ: أَفِي شَكٍّ أَنْتَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ؟ أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلَتْ لَهُمْ طَيِّبَاتُهُمْ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا. قَالَ: وَكَانَ أَقْسَمَ أَنْ لاَ يَدْخُلَ عَلَى نِسَائِهِ شَهْرًا، فَعَاتَبَهُ اللهُ فِي ذَلِكَ وَجَعَلَ لَهُ كَفَّارَةَ اليَمِينِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ، فَأَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَدَأَ بِي قَالَ: يَا عَائِشَةُ، إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ شَيْئًا فَلاَ تَعْجَلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ قَالَتْ: ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ) الآيَةَ. قَالَتْ: عَلِمَ وَاللهِ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: أَفِي هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ؟ فَإِنِّي أُرِيدُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ. قَالَ مَعْمَرٌ، فَأَخْبَرَنِي أَيُّوبُ، أَنَّ عَائِشَةَ، قَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ تُخْبِرْ أَزْوَاجَكَ أَنِّي اخْتَرْتُكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا بَعَثَنِي اللهُ مُبَلِّغًا وَلَمْ يَبْعَثْنِي مُتَعَنِّتًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەفەرمووێت: بەردەوام سووربووم لەسەر ئەوەی پرسیار بکەم لە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ دەربارەی ئەو دوو هاوسەرەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمووێت: **(إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا)**. سورة التحريم: ٤. واتە: ئەگەر ئێوە (ئەی حەفصەو عائیشە!) تەوبە بکەن لای خواو لەو هەڵس و کەوتەیە پەشیمان ببنەوە، دیارە کارێکی باشتان ئەنجامداوەو، خۆتان لە تووڕەیی خوا لاداوە، چونکە بەراستیی بەرامبەر بە دڵسۆزی بۆ پەیامبەر صلی الله علیه وسلم دڵتان لە هەق لایدا.

بەڵام لێم نەپرسی ئەوەندە سام و هەیبەتی هەبوو لە دڵمدا، هەتا پێشەوا

عومەر ڕەزای خوای لێ بێ چوو بۆ حەج و منیش لە خزمەتیدا چووم، لەڕێگە ویستی دەستنوێژ بگرێ جەوەنەیەکم پێ بوو ئاوم کرد بە دەستیدا و دەستنوێژی گرت، وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران، ئەو دوو هاوسەرەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کێ و کێ بوون کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: **(إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا)**. پێی فەرمووم: چەند سەیریت ئەی کوڕی عەباس! فەرمووی: عائیشە و حەفصەی کچم بوون، زوهری فەرمووی: سوێند بە (الله) پرسیارەکەی پێ ناخۆش بوو بەلاّم نەیشاریەوە، ئیبنو عەباس فەرمووی: جا بەدوورو درێژی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕامەوە، فەرمووی: ئێمەی پیاوانی قورەیش زالّ بووین بەسەر ژنەکانماندا، کاتێ گەیشتینە مەدینە دەبینین ئەوان ژنەکانیان زالّن بەسەریاندا، بەرە بەرە ژنەکانی ئێمەش خووی ئەوانیان گرت لەوانەوە فێربوون، ڕۆژێ لە ژنەکەم تووڕەبووم، ئەویش وەلاّمی دامەوە، منیش ئینکاریم کردوو وتم ئەوە وەلاّمم دەدەیتەوەو دەمە دەمێم لەگەلّ دەکەیت، وتی: بۆچی وەلاّمت نەدەمەوە؟ سوێند بە (الله) هاوسەرانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕۆژانە وەلاّمی دەدەنەوە و دەمە دەمێی لەگەلّ دەکەن، تەنانەت هەیانە ڕۆژ تا ئێوارە قسەی لەگەلّ ناکات، فەرمووی: لەدلّی خۆمدا وتم: هەر کامیان ئەو کارە بکات بەرامبەر بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مالّ وێران و تیاچووە، مالّمان لە عەوالی مەدینە بوو لەناو بەنی ئومەییەکاندا، دراوسێیەکی ئەنصاریم هەبوو، کردبوومان بە نۆبە هەر ڕۆژە و یەکێکمان دادەبەزین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هەوالّی وەحی و جگە لەویشمان بۆ یەك دەهێنایەوە، ڕۆژێ باسی ئەوەمان دەکرد کە پادشای غەسان لەشکری ئامادەکردووە بۆ جەنگ و دەیانەوێ بێنە سەرمان، پێشەوا عومەر فەرمووی: ڕۆژێ دراوسێکەم دابەزی بۆ مەدینە سەر لەئێوارێ کە هاتەوە زۆر بە توندی لەدەرگای دا، منیش چوومە

دەرەوە بـۆ لای، وتـی: کـارێکی گـەورە رویـداوە، وتم: لەشـکری غەسـان هاتۆتـە سەرمان؟ وتی: لەوەش گەورەتر و سامناك تر رویداوە، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم ژنەکانی تەڵاقداوە، فەرمووی: لەدڵی خۆمدا وتم: حەفصە مـاڵ وێـران و رەنجەڕۆ بوو، بێگومان هەر خۆم ئەمزانی ئەمـە روودەدات، نوێـژی بـەیانیم کـردوو، جلەکانم لەبەرکرد خۆم تەندو تۆڵ کـردەوە، لەپاشـدا رۆشـتم بـۆ لای حەفصـە سـەیر دەکەم دەگری، وتم: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم تـەڵاقی داون؟ وتـی: نازانم، ئەوەتا لەو هۆدەدا بۆ خۆی کەناری گرتووە، لای حەفصە درچووم رۆشـتم بـۆ لای غـوڵامێکی رەش، وتم: مۆڵـەت وەرگـرە بـۆ عومـەر بـۆ ئـەوەی سـەردانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بکەم، ئەویش چووە ژوورەوە و هاتـە دەرەوە بۆ لام، وتی: باسی تۆم بۆ کرد، هیچ قسەی نـەکرد، مـنـیش رۆشـتم بـۆ مزگـەوت، چەند کەسێ لەدەوری مینبەرکە بوون دەگریان، منیش لایان دانیشتم، لەپاشدا خەم و پەژارە پاڵی پێوەنامەوە چوومەوە بۆ لای غوڵامە رەشەکە وتم: مۆڵەت وەرگرە بۆ عومەر، ئەویش چووە ژوورەوە و هاتە دەرەوە بۆ لام، وتی: باسی تۆم بۆ کرد، هـیچ قسەی نەکرد، منیش رۆشتمەوە بۆ مزگەوت دانیشتم، لەپاشدا خەم و پـەژارە پـاڵی پێوەنامەوە و چوومەوە بۆ لای غوڵامە رەشـەکە وتم: مۆڵـەت وەرگـرە بـۆ عومـەر، ئەویش چووە ژوورەوە و هاتە دەرەوە بۆ لام، وتی: باسی تۆم بۆ کـرد، هـیچ قسـەی نەکرد، فەرمووی: پشتم هـەڵکرد و ویسـتم بـڕۆم، غولامەکـە بـانگی کـردم، وتـی: مۆڵەتی پێ داوی فەرموو بچۆرە ژوورەوە بۆ خزمەتی، فەرمووی: چوومەژوورەوە بۆ لای، دیم لەسەر حەسیرێکی چنراو راکشاوە، شـوێنەواریم بـە جەسـتەیەوە دی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ژنەکانت تەڵاقداوە، فەرمووی: نـا، وتم: (الله أکبر)، بێگومان ئەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم، دیـت ئێمـەی کۆمەڵی قورەیش چۆن زاڵ بووین بەسەر ژناندا، بەڵام کاتێ هاتینە مەدینە بینیمـان

ئەوان ژنەکانیان زاڵن بەسەریاندا، بەرە بەرە ژنەکانی ئێمەش خووی ئەوانیان گرت لەوانەوە فێربوون، ڕۆژێ لە ژنەکەم تووڕەبووم، ئەویش وەڵامی دامەوە، منیش ئینگاریم کردوو وتم ئەوە وەڵامم دەدەیتەوەو دەمە دەمێم لەگەڵ دەکەیت، وتی: بۆچی وەڵامت نەدەمەوە؟ سوێند بە (الله) هاوسەرانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕۆژانە وەڵامی دەدەنەوە و دەمە دەمێی لەگەڵ دەکەن، تەنانەت هەیانە ڕۆژ تا ئێوارە قسەی لەگەڵ ناکات، بە حفصەم وت: ئێوە وەڵامی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەدەنەوە و دەمە دەمێی لەگەڵ دەکەن؟ وتی: بەڵێ، هەمانە ڕۆژ تا ئێوارە قسەی لەگەڵ ناکات، فەرمووی: وتم: هەرکەس ئەو کارە بکات بەرامبەر بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ماڵ وێران و ڕەنجەڕۆیە، چۆن کەسێ لەئێوە لەخۆی ناترسێ خوای گەورە لەسەر زویرکردنی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم هەڵبداتێ و تووڕ ببێ لێی و ماڵ وێران و ڕەنجەڕۆ ببێ، پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم زەردخەنەیکی کرد، فەرمووی: بە حەفصەم وت: دەمە دەمێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مەکە، داوای هیچی لێ مەکە، هەرچیەکت ویست لەخۆم داوا بکە، تۆ بەهۆی عائیشەوە لەخۆت بایی مەبە، ئەو لەتۆ جوانترە، لەلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆشەویستریشە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەردخەنەیکی تری کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قسەی خۆشترت بۆ بکەم، فەرمووی: بەڵێ، وتی: سەرم هەڵبڕی، لەهۆدەکەیدا هیچ شتێکم نەدی دڵ بیگرێ جگە لە سێ کەوڵ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوا بکە لەخوای گەورە ڕۆزی ئوممەتت فراوان بکات و بکەونە خێر و خۆشیەوە، ئەوتا ڕۆم و فارس خوا ناپەرستن و خێر و بێری دنیای ڕژاندووە بەسەریاندا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا دانیشت و فەرمووی: ئەوە گومانت هەیە ئەی کوڕی خەتتاب؟ ئەوانە

قەومێکن پەلەیان لەبەشی خۆیان کردووە و خەڵاتی خۆیان لـە دونیـادا وەرگرتـووە، فەرمووی: سوێندی خوارد هەتا مانگێ نەچێ بەلای ژنەکانیدا، خوای گەورە گلەیی لێ کرد لەسەر ئەوە، کەفارەتی سوێندی کەوتەسەر، عائیشـە ڕەزای خـوای لـێ بـێ فەرمووی: دوای تێپەڕبوونی بیست و نۆ رۆژ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لای من و لەمنەوە دەستی پێ کرد، فەرمووی: ئەی عائیشە، من شتێکت بۆ باس دەکەم بەڵام پەلە مەکە هەتا پرس بە بـاوك و دایکـت دەکـەیت)، عائیشـە فەرمووی: لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا (٢٨) وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا (٢٩))**. سورة الاحزاب: ٢٨ - ٢٩. واتە: ئەی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم! بە ژنەکانت بڵێ: ئەر ئێوە ژین و جوانی ئـەم دنیایـەتان دەوێ دەسـا وەرنـەپێش، بـا مـارەیی و هەندێ شتومەکتان بدەمێ و بـە خـوا پەسـەندانەو جـوانی دەسـتتان لێبـەر بـدەم و بەرێتانکەم، واتە: بێ هیچ ڕەنجە دڵ و گازنـدەو دەردی سـەرییەك، وە ئەگـەر خـواو پەیامبەرەکەیی و، پاداشی دوا ڕۆژتان دەوێ و، ڕازی دەبن بـەو ژیانـەی ئێسـتاتان، ئەوە بەڕاستی خوا بۆ چاکە کارانتان - ئەوانەتان ڕازی دەبن بەم ژیانە- پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووە.

عائیشە فەرمووی: سوێند بە (الله) ئەمزانی باوك و دایکـم فـەرمانم پـێ ناکـەن لێی جیاببمەوە و تەڵاقی لێ وەربگرم، وتم: بۆ ئەمـە پـرس و را بـە بـاوك و دایکـم بکەم، من خواو پێغەمبەرەکەی و ژیانی دواڕۆژوو بەهەشتم دەوێ.

مەعمەر فەرمووی: ئەیوب پێی راگەیانـدم، کـە عائیشـە ڕەزای خـوای لـێ بـێ فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم رای مەگەیەنـە بـە

هاوسەرەکانی ترت من تۆم هەڵبژاردووە، فەرمووی: (خوای گەورە بۆ راگەیاندنی پەیامەکەی منی ناردوە، بۆ ئەوە منی نەناردووە کە ببمە نەگبەتی بۆ خەڵك و دینیان لەسەر قورس و نارەحەت بکەم).

**دەربارەی سورەتی (ن).**

**٦٦ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ ن**

٣٣١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ سُلَيْمٍ، قَالَ: قَدِمْتُ مَكَّةَ فَلَقِيتُ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ فَقُلْتُ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ إِنَّ نَاسًا عِنْدَنَا يَقُولُونَ فِي الْقَدَرِ، فَقَالَ عَطَاءٌ: لَقِيتُ الْوَلِيدَ بْنَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ، فَقَالَ لَهُ: اكْتُبْ، فَجَرَى بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى الأَبَدِ. وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَفِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد قەڵەم بوو، فەرمووی: بنووسە، ئیتر قەڵەم هەرچی دەبێ و رووەدات هەتا هەتایە گشتی تۆمار کرد).

## دەربارەی سورەتی (الحاقة).

## ٦٧ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الحَاقَّةِ

٣٣٢٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي قَيْسٍ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَيْرَةَ، عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ، عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: زَعَمَ أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا فِي البَطْحَاءِ فِي عِصَابَةٍ، وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ فِيهِمْ، إِذْ مَرَّتْ عَلَيْهِمْ سَحَابَةٌ فَنَظَرُوا إِلَيْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا اسْمُ هَذِهِ؟ قَالُوا: نَعَمْ، هَذَا السَّحَابُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَالمزْنُ؟ قَالُوا: وَالمزْنُ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَالعَنَانُ؟ قَالُوا: وَالعَنَانُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ تَدْرُونَ كَمْ بُعْدُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ؟ قَالُوا: لاَ، وَاللَّهِ مَا نَدْرِي، قَالَ: فَإِنَّ بُعْدَ مَا بَيْنَهُمَا إِمَّا وَاحِدَةٌ، وَإِمَّا اثْنَتَانِ، أَوْ ثَلاَثٌ وَسَبْعُونَ سَنَةً، وَالسَّمَاءُ الَّتِي فَوْقَهَا كَذَلِكَ، حَتَّى عَدَّدَهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ كَذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: فَوْقَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ بَحْرٌ بَيْنَ أَعْلاَهُ وَأَسْفَلِهِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى السَّمَاءِ، وَفَوْقَ ذَلِكَ ثَمَانِيَةُ أَوْعَالٍ بَيْنَ أَظْلاَفِهِنَّ وَرُكَبِهِنَّ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، ثُمَّ فَوْقَ ظُهُورِهِنَّ العَرْشُ، بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاَهُ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ، وَاللَّهُ فَوْقَ ذَلِكَ. قَالَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ مَعِينٍ يَقُولُ: أَلاَ يُرِيدُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدٍ أَنْ يَحُجَّ حَتَّى يُسْمَعَ مِنْهُ هَذَا الحَدِيثَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى الوَلِيدُ بْنُ أَبِي ثَوْرٍ، عَنْ سِمَاكٍ، نَحْوَهُ. وَرَفَعَهُ وَرَوَى شَرِيكٌ، عَنْ سِمَاكٍ، بَعْضَ هَذَا الحَدِيثِ وَوَقَفَهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ هُوَ: ابْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدٍ الرَّازِيُّ.

واتە: لە عەباسی كوڕی (عبد المطلب)ەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەو دەشتە لەناو كۆمەڵێ خەڵكدا دانیشتبووم، پێغەمبەری خواش صلی الله علیه

وسلم لەناویاندا دانیشتبوو، پەڵە هەورێ لەسەروویانەوە رابوورد سەیریان کرد، فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەمە ناوی چیە؟) وتیان: بەڵێ، ئەوە هەورە، فەرمووی: (گەواڵەشی پێ دەڵێن) وتیان: بەڵێ، گەواڵەشی پێ دەڵێن، فەرمووی: (پەڵە هەوریشی پێ دەڵێن) وتیان: بەڵێ، پەڵە هەوریشی پێ دەڵێن، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموون: (ئایا دەزانن دووری نێوان ئاسمان و زەوی چەندە؟) وتیان: نا، سوێند بە (الله) نایزانین، فەرمووی: (دووری نێوان ئاسمان و زەوی حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو یا حەفتاو سێ ساڵە، دووری نێوان ئاسمانی یەکەم و ئاسمانی دووەم بە هەمان شێوەیە)، جا هەتا حەوت ئاسمانی لەسەر ئەم شێوەیە ژمارد، لەپاشدا فەرمووی: (لەسەرووی ئاسمانی حەوتەمەوە دەریایەکە دووری نێوان سەروو خواری بەقەد دووری نێوان ئاسمانێکە بۆ ئاسمانێکی تر، لەسەرووی ئەوەشەوە هەشت مەلائیکە هەیە لەسەر شێوەی سابرێنە کێوین بەینی سمیان بۆ ئەژنۆیان هێندەی دووری نێوان ئاسمانێکە بۆ ئاسمانێکی تر، لەسەرووی ئەوەشەوە عەرشە سەروو خواری بەقەد دووری نێوان ئاسمانێکە بۆ ئاسمانێکی تر، خوای گەورەش لەسەرووی ئەوەوەیە واتە لەسەر عەرشە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین).

٣٣٢١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدٍ الرَّازِيُّ وَهُوَ الدَّشْتَكِيُّ، أَنَّ أَبَاهُ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلاً بِبُخَارَى عَلَى بَغْلَةٍ، وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ، يَقُولُ: كَسَانِيهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی سەعدی رازی دەشتەکیەوە، لەباوکیەوە، ئەویش لەباوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێکم دی لە

بوخارا بە سواری ئێسترێکەوە عەمامەیەکی ڕەشی بەسەرەوە بوو ئەیفەرموو: ئەم عەمامە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسری کردووم.

**دەربارەی سورەتی (سَأَلَ سَائِلٌ).**

**٦٨ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ سَأَلَ سَائِلٌ**

٣٣٢٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ أَبِي السَّمْحِ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: (كَالمُهْلِ) قَالَ: كَعَكَرِ الزَّيْتِ، فَإِذَا قَرَّبَهُ إِلَى وَجْهِهِ سَقَطَتْ فَرْوَةُ وَجْهِهِ فِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ رِشْدِينَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی **(كَالْمُهْلِ)** سورة المعارج: ٨. فەرموویەتی: (واتە: وەك خڵتەی زەیت و ڕۆنی داخکراو، کاتێ نزیکی روخساریان دەکرێتەوە هاڵاوەکەی پێستی دەم و چاویان دادەماڵێ و دەکەوێتە ناویەوە).

**دەربارەی سورەتی (الجن).**

**٦٩ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الجِنِّ**

٣٣٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الوَلِيدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الجِنِّ وَلاَ رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي طَائِفَةٍ

مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ، فَقَالُوا: مَا حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلاَّ أَمْرٌ حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ؟ قَالَ: فَانْطَلَقُوا يَضْرِبُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، يَبْتَغُونَ مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، فَانْصَرَفَ أُولَئِكَ النَّفَرُ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِنَخْلَةَ عَامِدًا إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا القُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ، فَقَالُوا: هَذَا وَاللهِ الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. قَالَ: فَهُنَالِكَ رَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا (إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا) فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى نَبِيِّهِ: (قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الجِنِّ) وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الجِنِّ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَوْلُ الجِنِّ لِقَوْمِهِمْ: (لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا) قَالَ: لَمَّا رَأَوْهُ يُصَلِّي وَأَصْحَابُهُ يُصَلُّونَ بِصَلاَتِهِ وَيَسْجُدُونَ بِسُجُودِهِ، قَالَ: تَعَجَّبُوا مِنْ طَوَاعِيَةِ أَصْحَابِهِ لَهُ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ: (لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم قورئانی نەخوێندۆتەوە بەسەر جنۆکەکاندا و نەیشی دیون، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵانی دەرچوو بەرەو بازاڕی (عکاظ) رۆژی کۆبوونەوەی عەرەبەکان بوو لەو شوێنەدا، هەتا عەرەبەکان بانگ بکات بۆ سەر دینی ئیسلام، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە شەیتانەکان رێگەیان لێ گیرابوو سەرکەون بۆ ئاسمانەکان هەواڵ و دەنگ و باس بزانن، ئەو شەیتانانەی ئەو کارەیان بکردایە بڵێسەی ئاگر و بروسکە و چەخماخە

بەرەنگاریان دەبۆوەوە، کە دەگەڕانەوە پێیان دەوتن: ئەوە چیتانە؟ دەیانوت: هەواڵ و دەنگ و باسی ئاسمانمان لێ قەدەغەکراوە، دەیانوت: دەی کارێکی گرنگ روویدابێ، بڕۆن رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی سەر زەوی بگەڕێن بزانن چی رویداوە، ئەوانەی بەرەو مەککە رۆشتن بینیان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە (نخلة) بەرنوێژی نوێژی بەیانی دەکات بۆ هاوەڵانی، گوێ دەگرن لە قورئان خوێندنەکەی، دەڵێن: کەواتە ئەمەیە رێگەی هەواڵ و دەنگ و باسی ئاسمانی لێ قەدەغەکردووین، جا دەگەڕێنەوە بۆ لای قەومەکەیان و دەڵێن: ئەی گەلی ئێمە: فەرمووی:

**(إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا (٢) وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ)** سورة الجن: ٤. واتە: بێگومان ئێمە گوێمانگرت بۆ قورئانێکی سەیروسەمەرە لە رووی هۆنینەوەو، رەوانبێژیی و، خۆشخوانیەوە، واتە: هەقە عەرەبەکانیش پتر تیژ رەوییان کردبا بۆ بڕواهێنان پێی، چونکە بەزمانی ئەوان هاتووە، چاك تێ دەگەن و دەزانن کە چەندە رەوانبێژە.. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەمڕۆو سبەینێ دەکەن! بەڵام جینیەکان هەر ئەو دەمەی کە بیستیان موسڵمان بوون، ئەو قورئانە، هیدایەت و رێنمایی دەکات بۆ رێی ڕاست و هەق، ئێمەش بڕوامان پێهێناو هەرگیز هیچ کەسێك ناکەینە شەریك و هاوبەشیی پەروەردگارمان.

خوای گەورە ئەمەی بۆ دابەزاند پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: **(لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا)**. سورة الجن: ١٩. واتە: وە کاتێ بەندەی خوا (موحەممەد) صلی الله علیه وسلم بۆ خواپەرستیی هەڵساو هەر خوای دەپەرست لە نوێژەکەیدا، جنیەکان خەریك بوو دابارنە سەری لەبەر سوور بوونیان لەسەر بیستنی قورئان.

٣٣٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الجِنُّ يَصْعَدُونَ إِلَى السَّمَاءِ يَسْتَمِعُونَ الوَحْيَ، فَإِذَا سَمِعُوا الكَلِمَةَ زَادُوا فِيهَا تِسْعًا، فَأَمَّا الكَلِمَةُ فَتَكُونُ حَقًّا، وَأَمَّا مَا زَادُوهُ فَيَكُونُ بَاطِلاً، فَلَمَّا بُعِثَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنِعُوا مَقَاعِدَهُمْ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِإِبْلِيسَ، وَلَمْ تَكُنِ النُّجُومُ يُرْمَى بِهَا قَبْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُمْ إِبْلِيسُ: مَا هَذَا إِلاَّ مِنْ أَمْرٍ قَدْ حَدَثَ فِي الأَرْضِ، فَبَعَثَ جُنُودَهُ فَوَجَدُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمًا يُصَلِّي بَيْنَ جَبَلَيْنِ أُرَاهُ قَالَ: بِمَكَّةَ، فَلَقُوهُ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: هَذَا الحَدَثُ الَّذِي حَدَثَ فِي الأَرْضِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جنۆکەکان سەرەکەوتن بۆ ئاسمان بۆئەوەی هەواڵ و دەنگ و باسی وەحی بزانن، کاتێ گوێبیستی وشەیە دەبوون نۆی تریان بۆ زیاد دەکرد، ئەوشەیەی کە بەرگوێیان دەکەوت وشەیەکی هەق و راست بوو بەڵام نۆ وشەکەکانی تر ناهەق و پووچ و بەتاڵ بوون، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رەوانەکرا ئەو شوێنەیان لێ قەدەغەکرا کە لێیەوە سەردەکەوتن بەرەو ئاسمان، ئەوەیان بۆ شەیتان باسکرد، پێشتر ئەستێرەکان بلێسەی ئاگریان تێ نەدەگرتن، شەیتان پێی وتن: بێگومان شتێ روویداوە لە زەویدا، جا شەیتان سەربازەکانی نارد بۆ ئەوەی هەواڵێ بزانن، رۆشتن بینیان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنێوان دوو کێودا نوێژ دەکات، گەڕانەوە و هەواڵەکەیان پێ راگەیاند، وتی: ئەمە ئەو شتەیە کە لە زەویدا روویداوە.

## دەربارەی سورەتی (المدثر).

## ٧٠ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الْمُدَّثِّرِ

٣٣٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الوَحْيِ، فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءَ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ فَجُثِثْتُ مِنْهُ رُعْبًا، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَدَثَّرُونِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ)، إِلَى قَوْلِهِ: (وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ) قَبْلَ أَنْ تُفْرَضَ الصَّلَاةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَيْضًا.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو باسی حاڵی خۆی دەکرد کاتێ وەحی بۆ دەهات چۆن بووە، فەرمووی: (جارێ ڕێم دەکرد لەئاسمانەوە دەنگێکم بیست سەرم بەرزکردەوە، سەیردەکەم مەلائیکەیەکە هاتوە بۆ لام لە ئەشکەوتی حیرا، لەنێوان ئاسمان و زەویدا لەسەر کورسیەك دانیشتووە، لە ترسان لەرزم لێ نیشت، گەڕامەوە بۆ ماڵەوە وتم: دامپۆشن، دامپۆشن، دامپۆشن). خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنْذِرْ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ**). سورة المدثر: ١ - ٥. واتە: ئەی ئەوەی جلکی خەوت بەخۆوە پێچاندووە! ئەی پێغەمبەر! صلی الله علیه وسلم هەستە، لە ناو نوێنەکەت خەڵکی بێباوەڕ بێدار بکەرەوەو بترسێنە لە سزای خوا. وە پەروەردگاری خۆت بە گەورە بگرە، چونکە تەنها ئەو خاوەنی گەورەیی و (کبریا)یە، کەوابوو ڕووی دڵت هەر لەو بکە، ئیتر بێ بڕواکان بڕوا دێنن یان ناهێنن

گرنگ نیە، وە بەرگ و کالآت، خاوێن بکەرەوە، واتە: دڵ و دەروونت، کارو کردارت هەمووی بە خاوێن رابگرە (چونکە موسڵمان دەبێ گرنگی بە دیوی دەرەوەو ناوەوەی بدات)، لە هەموو گوناح و جۆرە کارێکی ناپوخت و نا پەسەند گەڕێ. ئەم ئایەتانە مانایان ئەوە نییە کە خوا نەخواستە رۆژێ پەیامبەر صلی الله علیه لموس لە هێڵ لای دابێت، نەخێر.. بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئوممەتەکەی تەمێ بێ و خۆیشی لەسەر رەوشتە بەرزەکانی بەردەوام بێت.

٣٣٢٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُوسَى، عَنِ ابْنِ لَهِيعَةَ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الصَّعُودُ جَبَلٌ مِنْ نَارٍ يَتَصَعَّدُ فِيهِ الكَافِرُ سَبْعِينَ خَرِيفًا، ثُمَّ يَهْوِي بِهِ كَذَلِكَ أَبَدًا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ. وَقَدْ رُوِيَ شَيْءٌ مِنْ هَذَا عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، مَوْقُوفًا.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (الصَّعُودُ) کێوێکە لەناو ئاگردا کافر بە حەفتا ساڵ سەردەکەوێ هەتا دەگاتە سەرەوە، لەپاشدا بە حەفتا ساڵیش دێتە خوارەوە هەتا هەتایە بەو شێوەیە).

٣٣٢٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ نَاسٌ مِنَ اليَهُودِ لأُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ يَعْلَمُ نَبِيُّكُمْ كَمْ عَدَدُ خَزَنَةِ جَهَنَّمَ؟ قَالُوا: لاَ نَدْرِي حَتَّى نَسْأَلَهُ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، غُلِبَ أَصْحَابُكَ اليَوْمَ. قَالَ: وَبِمَ غُلِبُوا؟ قَالَ: سَأَلَهُمْ يَهُودُ: هَلْ يَعْلَمُ نَبِيُّكُمْ كَمْ عَدَدُ خَزَنَةِ جَهَنَّمَ؟ قَالَ: فَمَا قَالُوا؟ قَالَ: قَالُوا: لاَ نَدْرِي حَتَّى نَسْأَلَ نَبِيَّنَا. قَالَ: أَفَغُلِبَ قَوْمٌ سُئِلُوا عَمَّا لاَ

يَعْلَمُونَ؟ فَقَالُوا: لاَ نَعْلَمُ حَتَّى نَسْأَلَ نَبِيَّنَا، لَكِنَّهُمْ قَدْ سَأَلُوا نَبِيَّهُمْ، فَقَالُوا: أَرِنَا اللَّهَ جَهْرَةً، عَلَيَّ بِأَعْدَاءِ اللهِ، إِنِّي سَائِلُهُمْ عَنْ تُرْبَةِ الجَنَّةِ وَهِيَ الدَّرْمَكُ، فَلَمَّا جَاءُوا قَالُوا: يَا أَبَا القَاسِمِ، كَمْ عَدَدُ خَزَنَةِ جَهَنَّمَ؟ قَالَ: هَكَذَا وَهَكَذَا فِي مَرَّةٍ عَشَرَةٌ، وَفِي مَرَّةٍ تِسْعَةٌ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا تُرْبَةُ الجَنَّةِ؟ قَالَ: فَسَكَتُوا هُنَيْهَةً، ثُمَّ قَالُوا: خُبْزَةٌ يَا أَبَا القَاسِمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الخُبْزُ مِنَ الدَّرْمَكِ. هَذَا حَدِيثٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ مُجَالِدٍ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چەند جولەکەیە بە چەند کەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم، وت: ژمارەی کاربەدەست و دەگاوانەکانی دۆزەخ چەندن؟ وتیان: نازانین هەتا پرسیار لە پێغەمبەرەکەمان صلی الله علیه وسلم نەکەین، پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەمڕۆ هاوەڵانی تۆ بۆڕدران، فەرمووی: (چۆن بۆڕدران؟). وتی: جولەکەکان لێیان پرسین ژمارەی کاربەدەست و دەگاوانەکانی دۆزەخ چەندن؟ وتیان: نازانین هەتا پرسیار لە پێغەمبەرەکەمان صلی الله علیه وسلم نەکەین، فەرمووی: (بۆڕدران چۆن وا دەبێ، کۆمەڵێ پرسیارێکیان لێ بکرێ). ئەوانیش بڵێن: نازانین هەتا پرسیار لە پێغەمبەرەکەمان صلی الله علیه وسلم نەکەین، بەڵام ئەو جولەکانە نەوەی ئەوانەن لە پێغەمبەری خۆیان دەپرسی: بە ئاشکرا خوامان پێ نیشان بدە با بەچاوی خۆمان ببینین، ئەو دوژمنانەی خوام بۆ بێنن، من پرسیاری خاکی بەهەشتیان لێ دەکەم کە ئاردی بێ گەردە)، کاتێ هاتن وتیان: ئەی ئەبا قاسیم! ژمارەی کاربەدەست و دەگاوانەکانی دۆزەخ چەندن؟ فەرمووی: (ئاوا و ئاوا نۆزدە کەسن)، وتیان: بەڵێ وایە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خاکی بەهەشت چیە؟).ماوەیە بێدەنگ بوون، لەپاشدا وتیان: نانە، فەرمووی: (نانی ئاردی بێگەردە).

٣٣٢٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَزَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُهَيْلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ القُطَعِيُّ، وَهُوَ أَخُو حَزْمِ بْنِ أَبِي حَزْمٍ القُطَعِيُّ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ فِي هَذِهِ الآيَةَ: (هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ) قَالَ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا أَهْلٌ أَنْ أُتَّقَى، فَمَنْ اتَّقَانِي فَلَمْ يَجْعَلْ مَعِي إِلَهًا، فَأَنَا أَهْلٌ أَنْ أَغْفِرَ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَسُهَيْلٌ لَيْسَ بِالقَوِيِّ فِي الحَدِيثِ، وَقَدْ تَفَرَّدَ سُهَيْلٌ بِهَذَا الْحَدِيثِ عَنْ ثَابِتٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ)** سورة المدثر: ٥٦. واتە: هەر ئەویشە شیاوی لێ ترسانە، چونکە خاوەنی تۆڵەی سەختە، وە هەر ئەویشە شیاوی لێبوردنە لە تاوان، کەواتە تا زووە وەرن تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوە لەو کارە خراپانەتان.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: من شایستەی ئەوەم هەموو کەس شەرم و شکۆم لێ بکات و لێم بترسێ، ئەوەی لێم بترسێ و هاوبەشم بۆ دانەنێ، ئەوە شایستەی ئەوەیە من لێی خۆش ببم).

## دەربارەی سورەتی (القيامة).

## ٧١ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ القِيَامَةِ

٣٣٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ يُحَرِّكُ بِهِ لِسَانَهُ يُرِيدُ أَنْ يَحْفَظَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ) قَالَ: فَكَانَ يُحَرِّكُ بِهِ شَفَتَيْهِ، وَحَرَّكَ سُفْيَانُ

شَفَتَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَالَ عَلِيٌّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: وَكَانَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ يُحْسِنُ الثَّنَاءَ عَلَى مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ خَيْرًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ وەحی بۆ دەهات زمانی بە قورئان خوێندن زۆر دەجوڵاند دەیویست لەبەری بکات، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ** (١٦) **إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ**). سورة القيامة: ١٦ - ١٧.

واتە: زمانت بە قورئان خوێندن مەجووڵێنە، واتە: پەلە مەکە بۆ لەبەرکردنی، بەڕاستی کۆکردنەوەو لەبەرکردنیی و ئیسپاتی خوێندنەوەی لەسەر زمانت لەسەر ئێمەیە.

٣٣٣٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي شَبَابَةُ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَدْنَى أَهْلِ الجَنَّةِ مَنْزِلَةً لَمَنْ يَنْظُرُ إِلَى جِنَانِهِ وَأَزْوَاجِهِ وَخَدَمِهِ وَسُرُرِهِ مَسِيرَةَ أَلْفِ سَنَةٍ، وَأَكْرَمُهُمْ عَلَى اللهِ مَنْ يَنْظُرُ إِلَى وَجْهِهِ غُدْوَةً وَعَشِيَّةً، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ). هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ إِسْرَائِيلَ، مِثْلَ هَذَا مَرْفُوعًا. وَرَوَى عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبْجَرَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَوْلَهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ. وَرَوَى الأَشْجَعِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَوْلَهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا ذَكَرَ فِيهِ عَنْ مُجَاهِدٍ، غَيْرَ الثَّوْرِيِّ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ الأَشْجَعِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، ثُوَيْرٌ يُكْنَى أَبَا جَهْمٍ، وَأَبُو فَاخِتَةَ اسْمُهُ: سَعِيدُ بْنُ عِلاَقَةَ.

واتە: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نزمترین پایە لە بەهەشتدا پایەی ئەو کەسانەیە کە سەد

هەزار ساڵە ڕێ سەیری باخ و باخات و ژن و کارەکەر و نۆکەر و تەخت و چارپایەی خۆیان دەکەن، ئەو بەهەشتیانەی کە زیاتر بەقەدر و بەڕێزن ئەوانەن کە بەیانیان و ئێواران تەماشای زاتی (الله) دەکەن). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ** (٢٢) **إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ**). سورة القيامة: ٢٢ - ٢٣. واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا دەم و چاوو ڕوخسارگەلێ (واتە: ڕوومەتی باوەڕداران) گەشاوەو پاراوو پرشنگدارەو خۆشیی و شادییان لێ دەبینرێ، بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن.

## دەربارەی سورەتی (عبس).

## ٧٢ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ عَبَسَ

٣٣٣١ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَمَوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: هَذَا مَا عَرَضْنَا عَلَى هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أُنْزِلَ: (عَبَسَ وَتَوَلَّى) فِي ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى، أَتَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَعَلَ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَرْشِدْنِي، وَعِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ مِنْ عُظَمَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْرِضُ عَنْهُ وَيُقْبِلُ عَلَى الآخَرِ، وَيَقُولُ: أَتَرَى بِمَا أَقُولُ بَأْسًا؟ فَيَقُولُ: لاَ، فَفِي هَذَا أُنْزِلَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أُنْزِلَ عَبَسَ وَتَوَلَّى فِي ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (**عَبَسَ وَتَوَلَّى** (١) **أَنْ جَاءَهُ الْأَعْمَى**). سورة عبس: ١ - ٢. واتە: پەیامبەر صلی الله علیه وسلم ڕووی گرژ کردو، ڕووی سوڕاند لەوە کە ئیماندارە نابیناکە هاتە لای.

دەربارەی ئیبنو ئومی مەکتوم دابەزی کە پیاوێکی نابینا بوو، هاتە خزمەت

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: شتێکەم فێربکە، لەوکاتەدا یەکێ لە گەورەکانی قورەیشی لەلابوو دەیویست بانگی بکات بۆ سەر دینی ئیسلام، بۆیە رووی لێ وەرگێڕا، رووی کردە یەکێکی تر فەرمووی: (ئەوەی بۆت باس دەکەم لەباسی یەکتاپەرستی هیچ نارەحەتی و زیانێکی تێدایە؟) وتی: نا، جا بەو هۆیەوە: (عَبَسَ وَتَوَلَّى) دابەزی.

٣٣٣٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفَضْلِ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً، فَقَالَتْ امْرَأَةٌ: أَيُبْصِرُ أَوْ يَرَى بَعْضُنَا عَوْرَةَ بَعْضٍ؟ قَالَ: يَا فُلاَنَةُ (لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَفِيهِ عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژی قیامەتدا بەپێی پەتی و بە رووت و قووتی و خەتەنەنەکراوی حەشر دەکرێن)، ئافرەتێ وتی: شەرمگەی یەکتر دەبینین؟ فەرمووی: (ئەی فلانە کەس: (لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ). سورة عبس: ٣٧. واتە: چونکە هەر کەسێك لێیان سەرگەرمی کارو کێشەی خۆیەتیی و نای پەردەژێتە سەر ئەوی تر.

## دەربارەی سورەتی (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ).

## ٧٣ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ

٣٣٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ العَظِيمِ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ بَحِيرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَهُوَ ابْنُ يَزِيدَ الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ

ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُ رَأْيُ عَيْنٍ فَلْيَقْرَأْ: (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ)، وَ (إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ)، وَ (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی پێیخۆشە کە بە چاوی خۆی بڕوانێتە دیمەنێکی ڕۆژی قیامەت، با سورەتی (تەکویر) و (إنفطار) و (ئینشیقاق) بخوێنێ).

## دەربارەی سورەتی (للمطففين).

### ٧٤ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ

٣٣٣٤ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ عَجْلَانَ، عَنِ الْقَعْقَاعِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ (كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر بەندەیەك کە گوناح دەکات، خێرا خاڵێکی ڕەش بە دڵیەوە دەنووسێ، جا ئەگەر تەوبەی کردو پەشیمان بوویەوە، ئەوا لێی پاك دەبێتەوە، ئەگەرنا، وردە وردە زیاد دەکا تا بەتەواوی دڵی ژەنگ دەگرێت، هەر ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: **(كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ)**. سورة المطففين: ٣٧. واتە: بەڵکو ئەوەی دەیانکرد لە تاوان و گوناە زاڵبووە بەسەر دڵەکانیاندا، بۆیە ڕاست و ناڕاست لە یەك ناکەنەوەو ئایەتەکانمان بە درۆ دەخەنەوە.

٣٣٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ دُرُسْتَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: حَمَّادٌ: هُوَ عِنْدَنَا مَرْفُوعٌ، (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ) قَالَ: يَقُومُونَ فِي الرَّشْحِ إِلَى أَنْصَافِ آذَانِهِمْ.

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە: **(يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ)** سورة المطففين: ٦. واتـە: ئـەو رۆژەی هـەموو خـەڵكی بـە پێـوە دەوەسـتن بـۆ حـوكم و فـەرمانی خواوەنـدی جیهانەكان.

ئیبنو عومەر رەزای خوای لـێ بـێ دەفـەرموێت: ئـەو رۆژە ئەوەنـدە سـەختەو خەجاڵەت هێنەرە، هەر یەكەیان لە نێو ئارەقی خۆیدا تا بنا گوێی ون دەبێ.

٣٣٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ) قَالَ: يَقُومُ أَحَدُهُمْ فِي الرَّشْحِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَفِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

## دەربارەی سورەتی (إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ).

## ٧٥ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ

٣٣٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ هَلَكَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: (فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ)، إِلَى قَوْلِهِ: (يَسِيرًا) قَالَ: ذَلِكِ العَرْضُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسْوَدِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبَانَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کەسێك لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت تیادەچێت و سزاو ئەشکەنجە دەدرێت)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بێگومان خوای گەورە دەفەرموێت: (**فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ (٧) فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا (٨) وَيَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا**). سورة المطففين: ٧ - ٩. واتە: ئەو کەسەی نامەی کردەوەکانی بدرێتە دەستی ڕاستی، ئەوە لێپرسینەوەیەکی سوك و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت، وە بە دڵخۆشیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو کەس و کاری. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: بێگومان ئەوە خستنەڕووی کردەوەکانە).

٣٣٣٨ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ الهَمَذَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کەسێك لێپرسینەوەی لەگەڵ سزاو ئەشکەنجە دەدرێت).

**دەربارەی سورەتی (البروج).**

## ٧٦ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الْبُرُوجِ

٣٣٣٩ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، وَعُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْيَوْمُ الْمَوْعُودُ يَوْمُ القِيَامَةِ، وَاليَوْمُ الْمَشْهُودُ يَوْمُ عَرَفَةَ، وَالشَّاهِدُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، وَمَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَلاَ غَرَبَتْ عَلَى يَوْمٍ أَفْضَلَ مِنْهُ، فِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُؤْمِنٌ يَدْعُو اللَّهَ بِخَيْرٍ إِلاَّ اسْتَجَابَ اللَّهُ لَهُ، وَلاَ يَسْتَعِيذُ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَعَاذَهُ اللَّهُ مِنْهُ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا قُرَّانُ بْنُ تَمَّامٍ الأَسَدِيُّ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَمُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ الرَّبَذِيُّ يُكْنَى أَبَا عَبْدِ العَزِيزِ، وَقَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ وَغَيْرُهُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، وَمُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ يُضَعَّفُ فِي الْحَدِيثِ. ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ وَغَيْرُهُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (( **(وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ، وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ)** سورة البروج: ٢- ٣. **(الْيَوْمِ الْمَوْعُودِ)** واتە: رۆژی قیامەت، **(الْيَوْمِ الْمَشْهُودِ)** واتە: رۆژی عەرەفە، (شَاهِدٍ) واتە: رۆژی هەینی)، فەرمووی: (خۆر لەسەر هیچ رۆژێ هەڵنایەت و ئاوا نابێ چاکتر بێ لە رۆژی هەینی چونکە ساتێکی تێدایە هەر باوەردارێ لەو کاتەدا داوای خێر لەخوای گەورە بکات ئیللا خوا وەڵامی دەداتەوە و دوعاکەی گیرا دەکات، پەنا بگرێت بە خوا لە هەر شتێ خوا پەنای دەدات و ئەو شتەی لێ دوور دەخاتەوە).

٣٣٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ صُهَيْبٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى الْعَصْرَ هَمَسَ، وَالْهَمْسُ فِي قَوْلِ بَعْضِهِمْ تَحَرُّكُ شَفَتَيْهِ كَأَنَّهُ يَتَكَلَّمُ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّكَ يَا رَسُولَ اللهِ إِذَا صَلَّيْتَ الْعَصْرَ هَمَسْتَ؟ قَالَ: إِنَّ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ كَانَ أُعْجِبَ بِأُمَّتِهِ فَقَالَ: مَنْ يَقُومُ لِهَؤُلاَءِ؟ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَنْ خَيِّرْهُمْ بَيْنَ أَنْ أَنْتَقِمَ مِنْهُمْ وَبَيْنَ أَنْ أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوَّهُمْ، فَاخْتَارُوا النِّقْمَةَ، فَسَلَّطَ عَلَيْهِمُ الْمَوْتَ، فَمَاتَ مِنْهُمْ فِي يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفًا. - قَالَ: وَكَانَ إِذَا حَدَّثَ بِهَذَا الْحَدِيثِ حَدَّثَ بِهَذَا الْحَدِيثِ الآخَرِ، قَالَ: كَانَ مَلِكٌ مِنَ الْمُلُوكِ، وَكَانَ لِذَلِكَ الْمَلِكِ كَاهِنٌ يَكْهَنُ لَهُ، فَقَالَ الْكَاهِنُ: انْظُرُوا لِي غُلاَمًا فَهِمًا، أَوْ قَالَ: فَطِنًا، لَقِنًا، فَأُعَلِّمَهُ عِلْمِي هَذَا، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ أَمُوتَ فَيَنْقَطِعَ مِنْكُمْ هَذَا الْعِلْمُ، وَلاَ يَكُونَ فِيكُمْ مَنْ يَعْلَمُهُ. قَالَ: فَنَظَرُوا لَهُ عَلَى مَا وَصَفَ، فَأَمَرُوهُ أَنْ يَحْضُرَ ذَلِكَ الْكَاهِنَ، وَأَنْ يَخْتَلِفَ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ يَخْتَلِفُ، إِلَيْهِ وَكَانَ عَلَى طَرِيقِ الْغُلاَمِ رَاهِبٌ فِي صَوْمَعَةٍ، قَالَ مَعْمَرٌ: أَحْسِبُ أَنَّ أَصْحَابَ الصَّوَامِعِ كَانُوا يَوْمَئِذٍ مُسْلِمِينَ، قَالَ: فَجَعَلَ الْغُلاَمُ يَسْأَلُ ذَلِكَ الرَّاهِبَ كُلَّمَا مَرَّ بِهِ، فَلَمْ يَزَلْ بِهِ حَتَّى أَخْبَرَهُ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَعْبُدُ اللَّهَ. قَالَ: فَجَعَلَ الْغُلاَمُ يَمْكُثُ عِنْدَ الرَّاهِبِ وَيُبْطِئُ عَنِ الْكَاهِنِ، فَأَرْسَلَ الْكَاهِنُ إِلَى أَهْلِ الْغُلاَمِ إِنَّهُ لاَ يَكَادُ يَحْضُرُنِي، فَأَخْبَرَ الْغُلاَمُ الرَّاهِبَ بِذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: إِذَا قَالَ لَكَ الْكَاهِنُ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَقُلْ: عِنْدَ أَهْلِي، وَإِذَا قَالَ لَكَ أَهْلُكَ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّكَ كُنْتَ عِنْدَ الْكَاهِنِ. قَالَ: فَبَيْنَمَا الْغُلاَمُ عَلَى ذَلِكَ إِذْ مَرَّ بِجَمَاعَةٍ مِنَ النَّاسِ كَثِيرٍ قَدْ حَبَسَتْهُمْ دَابَّةٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ تِلْكَ الدَّابَّةَ كَانَتْ أَسَدًا. قَالَ: فَأَخَذَ الْغُلاَمُ حَجَرًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مَا يَقُولُ الرَّاهِبُ حَقًّا فَأَسْأَلُكَ أَنْ أَقْتُلَهَا. قَالَ: ثُمَّ رَمَى فَقَتَلَ الدَّابَّةَ. فَقَالَ النَّاسُ: مَنْ قَتَلَهَا؟ قَالُوا: الْغُلاَمُ، فَفَزِعَ النَّاسُ وَقَالُوا: لَقَدْ عَلِمَ هَذَا الْغُلاَمُ عِلْمًا لَمْ

يَعْلَمْهُ أَحَدٌ. قَالَ: فَسَمِعَ بِهِ أَعْمَى، فَقَالَ لَهُ: إِنْ أَنْتَ رَدَدْتَ بَصَرِي فَلَكَ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: لاَ أُرِيدُ مِنْكَ هَذَا، وَلَكِنْ أَرَأَيْتَ إِنْ رَجَعَ إِلَيْكَ بَصَرُكَ، أَتُؤْمِنُ بِالَّذِي رَدَّهُ عَلَيْكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ فَرَدَّ عَلَيْهِ بَصَرَهُ، فَآمَنَ الأَعْمَى، فَبَلَغَ الْمَلِكَ أَمْرُهُمْ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ، فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَالَ: لأَقْتُلَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْكُمْ قِتْلَةً لاَ أَقْتُلُ بِهَا صَاحِبَهُ، فَأَمَرَ بِالرَّاهِبِ وَالرَّجُلِ الَّذِي كَانَ أَعْمَى فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ عَلَى مَفْرِقِ أَحَدِهِمَا فَقَتَلَهُ، وَقَتَلَ الآخَرَ بِقِتْلَةٍ أُخْرَى. ثُمَّ أَمَرَ بِالغُلاَمِ، فَقَالَ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا فَأَلْقُوهُ مِنْ رَأْسِهِ، فَانْطَلَقُوا بِهِ إِلَى ذَلِكَ الجَبَلِ، فَلَمَّا انْتَهَوْا إِلَى ذَلِكَ الْمَكَانِ الَّذِي أَرَادُوا أَنْ يُلْقُوهُ مِنْهُ جَعَلُوا يَتَهَافَتُونَ مِنْ ذَلِكَ الجَبَلِ وَيَتَرَدَّوْنَ، حَتَّى لَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلاَّ الغُلاَمُ. قَالَ: ثُمَّ رَجَعَ، فَأَمَرَ بِهِ الْمَلِكُ أَنْ يَنْطَلِقُوا بِهِ إِلَى البَحْرِ فَيُلْقُونَهُ فِيهِ، فَانْطُلِقَ بِهِ إِلَى البَحْرِ، فَغَرَّقَ اللَّهُ الَّذِينَ كَانُوا مَعَهُ وَأَنْجَاهُ، فَقَالَ الغُلاَمُ لِلْمَلِكِ: إِنَّكَ لاَ تَقْتُلُنِي حَتَّى تَصْلُبَنِي وَتَرْمِيَنِي وَتَقُولَ إِذَا رَمَيْتَنِي: بِسْمِ اللهِ رَبِّ هَذَا الغُلاَمِ. قَالَ فَأَمَرَ بِهِ، فَصُلِبَ، ثُمَّ رَمَاهُ، فَقَالَ: بِسْمِ اللهِ رَبِّ هَذَا الغُلاَمِ. قَالَ: فَوَضَعَ الغُلاَمُ يَدَهُ عَلَى صُدْغِهِ حِينَ رُمِيَ، ثُمَّ مَاتَ، فَقَالَ أُنَاسٌ: لَقَدْ عَلِمَ هَذَا الغُلاَمُ عِلْمًا مَا عَلِمَهُ أَحَدٌ، فَإِنَّا نُؤْمِنُ بِرَبِّ هَذَا الغُلاَمِ. قَالَ: فَقِيلَ لِلْمَلِكِ أَجَزِعْتَ أَنْ خَالَفَكَ ثَلاَثَةٌ، فَهَذَا العَالَمُ كُلُّهُمْ قَدْ خَالَفُوكَ. قَالَ: فَخَدَّ أُخْدُودًا ثُمَّ أَلْقَى فِيهَا الحَطَبَ وَالنَّارَ، ثُمَّ جَمَعَ النَّاسَ. فَقَالَ: مَنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ تَرَكْنَاهُ، وَمَنْ لَمْ يَرْجِعْ أَلْقَيْنَاهُ فِي هَذِهِ النَّارِ، فَجَعَلَ يُلْقِيهِمْ فِي تِلْكَ الأُخْدُودِ. قَالَ: يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِيهِ: (قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ النَّارِ ذَاتِ الوَقُودِ) حَتَّى بَلَغَ (العَزِيزِ الحَمِيدِ) قَالَ: فَأَمَّا الغُلاَمُ فَإِنَّهُ دُفِنَ قَالَ: فَيُذْكَرُ أَنَّهُ أُخْرِجَ فِي زَمَنِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ وَإِصْبَعُهُ عَلَى صُدْغِهِ كَمَا وَضَعَهَا حِينَ قُتِلَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە صوهەیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی عەسری دەکرد لێوی دەجولاند وەك

ئەوەی قسەیە بکات، پێی وترا: بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! کاتێ نوێژی عەسرت کرد لێوت دەجولاند، فەرمووی: (پەیامبەرێ لە پەیامبەران سەری سوڕما لەزۆری گەلەکەی، فەرمووی: کێ کاروباری ئەمانە بەڕێوە ببات؟ خوای گەورە وەحی بۆ نارد بێگومان چاکترینیان سەرپشك بن لەنێوان ئەم دوو حاڵەتەدا و یەکێکیان هەڵبژێرن: تۆڵەیان لێ بسەنرێت، یان دوژمن زاڵ بێ بەسەریندا، ئنیش سزاو تۆڵەیان هەڵبژارد، مردنی الێ کرد بە سەریاندا، لەرۆژێکدا حەفتا هەزاریان لێ مرد).

فەرمووی: پادشایە لە پادشاکان جادوگەرێکی هەبوو، رۆژێ جادوگەرەکە بە پادشای وت: من پیر بووم دەترسم بمرم بۆیە منداڵێکی ئاقڵ و تێگەیشتووم بۆ بنێرە با فێری زانستی جادوگەری بکەم لەدوای من ئەو زانستە بەردەوام بێ و ئەم کارەتان بۆ بکات، ئەویش کوڕێکی ئاقڵ و تێگەیشتووی لەو شێوەیەی بۆ پەیدا کرد، هەموو رۆژێ کوڕەکە دەڕۆیشت بۆ دێرەکە بۆ لای جادوگەرەکە بۆ ئەوەی فێری زانستی جادوگەری ببێ، لەسەر رێگاکەی (راهیب)خواناسێ هەبوو لای دەدا بۆ لای ئەویش و گوێی لەقسەی ئەویش دەگرت و قسەکانی بەدڵ بوو، بەڵام کە دەچوو بۆ لای جادوگەرەکە لەسەر ئەوە لێی دەدا، سکاڵای خۆی لای خواناسەکە کرد، ئەویش پێی وت: ئەگەر جادوگەرەکە پێی وتی: لەکوێ بووی بۆ دواکەوتی؟ بڵێ لەماڵەوە دواکەوتم، ئەگەر لەماڵەوە پێیان وتی: لەکوێ بووی بۆ دواکەوتی؟ بڵێ لەلای جادوگەرەکە دواکەوتم، ماوەیە بەو شێوەیە کاری بەڕێ کرد، رۆژێ دای بەلای کۆمەڵێ خەڵکدا دەعبایە رێگەی لێ گرتبوون، هەندێ وتیان: شێر بووە، بەردێکی هەڵگرت وتی: خودایە ئەگەر پیاوە خواناسەکە راست دەکات ئەوە بەم بەردە بیکوژە، بەردەکەی پێدا کێشاو کوشتی، خەڵکەکە وتیان: کێ کوشتی؟ وتیان: کوڕەکە، جا خەڵکەکە ترسان وتیان: ئەم کوڕە زانستێ دەزانێ هیچ کەس

نایزانێ، فەرمووی: كوێرێ دەنگ و باسی كورەكەی بیست، پێی وت: ئەگەر چاوەكانم بۆ بگێڕیتەوە ئەوەند و ئەوەندەت دەدەمێ، ئەویش پێی وت: ئەوەم ناوێ لێت، ئەگەر چاوەكانت بۆ گەڕانەوە باوەڕ دێنی بەوەی بۆی گەڕاندویتەوە؟ وتی: بەڵێ، كوڕەكە بۆی پاڕایەوە لەخوا چاوەكانی بۆ گەڕایەوە، كوێرەكە باوەڕی هێنا، بەسەرهاتەكەیان گەیشتە پاشا، پاشا ناردی بەدوایاندا، كوڕەكە و خواناسەكە و كوێرەكەیان هێنا، پاشا وتی: هەریەكێكتان بەشێوەیە دەكوژم پەشیمان نەبنەوە، فەرمانی دا بە كوشتنی خواناسەكە و كوێرەكە یەكێكیانیان بە مشار كرد بەدوو كەرتەوە، ئەوی تریشیان بە شێوەیەكی تر كوشت، لەپاشدا فەرمانی دا بە كوشتنی كوڕەكە، وتی: بیبەن بۆ سەر لوتكەی فلانە كێو بەسەردا هەڵی بدەنە خوارەوە، بردیان بۆ سەر لوتكەی كێوەكە جگە لە كوڕەكە هەر هەموویان یەك بەیەك كەوتنەخوارەوە، فەرمووی: لەپاشدا كوڕەكە گەڕایەوە بۆ لای پاشا، پاشا فەرمانی دا كە بیبەن فڕێی بدەنە ناو دەریاوە، كۆمەڵێ لەدەست و پێوەندەكانی بردیان بۆ ناو دەریا، خوای گەورە هەر هەموویانی نقوم كرد و خنكان كوڕەكە رزگاری بوو، گەڕایەوە بۆ لای پاشا پێی وت: تۆ ناتوانی من بكوژی هەتا هەڵم نەواسی بە دارا و تیربارانم نەكەی و نەڵێی بەناوی خوای پەروەردگاری ئەم كورەوە، فەرمووی: پاشا فەرمانی دا كوڕەكەیان هەڵواسی وتی: بەناوی خوای پەروەردگاری ئەم كورەوە، جا تیربارانی كرد، لەوكاتەدا كوڕەكە دەستی نابووە سەر لایەكی رومەتی، لەپاشدا مرد، خەڵكەكە وتیان: ئەم كوڕە زانستێ فێربووە هیچ كەس نایزانێ، ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری ئەم كوڕە، وترا بە پاشا: تۆ لە سێ كەس دەترسای بەربەرەكانێی تۆ بكەن و پێچەوانەت بجوڵێنەوە، ئێستا ئەوەتا سەرجەم خەڵكەكە باوەڕیان هێناوە بە پەروەردگاری ئەم كوڕە و بەربەرەكانێی تۆ دەكەن و پێچەوانەت دەجوڵێنەوە، پاشا وتی: خەندەك لێ بدەن، خەندەكی زۆریان لێ داو پڕیان كرد لە دار و ئاگریان تێ بەردان، لەپاشدا خەڵكەكەیان كۆكردەوە، وتی: هەركەس

گەڕایەوە وازی لێ دێنین، هەرکەسیش نەگەڕایەوە دەیخەنە ناو ئاگرەوە، جا خستنیانە ناو ئەو خەندەکانەوە، فەرمووی: خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ (٤) النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ (٥) إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ (٦) وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ (٧) وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ). سورة البروج: ٤ – ٨. واتە: بە کوشت چن خاوەنانی لەغەمەکانی ئاگری بە سووتك، دەرەنجام خاوەن لەغەمەکان ئەوانەی بڕیاری ئەو لەغەمەیان دا نەفرینکران، ئەوەبوو خوای گەورە تۆڵەی لێسەندن، کاتێ دانیشتبوون لەسەر لێواری لەغەمەکان، کەیفیان ئەکرد بە سووتاندنی موسڵمانەکان، وە ئەوان لەسەر ئەوەی دەیانکرد بە بڕوادارەکان ئامادەبوون، مەبەست لەم داستانە وشیارکردنەوەی (قورەیش)ـە، کە ئەگەر ئەوانیش دەست لە ئەشکەنجەی موسڵمانەکان هەڵنەگرن خوا لە میهرەبانی خۆی بێ بەشیان دەکات و ئەیان فەوتێنێ، لەملایشەوە دڵدانەوەی موسڵمانەکانە، عەیبیان لێنەدۆزی بوونەوەو هیچ شتێکیان پێناخۆش نەبوو لێیان، ئەوە نەبێت کە باوەڕیان هێنابوو بە خوای دەسەڵاتداری سوپاسکراو.

### دەربارەی سورەتی (الغاشیة).

### ٧٧ – بَاب وَمِنْ سُورَةِ الغَاشِيَةِ

٣٣٤١ – (صحيح متواتر) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ، ثُمَّ قَرَأَ: (إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (من فەرمانم پێكراوە لەگەڵ خەڵكدا بجەنگم دەڵێن: (لا إله إلا الله)، ئەگەر وتیان ئەوە خوێن و ماڵیان دەپارێزن لێم بەحەقی ئیسلام نەبێت، دوای ئەوە لێپرسینەوەیان لەلای خوایە). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ لَسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ). سورة الغاشية: ٢١ - ٢٢. واتە: ئینجا تۆیش ئەی موحەممەد! صلی الله علیه وسلم ئامۆژگارییان بكەو ئەم شتانەیان بخەرەوە یاد، ئیتر گوێت لێ نەبێت، ئەبیسن، یان نابیسن، چونكە تۆ لەم كاتەدا هەر ئامۆژگاریكارێكی بۆیان، هیچ دەسەڵاتێكت نیە بەسەریانا تا بتوانی بە زۆر بڕوایان پێ بێنیت، یان كوشتاریان لەگەڵ بكەیت.

### دەربارەی سورەتی (الفجر).

### ٧٨ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الفَجْرِ

٣٣٤٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، وَأَبُو دَاوُدَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ عِصَامٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَهْلِ البَصْرَةِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ الشَّفْعِ وَالوَتْرِ، فَقَالَ: هِيَ الصَّلاَةُ بَعْضُهَا شَفْعٌ وَبَعْضُهَا وِتْرٌ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ قَتَادَةَ. وَقَدْ رَوَاهُ خَالِدُ بْنُ قَيْسٍ أَيْضًا، عَنْ قَتَادَةَ.

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم پرسی دەربارەی مانای: (الشَّفْعِ) و (الْوَتْرِ). كە لەم ئایەتەدا هاتوون: (وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ). سورة الفجر: ٣. ئەویش فەرمووی: (مەبست نوێژەكانە ژمارەی ركاتەكانی جووتە یان تاكە، (الشَّفْعِ) واتە: جوت، (الْوَتْرِ)یش واتە: تاك).

دەربارەی سورەتی (وَالشَّمسِ وَضُحَاهَا).

٧٩ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا

٣٣٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الْهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَمْعَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا يَذْكُرُ النَّاقَةَ وَالَّذِي عَقَرَهَا فَقَالَ: (إِذْ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا) انْبَعَثَ لَهَا رَجُلٌ عَارِمٌ عَزِيزٌ مَنِيعٌ فِي رَهْطِهِ مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَذْكُرُ النِّسَاءَ فَقَالَ: إِلاَمَ يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ، فَيَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ وَلَعَلَّهُ أَنْ يُضَاجِعَهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ قَالَ: ثُمَّ وَعَظَهُمْ فِي ضَحِكِهِمْ مِنَ الضَّرْطَةِ فَقَالَ: إِلاَمَ يَضْحَكُ أَحَدُكُمْ مِمَّا يَفْعَلُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە (عبـد الله)ی كـوڕی زەمعــەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموويەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم بـوو باسـی وشترەكە و ئەو كەسەی دەكرد كە كوشتی فەرمووی: **(إِذْ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا)** سورة الشمس: ١٢. واتە: ئەو دەمە كە بە پەلە نەگبـەتترینیان (قـەداری كـوڕی سـالیف) هەسـتایە سەر پێ بۆ كوشتنی وشترەكە.

فەرمووی: (ئەو پیاوە نەگبەتە وشتركەی صـالح پێغەمبـەری كوشـت، پیـاوێكی خاوەن دەسەڵات و بەهێز بوو لەناو هۆزەكەیدا، كەسوكارێكی زۆری هـەبوو پشـتیان دەگرت وەك ئەبو زەمعە)، لەپاشدا بـۆ خـۆم گـوێم لـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم بـوو باسـی ئافرەتـانی دەكـرد، فـەرمووی: (ئـەوە چـۆن كارێكـە كەسـێ لـەئێوە بـەڕۆژدا وەك بەنـدە داركـاری ژنەكـەی دەكـات، دوور نیـە لـەكۆتایی ئـەو ڕۆژەشدا لەتەكی جووت ببێ)، جا لەبارەی ئەوەوە كە بـە تـڕی یـەكتر پـێ دەكـەنین ئامۆژگاری كردن و فەرمووی: (ئەوە بۆ چی بەشتێ پێدەكەنن لەكاتێكدا لەخۆشتان ڕوودەدات).

دەربارەی سورەتی (وَالَّيْلِ إِذَا يَغْشَى).

## ٨٠ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى

٣٣٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ بْنُ قُدَامَةَ، عَنْ مَنْصُورِ بْنِ الْمُعْتَمِرِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ: قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي الْبَقِيعِ، فَأَتَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَلَسَ وَجَلَسْنَا مَعَهُ وَمَعَهُ عُودٌ يَنْكُتُ بِهِ فِي الأَرْضِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ: مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلاَّ قَدْ كُتِبَ مَدْخَلُهَا، فَقَالَ الْقَوْمُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلاَ نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ، فَهُوَ يَعْمَلُ لِلسَّعَادَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ، فَإِنَّهُ يَعْمَلُ لِلشَّقَاءِ؟ قَالَ: بَلْ اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَإِنَّهُ مُيَسَّرٌ لِعَمَلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَإِنَّهُ مُيَسَّرٌ لِعَمَلِ الشَّقَاءِ، ثُمَّ قَرَأَ: (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبو طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە مەدینە لەگۆڕستانی بەقیع لەگەڵ تەرمێکدابووین پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لەوێ ئامادەبوو، هات لەلامان دانیشت داردەستێکی بەدەستەوە بوو، بە بێ دەنگی کەم کەم داردەستەکەی دەخشاند لە زەوی — وەك ئەوەی بیر لەشتێکی گرنگ بکاتەوە -، لەپاشدا سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: (یەك بە یەکتان، یەك بە یەکی روحە دروستکراوەکان، ئیللا خوای گەورە جێگەی ئەوی لە بەهەشت یان لەدۆزەخ دا نوسیوە، ئیللا نوسراوە کە بەدبەختە یان بەختەوەرە). خەڵکەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە

وسلم، جا کەوایە بۆ پشت نەبەستین بەو نوسراوەمان و پاڵی لێ نەدەینەوەو واز لەکاروکردەوەی چاکە نەهێنین، ئەوەی بەختەوەر بێ ئەوە بەختەوەرەو، ئەوەشی بەدبەخت بێ ئەوە بەدبەختەو لە ئەزەلدا بۆیان نوسراوە؟ فەرمووی: (هەوڵ بدەن و با کردەوەتان هەبێت، هەموو کەسێ بۆچی دروستکراوە بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەچێت و بۆی ئاسان دەبێت، بەختیار ڕێگەی چاکەو بەختەوەری دەگرێ و، بەدبەختیش ڕێگەی خراپەو بەدبەختی دەگرێ). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى)**. سورة الليل: ٥ - ١٠. واتە: ئینجا ئەوەی ماڵ و سامانی خۆی لە بەر خوا بەخشیی و لە نافەرمانی خوا خۆی پاراست و بڕوای بە پاداشتی چاکتر کرد، ئەوا ئێمەش بێگومان بۆ بەهەشت و بۆ کاری ئاسان و چاك، ئامادەو ڕێنوێنیی دەکەین و، دەیخەینە سەر ڕاستە ڕێ، وە ئەوەش چرووکی کردو خۆی بێ نیاز گرت و بڕواشی بە پاداشی چاکتر نەکرد لە لای خوا، ئەوا ئێمەش کار ئاسانی بۆ دەکەین، بۆ دژوارترین ڕێگە.

## دەربارەی سورەتی (وَالضُّحَى).

### ٨١ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ وَالضُّحَى

٣٣٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ جُنْدَبٍ البَجَلِيِّ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَارٍ، فَدَمِيَتْ إِصْبَعُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ وَفِي سَبِيلِ اللهِ مَا لَقِيتِ

قَالَ: وَأَبْطَأَ عَلَيْهِ جِبْرِيلُ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: قَدْ وُدِّعَ مُحَمَّدٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ.

واتە: لە جوندەبی بەجەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ لە ئەشکەوتێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بووم، پەنجەیەکی برینداربوو خوێنی لێهات، فەرمووی: (تۆ پەنجەیەکی لەڕێی خوا خوێنت لێهات). ڕاوی فەرمووی: جبریل بۆ ماوەیەك لە هێنانی وەحی دوا کەوت، ئینجا موشریکەکان وتیان: دیارە خوا دەست بەرداری موحەممەد بووە! ئەوجا خوای باڵا دەست ئەم سوورەتەی دابەزاند: **(مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى)**. سورة الضحى: ٣. واتە: بەوانە سوێند، لەوکاتەوە پەروەردگارت هەڵی بژاردوویت دەستبەردارت نەبووەو نەیبووغزاندوویت ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم!.

## دەربارەی سورەتی (أَلَمْ نَشْرَحْ).

## ٨٢ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ أَلَمْ نَشْرَحْ

٣٣٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ، رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا عِنْدَ الْبَيْتِ بَيْنَ النَّائِمِ وَالْيَقْظَانِ، إِذْ سَمِعْتُ قَائِلاً يَقُولُ: أَحَدٌ بَيْنَ الثَّلاَثَةِ، فَأُتِيتُ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ فِيهَا مَاءُ زَمْزَمَ، فَشَرَحَ صَدْرِي إِلَى كَذَا وَكَذَا، قَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: مَا يَعْنِي؟، قَالَ: إِلَى أَسْفَلِ بَطْنِي، فَاسْتُخْرِجَ قَلْبِي، فَغُسِلَ قَلْبِي بِمَاءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ أُعِيدَ

مَكَانَهُ، ثُمَّ حُشِيَ إِيمَانًا وَحِكْمَةً وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ، وَهَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ وَفِيهِ عَنْ أَبِي ذَرٍّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ، لە مالیکی کوڕی صەعصەعەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جارێ لە کەعبە لە بەینی حەمزەی مامم و جەعفەری ئامۆزامدا ڕاکشابووم، لەنێوان خەوتوو بێداریدا بووم، گوێم لێ بوو یەکێ وتی: لەو سیانە یەکێکیانە، تەشتێکی ئاڵوتنیان هێنا، ئاوی زەمزەمی تێدا بوو، لەوێوە بۆ ئەوێ سنگیان هەڵدڕیم). قەتادە وتی: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ڕەزای خوای لێ بێ وت: یانی چی؟ فەرمووی: (هەتا بەشی خوارەوەی سکمیان هەڵدڕی، دڵمیان دەرهێنا، بە ئاوی زەمزەم شۆردیان، لەپاشدا خستیانەوە شوێنی خۆی، ئینجا پڕیان کرد لە ئیمان و زانست و حیکمەت و دانایی).

## دەربارەی سورەتی (والتِّين).

## ٨٣ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ والتِّينِ

٣٣٤٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً بَدَوِيًّا أَعْرَابِيًّا، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَرْوِيهِ يَقُولُ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ: وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ فَقَرَأَ: (أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الحَاكِمِينَ) فَلْيَقُلْ: بَلَى وَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينَ. هَذَا حَدِيثٌ إِنَّمَا يُرْوَى بِهَذَا الْإِسْنَادِ عَنْ هَذَا الأَعْرَابِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَلاَ يُسَمَّى.

واتە: ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێت: هەرکەس سورەتی: (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ) سورة التين: ١. واتە: سوێند بە داری هەنجیرو زەیتوون، یان

بەو جێگایەی کە هەنجیرو زەیتوونی تیا سەوز دەبێ، واتە: شاری قودسی پیرۆز جێگای لە دایکبوونی عیسا سەلامی خوای لەسەربێ.

خوێندو گەیشتە کۆتا ئایەتی: (أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ) سورة التين: ٣. واتە: ئایا خوا لە هەموو داوەرەکان داوەرتر نیە؟! بەڵێ لە هەموو داوەرێك داوەرترو دادپەروەر ترە، چونکە ئادەمزاد بۆ ئەوە دروستکراوە ژیریی خۆی بخاتە گەڕ بۆ دۆزینەوەی خوا، جا کاتێ ئەو خۆی گێل و کوێر کرد، ئەوا ئیتر ڕەوایە پەستترین پلەی بدرێتێ و ببرێتە ریزی پەستترین گیاندارەکانیشەوەو بشنێردرێ بۆ دۆزەخ.

دەبێ بڵێ: بەڵێ من شایەتی دەدەم لەسەر ئەوە کە خوای گەورە لە هەموو داوەرێك داوەرترو دادپەروەر ترە.

## دەربارەی سورەتی (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ).

## ٨٤ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ

٣٣٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ الكَرِيمِ الجَزَرِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: (سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ، لَئِنْ رَأَيْتُ مُحَمَّدًا يُصَلِّي لأَطَأَنَّ عَلَى عُنُقِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ فَعَلَ لأَخَذَتْهُ الْمَلاَئِكَةُ عِيَانًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە: (سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) سورة العلق: ٨. واتە: جا با ئەوکاتە هاوەڵ و هاوڕێ و هاو دانیشتووەکانی بانگ بکاو هاواریان بۆ ببات، بەڵکو نەهێڵن.

ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: ئەبو جەهل وتی: ئەگەر

موحەممەدم دی نوێژ بکات پێ دەخەمە سەر ریسی ملی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر ئەو کارەی بکردایە مەلائیکە بە ئاشکرا پەل پەلیان دەکردوو پارچە پارچە دەیانفڕاند).

٣٣٤٩ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فَجَاءَ أَبُو جَهْلٍ فَقَالَ: أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَزَبَرَهُ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: إِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا بِهَا نَادٍ أَكْثَرُ مِنِّي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَاللَّهِ لَوْ دَعَا نَادِيَهُ لأَخَذَتْهُ زَبَانِيَةُ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَفِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لای مەقام نوێژی دەکرد، ئەبو جەهل هات وتی: ئەوە چەند جارم پێ وتی ئەمە مەکە؟ ئەوە چەند جارم پێ وتی ئەمە مەکە؟ ئەوە چەند جارم پێ وتی ئەمە مەکە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێی تووڕە بوو سەلامی دایەوە و رۆشت، ئەبو جەهل وتی: خۆت چاك دەزانی لەم شارەدا کەس نیە وەك من نادی و دیوەخانی پڕ بێ لە خەڵك و یار و یاوەر، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: **(فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ (١٧) سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ)** سورة العلق: ٧ - ٨.
واتە: جا با ئەوکاتە هاوەڵ و هاوڕێ و هاو دانیشتووەکانی بانگ بکاو هاواریان بۆ ببات، بەڵکو نەهێڵن، بە تەئکید ئێمەش دەرگاوانەکانی دۆزەخی بۆ بانگ دەکەین تا بیگرن، کە بەڕاستیی کۆمەڵێکی زەبر بەدەستن. (ئیبنو عەباس) فەرمووی: ئەگەر هاواری بۆ بردبان، دەستبەجێ فریشتەی سزا دەیگرت و تیا دەچوو.

## دەربارەی سورەتی (لَيْلَةِ الْقَدْرِ).

## ٨٥ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ

٣٣٥٠ - (ضعيف الإسناد مضطرب، ومتنه منكر) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ بْنُ الفَضْلِ الحُدَّانِيُّ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: قَامَ رَجُلٌ إِلَى الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ، بَعْدَ مَا بَايَعَ مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ: سَوَّدْتَ وُجُوهَ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ يَا مُسَوِّدَ وُجُوهِ الْمُؤْمِنِينَ فَقَالَ: لاَ تُؤَنِّبْنِي رَحِمَكَ اللَّهُ، فَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرِيَ بَنِي أُمَيَّةَ عَلَى مِنْبَرِهِ فَسَاءَهُ ذَلِكَ، فَنَزَلَتْ: (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الكَوْثَرَ) يَا مُحَمَّدُ، يَعْنِي نَهْرًا فِي الجَنَّةِ، وَنَزَلَتْ: (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ القَدْرِ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ القَدْرِ لَيْلَةُ القَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ) يَمْلِكُهَا بَعْدَكَ بَنُو أُمَيَّةَ يَا مُحَمَّدُ قَالَ القَاسِمُ، فَعَدَدْنَاهَا فَإِذَا هِيَ أَلْفُ شَهْرٍ لاَ تَزِيدُ يَوْمًا وَلاَ تَنْقُصُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ القَاسِمِ بْنِ الفَضْلِ. وَقَدْ قِيلَ عَنِ القَاسِمِ بْنِ الفَضْلِ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَازِنٍ، وَالقَاسِمُ بْنُ الفَضْلِ الحُدَّانِيُّ هُوَ ثِقَةٌ؛ وَثَّقَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، وَيُوسُفُ بْنُ سَعْدٍ رَجُلٌ مَجْهُولٌ وَلاَ نَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ عَلَى هَذَا اللَّفْظِ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە یوسوفی كوڕی سەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەدوای ئەوەی حەسەنی كوڕی پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ پەیمانیدا بە موعاویە، پیاوێ هەستا بۆی وتی: تۆ ڕووی باوەڕدارانت ڕەش كرد، یان وتی: ئەی ئەو كەسەی كە ڕووی باوەڕدارانت ڕەش كرد، ئەویش فەرمووی: ڕەحمەتی خوات لێ بێ سەركۆنەم مەكە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەخەودا بەنی ئومەییەی دەبینێ لەسەر مینبەرەكەی خۆی وتار دەدەن و حوكم دەكەن، زۆر پێی ناخۆش دەبێ، ئەم سورەتەی بۆ نارد: (**إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الكَوْثَرَ**) سورة

الكوثر: ١. واتە: بەڕاستیی ئێمە چاکەو خۆشیی و خێرێکی زۆر گەورەمان بە تۆ بەخشی، کە مایەی سەر بەرزیی دنیاو قیامەتتە، یەکێ لەوانە ڕووبارێکی تایبەتە لە بەهەشتدا، وەك ئیمام (بوخاری) دەڵێ.

ئەی موحەممەد، واتە دەریایە لە بەهەشتدا، هەروەها ئەم سورەتەش دابەزی: (**إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ**). سورة القدر: ١ - ٣. واتە: بەڕاستیی ئێمە لە شەوێکی زۆر پیرۆزو بەرێزدا قورئانمان دابەزاند. بەڵێ بەڕاستیی ئەو شەوە زۆر بەرێزە، چونکە قورئانی تێدا هاتووە، جا دەبێ چ پلەیەك لەوە گەورەتر بێ کە خوای گەورە بەو شەوەی بەخشیوە؟ تۆ چووزانیت شەوی بە فەڕ چیەو چەندە بە بەرەکەتە؟ شەوی قەدر لە هەزار مانگ چاکترە، واتە: فەڕو بەرەکەتی ئەو شەوە زۆر زیاترە لەو شەوانەی قەدریان تیا نەبێ، دیاریکردنی ژمارەی هەزار مانگ پێدەچێ لای عەرەبەکان باو بووبێ و وترابێ: فلانە ئیش لە ئیشی هەزار مانگ چاکترە، واتە: لەوە دەچێ مەبەست دیارییکردنی لای سەرووی ژمارە نەبێ، چونکە ئەو شەوە نەك لە هەزار مانگ، بەڵکو بە بۆنەی هاتنی ئەم قورئانەوە لە تەواوی ڕۆژەکانی تری گێتی چاکترە.

واتە: ئەی موحەممەد (**لَيْلَةُ الْقَدْرِ**) کە دراوە بە تۆ لەو هەزار مانگە چاکترە کە بەنی ئومەییە حوکمی تێدا دەکەن، قاسیم فەرمووی: ژماردمان ڕێك هەزار مانگ حوکمیان کرد.

٣٣٥١ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدَةَ بْنِ أَبِي لُبَابَةَ، وَعَاصِمٍ هُوَ ابْنُ بَهْدَلَةَ، سَمِعَا زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ، يَقُولُ: قُلْتُ لأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، إِنَّ أَخَاكَ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ القَدْرِ، فَقَالَ: يَغْفِرُ اللَّهُ لأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لَقَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ

وَعِشْرِينَ، وَلَكِنَّهُ أَرَادَ أَنْ لاَ يَتَّكِلَ النَّاسُ، ثُمَّ حَلَفَ لاَ يَسْتَثْنِي أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: بِأَيِّ شَيْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ؟ قَالَ: بِالآيَةِ الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ بِالعَلاَمَةِ أَنَّ الشَّمْسَ تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ لاَ شُعَاعَ لَهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: زیڕی كوڕی حوبەیش فەرمووی: بە ئوبەی كوڕی كەعبم وت: برا دینیەكەت (عبد الله)ی كوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت: هەركەس بە درێژایی ساڵ شەوانە هەستێ شەونوێژ بكات شەوی قەدری بە نسیب دەبێ و خێری هەزار مانگ عیبادەتی بۆ دەنوسرێت، ئوبەی فەرمووی: خوا لە باوكی (عبد الرحمن) خۆش ببێ - باوكی (عبد الرحمن) نازناوی (عبد الله)ی كوڕی مەسعودە - ، بێگومان خۆی باش دەزانێ لە دە شەوی كۆتایی مانگی ڕەمەزاندایە، بەڕاستی شەوی بیست و حەوتیشە، بەڵام ئەو دەیەوێ خەڵك پاڵی لێ نەدەنەوە، لەپاشدا بەدڵنیاییەوە سوێندی خوارد كە شەوی بیست و حەوتە، وتی: پێم وت: ئەی باوكی (منذر) بە چ بەڵگەیە وا دەڵێی؟ فەرمووی: بەم بەڵگە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێ ڕاگەیاندووین: (بەیانی ئەو ڕۆژە كە خۆر هەڵدێ تیشكی نیە هەتا بەرزدەبێتەوە).

### دەربارەی سورەتی (لم یكن).

### ٨٦ - بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ لَمْ يَكُنْ

٣٣٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الْمُخْتَارِ بْنِ فُلْفُلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ

لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا خَيْرَ الْبَرِيَّةِ، قَالَ: ذَلِكَ إِبْرَاهِيمُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پیـاوێ وتـی بـە پێغەمبـەری خـوای صلی الله علیـە وسلم: (ئـەی چاکترین دروستکراوی خوا). فەرمووی: (ئـەو وەسـفە بـۆ ئیـبراهیم سـەلامی خـوای لەسەر بێ بەکاردەهێنرێت).

## دەربارەی سورەتی (إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ).

## ٨٧ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ

٣٣٥٣ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الآيَةَ: (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا) قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا أَخْبَارُهَا؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّ أَخْبَارَهَا أَنْ تَشْهَدَ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ بِمَا عَمِلَ عَلَى ظَهْرِهَا، تَقُولُ: عَمِلَ يَوْمَ كَذَا كَذَا وَكَذَا، فَهَذِهِ أَخْبَارُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا). سورة الزلزلة: ٤. واتـە: لـەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵـەکانی خـۆی دەگێڕێتـەوە. پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فـەرمووی: (ئایـا دەزانـن ئـەو هەواڵـەی کـە زەوی دەگێڕێتەوە چییە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باش دەیزانن، فەرمووی: (ئەوەیە زەوی شایەتی دەدات لەسـەر هـەموو بەندەیـە، چ پیـاو بـێ چ ژن کـە چـی کـردووە

لەسەر پشتی و دەڵێ: تۆ لەو رۆژە و لەو رۆژەدا ئەوە و ئەوەت کردووە). فەرمووی: (ئەوەیە هەواڵەکەی).

## دەربارەی سورەتی (أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ).

## ٨٨ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ

٣٣٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَقْرَأُ: أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ قَالَ: يَقُولُ ابْنُ آدَمَ: مَالِي مَالِي، وَهَلْ لَكَ مِنْ مَالِكَ إِلاَّ مَا تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ، أَوْ أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ؟ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (مطرف)ی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی شیخیرەوە، لە باوکیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە گەیشتوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ) سورة التكاثر: ١. واتە: خەڵکینە خۆ هەڵکێشانتان بە زۆریی سامان و منداڵ، بێ ئاگای کردوون، فەرمووی: (ئادەمیزاد دەڵێ: ماڵ و سامانەکەم، ئایا ماڵ و سامانت هەیە سوودت پێ بگەیەنێ جگە لەوەی بەخشیت و لە قیامەت پاداشتەکەی وەردەگریت، یان خواردت و لەناوچوو، یا پۆشیت و کۆنت کردوو رزی و نەما).

٣٣٥٥ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَكَّامُ بْنُ سَلْمٍ الرَّازِيُّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي قَيْسٍ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنِ الْمِنْهَالِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: مَا زِلْنَا نَشُكُّ فِي عَذَابِ القَبْرِ حَتَّى نَزَلَتْ: (أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ) قَالَ أَبُو كُرَيْبٍ،

مَرَّةً عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي قَيْسٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الْمِنْهَالِ بْنِ عَمْرٍو. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بەردەوام گومانمان هەبوو لە سزای گۆڕ هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: (**أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ**).

٣٣٥٦ - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَلْقَمَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَاطِبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ) قَالَ الزُّبَيْرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَأَيُّ النَّعِيمِ نُسْأَلُ عَنْهُ، وَإِنَّمَا هُمَا الأَسْوَدَانِ التَّمْرُ وَالماءُ؟ قَالَ: أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی زوبێری كوڕی عەوامەوە، لە باوكیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: (**ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ**). سورة التكاثر: ٨. واتە: پاشان باوەڕتان هەبێت لەو رۆژەدا پرسیاری هەموو بەهرەیەكتان لێدەكرێ: تەندروستیی، ماڵ و سامان، خێڵ و هۆز، هەر بەهرەیەكی تر كە خوا پێی دابن، چۆنتان دەست كەوتووە..؟ لە رێی شەرعەوە، یا لە رێگاكانی ترەوە..؟ وە چۆنتان بەخت كردووە..؟

زوبێر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، كام نازو نیعمەتەمان لێ دەپرسنەوە، خۆ ئێمە خۆراكمان خورماو ئاوە، فەرمووی: (ئەوە دەبێ هەر ببێ لێپرسینەوەتان لێ دەكرێ ئەو دووانە خورماو ئاو دوو نیعمەتی گەورەن).

٣٣٥٧ - (حسن بما قبله) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ

هَذِهِ الآيَةَ: (ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ) قَالَ النَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ، عَنْ أَيِّ النَّعِيمِ نُسْأَلُ؟ فَإِنَّمَا هُمَا الأَسْوَدَانِ وَالْعَدُوُّ حَاضِرٌ، وَسُيُوفُنَا عَلَى عَوَاتِقِنَا؟ قَالَ: إِنَّ ذَلِكَ سَيَكُونُ. وَحَدِيثُ ابْنِ عُيَيْنَةَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو عِنْدِي أَصَحُّ مِنْ هَذَا، سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ أَحْفَظُ وَأَصَحُّ حَدِيثًا مِنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: **(ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ)**. سورة التكاثر: ٨.

خەڵك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، كام نازو نیعمەتەمان لێ دەپرسنەوە، خۆ ئێمە خۆراكمان خورماو ئاوە، دوژمن ئامادەیە بۆ لەناوبردنمان، شمشێرەكانیشمان لە سەرشانە بۆ جەنگ بەرامبەر بە دوژمن، فەرمووی: (ئەوە دەبێ هەر ببێ لێپرسینەوەتان لێ دەكرێ ئەو دووانە خورماو ئاو دوو نیعمەتی گەورەن).

٣٣٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ العَلاَءِ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَرْزَمٍ الأَشْعَرِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ، يَعْنِي العَبْدَ مِنَ النَّعِيمِ، أَنْ يُقَالَ لَهُ: أَلَمْ نُصِحَّ لَكَ جِسْمَكَ، وَنُرْوِيَكَ مِنَ الْمَاءِ البَارِدِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَالضَّحَّاكُ هُوَ ابْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَرْزَبٍ، وَيُقَالُ ابْنُ عَرْزَمٍ، وَابْنُ عَرْزَمٍ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (یەكەمین شتێ لەرۆژی قیامەتدا بەندە پرسیاری لێ دەكرێ ناز و نیعمەتە، پێی دەوترێ: ئایا تەندروستیمان نەبەخشی بە جەستەت، ئاوی ساردمان پێ نەبەخشیت).

دەربارەی سورەتی (الكوثر).

## ٨٩ – بَاب وَمِنْ سُورَةِ الكَوْثَرِ

٣٣٥٩ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الكَوْثَرَ): أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: هُوَ نَهْرٌ فِي الجَنَّةِ قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَأَيْتُ نَهْرًا فِي الجَنَّةِ حَافَّتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ. قُلْتُ: مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذَا الكَوْثَرُ الَّذِي أَعْطَاكَهُ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الكَوْثَرَ)** سورة الكوثر: ١. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کەوسەر ڕوبارێکە لە بەهەشتدا)، ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لە بەهەشتدا ڕوبارێکم دی قەراخەکەی گومەزی مرواری هەڵۆڵ بوو، وتم: (ئەی جبریل ئەمە چیە؟) وتی: ئەمە حەوزی کەوسەرە خوا بەخشیویەتی بە تۆ.

٣٣٦٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُرَيْجُ بْنُ النُّعْمَانِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَيْنَا أَنَا أَسِيرُ فِي الجَنَّةِ، إِذْ عُرِضَ لِي نَهْرٌ حَافَّتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ، قُلْتُ لِلْمَلَكِ: مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا الكَوْثَرُ الَّذِي أَعْطَاكَهُ اللَّهُ، قَالَ: ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ إِلَى طِينَةٍ فَاسْتَخْرَجَ مِسْكًا، ثُمَّ رُفِعَتْ لِي سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى فَرَأَيْتُ عِنْدَهَا نُورًا عَظِيمًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ لە

بەهەشتدا دەسورامەوە لەپڕ رووبارێکم لێ دەرکەوت ئەم بەر و ئەوبەرەکەی گومەزی مرواری بوو، بە مەلائیکەکەم وت: (ئەمە چیە؟) وتی: ئەمە حەوزی کەوسەرە خوا بەخشیویەتی بە تۆ). فەرمووی: لەپاشدا دەستی برد بۆ قوڕ و لیتەی بنەکەی میسکی دەرهێنا، ئینجا درەختی (سدرة)م نیشاندرا لەلایدا نورێکی گەورە و شکۆمەندم بینی).

٣٣٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الكَوْثَرُ نَهْرٌ فِي الجَنَّةِ، حَافَّتَاهُ مِنْ ذَهَبٍ، وَمَجْرَاهُ عَلَى الدُّرِّ وَاليَاقُوتِ، تُرْبَتُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَمَاؤُهُ أَحْلَى مِنَ العَسَلِ، وَأَبْيَضُ مِنَ الثَّلْجِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەوسەر روبارێکە لە بەهەشتدا قەراخەکەی لەم بەر و لەوبەرەکەی لە ئالتوونە، شوێنی رۆشتنی ئاوەکە لە دوڕو یاقوتە، بۆنی خاکەکەی لەبۆنی میسك خۆشترە، ئاوەکەی لە هەنگوین شیرینترە، لەبەفریش سپی ترە).

**دەربارەی سورەتی (الفتح).**

**٩٠ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الْفَتْحِ**

٣٣٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ عُمَرُ يَسْأَلُنِي مَعَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَتَسْأَلُهُ وَلَنَا بَنُونَ مِثْلُهُ؟ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: إِنَّهُ مِنْ حَيْثُ تَعْلَمُ، فَسَأَلَهُ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ

وَالفَتْحُ) فَقُلْتُ: إِنَّمَا هُوَ أَجَلُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْلَمَهُ إِيَّاهُ، وَقَرَأَ السُّورَةَ إِلَى آخِرِهَا، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: وَاللهِ مَا أَعْلَمُ مِنْهَا إِلاَّ مَا تَعْلَمُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَتَسْأَلُهُ وَلَنَا ابْنٌ مِثْلُهُ؟ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاریان لێ کردم، (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: ئەوە پرسیار لەو دەکەن لەکاتێکدا ئێمە منداڵەکانمان لە تەمەنی ئەودان؟ پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ پێی فەرموو: لەپێناوی ئەوەدا کە ئەوان بزانن ئیبنو عەباس زانایە، دەربارەی مانای ئەم سورەتە لێی پرسی: **(إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالفَتْحُ)**. سورة الفتح:١. وتم: ئەم سورەتە باسی هاتنی ئاکامی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەکات و نیشانەی نزیکبوونەوەی مردنیەتی خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە، جا سورەتەکەی خوێندەوە تا کۆتایی، پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ پێی فەرموو: سوێند بە (الله) منیش هەر ئەوەندەی لێ دەزانم کە ئێوە دەیزانن دەربارەی ئەم سورەتە.

**دەربارەی سورەتی (تبت یدا).**

**٩١ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ تَبَّتْ**

٣٣٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى الصَّفَا فَنَادَى: يَا صَبَاحَاهُ، فَاجْتَمَعَتْ

إِلَيْهِ قُرَيْشٌ، فَقَالَ: إِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ، أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنِّي أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ الْعَدُوَّ مُمَسِّيكُمْ أَوْ مُصَبِّحُكُمْ أَكُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟ فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ: أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا؟ تَبًّا لَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چووە سەر گردۆلکەی صەفاو هاواری کرد: (ئەی هاوار فریاکەون) وشەی (**يَا صَبَاحَاهُ**) بۆ بەدەمەوە هاتنە بەتایبەت لەکاتێکدا کە دوژمن هێرش دێنێ، جا قورەیش لەدەوری کۆبوونەوە، فەرمووی: (من ترسێنەرێکم بۆتان، هەتا ئاگادارتان بکەمەوە بەرامبەر سزایەکی زۆر توند و قورسی ڕۆژی قیامەت، ئەگەر پێتان ڕابگەیەنم و بڵێم لەشکری دوژمن سەر لە بەیانی یان سەر لە ئێوارە لەناکاو دەدات بەسەرتاندا، ئایا بڕوام پێ دەکەن؟ وتیان: بەڵێ تا ئێستا درۆمان لێ نەبیستوویت، ئەبو لەهەب وتی: یاخوا بەخێر نەیێت و تیابچیت، هەر بۆ ئەمە کۆت کردوینەوە؟ جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (**تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ**). سورة المسد:١. واتە: یاخوا هەر دوو دەستەکانی (أبولهب) بە بڕین چن و تیابچن، خۆ تیاشچوو.

## دەربارەی سورەتی (الإخلاص).

## ٩٢ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الإِخْلَاصِ

٣٣٦٤ - (حسن دون قوله: والصمد الذي ... ) : حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَعْدٍ هُوَ الصَّغَانِيُّ، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الرَّازِيِّ، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ الْمُشْرِكِينَ قَالُوا لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: انْسُبْ لَنَا رَبَّكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ اللَّهُ الصَّمَدُ) فَالصَّمَدُ: الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ،

لأَنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُولَدُ إِلاَّ سَيَمُوتُ، وَلَيْسَ شَيْءٌ يَمُوتُ إِلاَّ سَيُورَثُ، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَمُوتُ وَلاَ يُورَثُ: (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) قَالَ: لَمْ يَكُنْ لَهُ شَبِيهٌ وَلاَ عِدْلٌ وَلَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە هاوبەش بۆ خوا دانەران وتیان بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: وەسفی پەروەردگاری خۆتمان بۆ بکە، جا خوای گەورە ئەم سورەتەی دابەزاند: **(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ** (١) **اللَّهُ الصَّمَدُ** (٢) **لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ** (٣) **وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ)**. واتە: ئەی موحەممەد! صلی الله علیه وسلم بڵێ: ئەو پەروەردگارەی کە من دەیپەرستم، تاك و تەنیایەو، هاوەڵ و هاوبەشی نیە، ئەو خوایە کە ناوی (الله)یە، جێگای هیواو ئومێدەو، بێ نیازیشە، هیچ کەسێکیش - بێ لەو- شیاوی ئەوە نییە گیروگرفتەکان ببرێنە لای بۆ چارەسەر، هەر ئەو زاتە گەورەیەشە، کە دەبێ هەر بۆلای ئەو بگەڕێنەوە، کەسی لێ نەبووەو، هیچ ڕۆڵەیەکی نیە — وەك جولەکەو گاورو بتپەرستەکان دەڵێن -، چونکە خوا زۆر بڵندو پاك و بێخەوش و دوورە لەو جۆرە بیرو بۆچوونانە و لە کەسیش نەبووەو بێ دایك و بابە، چونکە هەموو شتێکی لە دایك بوو تازەو نوێیەو، سەرەتایەکی هەیە، خۆ خوایش بێ سەرەتاو (ئەزەل)یە و هەرگیز هیچ کەسێك هاوشێوەو هاوتای نیەو، کەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی بکات.

٣٣٦٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الرَّازِيِّ، عَنِ الرَّبِيعِ، عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرَ آلِهَتَهُمْ فَقَالُوا: انْسُبْ لَنَا رَبَّكَ. قَالَ: فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ بِهَذِهِ السُّورَةِ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ). فَذَكَرَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعْدٍ. وَأَبُو سَعْدٍ اسْمُهُ: مُحَمَّدُ بْنُ مُيَسَّرٍ، وَأَبُو جَعْفَرٍ الرَّازِيُّ اسْمُهُ: عِيسَى، وَأَبُو الْعَالِيَةِ اسْمُهُ: رُفَيْعٌ وَكَانَ عَبْدًا أَعْتَقَتْهُ امْرَأَةٌ سَائِبَةً.

واتە: لە ئەبی عالیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، باسی خواکانی هاوبەش بۆ خوا دانەرانی کرد، ئەوانیش وتیان: وەسفی پەروەردگاری خۆتمان بۆ بکە، فەرمووی: ئیتر جبریل بەم سورەتەوە هات بۆ خزمەتی: (**قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ** (١) **اللَّهُ الصَّمَدُ** (٢) **لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ** (٣) **وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ**).

## دەربارەی سورەتی (المعوذتین).

## ٩٣ - بَاب وَمِنْ سُورَةِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ

٣٣٦٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عَمْرٍو العَقَدِيُّ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَظَرَ إِلَى القَمَرِ، فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ اسْتَعِيذِي بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ هَذَا، فَإِنَّ هَذَا هُوَ الغَاسِقُ إِذَا وَقَبَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی عائیشە پەنا بگرە بە خوا لە شەڕ و خراپەی ئەمە، چونکە بێگومان ئەمە: (**غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ**)ە کە خوای گەورە دەفەرموێت: (**وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ**). واتە: وە لە شەڕو خراپەو زیانی تاریکی شەو، کە دادێت و هەموو شتێك دادەپۆشێ بە ژێریشیەوەو ترووسکایی لێ دەبڕێ و دەبێتە شەوە زەنگ.

٣٣٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ وَهُوَ ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ، عَنِ

النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيَّ آيَاتٍ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) إِلَى آخِرِ السُّورَةِ، وَ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ) إِلَى آخِرِ السُّورَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی چەند ئایەتێکم بۆ هاتووە هەتا ئێستا وێنەیانم نەدیوە کە بریتین لە: (**قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ (١) مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ (٢) وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ (٣) وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ (٤) وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ (٥)**). سورة الفلق. وە: (**قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ (١) مَلِكِ النَّاسِ (٢) إِلَهِ النَّاسِ (٣) مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ (٤) الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ (٥) مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ (٦)**). سورة الناس.

## ٩٤ - بَابٌ

٣٣٦٨ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَفْوَانُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَارِثُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ وَنَفَخَ فِيهِ الرُّوحَ عَطَسَ فَقَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ، فَحَمِدَ اللَّهَ بِإِذْنِهِ، فَقَالَ لَهُ رَبُّهُ: رَحِمَكَ اللَّهُ يَا آدَمُ، اذْهَبْ إِلَى أُولَئِكَ الْمَلَائِكَةِ، إِلَى مَلَإٍ مِنْهُمْ جُلُوسٍ، فَقُلْ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، قَالُوا: وَعَلَيْكَ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ بَنِيكَ، بَيْنَهُمْ، فَقَالَ اللَّهُ لَهُ وَيَدَاهُ مَقْبُوضَتَانِ: اخْتَرْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، قَالَ: اخْتَرْتُ يَمِينَ رَبِّي وَكِلْتَا يَدَيْ رَبِّي يَمِينٌ مُبَارَكَةٌ ثُمَّ بَسَطَهَا فَإِذَا فِيهَا آدَمُ وَذُرِّيَّتُهُ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ، مَا هَؤُلَاءِ؟ فَقَالَ: هَؤُلَاءِ ذُرِّيَّتُكَ، فَإِذَا كُلُّ إِنْسَانٍ مَكْتُوبٌ عُمْرُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، فَإِذَا فِيهِمْ رَجُلٌ أَضْوَؤُهُمْ، أَوْ

مِنْ أَضْوَئِهِمْ، قَالَ: يَا رَبِّ مَنْ هَذَا؟ قَالَ: هَذَا ابْنُكَ دَاوُدُ قَدْ كَتَبْتُ لَهُ عُمْرَ أَرْبَعِينَ سَنَةً. قَالَ: يَا رَبِّ زِدْهُ فِي عُمْرِهِ. قَالَ: ذَاكَ الَّذِي كُتِبَ لَهُ. قَالَ: أَيْ رَبِّ، فَإِنِّي قَدْ جَعَلْتُ لَهُ مِنْ عُمْرِي سِتِّينَ سَنَةً. قَالَ: أَنْتَ وَذَاكَ، قَالَ: ثُمَّ أُسْكِنَ الجَنَّةَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أُهْبِطَ مِنْهَا، فَكَانَ آدَمُ يَعُدُّ لِنَفْسِهِ، قَالَ: فَأَتَاهُ مَلَكُ الْمَوْتِ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: قَدْ عَجَّلْتَ، قَدْ كُتِبَ لِي أَلْفُ سَنَةٍ. قَالَ: بَلَى وَلَكِنَّكَ جَعَلْتَ لِابْنِكَ دَاوُدَ سِتِّينَ سَنَةً، فَجَحَدَ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ، وَنَسِيَ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ. قَالَ: فَمِنْ يَوْمِئِذٍ أُمِرَ بِالكِتَابِ وَالشُّهُودِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ رِوَايَةِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کـاتێ خـوای گـەورە ئـادەمی دروستکرد، ڕوحی کرد بە بەریا پژمی، فەرمووی: (**الحَمْدُ لِلَّهِ**) سوپاسی خـوای کـرد بە ڕێگەپێدانی خـوا خـۆی، پـەروەردگاری پێـی فـەرموو: (**رَحِمَكَ اللَّهُ**)، ڕەحمـەتی خوات لێ بێ ئەی ئادەم، بـڕۆ بـۆ لای ئـەو مەلائیکانـە، بـۆ لای کۆمـەڵێکیان کـە دانیشتوون، بڵێ: (**السَّلامُ عَلَيْكُمْ**) سڵاوی خواتان لێ بێ، وتیـان: (**وَعَلَيْكَ السَّلامُ وَرَحْمَةُ اللهِ**). لەپاشـدا گەڕایـەوە بـۆ خزمـەت پـەروەردگاری، فـەرمووی: ئەمـە سڵاوکردنی تۆ و نەوەکانتە لەنێوان خۆیاندا، خوای گەورە هەردوو دەستی داخسـت و فـەرمووی: هەڵبـژێرە کامیانـت دەوێ، دەسـتی ڕاسـتی پـەروەردگارم هەڵبـژارد هەردوو دەستی پەروەردگارم هەر ڕاست و پیرۆزن، لەپاشدا دەستی کـردەوە ئـادەم و نەوەکانی تێدا بوو، فەرمووی: ئـەی پـەروەردگارم ئەوانـە کـێن؟ فـەرمووی: ئەوانـە نەوەی تۆن، هەموو کەسێ لەوانە تەمەنی لە نێوچاوانی نوسرابوو، یـەکێکیان تێـدا بوو لەهەر هەموویان نورانی تر بوو، ئادەم فەرمووی: ئەی پەروەردگارم ئەوە کێیـە؟

فەرمووی: ئەوە داودی کوڕتە چل ساڵ تەمەنی بۆ نوسراوە، ئادەم فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! تەمەنی زیاتر بکە، فەرمووی: هەر ئەوەندەم بۆ نوسیوە، ئادەم فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! من شەست ساڵ لەتەمەنی خۆم دەخەمە سەر تەمەنی ئەو، فەرمووی: باشە، فەرمووی: لەپاشدا لەبەهەشت نیشتەجێ بە ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێ، ئینجا دوای ئەوە دابەزە بۆ سەر زەوی، ئادەم خۆی ئامادەکرد، مەلائیکەی مردن هات بۆ لای روحی بکێشێ، ئادەم فەرمووی: بەڕاستی پەلەت کرد، من هەزار ساڵم بۆ نوسراوە، وتی: بەڵێ بەلاَم تۆ شەست ساڵت داوە بە داودی کوڕت، جا نکوڵی کرد نەوەکانیشی نکوڵیان کرد، لەیادی چوو، نەوەکانیشی لەیادیان چوو). فەرمووی: ئیتر لەو رۆژەوە فەرمانکرا بە نوسین و شایەت).

## ٩٥ - بَابٌ

٣٣٦٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا العَوَّامُ بْنُ حَوْشَبٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الأَرْضَ جَعَلَتْ تَمِيدُ، فَخَلَقَ الجِبَالَ، فَقَالَ بِهَا عَلَيْهَا فَاسْتَقَرَّتْ، فَعَجِبَتِ الْمَلاَئِكَةُ مِنْ شِدَّةِ الجِبَالِ. قَالُوا: يَا رَبِّ هَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الجِبَالِ؟ قَالَ: نَعَمُ الحَدِيدُ، قَالُوا: يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الحَدِيدِ؟ قَالَ: نَعَمُ النَّارُ. فَقَالُوا: يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: نَعَمُ الْمَاءُ. قَالُوا: يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الْمَاءِ؟ قَالَ: نَعَمُ الرِّيحُ. قَالُوا: يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الرِّيحِ؟ قَالَ: نَعَمْ ابْنُ آدَمَ، تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ بِيَمِينِهِ يُخْفِيهَا مِنْ شِمَالِهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە خـوای گەورە زەوی دروسـتکرد دەجـولا و لەجولـە نەدەکـەوت، جـا کێوەکـانی دروسـتکرد لەنگەری گرت و لەجولە کەوت، مەلائیکە لە بـەهێزی کێوەکـان سـەریان سـوڕما، وتیان: ئەی پەروەردگار! ئایا هیچ شتێ لە دروستکراوەکانت بەهێزترە لە کێوەکـان؟ فــەرمووی: بــەڵێ، ئاســن، وتیــان: ئــەی پــەروەردگار! ئایــا هــیچ شــتێ لــە دروســتکراوەکانت لــە ئاسـن بـەهێزترە؟ فـەرمووی: بـەڵێ، ئـاگر، وتیـان: ئـەی پەروەردگار! ئایا هیچ شـتێ لـە دروسـتکراوەکانت لـە ئـاگر بـەهێزترە؟ فـەرمووی: بەڵێ، ئاو، وتیان: ئەی پەروەردگار! ئایا هـیچ شـتێ لـە دروسـتکراوەکانت لـە ئـاو بەهێزترە؟ فەرمووی: بەڵێ، هـەوا، وتیـان: ئـەی پـەروەردگار! ئایـا هـیچ شـتێ لـە دروستکراوەکانت لە هـەوا بـەهێزترە؟ فـەرمووی: بـەڵێ، نـەوەی ئـادەم، بەدەسـتی ڕاستی خێر و سەدەقەیە دەکات دەستی چەپی پێی نازانێ واتە: ئەوەندە بـە نهێنـی ئەنجامی دەدات).

# باسەکانی پاڕانەوە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٤٥ - أَبْوَابُ الدَّعَوَاتِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی پاڕانەوە

### ١ - بَاب مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الدُّعَاءِ

٣٣٧٠ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ العَظِيمِ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ القَطَّانُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الحَسَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللهِ تَعَالَى مِنَ الدُّعَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِمْرَانَ القَطَّانِ، وَعِمْرَانُ القَطَّانُ هُوَ ابْنُ دَاوَرَ وَيُكْنَى أَبَا العَوَّامِ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ عِمْرَانَ القَطَّانِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ شتێ لەلای خوا لە پاڕانەوە بەڕێزتر نیە).

٣٣٧١ - (ضعيف بهذا اللفظ) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ ابْنِ لَهِيعَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي جَعْفَرٍ، عَنْ أَبَانَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الدُّعَاءُ مُخُّ العِبَادَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ.

واتــە: لــە ئەنەســی كــوڕی مالیكــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پاڕانەوە مـۆخ و كرۆكی پەرستشە).

٣٣٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ ذَرٍّ، عَنْ يُسَيْعٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ ثُمَّ قَرَأَ: (وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ مَنْصُورٌ، وَالأَعْمَشُ، عَنْ ذَرٍّ، وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ذَرٍّ.

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دوعاو پاڕانەوە پەرستشە). لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)**. سورة غافر: ٦٠. واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: داوا لە من بكەن و لە من بپاڕێنەوە، منیش وەڵامتان دەدەمەوە، بێگومان ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن لە پەرستنم بە تەنیا، بێگومان بە سەر شۆڕیی و بە بچووكی دەچنە دۆزەخەوە.

## ٢ - بَاب مِنْهُ

٣٣٧٣ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهُ مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللَّهَ يَغْضَبْ عَلَيْهِ. وَقَدْ رَوَى وَكِيعٌ، عَنْ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، هَذَا الحَدِيثَ وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی هەرکەس لەخوا نەپاڕێتەوە لێی تورە دەبێت).

٣٣٧٣م- (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ حُمَيْدٍ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. حُمَيْدٌ هَذَا يُقَالُ لَهُ: الْفَارِسِيُّ، سَكَنَ الْمَدِينَةَ.

٣٣٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مَرْحُومُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْعَطَّارُ، حَدَّثَنَا أَبُو نَعَامَةَ السَّعْدِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم فِي غَزَاةٍ، فَلَمَّا قَفَلْنَا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ فَكَبَّرَ النَّاسُ تَكْبِيرَةً وَرَفَعُوا بِهَا أَصْوَاتَهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: إِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَصَمَّ وَلاَ غَائِبٍ، هُوَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رُءُوسِ رِحَالِكُمْ، ثُمَّ قَالَ: يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ قَيْسٍ، أَلاَ أُعَلِّمُكَ كَنْزًا مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو عُثْمَانَ النَّهْدِيُّ اسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُلٍّ، وَأَبُو نَعَامَةَ السَّعْدِيُّ اسْمُهُ عَمْرُو بْنُ عِيسَى.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، کاتێ گەڕاینەوە لەمەدینە دەرکەوتین، خەڵکە بەدەنگی بەرز (الله أكبر)یان دەوتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان کەڕ و لاڵ نیە یان غائیب نیە، بەڵکو نزیکە لێتانەوە و دەبیستێ و دەبینێ ئیتر پێویست بەوە ناکات دەنگتان بەرزبکەنەوە). لەپاشدا فەرمووی: (ئەی

(عبد الله)ی کوڕی قەیس وشیاربە وشەیەکت نیشان بدەم کە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت؟ (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) هیچ گۆڕان و هێزێك نیە مەگەر بە خوای گەورەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی یادی خوا

## ٤ - بَاب مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الذِّكْرِ

٣٣٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ قَيْسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ شَرَائِعَ الإِسْلاَمِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ، قَالَ: لاَ يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بوسرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرز و سوننەتەکان زۆربوون لەسەرم توانای ئەوەم نیە هەر هەموویان جێبەجێ بکەم لەبەرئەوە شتێکم پێ رابگەیەن کە دەستی پێوە بگرم و پابەند بم پێوەی، فەرمووی: (با بەردەوام زمانت پاراو بێ بە یادی خواوە).

## باسێکی تر لەو بارەوە

## ٥ - بَاب مِنْهُ

٣٣٧٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ أَيُّ العِبَادِ أَفْضَلُ دَرَجَةً عِنْدَ اللهِ يَوْمَ القِيَامَةِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ. قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ

اللهِ وَمِنَ الغَازِي فِي سَبِيلِ اللهِ؟ قَالَ: لَوْ ضَرَبَ بِسَيْفِهِ فِي الكُفَّارِ وَالمشْرِكِينَ حَتَّى يَنْكَسِرَ وَيَخْتَضِبَ دَمًا لَكَانَ الذَّاكِرُونَ اللهَ كَثِيرًا أَفْضَلَ مِنْهُ دَرَجَةً. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ دَرَّاجٍ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویــەتی: دەربــارەی لــەڕۆژی قیامــەتــدا چ بەندەیــە لای خــوای گــەورە پایــەی بەرزترە پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیــە وســلم، ئــەویش فــەرمووی: (ئەو كەسانەی زۆر زۆر زیكر و یادی خوا دەكەن)، فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبــەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەو كەسەش پایەیان بەرزترە لە پێناوی دینی خوا غــەزا دەكات و دەجەنگێ؟ فەرمووی: (ئەگەر بە شمشێرەكەی ئەوەنــدە بــدات لــە گــەردنی كافر و هاوبەش بۆ خوا دانەران هــەتا شمشــێرەكەی دەشــكێ و خوێنــاوی دەبــێ یــان خۆی خوێناوی دەبێ و دەكوژرێ تــا ئــەو ڕادەیــەش هێشــتا ئــەو كەســانەی زۆر زۆر زیكر و یادی خوا دەكەن پلەیە یان چەند پلەیە پایەیان بەرزترە).

## باسێكی تر لەو بارەوە

### ٦ - بَاب مِنْهُ

٣٣٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعِيدٍ هُوَ ابْنُ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ زِيَادٍ، مَوْلَى ابْنِ عَيَّاشٍ عَنْ أَبِي بَحْرِيَّةَ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالوَرِقِ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟ قَالُوا: بَلَى. قَالَ: ذِكْرُ اللهِ تَعَالَى قَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: مَا شَيْءٌ أَنْجَى مِنْ عَذَابِ اللهِ مِنْ ذِكْرِ اللهِ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا

الحَدِيثَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعِيدٍ، مِثْلَ هَذَا بِهَذَا الإِسْنَادِ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنْهُ فَأَرْسَلَهُ.

واتە: لە ئەبی دەردائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئایا پێتان نەڵێم کام کردەوەتان چاکە و خاوێنترە لای پەروەردگارتان، پلەتان پێی بەرزبێتەوە و چاکتر بێ بۆ ئێوە لە بەخشینی زێڕ و زیو، چاکتر بێ لەوەی ڕووبەڕووی دوژمنانتان ببنەوە و بدەن لە گەردنیان و ئەوانیش بدەن لە گەردنتان؟) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (یادی خوایە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی کۆمەڵێك کۆببنەوە زیکر و یادی خوا بکەن

### ٧ - بَاب مَا جَاءَ فِي القَوْمِ يَجْلِسُونَ فَيَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ مَا لَهُمْ مِنَ الفَضْلِ

٣٣٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَغَرِّ أَبِي مُسْلِمٍ، أَنَّهُ شَهِدَ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مَا مِنْ قَوْمٍ يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلاَّ حَفَّتْ بِهِمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرە ڕەزای خوایان لێ بێ شایەتیان دا، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کۆمەڵێك لەبەر ڕەزامەندی خوا کۆببنەوە زیکر و یادی خوا بکەن ئیللا مەلائیکە دەورەیان لێدەدەن و، ڕەحمەت و میهرەبانی دایان دەپۆشێت، ئارامی و دڵنیایی بەسەریاندا دادەبارێت و، خودایش لە بارەگای بەرزو باڵای خۆی لای (مەلەئی ئەعلا) باسیان دەکات).

٣٣٧٩ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْحُومُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْعَطَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نَعَامَةَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ، إِلَى الْمَسْجِدِ فَقَالَ: مَا يُجْلِسُكُمْ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ. قَالَ: آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَمَا كَانَ أَحَدٌ بِمَنْزِلَتِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقَلَّ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: مَا يُجْلِسُكُمْ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ لِمَا هَدَانَا لِلإِسْلاَمِ وَمَنَّ عَلَيْنَا بِهِ، فَقَالَ: آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟ قَالُوا: آللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ لِتُهْمَةٍ لَكُمْ، إِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ وَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللَّهَ يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلاَئِكَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ، وَأَبُو نَعَامَةَ السَّعْدِيُّ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ عِيسَى، وَأَبُو عُثْمَانَ النَّهْدِيُّ اسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُلٍّ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: موعاویــە ڕەزای خــوای لــێ بــێ لــەماڵ دەرچــوو بــەرەو مزگــەوت، کۆڕێکی دی، فــەرمووی: بۆچــی دانیشــتوون؟ وتیــان: زیکــر و یــادی خــوا دەکــەین، فەرمووی: تو خوا هەر بۆ ئەوە دانیشتوون و بەس؟ وتیان: بــەڵێ، ســوێند بــە (الله) بەس بۆ ئەوە دانیشتووین، فەرمووی: لەبەر ئەوە ئێوەم سوێند نەدا کە باوەڕتان پێ نەکەم، بەڵکو باوەڕتان پێ دەکەم، کەس نیە هێندەی مــن پایــەی لــە پێغەمبــەرەوە صلی الله علیه وسلم نزیك بێ – بە عینوانی ئەوەی مــن نووســەری وەحــی بــووم و زاوام بووە و زۆر لە خزمەتیدا بووم – لەگەڵ ئەوەشــدا وەك فەرمایشــتی ئــەو کــەم بگێڕێتــەوە، جــارێ پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم دەرچــوو ڕۆیشــت بــۆ مزگەوت، بە ئەڵقە دانیشتبوون، فەرمووی: (بۆچی دانیشتوون؟) وتیان: دانیشــتوون زیکر و یادی خوا دەکەین، سوپاسی خوا دەکەین لەسەرئەوە کە شــارەزای کــردووین

و هیدایـەتی داویـن بـۆ دینـی ئیسـلام و ئـەم بـەهرە گەورەیـە پـێ بەخشـیووین، فەرمووی: (تو خوا هەر بۆ ئەوە دانیشتوون؟ وتیان: بەڵێ، سوێند بە (الله) بەس بـۆ ئەوە دانیشتووین، فەرمووی: (لەبەر ئەوە ئێوەم سوێند نەدا کە باوەڕتان پێ نەکەم، بەڵکو باوەڕتان پێ دەکەم، بێگومان جبریل هات بۆ لام و پێی ڕاگەیاندم کـە خـوای گەورە شانازیتان پێوە دەکات لای مەلائیکەکان).

## دەربارەی کۆمەڵێ دانیشن و یادی خوا نەکەن

## ٨ - بَابٌ فِي الْقَوْمِ يَجْلِسُونَ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ

٣٣٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ صَالِحٍ، مَوْلَى التَّوْأَمَةِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا لَمْ يَذْكُرُوا اللَّهَ فِيهِ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ، إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً، فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: تِرَةً: يَعْنِي حَسْرَةً وَنَدَامَةً. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْمَعْرِفَةِ بِالعَرَبِيَّةِ: التِّرَةُ هُوَ الثَّأْرُ. حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ الأَغَرَّ أَبَا مُسْلِمٍ، قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ مِثْلَهُ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کۆمـەڵێ دانیشن و یـادی خوا نەکەن و سـەڵاوات نـەدەن لەسـەر پێغەمبەرەکـەیان، ئـیللا لـەڕۆژی قیامـەتـدا دەبێتـە حەسـرەت بۆیـان، خـوای گـەورە ئەگـەر ویسـتی سـزایان دەدات، ئەگـەر ویستیشی لێیان خۆش دەبێ).

## دەربارەی بێگومان پاڕانەوەی موسوڵمان گیرایە

## ٩ - بَاب مَا جَاءَ أَنَّ دَعْوَةَ الْمُسْلِمِ مُسْتَجَابَةٌ

٣٣٨١ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْعُو بِدُعَاءٍ إِلاَّ آتَاهُ اللَّهُ مَا سَأَلَ أَوْ كَفَّ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهُ، مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەركەسێ بۆ پێویستیە بپاڕێتەوە خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەكات، یان بەو ئەندازەیە خراپەیەكی لەسەر لادەبات، بە مەرجێ پاڕانەوەكەی تاوان نەبێت یان بۆ پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی نەبێت).

٣٣٨٢ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَرْزُوقٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ وَاقِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَطِيَّةَ اللَّيْثِيُّ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَسْتَجِيبَ اللَّهُ لَهُ عِنْدَ الشَّدَائِدِ وَالكَرْبِ فَلْيُكْثِرِ الدُّعَاءَ فِي الرَّخَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ پێی خۆشە لەكاتی كارەسات و تەنگانەدا خوای گەورە پاڕانەوەكانی لێ قبوڵ بكات با لەكاتی خۆشی و تەندروستی و خۆشگوزەرایدا بپاڕێتەوە).

٣٣٨٣ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَبِيبِ بْنِ عَرَبِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ كَثِيرٍ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ طَلْحَةَ بْنَ خِرَاشٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الحَمْدُ لِلَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُوسَى بْنِ إِبْرَاهِيمَ. وَقَدْ رَوَى عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ مُوسَى بْنِ إِبْرَاهِيمَ، هَذَا الحَدِيثَ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (گەورەترین و چاکترین زیکر و یادی خوا بریتیە لە **(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)**، هەروەها گەورەترین و چاکترین پاڕانەوەش بریتیە لە: **(الحَمْدُ لِلَّهِ)**).

٣٣٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ الْمُحَارِبِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ خَالِدِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنِ البَهِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، وَالبَهِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ اللَّهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە هەموو کات و حاڵەتێکیدا یادی خوای دەکرد.

## ئەوەی دەپاڕێتەوە با لەخۆیەوە دەست پێ بکات

## ١٠ - بَاب مَا جَاءَ أَنَّ الدَّاعِيَ يَبْدَأُ بِنَفْسِهِ

٣٣٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قَطَنٍ، عَنْ حَمْزَةَ الزَّيَّاتِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا ذَكَرَ أَحَدًا فَدَعَا لَهُ بَدَأَ بِنَفْسِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو قَطَنٍ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ الهَيْثَمِ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی یەکێکی دەکرد و بۆی دەپاڕایەوە لەخۆیەوە دەست پێ دەکرد.

## دەربارەی دەست بەرزکردنەوە لەکاتی پاڕانەوەدا

## ١١ - بَاب مَا جَاءَ فِي رَفْعِ الأَيْدِي عِنْدَ الدُّعَاءِ

٣٣٨٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ عِيسَى الجُهَنِيُّ، عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ الجُمَحِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ فِي الدُّعَاءِ، لَمْ يَحُطَّهُمَا حَتَّى يَمْسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى فِي حَدِيثِهِ: لَمْ يَرُدَّهُمَا حَتَّى يَمْسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ عِيسَى. وَقَدْ تَفَرَّدَ بِهِ وَهُوَ قَلِيلُ الحَدِيثِ، وَقَدْ حَدَّثَ عَنْهُ النَّاسُ، وَحَنْظَلَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ الجُمَحِيُّ هُوَ ثِقَةٌ، وَثَّقَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ.

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەردوو دەستی بەرزدەکردنەوە و دەپاڕایەوە دای نەدانان هەتا مەسحی دەم و چاوی پێ دەکردن و دەهێنان بە روخساریدا.

## ئەوەی پەلە بکات لە گیرابوونی پاڕانەوەکەیدا

## ١٢ - بَاب مَا جَاءَ فِيمَنْ يَسْتَعْجِلُ فِي دُعَائِهِ

٣٣٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ، مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو عُبَيْدٍ اسْمُهُ: سَعْدٌ، وَهُوَ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَزْهَرَ، وَيُقَالُ: مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَزْهَرَ هُوَ ابْنُ عَمِّ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە وەلامی نزاو پاڕانەوەی کەسێکتان دەداتەوە بە مەرجێ پەلەپەل نەکات وەك ئەوەی دەڵێ: هەر دەپاڕێمەوە بەلاّم پاڕانەوەکەم گیرا نابێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پاڕانەوەی بەیانیان و ئێواران

## ١٣ - بَاب مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ إِذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى

٣٣٨٨ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ وَهُوَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، قَالَ:

سَمِعْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ وَمَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ: بِسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَيَضُرَّهُ شَيْءٌ وَكَانَ أَبَانُ، قَدْ أَصَابَهُ طَرَفُ فَالِجٍ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ أَبَانُ: مَا تَنْظُرُ؟ أَمَا إِنَّ الحَدِيثَ كَمَا حَدَّثْتُكَ، وَلَكِنِّي لَمْ أَقُلْهُ يَوْمَئِذٍ لِيُمْضِيَ اللَّهُ عَلَيَّ قَدَرَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبانی كوڕی پێشەوا (عُثْمَان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا (عُثْمَان)ی كوڕی عەفان بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس سەر لە بەیانیان و سەر لە ئێوارانی هەموو شەو و ڕۆژێ سێ جار بڵێ: (**بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ**). واتە: بەناوی ئەو خوایەی كە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێ زەرەر و زیان ناگەیەنێ نە لەزەوی و نە لە ئاسماندا، ئەو خودایەیە كە بیسەر و بینایە، هیچ شتێ زیانی پێ ناگەیەنێ).

ئەبانی كوڕی پێشەوا (عُثْمَان) ئیفلیج بوو لایەكی شەلەل لێی دا، ئەو پیاوەی فەرموودەكەی لێ بیست سەیری كرد — وەك ئەوەی بڵێ خۆ تۆ ئەو ویردەت خوێندووە ئەی بۆچی ئیفلیج بووی — ، ئەبان پێی وت: ئەوە بۆچی بەو شێوەیە سەیرم دەكەی سوێند بە (الله) نە من بەناوی باوكمەوە درۆ دەكەم، نە باوكیشم بەناوی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم درۆ دەكات. بەڵام ئەو ڕۆژەی كە ئیفلیج بووم تورە بووم لەیادم چوو بیڵێم.

٣٣٨٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي سَعْدٍ سَعِيدِ بْنِ الْمَرْزُبَانِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ ثَوْبَانَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُمْسِي: رَضِيتُ بِاللهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يُرْضِيَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتـە: لـە (ثوبـان)ەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس سەر لە ئێواران بڵێ: (**رَضِيتُ بِاللّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا**). واتە: رازیم بە (الله) پەروەردگارم بێ و، ئیسلام دین و بەرنامەم بێ و، موحەممەد صلی الله علیـە وسـلم پێغەمبـەرم بێ، ئەوە دەبێ بە هەق لەسەر خوای گەورە کە رازی بکات).

٣٣٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَمْسَى قَالَ: أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، أُرَاهُ قَالَ،: لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ وَسُوءِ الكِبَرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ وَعَذَابِ القَبْرِ وَإِذَا أَصْبَحَ قَالَ ذَلِكَ أَيْضًا: أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ وَالحَمْدُ لِلَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، بِهَذَا الإِسْنَادِ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسـعودەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم ئێـوارەی لـێ دەهـات دەیفەرموو: (**أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ، وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ، وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَمِنْ سُوءِ الْكِبَرِ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ،**

**وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ)**. واتە: کەوتینە ئێوارەو هەر خوا خاوەنی موڵکە، سوپاس و ستایش بۆ خوا، هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، پەروەردگارم داوای ئەو خێرەت لێ دەکەم کە لەم شەوەدا هەیە، داوای خێری دوای ئەوەشت لێ دەکەم، پەنا دەگرم بە تۆ لەو شەڕ و خراپەیەی لەم شەوەدا هەیە، پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی دوای ئەوەش، پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە تەمەڵی و سەرەنجامی خرپ، پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای ناو گۆڕ و سزای ناو ئاگری دۆزەخ.

کاتێ کە بەیانی لێ دەهات دەیفەرموو: **(أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ)**. واتە: کەوتینە بەیانی و هەر خوا خاوەنی موڵکە...).

٣٣٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُهَيْلُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُ أَصْحَابَهُ يَقُولُ: إِذَا أَصْبَحَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ، وَإِذَا أَمْسَى فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاوەڵانی فێردەکرد دەیفەرموو: (هەرکەس لە ئێوە بەیانی بەسەردا هات با بڵێ: **(اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ)**. واتە: خودایە بە بخشش و نیعمەتی تۆوە بەیانی و شەومان بەسەردا هات و بە بخشش و نیعمەتی تۆوە دەژین و دەمرین، زیندووبوونەوەش هەر بۆ لای تۆ دەگەڕێتەوە).

(ئەگەر ئێوارەی بەسەردا هات با بڵێ: **(اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ**

**نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ**. واتە: خودایە بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە ئێوارەمان بەسەردا هات و، بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە دەژین و دەمرین، کاتێ زیندوودەبینەوە دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ).

## ١٤ - بَاب مِنْهُ

٣٣٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ عَاصِمٍ الثَّقَفِيَّ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللهِ مُرْنِي بِشَيْءٍ أَقُولُهُ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ؟ قَالَ: قُلْ: اللَّهُمَّ عَالِمَ الغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، قَالَ: قُلْهُ إِذَا أَصْبَحْتَ، وَإِذَا أَمْسَيْتَ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، چەند وشەیەکم فێر بکە هەتا بەیانیان و ئێواران بیانخوێنم، فەرمووی: (بڵێ: خودایە ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی زانا بە هەموو نهێنی و ئاشکرایە، ئەی پەروەردگار و پادشای هەموو شتێك، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە تۆ، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی نەفس و دەروونم، هەروەها لە شەڕ و خراپەی شەیتان و هاوتا دانانی). بەیانیان و ئێواران و کاتێ چویتە سەر جێگا خەوتنەکەشت هەم بیانخوێنە.

## ١٥ - بَاب مِنْهُ

٣٣٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى سَيِّدِ الاِسْتِغْفَارِ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، وَأَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَعْتَرِفُ بِذُنُوبِي، فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، لاَ يَقُولُهَا أَحَدُكُمْ حِينَ يُمْسِي فَيَأْتِي عَلَيْهِ قَدَرٌ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ، وَلاَ يَقُولُهَا حِينَ يُصْبِحُ فَيَأْتِي عَلَيْهِ قَدَرٌ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ أَبْزَى، وَبُرَيْدَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَعَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ هُوَ ابْنُ أَبِي حَازِمٍ الزَّاهِدُ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ.

واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووە: (ئایا ڕێنموونیت بکەم بۆ گەورەترین پاڕانەوەی لێخۆشبوون: **(اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، وَأَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَعْتَرِفُ بِذُنُوبِي، فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ)**.

واتە: خودایە تۆ پەروەردگاری منی، تۆ دروستت کردووم، منیش بەندەی تۆم، خودایە من لەسەر بەڵێن و پەیمانەکەی خۆمم کە بە تۆم داوە ئەوەندەی لە توانامدا هەبێ، خودایە پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و خراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە، خودایە دان بەوەدا دەنێم کە تۆ بەخشش و نیعمەتت بەسەردا ڕشتووم، دانیش بە تاوانەکانمدا دەنێم و داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم، هیچ کەسێکیش لە تاوانەکان خۆش نابێ جگە لە تۆ.

هەرکەس ئێوارەی لێهات بیخوێنێت ئەو شەوە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەس کەوتە بەیانی بیخوێنێت ئەو رۆژە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە.

## دەربارەی پاڕانەوەی کەسێ بچێتە سەر جێگای خەوتن

## ١٦ – بَاب مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ

٣٣٩٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيِّ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: أَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ تَقُولُهَا إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ، فَإِنْ مِتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ مِتَّ عَلَى الفِطْرَةِ، وَإِنْ أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ وَقَدْ أَصَبْتَ خَيْرًا، تَقُولُ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ قَالَ البَرَاءُ: فَقُلْتُ: وَبِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، قَالَ: فَطَعَنَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي، ثُمَّ قَالَ: وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ الْبَرَاءِ. وَرَوَاهُ مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنِ البَرَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ وَأَنْتَ عَلَى وُضُوءٍ. وَفِي الْبَابِ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم پێی فەرمووم: (ئایا چەند وشەیەکت فێرنەکەم کاتێ کە دەتەوێ بچیتە سەر جێگای خەوتنەکەت بیانلێی، جا ئەگەر لەپاش خوێندنی ئەم دوعایە لەو شەوەدا بمریت ئەوە لەسەر دینی پاکی ئیسلامەتی دەمریت، ئەگەر رۆشیت لێ بوویەوە تووشی خێر و خۆشی دەبیت:

(اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ). واتە: خودایە خۆم تەسلیمی تۆ کرد و کاروبارم بۆ لای تۆ گەڕاندەوە و سپاردم بە تۆ، پشتم بەستوە بە تۆ، ئومێدەوار و خۆشحاڵم بە پاداشتەکانت و دەترسم لە سزکانت، هیچ حەشارگەیەك نیە هەتا خۆم حەشار بدەم و هیچ رزگاربونێکیش نیە لە سزاکانت، جگە لەوە نەبێت کە بگەڕێمەوە بۆ لای تۆ، باوەڕم هێناوە بە قورئانەکەت کە داتبەزاندۆتە خوارەوە، هەروەها باوەڕیشم هێناوە بە پێغەمبەرەکەت کە موحەممەدە صلی الله علیه وسلم خۆت رەوانەت کردووە بۆ سەر خەڵك و جنۆکەکان.

بەم شێوەیەش هاتووە: (کاتێ کە دەتەوێ بچیتە سەر جێگای خەوتنەکەت وەك چۆن دەستنوێژ دەگریت بۆ نوێژ بەو شێوەیە دەستنوێژێکی جوان بگرە، لەپاشدا لەسەر لای راست راکشێ و بڵێ: (اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ......).

٣٣٩٥ - (ضعيف الإسناد، وقوله (وبرسولك) مخالف للحديث السابق) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ إِسْحَاقَ، ابْنِ أَخِي رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا اضْطَجَعَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَنْبِهِ الأَيْمَنِ ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، أُومِنُ بِكِتَابِكَ وَبِرَسُولِكَ، فَإِنْ مَاتَ مِنْ لَيْلَتِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ.

٣٣٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا، فَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُؤْوِيَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچووە سەرجێگای خەوتنەکەی دەیفەرموو: (**الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا، فَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُؤْوِيَ**). واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی نان و ئاومان دەداتێ و تێر خواردن و تێر ئاوی کردووین، بێ پێویستی کردووین لە دروستکراوەکانی و ڕەحمی پێ کردووین و جێگەو ڕێگەی حەوانەوەی پێ داوین، لەکاتێکدا کەسانێك هەن نەشوێنیان هەیە تێیدا بژین و نەکەسیش دەیانگرێتەخۆ).

## ١٧ - بَاب مِنْهُ

٣٣٩٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الوَصَّافِيِّ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يَأْوِي إِلَى فِرَاشِهِ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الحَيَّ القَيُّومَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، غَفَرَ اللَّهُ ذُنُوبَهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ وَرَقِ الشَّجَرِ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ رَمْلِ عَالِجٍ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ أَيَّامِ الدُّنْيَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ الوَصَّافِيِّ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ الوَلِيدِ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بچێتە سەر جێگای خەوتنەکەی و

سێ جار بلێ: (**أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الحَيُّ القَيُّومَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ**). واتە: داوای لێخۆشبوون دەكەم لەو خوایەی كە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لەو زیندوی هەڵسوڕێنەری بونەوەرە، دەگەڕێمەوە بۆلای، ئەوا خوای گەورە لە گوناهو تاوانەكانی خۆشدەبێت ئەگەرچی وەك كەفی دەریا بن، یان بەقەد گەڵای داران، یا بەقەد رملی كۆكراوە، یان بەقەد رۆژەكانی دونیا بن.

## ١٨ - بَاب مِنْهُ

٣٣٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ رَأْسِهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَجْمَعُ، أَوْ تَبْعَثُ، عِبَادَكَ.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (حذیفة)ی كوڕی یەمانەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێ دەیویست راكشێ دەستی راستی دەخستە ژێر كوڵمی، لەپاشدا دەیفەرموو: (**اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ**). واتە: خودایە بم پارێزە لە سزاكەت ئەو رۆژەی كە بەندەكانت زیندوو دەكەیتەوە كە رۆژی قیامەتە).

٣٣٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ يُوسُفَ بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَسَّدُ يَمِينَهُ عِنْدَ الْمَنَامِ، ثُمَّ يَقُولُ: رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَرَوَى

الثَّوْرِيُّ، هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ، لَمْ يَذْكُرْ بَيْنَهُمَا أَحَدًا. وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، وَرَجُلٌ آخَرَ، عَنِ البَرَاءِ. وَرَوَى إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ البَرَاءِ، وَعَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ.

واتـە: لـە بـەرائی کـوڕی عازیبـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ دەیویست ڕاکشێ دەستی ڕاستی دەکردە سەرین، لەپاشدا دەیفەرموو: (**اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ**). واتە: خودایە بم پارێزە لە سزاکەت ئەو ڕۆژەی کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە کە ڕۆژی قیامەتە.

## ١٩ - بَاب مِنْهُ

٣٤٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا إِذَا أَخَذَ أَحَدُنَا مَضْجَعَهُ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ، وَرَبَّ الأَرَضِينَ، وَرَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالقُرْآنِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذِي شَرٍّ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَالظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَالبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنَ الفَقْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمانی پـێ کـردین کـاتێ چووینە سـەر

جێگای خەوتن بڵێین: (**اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ، وَرَبَّ الأَرَضِينَ، وَرَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالقُرْآنِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذِي شَرٍّ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَالظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَالبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنَ الفَقْرِ**). واتە: خودایە ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، ئـەی پـەروەردگاری هەموو شتێك، تەقێنەرەی دانەوێڵـەو نـاوك و سـەوزکردنی، دابەزێنـەری تـەورات و ئینجیل و قورئان، پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و زیانی هـەموو ئـەو دروسـتکراوانەی خـۆت کـە جڵـەویان بـە دەسـت تۆیـە، خودایـە هـیچ شـتێکت لەپێشـەوە نـەبووەو دەمێنیت لەدوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان و بەهێز و بە توانایـت، هـیچ شتێکیش لەسەرووی تۆوە نیە، هەموو دروستکراوەکان پێویستیان بەتۆیەو کەسیش نیە هاوشێوەی تۆ بێ، سا خودایە قەرزاریمان لەسەر لابەرەو دەوڵەمەندیشـمان بکـە لە هەژاری).

## ٢٠ - بَاب مِنْهُ

٣٤٠١ - (حسن) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ عَنْ فِرَاشِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَلْيَنْفُضْهُ بِصَنِفَةِ إِزَارِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ بَعْدُ، فَإِذَا اضْطَجَعَ فَلْيَقُلْ: بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، فَإِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ، فَإِذَا اسْتَيْقَظَ فَلْيَقُلْ: الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي فِي جَسَدِي، وَرَدَّ عَلَيَّ رُوحِي وَأَذِنَ لِي بِذِكْرِهِ.

وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَعَائِشَةَ. وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ وَقَالَ: فَلْيَنْفُضْهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ.

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە یەکێ لەئێوە دەیەوێ بچێتە سەر جێگای خەوتنەکەیەوە با جێگەکەی بتەکێنێ چونکە ئێوە نازانن لەپاش ئێوە نوێنەکە چی تری تێ دەچێ — لەوانەیە مارێ یان دوپشکێ یا هەرشتێ زیان بگەیەنێ تێی چوبێ - لەپاشدا لەسەر لای راست راکشێ، ئینجا بڵێ: (**بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ**). واته: پەروەردگارم بە ناوی تۆ تەنیشتی خۆم لەسەر ئەم نوێنە دانا، بە پشتیوانی تۆش بەرزی دەکەمەوەو لەخەو هەڵەسم، خودایە خۆ ئەگەر لەم خەوەدا روحەکەمت گرتەوەو روحت کێشام رەحمی پێ بکە، خۆ ئەگەر گەڕاندیشتەوەو لەم خەوە خەبەرم دەکەیتەوە ئەوا بیپارێزە لە تاوان و لە زیانی شەیتان و ئاگات لێی بێ، بەوەی کە بەندە چاکەکانی خۆتی پێ دەپارێزیت. کاتێ هەستا لەخەو بڵێ: (**الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي فِي جَسَدِي، وَرَدَّ عَلَيَّ رُوحِي وَأَذِنَ لِي بِذِكْرِهِ**). واته: سوپاس بۆ ئەو خوایەی روحی بۆ گێڕامەوە، ساغ و سەلامەتی کردم لە جەستەمدا، مۆڵەتیدام یادی بکەمەوە.

### دەربارەی قورئان خوێندنی کەسێ لەکاتی خەودا.

### ٢١ - بَاب مَا جَاءَ فِيمَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ عِنْدَ الْمَنَامِ

٣٤٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُفَضَّلُ بْنُ فَضَالَةَ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى

فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ، جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا، فَقَرَأَ فِيهِمَا: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ، وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەچووە سەرجێگای خەوتنەکەی هەموو شەوێ هەردوو لەپی خۆی دانا بەیەکەوەو فووی پێدا دەکردن، ئینجا ئەم سێ سورەتەی پێدا دەخوێندن: **(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)** و **( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ)** و **(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)**. لەپاشدا دەیهێنان بەجەستەی خۆیدا ئەوەندەی کە دەستی پێ بگەیشتایە، لەپێشدا دەیهێنان بە سەر و ڕوخساریدا ئینجا بە بەری جەستەیدا، پاشان بەودیوی جەستەیدا، سێ جار ئەو کارەی دەکرد.

## ٢٢ - بَاب مِنْهُ

٣٤٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلِّمْنِي شَيْئًا أَقُولُهُ إِذَا أَوَيْتُ إِلَى فِرَاشِي، قَالَ: اقْرَأْ: قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ قَالَ شُعْبَةُ: أَحْيَانًا يَقُولُ مَرَّةً وَأَحْيَانًا لاَ يَقُولُهَا. حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ حِزَامٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ، وَهَذَا أَصَحُّ. وَرَوَى زُهَيْرٌ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَهَذَا أَشْبَهُ وَأَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ شُعْبَةَ، وَقَدْ

اضْطَرَبَ أَصْحَابُ أَبِي إِسْحَاقَ فِي هَذَا الحَدِيثِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ، قَدْ رَوَاهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ نَوْفَلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ هُوَ: أَخُو فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ.

واتە: فەروەی کوڕی نەوفل ڕەزای خوای لێ بێ هاتە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شتێکم فێر بکە کاتێ چوومە سەرجێگای خەوتن بیخوێنم، فەرمووی: **(قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ)** بەتەواوی بخوێنە، چونکە بێگومان خوێندنی ئەم سورەتە بەری بوونە لە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان).

٣٤٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُونُسَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ بِتَنْزِيلُ السَّجْدَةِ، وَبِتَبَارَكَ. وَهَكَذَا رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَرَوَى زُهَيْرٌ، هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: سَمِعْتَهُ مِنْ جَابِرٍ؟ قَالَ: لَمْ أَسْمَعْهُ مِنْ جَابِرٍ، إِنَّمَا سَمِعْتُهُ مِنْ صَفْوَانَ، أَوْ ابْنِ صَفْوَانَ. وَقَدْ رَوَى شَبَابَةُ، عَنْ مُغِيرَةَ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، نَحْوَ حَدِيثِ لَيْثٍ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەدەخەوت هەتا سورەتی (السجدة) و سورەتی (الملك)ی نەخوێندایە.

٣٤٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي لُبَابَةَ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ، كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الزُّمَرَ، وَبَنِي إِسْرَائِيلَ. أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: أَبُو لُبَابَةَ هَذَا اسْمُهُ: مَرْوَانُ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زِيَادٍ، وَسَمِعَ مِنْ عَائِشَةَ، سَمِعَ مِنْهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەدەخەوت هەتا سورەتی (الزمر) و سورەتی (بنی اسرائیل)ی نەخوێندایە.

٣٤٠٦ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا بَقِيَّةُ بْنُ الوَلِيدِ، عَنْ بَحِيرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بِلاَلٍ، عَنِ العِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الْمُسَبِّحَاتِ، وَيَقُولُ: فِيهَا آيَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ آيَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عرباض)ی كوڕی ساریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەدەخەوت هەتا ئەو سورەتانەی نەخوێندایە كە بە: **(سُبْحَانَ)** یان **(سَبَّحَ)** یا **(يُسَبِّحُ)** یان **(سَبِّحْ)** دەست پێ دەكەن - ژمارەیان حەوت سورەتە: **(سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى وَالْحَدِيدُ وَالْحَشْرُ وَالصَّفُّ وَالْجُمُعَةُ وَالتَّغَابُنُ وَالْأَعْلَى)**. دەیفەرموو: ئایەتێكی تێدایە خێری هەزار ئایەتی هەیە.

**٢٣ - بَاب مِنْهُ**

٣٤٠٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي العَلاَءِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ رَجُلٍ مَنْ بَنِي حَنْظَلَةَ، قَالَ: صَحِبْتُ شَدَّادَ بْنَ أَوْسٍ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ: أَلاَ أُعَلِّمُكَ مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا أَنْ نَقُولَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فِي الأَمْرِ، وَأَسْأَلُكَ عَزِيمَةَ الرُّشْدِ، وَأَسْأَلُكَ شُكْرَ نِعْمَتِكَ، وَحُسْنَ عِبَادَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ لِسَانًا صَادِقًا، وَقَلْبًا سَلِيمًا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا تَعْلَمُ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا تَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ مِمَّا تَعْلَمُ إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الغُيُوبِ.

واتە: لە پیاوێكی بەنی (حَنْظَلَةَ)وە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە سەفەرێكدا

لە خزمەت شەدادی کوڕی ئەوسدا بووم فەرمووی: ئایا پاڕانەوەیەکت فێر نەکەم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فێری کردووین کە بڵێین: (خودایە لەسەر کاری خێر بەردەوام و دامەزراومان بکە، توانام پێ بدە لەسەر ژیری و ڕێی راست، داوات لێ دەکەم وام لێ بکە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانت بم و، بە چاکی بتپەرستم، خودایە داوای زمانێکی راستگۆ و دڵێکی ساغت لێ دەکەم، پەنا ئەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی ئەو شتانەی کە تۆ دەزانی شەڕ و خراپەیان تێدایە، خودایە داوای خێری ئەو شتانەت لێ دەکەم کە تۆ دەزانی خێریان تێدایە، خودایە داوای لێبوردنی ئەو تاوانانەت لێ دەکەم کە تۆ خۆت دەیانزانی).

٣٤٠٧ (م) - (ضعيف) قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَأْخُذُ مَضْجَعَهُ، يَقْرَأُ سُورَةً مِنْ كِتَابِ اللهِ، إِلاَّ وَكَّلَ اللَّهُ بِهِ مَلَكًا، فَلاَ يَقْرَبُهُ شَيْءٌ يُؤْذِيهِ حَتَّى يَهُبَّ مَتَى هَبَّ. هَذَا حَدِيثٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالجُرَيْرِيُّ هُوَ: سَعِيدُ بْنُ إِيَاسٍ أَبُو مَسْعُودٍ الجُرَيْرِيُّ، وَأَبُو العَلاَءِ اسْمُهُ: يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ.

فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ بشێت سەر جێگا خەوتنەکەی سورەتێ لە قورئان بخوێنێ، ئیللا خوای گەورە مەلائیکەیە رائەسپێرێ و فەرمانی پێ دەکات کە پاسەوانی بکات هیچ شتێ زایانی پێ نەگەیەنێ هەتا خەبەری دەبێتەوە ئیتر هەرچەندە بخایەنێ).

### دەربارەی (سبحان الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) لەکاتی خەوتندا

### ٢٤ - بَاب مَا جَاءَ فِي التَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ وَالتَّحْمِيدِ عِنْدَ الْمَنَامِ

٣٤٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الخَطَّابِ زِيَادُ بْنُ يَحْيَى البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَزْهَرُ السَّمَّانُ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: شَكَتْ إِلَيَّ

فَاطِمَةُ مَجْلَ يَدَيْهَا مِنَ الطَّحِينِ، فَقُلْتُ: لَوْ أَتَيْتِ أَبَاكِ فَسَأَلْتِهِ خَادِمًا، فَقَالَ: أَلاَ أَدُلُّكُمَا عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنَ الخَادِمِ؟ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضْجَعَكُمَا تَقُولاَنِ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَأَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ مِنْ تَحْمِيدٍ وَتَسْبِيحٍ وَتَكْبِيرٍ وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَوْنٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عَلِيٍّ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (فاطمة) ڕەزای خوای لێ بێ ئەوەندە هەویری شێلا بوو دەستەکانی بلّقیان کردبوو بۆیە سکالاّی کرد لەلام منیش پێم وت: بچۆ بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلّکو خزمەتکارێکت بداتێ بۆ خزمەتکردنت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئاگاداربن شتێکتان نیشان دەدەم لە خزمەتکار چاکترە بۆتان، کاتێ کە چوونە سەر جێگا خەوتنەکەتان سی و سێ جار بڵێن: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێن: (الحَمدُ لِله)، سی و چوار جار بڵێن: (اللَّهُ أكبَر).

٣٤٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَزْهَرُ السَّمَّانُ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَشْكُو مَجْلَ يَدَيْهَا، فَأَمَرَهَا بِالتَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ وَالتَّحْمِيدِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە (فاطمة) ڕەزای خوای لێ بێ ئەوەندە هەویری شێلا بوو دەستەکانی بلّقیان کردبوو بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سکالاّی کرد لەلای، ئەویش فەرمانی پێ کرد بە وتنی: (سبحان الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله).

## ٢٥ - بَاب مِنْهُ

٣٤١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَلَّتَانِ لاَ يُحْصِيهِمَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ، أَلاَ وَهُمَا يَسِيرٌ، وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ: يُسَبِّحُ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ عَشْرًا، وَيَحْمَدُهُ عَشْرًا، وَيُكَبِّرُهُ عَشْرًا، قَالَ: فَأَنَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْقِدُهَا بِيَدِهِ، قَالَ: فَتِلْكَ خَمْسُونَ، وَمِائَةٌ بِاللِّسَانِ، وَأَلْفٌ وَخَمْسُ مِائَةٍ فِي الْمِيزَانِ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ تُسَبِّحُهُ وَتُكَبِّرُهُ وَتَحْمَدُهُ مِائَةً، فَتِلْكَ مِائَةٌ بِاللِّسَانِ، وَأَلْفٌ فِي الْمِيزَانِ، فَأَيُّكُمْ يَعْمَلُ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ أَلْفَيْنِ وَخَمْسَمِائَةِ سَيِّئَةٍ؟ قَالُوا: فَكَيْفَ لاَ نُحْصِيهَا؟ قَالَ: يَأْتِي أَحَدَكُمُ الشَّيْطَانُ وَهُوَ فِي صَلاَتِهِ، فَيَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا، اذْكُرْ كَذَا، حَتَّى يَنْفَتِلَ، فَلَعَلَّهُ أَلاَّ يَفْعَلَ، وَيَأْتِيهِ وَهُوَ فِي مَضْجَعِهِ، فَلاَ يَزَالُ يُنَوِّمُهُ حَتَّى يَنَامَ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، هَذَا الْحَدِيثَ، وَرَوَى الأَعْمَشُ، هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ مُخْتَصَرًا. وَفِي الْبَابِ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دوو شت هەن هەر بەندەیەكی موسوڵمان پارێزگاریان لێ بكات و بەردەوام بێ لەسەریان ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەو دوانەش ئاسانن، بەڵام ئەوانەی كاریان پێ دەكەن كەمن، ئەوەیە لەدوای هەموو نوێژێكی فەرزەوە دە جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللّٰه)، دە جار بڵێ: (الحَمدُ لِله)، دە جار بڵێ: (اللّٰهُ أَكْبَر). (عبد الله) فەرمووی: بەڕاستی پێغەمبەری خوام صلى الله علیه وسلم بینی بە پەنجەكانی دەستی ڕاستی ئەم ویردانەی دەژمارد،

فەرمووی: (ئەوە لە شەو و ڕۆژێكدا بە زمان دەكاتە سەدو پەنجا، بەلاّم بەكێشانی تەرازووی كردەوەكان دەكاتە هەزار و پێنج سەد، لەكاتی خەوتندا سی و سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللّه)، سی و سێ جار بڵێ: (الحَمدُ لِله)، سی و چوار جار بڵێ: (اللّهُ أَكْبَر)، ئەوە بە زمان دەكاتە سەد، بەلاّم بەكێشانی تەرازووی كردەوەكان دەكاتە هەزار، دەی كێ لەئێوە دوو هەزار و پێنج سەد تاوان دەكات؟). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن ئەو دوانە ناكەن لەكاتێكدا كە ئاسانن؟ فەرمووی: (كاتێ یەكێ لەئێوە لە نوێژدایە شەیتان دێت بۆ لای دەڵێ: یادی ئەوە و ئەوە بكە، یادی ئەوە و ئەوە بكە ئیش و كارێكی خۆی بیردەخاتەوە پێش ئەوەی بیانخوێنێ، لەكاتی خەوتنیشدا شەیتان دێت دەیخەوێنێ پێش ئەوەی بیانخوێنێ).

٣٤١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَثَّامُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الأَعْمَشِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بە پەنجەكانی دەستی ڕاستی تەسبیحاتی دەكرد.

٣٤١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ سَمُرَةَ الأَحْمَسِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَسْبَاطُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ قَيْسٍ الْمُلاَئِيُّ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مُعَقِّبَاتٌ لاَ يَخِيبُ قَائِلُهُنَّ، تُسَبِّحُ اللهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتَحْمَدُهُ ثَلاَثًا

وَثَلاَثِينَ، وَتُكَبِّرُهُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَعَمْرُو بْنُ قَيْسٍ الْمُلاَئِيُّ ثِقَةٌ حَافِظٌ. وَرَوَى شُعْبَةُ، هَذَا الحَدِيثَ عَنِ الحَكَمِ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَرَوَاهُ مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ، عَنِ الحَكَمِ، وَرَفَعَهُ.

واتە: لە كەعبی كوڕی عوجرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (چەند وشەيە هەيە لەدوای نوێژە فەرزەكانەوە دەوترێن دەبن بە پاشكۆيان، هەركەس بيانڵێ نائومێد نابێ: لەدوای هەموو نوێژێكەوە سی و سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللّه)، سی و سێ جار بڵێ: (الحَمدُ لله)، سی و چوار جار بڵێ: (اللّهُ أكْبَر).

٣٤١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ أَفْلَحَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: أُمِرْنَا أَنْ نُسَبِّحَ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَنَحْمَدَهُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَنُكَبِّرَهُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ، قَالَ: فَرَأَى رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْمَنَامِ، فَقَالَ: أَمَرَكُمْ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم أَنْ تُسَبِّحُوا فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتَحْمَدُوا اللهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتُكَبِّرُوا أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَاجْعَلُوا خَمْسًا وَعِشْرِينَ، وَاجْعَلُوا التَّهْلِيلَ مَعَهُنَّ، فَغَدَا عَلَى النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فَحَدَّثَهُ، فَقَالَ: افْعَلُوا. قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زەيدی كوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموويەتی: فەرمانمان پێ كراوە لەدوای هەموو نوێژێكەوە سی و سێ جار بڵێين: (سُبْحَانَ اللّه)، سی و سێ جار بڵێين: (الحَمدُ لله)، سی و چوار جار بڵێين: (اللّهُ أكْبَر). فەرمووی: پياوێكی ئەنصاری لەخەودا دی، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ كردوون لەدوای هەموو نوێژێكەوە سی و سێ

جار بڵێن: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێن: (الحَمدُ لِله)، سی و چوار جار بڵێن: (اللَّهُ أَكْبَر)، فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: بیکەن بە بیست و پێنج، (لا اله الا الله)یشی لەگەڵ بڵێن، بۆ بەیانی خەوەکەی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە، فەرمووی: (بیلێن).

## دەربارەی پاڕانەوەی کەسێ لەشەوا خەوی بزڕێ

## ٢٦ - بَاب مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ إِذَا انْتَبَهَ مِنَ اللَّيْلِ

٣٤١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ أَبِي رِزْمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَيْرُ بْنُ هَانِئٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي جُنَادَةُ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَالحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)، ثُمَّ قَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي، أَوْ قَالَ: ثُمَّ دَعَا، اسْتُجِيبَ لَهُ، فَإِنْ عَزَمَ وَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى قُبِلَتْ صَلاَتُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك خەوی زڕا بڵێ: **(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)**. لەپاشدا بپاڕێتەوەو بڵێ: **(رَبِّ اغْفِرْ لِي)**. واتە: ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبە). وەلید وتی: یان فەرمووی: ئەگەر پاڕایەوە ئەوە پاڕانەوەکەی قبوڵ دەبێ، ئەگەر هەستا دەسنوێژی گرت و نوێژی کرد ئەوە نوێژەکەی قبوڵ دەبێ).

٣٤١٥ - (ضعيف الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَسْلَمَةُ بْنُ عَمْرٍو، قَالَ: كَانَ عُمَيْرُ بْنُ هَانِئٍ، يُصَلِّي كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ سَجْدَةٍ، وَيُسَبِّحُ مِائَةَ أَلْفِ تَسْبِيحَةٍ.

واتە: لە مەسلەمەی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: عومەیری كوڕی هانی هەموو ڕۆژێ هەزار ركات نوێژ و سەد هەزار تەسبیحاتی دەكرد.

## ٢٧ - بَاب مِنْهُ

٣٤١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، وَوَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، وَأَبُو عَامِرٍ الْعَقَدِيُّ، وَعَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الْوَارِثِ، قَالُوا: حَدَّثَنَا هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي رَبِيعَةُ بْنُ كَعْبٍ الأَسْلَمِيُّ، قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ عِنْدَ بَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأُعْطِيهِ وَضُوءَهُ، فَأَسْمَعُهُ الْهَوِيَّ مِنَ اللَّيْلِ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَأَسْمَعُهُ الْهَوِيَّ مِنَ اللَّيْلِ يَقُولُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ڕەبیعەی كوڕی كەعبی ئەسلەمیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: شەو لەبەردەم دەرگای هۆدەكەی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خەوتبووم، ئاوی دەستنوێژم دایە ماوەیەكی زۆر لەشەو گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (**سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ**). هەروەها ماوەیەكی زۆر لەشەو گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (**الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**).

## ٢٨ - بَاب مِنْهُ

٣٤١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُجَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ الْهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ، قَالَ: اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا وَإِذَا اسْتَيْقَظَ، قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَا نَفْسِي بَعْدَ مَا أَمَاتَهَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (حُذَيْفَةَ)ی کوڕی یەمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیویست بخەوێ دەیفەرموو: (**اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا**). واتە: خودایە بە ناوی تۆ دەمرم و دەژیم. وە کاتێ لەخەو هەستایە دەیفەرموو: (**الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَا نَفْسِي بَعْدَ مَا أَمَاتَهَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ**). واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیانی بە بەرهێنامەوە دوای ئەوەی کە مراندی، زیندوبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

## دەربارەی کاتێ کەسێ لەخەو هەستا بۆ شەونوێژ چی بڵێ

## ٢٩ - بَاب مَا جَاءَ مَا يَقُولُ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ إِلَى الصَّلَاةِ

٣٤١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، يَقُولُ: (اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ

حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، إِنَّكَ إِلَهِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەنیوە شەودا هەڵئەسا بۆ شەونوێژ دەیفەرموو: ((**اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الحَقُّ، وَوَعْدُكَ الحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، إِنَّكَ إِلَهِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ**). واتە: خودایە! سوپاس و ستایش بۆ تۆیە، تۆ نورو ڕوناکی ئاسمانەکان و زەویت، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆیە تۆ هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکان و زەویت، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆیە تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەو شتانەی کەتیایدان، تۆ حەقیت، وتەکەت حەقە، پەیمانەکەشت حەقە، وە گەیشتن بە تۆ حەقە، ئاگری دۆزەخ حەقە، بەهەشت حەقە، ڕۆژی قیامەت حەقە، خودایە من خۆم سپاردووە بە تۆ، باوەڕیشم بەتۆ هێناوە، پشتم بە تۆ بەستوە، گەڕامەتەوە بۆلای تۆ، بە پشتیوانی تۆ بەرپەرچی دوژمنانم دەدەمەوە، حوکمی کێشەی خۆم و ئەو کەسەی مل نادات بۆ حەق دێنمەوە بۆلای تۆ، سا لەو گوناهانەم خۆشبە کە پێشم خستوەو لەوانەش کەدوام خستوە، ئەوەی کە بە پەنهانی ئەنجامم داوەو ئەوەشی کەئاشکرام کردووە، هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لەتۆ).

## ٣٠ - بَاب مِنْهُ

٣٤١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عِمْرَانَ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنْ دَاوُدَ بْنِ عَلِيٍّ هُوَ ابْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَيْلَةً حِينَ فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِكَ تَهْدِي بِهَا قَلْبِي، وَتَجْمَعُ بِهَا أَمْرِي، وَتَلُمُّ بِهَا شَعَثِي، وَتُصْلِحُ بِهَا غَائِبِي، وَتَرْفَعُ بِهَا شَاهِدِي، وَتُزَكِّي بِهَا عَمَلِي، وَتُلْهِمُنِي بِهَا رُشْدِي، وَتَرُدُّ بِهَا أُلْفَتِي، وَتَعْصِمُنِي بِهَا مِنْ كُلِّ سُوءٍ، اللَّهُمَّ أَعْطِنِي إِيمَانًا وَيَقِينًا لَيْسَ بَعْدَهُ كُفْرٌ، وَرَحْمَةً أَنَالُ بِهَا شَرَفَ كَرَامَتِكَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الفَوْزَ فِي الْقَضَاءِ، وَنُزُلَ الشُّهَدَاءِ، وَعَيْشَ السُّعَدَاءِ، وَالنَّصْرَ عَلَى الأَعْدَاءِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أُنْزِلُ بِكَ حَاجَتِي، وَإِنْ قَصُرَ رَأْيِي وَضَعُفَ عَمَلِي، افْتَقَرْتُ إِلَى رَحْمَتِكَ، فَأَسْأَلُكَ يَا قَاضِيَ الأُمُورِ، وَيَا شَافِيَ الصُّدُورِ، كَمَا تُجِيرُ بَيْنَ الْبُحُورِ أَنْ تُجِيرَنِي مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ، وَمِنْ دَعْوَةِ الثُّبُورِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقُبُورِ، اللَّهُمَّ مَا قَصُرَ عَنْهُ رَأْيِي، وَلَمْ تَبْلُغْهُ نِيَّتِي، وَلَمْ تَبْلُغْهُ مَسْأَلَتِي مِنْ خَيْرٍ وَعَدْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، أَوْ خَيْرٍ أَنْتَ مُعْطِيهِ أَحَدًا مِنْ عِبَادِكَ، فَإِنِّي أَرْغَبُ إِلَيْكَ فِيهِ، وَأَسْأَلُكَهُ بِرَحْمَتِكَ رَبَّ الْعَالَمِينَ، اللَّهُمَّ ذَا الحَبْلِ الشَّدِيدِ، وَالأَمْرِ الرَّشِيدِ، أَسْأَلُكَ الأَمْنَ يَوْمَ الوَعِيدِ، وَالجَنَّةَ يَوْمَ الخُلُودِ، مَعَ الْمُقَرَّبِينَ الشُّهُودِ الرُّكَّعِ، السُّجُودِ الْمُوفِينَ بِالعُهُودِ، إِنَّكَ رَحِيمٌ وَدُودٌ، وإِنَّكَ تَفْعَلُ مَا تُرِيدُ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنَا هَادِينَ مُهْتَدِينَ، غَيْرَ ضَالِّينَ وَلاَ مُضِلِّينَ، سِلْمًا لأَوْلِيَائِكَ، وَعَدُوًّا لأَعْدَائِكَ، نُحِبُّ بِحُبِّكَ مَنْ أَحَبَّكَ، وَنُعَادِي بِعَدَاوَتِكَ مَنْ خَالَفَكَ، اللَّهُمَّ هَذَا الدُّعَاءُ وَعَلَيْكَ الإِجَابَةُ، وَهَذَا الجُهْدُ وَعَلَيْكَ التُّكْلاَنُ، اللَّهُمَّ اجْعَلْ لِي نُورًا فِي قَلْبِي، وَنُورًا فِي قَبْرِي، وَنُورًا مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَنُورًا مِنْ خَلْفِي، وَنُورًا عَنْ يَمِينِي، وَنُورًا عَنْ شِمَالِي، وَنُورًا مِنْ فَوْقِي، وَنُورًا مِنْ تَحْتِي، وَنُورًا فِي سَمْعِي، وَنُورًا فِي بَصَرِي، وَنُورًا فِي شَعْرِي، وَنُورًا فِي

اللَّهُمَّ اصْحَبْنَا فِي سَفَرِنَا، وَاخْلُفْنَا فِي أَهْلِنَا، وَكَانَ يَقُولُ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ: آيِبُونَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَائِبُونَ، عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەفەری دەكرد سواری وڵاخەكەی دەبوو سێ جار دەیفەرموو: (الله أكبر)، جا دەیفەرموو: (**سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا، وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ**). سورة الزخرف: ١٣ – ١٤. واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی كە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین كە ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو. وە بەڕاستی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. لەپاشدا دەیفەرموو: (خودایە ئێمە لەم سەفەرەماندا داوای كردەوەی چاك و ڕەفتاری جوان و تەقوات لێ دەكەین، داوای كارێكت لێ دەكەین كە پێی ڕازی بیت، خوایە ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بكەیت و دوریەكەیان بۆ نزیك بكەیتەوە، خوایە تۆ ئاگات لێمانە لەم سەفەرەماندا تۆ پارێزەری كەسوكار و ماڵ و منداڵیشمانی). كاتێ كە دەگەڕایەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی دەیفەرموو: (گەڕاینەوە لەبێ ئاگایی، بە تەوبەكردن و پەرستشەوە، ستایشی پەروەردگارمان دەكەین).

## ٤٨ – بَابٌ

٣٤٤٨ – (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ الصَّوَّافُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ: دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هِشَامٍ الدَّسْتُوَائِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَزَادَ فِيهِ:

مُسْتَجَابَاتٌ لاَ شَكَّ فِيهِنَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو جَعْفَرٍ، هَذَا الَّذِي رَوَى عَنْهُ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، يُقَالُ لَهُ: أَبُو جَعْفَرٍ الْمُؤَذِّنُ، وَقَدْ رَوَى عَنْهُ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ غَيْرَ حَدِيثٍ، وَلاَ نَعْرِفُ اسْمَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سێ پاڕانەوە گیرادەبن: پاڕانەوەی ستەم لێکراو، پاڕانەوەی موسافیر، پاڕانەوەی باوك و دایك بۆ منداڵی خۆیان).

## کاتی هەڵکردنی بای توند چی بڵێ

## ٤٩ - بَاب مَا يَقُولُ إِذَا هَاجَتِ الرِّيحُ

٣٤٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَسْوَدِ أَبُو عَمْرٍو الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رَأَى الرِّيحَ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا، وَخَيْرِ مَا فِيهَا، وَخَيْرِ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ .. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بایەکی توندی دەبینی هەڵێ دەکرد، دەیفەرموو: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا، وَخَيْرِ مَا فِيهَا، وَخَيْرِ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ**). واتە: خوایە من داوای خێری ئەم بایەت لێ دەکەم، وە خێری ئەوەی تێیدایە، هەروەها خێری ئەوەش کە بۆی ڕەوانەکراوە، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی ئەم بایە، وە خراپەی ئەوەی تێیدایە، هەروەها خراپەی ئەوەش کە بۆی ڕەوانەکراوە.

## كەسێ گوێی لە هەورە گرمە بێ چی بڵێ

## ٥٠ - بَاب مَا يَقُولُ إِذَا سَمِعَ الرَّعْدَ

٣٤٥٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، عَنِ الْحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ أَبِي مَطَرٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا سَمِعَ صَوْتَ الرَّعْدِ وَالصَّوَاعِقِ، قَالَ: اللَّهُمَّ لاَ تَقْتُلْنَا بِغَضَبِكَ، وَلاَ تُهْلِكْنَا بِعَذَابِكَ، وَعَافِنَا قَبْلَ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە سالیمی كوڕی (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لەدەنگی هەورە گرمە دەبوو دەیفەرموو: (خودایە بە توڕەیی خۆت نەمانكوژیت، وە بە سزای خۆت لەناومان نەبەیت، پێش ئەوە سەلامەتمان بكە).

## كەسێ مانگی یەك شەوەی دی چی بڵێ

## ٥١ - بَاب مَا يَقُولُ عِنْدَ رُؤْيَةِ الْهِلاَلِ

٣٤٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ الْعَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ سُفْيَانَ الْمَدِينِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي بِلاَلُ بْنِ يَحْيَى بْنِ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ قَالَ: اللَّهُمَّ أَهْلِلْهُ عَلَيْنَا بِالْيُمْنِ وَالإِيمَانِ وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ، رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (طلحة)ی كوڕی (عبيد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مانگی یەك شەوەی دەبینی دەیفەرموو:

(خودایە بە ئاسایش و باوەڕ و سەلامەتی و ئیسلام هەڵیبێنەوە بەسەرماندا، پەروەردگاری من و تۆیش (الله)یە).

## دەربارەی كەسێ تووڕە بوو چی بڵێ

## ٥٢ - بَاب مَا يَقُولُ عِنْدَ الغَضَبِ

٣٤٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى عُرِفَ الغَضَبُ فِي وَجْهِ أَحَدِهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ غَضَبُهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ.

حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، عَنْ سُفْيَانَ، نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ .. وَهَذَا حَدِيثٌ مُرْسَلٌ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى لَمْ يَسْمَعْ مِنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ وَمَاتَ مُعَاذٌ فِي خِلاَفَةِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَقُتِلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى غُلاَمٌ ابْنُ سِتِّ سِنِينَ. هَكَذَا رَوَى شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَرَآهُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى يُكْنَى أَبَا عِيسَى، وَأَبُو لَيْلَى اسْمُهُ: يَسَارٌ وَرُوِيَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، قَالَ: أَدْرَكْتُ عِشْرِينَ وَمِائَةً مِنَ الأَنْصَارِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (معاذ)ی كوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: دوو پیاو لەخزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم قسەیان بە یەكتر وت، یەكێكیان ئەوەندە تووڕە بوو بە ناوچاویەوە دیار بوو، فەرمووی: (من وشەیە ئەزانم ئەگەر بیڵێ تووڕەییەكەی نامێنێ ئەویش بریتیە لە: (**أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ**)).

## دەربارەی کەسێ خەوێکی ناخۆشی دی چی بڵێ

## ٥٣ - بَاب مَا يَقُولُ إِذَا رَأَى رُؤْيَا يَكْرَهُهَا

٣٤٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنِ ابْنِ الْهَادِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ اللهِ فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَلَيْهَا وَلْيُحَدِّثْ بِمَا رَأَى، وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُهُ فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنْ شَرِّهَا وَلاَ يَذْكُرْهَا لأَحَدٍ فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. وَابْنُ الْهَادِ اسْمُهُ: يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أُسَامَةَ بْنِ الْهَادِ الْمَدِينِيُّ وَهُوَ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الْحَدِيثِ رَوَى عَنْهُ مَالِكٌ، وَالنَّاسُ.

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەگەر کەسێکتان خەوێکی خۆشی بینی و پێی خۆش بوو ئەوە لەخواوەیە، با سوپاسی خوا بکات و باسیشی بکات، ئەگەر شێکی تری دی و پێی ناخۆش بوو ئەوە لە شەیتانەوەیە، با پەنا بگرێ بە خوا و لای کەس باسی نەکات، ئیتر زیانی پێ ناگەیەنێ).

## کەسێ نۆبەرەی بەروبومی دی چی بڵێ

## ٥٤ - بَاب مَا يَقُولُ إِذَا رَأَى الْبَاكُورَةَ مِنَ الثَّمَرِ

٣٤٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ النَّاسُ إِذَا رَأَوْا أَوَّلَ الثَّمَرِ جَاءُوا بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا أَخَذَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثِمَارِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَمُدِّنَا، اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ عَبْدُكَ وَخَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ وَإِنِّي عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنَّهُ دَعَاكَ لِمَكَّةَ وَأَنَا أَدْعُوكَ لِلْمَدِينَةِ بِمِثْلِ مَا دَعَاكَ بِهِ لِمَكَّةَ وَمِثْلِهِ مَعَهُ، ثُمَّ يَدْعُو أَصْغَرَ وَلِيدٍ يَرَاهُ فَيُعْطِيهِ ذَلِكَ الثَّمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ خەڵك نۆبەرەی بەروبومیان دەدی دەیاهێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کە لێی وەردەگرتن دەیفەرموو: (خودایە بەرەکەت بڕێژە بەسەر بەروبووم و میوەهاتماندا، بەسەر شارەکەماندا، بەسەر عەیارە و مەن و مشتماندا، خودایە ئیبراهیم بەندە و هاوڕێ و پەیامبەری تۆیە، منیش بەندە و پەیامبەری تۆم، ئەو دوعای کرد بۆ مەککە، منیش دوعا دەکەم بۆ مەدینە بە وێنەی دوعاکەی ئەو ئەوەندەی تریش). لەپاشدا بچوکترین منداڵی بانگ دەکرد و دەیدایە دەستی.

## ئەگەر کەسێ خواردنێ بخوات چی بلێ

## ٥٥ - بَاب مَا يَقُولُ إِذَا أَكَلَ طَعَامًا

٣٤٥٥ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عُمَرَ وَهُوَ ابْنُ أَبِي حَرْمَلَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَخَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ عَلَى مَيْمُونَةَ فَجَاءَتْنَا بِإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ فَشَرِبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا عَلَى يَمِينِهِ وَخَالِدٌ عَلَى شِمَالِهِ، فَقَالَ لِي: الشَّرْبَةُ لَكَ، فَإِنْ شِئْتَ آثَرْتَ بِهَا خَالِدًا، فَقُلْتُ: مَا كُنْتُ أُوثِرُ عَلَى سُؤْرِكَ أَحَدًا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَطْعَمَهُ اللَّهُ الطَّعَامَ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ، وَمَنْ سَقَاهُ اللَّهُ لَبَنًا فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ. وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ شَيْءٌ يَجْزِي مَكَانَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ غَيْرُ اللَّبَنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، فَقَالَ: عَنْ عُمَرَ بْنِ حَرْمَلَةَ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: عَمْرُو بْنُ حَرْمَلَةَ، وَلاَ يَصِحُّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ من و خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووینە ماڵی مەیمونە قاپێ شیری بۆ هێناین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردیەوە، من لەلای ڕاستیەوە بووم خالیدیش لای چەپیەوە بوو، فەرمووی: (هەقی تۆیە چونکە لەلای ڕاستەوەی بەڵام ئەگەر بیدەی بە خالید ئەوە بەدەست خۆتە خۆت هەڵی بژێرە)، وتم: ئەوە ناکەم کەس هەڵنابـژێرم پێش خۆم دەمی بەر جێ دەمی تۆ بکەوێ، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (هەرکەسێ لەئێوە ئەگەر خواردنێکی خوارد با بڵێت: (**اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ**). خوایە پیت و بەرەکەتی تێخەو لەم خواردنە چاکترمان بدەرێ،

کاتێکیش کە شیری خواردەوە با بڵێت: (**اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ**). خوایە پیت و بەرەکەتی تێخەو بۆمانی زیاد بکە، هەروەها فەرمووی: (جگە لەشیر هیچ شتێ بری خواردن و خواردنەوە ناکەوێت).

## ئەگەر کەسێ لە خواردن بوویەوە چی بڵێ

## ٥٦ - بَاب مَا يَقُولُ إِذَا فَرَغَ مِنَ الطَّعَامِ

٣٤٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَوْرُ بْنُ يَزِيدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَعْدَانَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رُفِعَتِ الْمَائِدَةُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ يَقُولُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەپاش نانخواردن کە سفرەکە لەبەردەست پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم هەڵدەگیرا دەیفەرموو: (**الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا**). سوپاس و ستایش بۆ خوا، سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێ، خوای گەورە بەسمانەو وازمان لێ نەهێنراوەو وەلانەنراوین و، پەروەردگارمان کەس نیە بێ نیاز بێ پێی.

٣٤٥٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، وَأَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ رِيَاحِ بْنِ عَبِيدَةَ، قَالَ حَفْصٌ: عَنِ ابْنِ أَخِي أَبِي سَعِيدٍ، وقَالَ أَبُو خَالِدٍ: عَنْ مَوْلًى لأَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَكَلَ أَوْ شَرِبَ قَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە خواردن و خواردنەوە لێ دەبووەوە دەیفەرموو: (**الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ**) سوپاس و ستایش بۆ خوا، كە خواردنی داینێ و تێرئاوی كردین و كردوینی بە یەكێك لە موسوڵمانان.

٣٤٥٨ – (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو مَرْحُومٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَكَلَ طَعَامًا فَقَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَأَبُو مَرْحُومٍ اسْمُهُ: عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ مَيْمُونٍ.

واتە: لە سەهلی كوڕی (مُعَاذ)ی كوڕی ئەنەسەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ خواردنێ بخوات لەپاشدا بڵێت: (**الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ**) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە ئەم خواردنەی پێ بەخشیم ڕۆزی دام بەبێ گۆڕان و توانای خۆم، ئەوا خوای گەورە لە گوناهی لەوەوپێشی خۆش دەبێت).

## ئەگەر كەسێ گوێی لە زەڕەی گوێدرێژ بوو چی بڵێ

## ٥٧ - بَاب مَا يَقُولُ إِذَا سَمِعَ نَهِيقَ الحِمَارِ

٣٤٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَانًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر گوێتان لەدەنگی كەڵەشێر بوو داوای فەزڵ و چاكە بكەن لە خوای گەورە، چونكە ئەوە مەلائیكەی بینیوە، وە ئەگەر گوێتان لە زەڕەی كەر بوو پەنا بگرن بە خوای گەورە لە شەڕ و خراپەی شەیتان - بڵێن: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) - چونكە ئەوە شەیتانی بینیوە).

## دەربارەی گەورەیی (سبحان الله)و (الله اكبر)و (لا اله الا الله)و (الحمد لله)

## ٥٨ - بَاب مَا جَاءَ فِي فَضْلِ التَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ وَالتَّهْلِيلِ وَالتَّحْمِيدِ

٣٤٦٠ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ بَكْرٍ السَّهْمِيُّ، عَنْ حَاتِمِ بْنِ أَبِي صَغِيرَةَ، عَنْ أَبِي بَلْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا عَلَى الأَرْضِ أَحَدٌ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، إِلاَّ كُفِّرَتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى شُعْبَةُ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي بَلْجٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ وَأَبُو بَلْجٍ اسْمُهُ: يَحْيَى بْنُ أَبِي سُلَيْمٍ، وَيُقَالُ: ابْنُ سُلَيْمٍ

أَيْضًا. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ حَاتِمِ بْنِ أَبِي صَغِيرَةَ، عَنْ أَبِي بَلْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَحَاتِمٌ يُكْنَى أَبَا يُونُسَ الْقُشَيْرِيَّ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي بَلْجٍ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەس نیە لەسەر زەویدا بڵێ: (**لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَاللَّـهُ أَكْبَـرُ وَلاَ حَـوْلَ وَلاَ قُـوَّةَ إِلاَّ بِاللَّـهِ**) گوناهەکانی نەسڕێتەوە ئەگەر گوناهەکانی وەك کەفی دەریاش بن.

٣٤٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْحُومُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ العَطَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نَعَامَةَ السَّعْدِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزَاةٍ، فَلَمَّا قَفَلْنَا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ فَكَبَّرَ النَّاسُ تَكْبِيرَةً وَرَفَعُوا بِهَا أَصْوَاتَهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَصَمَّ وَلاَ غَائِبٍ، هُوَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رُءُوسِ رِحَالِكُمْ، ثُمَّ قَالَ: يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ قَيْسٍ، أَلاَ أُعَلِّمُكَ كَنْزًا مِنْ كُنُوزِ الجَنَّةِ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو عُثْمَانَ النَّهْدِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُلٍّ. وَأَبُو نَعَامَةَ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ عِيسَى. وَمَعْنَى قَوْلِهِ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رُءُوسِ رِحَالِكُمْ إِنَّمَا يَعْنِي عِلْمَهُ وَقُدْرَتَهُ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، کاتێ گەڕاینەوە لەمەدینە دەرکەوتین، خەڵکە بەدەنگی بەرز (الله أکبر)یان دەوتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان کەڕ و لاڵ نیە یان غائیب نیە، بەڵکو نزیکە لێتانەوە و دەبیستێ و

دەبینیٚ ئیتر پێویست بەوە ناکات دەنگتان بەرزبکەنەوە). لەپاشدا فەرمووی: (ئـەی (عبد الله)ی کـوڕی قـەیس وشـیاربە وشـەیەکت نیشـان بـدەم کـە گەنجینەیەکـە لـە گەنجینەکانی بەهەشت؟ (**لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ**) هیچ گۆڕان و هێزێك نیە مەگەر بە خوای گەورەوە.

## ٥٩ - بَابٌ

٣٤٦٢ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَيَّارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقِيتُ إِبْرَاهِيمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَقْرِئْ أُمَّتَكَ مِنِّي السَّلاَمَ وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ الجَنَّةَ طَيِّبَةُ التُّرْبَةِ عَذْبَةُ الْمَاءِ، وَأَنَّهَا قِيعَانٌ، وَأَنَّ غِرَاسَهَا سُبْحَانَ اللهِ وَالحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لـیٚ بـیٚ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو شـەوەی بەرزکرامـەوە بـۆ ئاسمان گەیشتم بە ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بیٚ، فـەرمووی: ئـەی موحەممـەد! سڵاوی من بگەیەنە بە ئوممەتەکەت و پێیان رابگەیەنە کە بەهەشت خاکەکـەی پـاك و باشە و ئاوەکەی زوڵاڵ و سازگارە، دەشتایی و نەرمایی زۆری تێدایە، ئـەو شـەتڵ و نەمامەیش تیایدا دەڕویٚ بریتیە لـە: ((سـبحان الله) و (لا الـه الا الله) و (الحمـد لله) و (الله اکبر) ).

٣٤٦٣ - (صحیح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى الجُهَنِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي مُصْعَبُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ قَالَ لِجُلَسَائِهِ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ قَالَ: يُسَبِّحُ أَحَدُكُمْ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ تُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ، وَتُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ سَيِّئَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بەو کەسانەی لەدەور و بەری دانیشتبوون فەرموو: (ئایا کەسێ لە ئێوە ناتوانێ هەزار چاکە بەدەست بێنێ؟). یەکێ لە دانیشتوانی کۆڕەکە فەرمووی: چۆن یەکێ لە ئێمە ئەتوانێ هەزار چاکە بەدەست بێنێ؟ فەرمووی: (هەرکەس سەد جار بڵێ: (سبحان الله) هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێ و هەزار خراپەی دەسڕێتەوە).

**٦٠ - بَابٌ**

٣٤٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ حَجَّاجٍ الصَّوَّافِ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ العَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ، غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ العَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ) نەمامە خورمایەکی لە بەهەشت بۆ دەنێژرێت).

٣٤٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُؤَمَّلُ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ العَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ العَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ) نەمامە خورمایەكی لە بەهەشت بۆ دەنێژرێت).

٣٤٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ غُفِرَتْ لَهُ ذُنُوبُهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) خوای گەورە لە گونەهەكانی خۆش دەبێ ئەگەر گونەهەكانی وەك كەفی دەریاش بن.

٣٤٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْفُضَيْلِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ القَعْقَاعِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، سُبْحَانَ اللهِ العَظِيمِ سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دوو وشە هەن لەسەر زمان ئاسان و سوكن، لەسەر تەرازوو قورس و سەنگینن، لای خوای گەورەش خۆشەویستن بریتین لە: (سُبْحَانَ اللهِ العَظِيمِ، سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ).

٣٤٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عِدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ أَكْثَرَ مِنْ زَبَدِ البَحْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، دەژێنێ و دەمرێنێ.

وەك ئەوە وایە دە کۆیلەی ڕزگار کردبێ، سەد چاکەی بۆ دەنوسرێ، سەد خراپەی بۆ دەسڕێتەوە، ئەو ڕۆژە تاکو ئێوارە لە شەیتان دەپارێزرێت، ئەگەر ئێوارەش بیڵێ هەروەك ئەوەی بۆ هەیە تاکو بەیانی، هیچ کەسێ بە قەد ئەو خێری ناکات، مەگەر کەسێ لەو زیاتر زیکر و یادی خوا بکات).

واتە: بە هەمان سەنەد لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (هەرکەس سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) گونەهەکانی هەڵدەوەرن ئەگەر چی وەك کەفی دەریاش بن.

٣٤٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ الْمُخْتَارِ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ

اللهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ القِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەیانیان و ئێواران سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ). لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ کەسێ کردەوەی وەها چاك و نایاب ناهێنێ مەگەر کەسێ بەقەد ئەو زیکر و یادی خوای کردبێ یان زیاتری کردبێ).

٣٤٧٠ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ الزِّبْرِقَانِ، عَنْ مَطَرٍ الوَرَّاقِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ لأَصْحَابِهِ: قُولُوا: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ، مَنْ قَالَهَا مَرَّةً كُتِبَتْ لَهُ عَشْرًا، وَمَنْ قَالَهَا عَشْرًا كُتِبَتْ لَهُ مِائَةٌ، وَمَنْ قَالَهَا مِائَةً كُتِبَتْ لَهُ أَلْفًا، وَمَنْ زَادَ زَادَهُ اللَّهُ، وَمَنْ اسْتَغْفَرَ اللَّهَ غَفَرَ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵانی فەرموو: (سەد جار بڵێن: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ). هەرکەس یەك جار بیڵێ دە چاکەی بۆ دەنوسرێ، هەرکەس دە جار بیڵێ سەد چاکەی بۆ دەنوسرێ، هەرکەس سەد جار بیڵێ هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێ، هەرکەس زیاتر بیڵێ خوای گەورە زیاتری بۆ دەنوسێ، هەرکەس داوای لێخۆشبوون بکات لە خوای گەورە لێی خۆش دەبێ).

## ٦٢ - بَابٌ

٣٤٧١ - (منكر حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ وَزِيرٍ الوَاسِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سُفْيَانَ الحِمْيَرِيُّ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ حُمْرَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ مِائَةً بِالغَدَاةِ وَمِائَةً بِالعَشِيِّ كَانَ كَمَنْ حَجَّ مِائَةَ حَجَّةٍ، وَمَنْ حَمِدَ اللَّهَ مِائَةً بِالغَدَاةِ وَمِائَةً بِالعَشِيِّ كَانَ كَمَنْ حَمَلَ عَلَى مِائَةِ فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ قَالَ غَزَا مِائَةَ غَزْوَةٍ، وَمَنْ هَلَّلَ اللَّهَ مِائَةً بِالغَدَاةِ وَمِائَةً بِالعَشِيِّ كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ مِائَةَ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَمَنْ كَبَّرَ اللَّهَ مِائَةً بِالغَدَاةِ وَمِائَةً بِالعَشِيِّ لَمْ يَأْتِ فِي ذَلِكَ اليَوْمِ أَحَدٌ بِأَكْثَرَ مِمَّا أَتَى إِلاَّ مَنْ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ عَلَى مَا قَالَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس بەیانیان سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ)، ئێوارانیش سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ) وەك ئەوە وایە سەد حەجی كردبێ، (هەركەس بەیانیان سەد جار بڵێ: (الحمد لله)، ئێوارانیش سەد جار بڵێ: (الحمد لله) وەك ئەوە وایە سەد ئەسپی بە بارەوە بەخشیبێ لەڕێی خوا، یان سەد غەزای كردبێ، (هەركەس بەیانیان سەد جار بڵێ: (لا اله الا الله) ئێوارانیش سەد جار بڵێ: (لا اله الا الله) وەك ئەوە وایە سەد بەندەی لەنەوەی ئیسماعیل ئازاد كردبێ، (هەركەس بەیانیان سەد جار بڵێ: (الله اكبر)، ئێوارانیش سەد جار بڵێ: (الله اكبر) هیچ كەسێ كردەوەی وەها چاك و نایاب ناهێنێ لەو ڕۆژەدا مەگەر كەسێ بەقەد ئەوی كردبێ یان زیاتری كردبێ).

٣٤٧٢ - (ضعيف الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ الأَسْوَدِ العِجْلِيُّ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: تَسْبِيحَةٌ فِي رَمَضَانَ أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ تَسْبِيحَةٍ فِي غَيْرِهِ.

واتە: پێشەوا زوهری دەفەرموێت: وتنی: (سُبْحَانَ اللهِ)یە لە مانگی رەمەزاندا، هەزار جار خێری زیاترە لە (سُبْحَانَ اللهِ)یەكی غەیری مانگی رەمەزان.

### ٦٣ - بَابٌ

٣٤٧٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ الخَلِيلِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَزْهَرَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، إِلَهًا وَاحِدًا أَحَدًا صَمَدًا، لَمْ يَتَّخِذْ صَاحِبَةً وَلاَ وَلَدًا، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، عَشْرَ مَرَّاتٍ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَرْبَعِينَ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَالخَلِيلُ بْنُ مُرَّةَ لَيْسَ بِالقَوِيِّ عِنْدَ أَصْحَابِ الحَدِيثِ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: هُوَ مُنْكَرُ الحَدِيثِ.

واتە: لە تەمیمی داریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس دە جار بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، إِلَهًا وَاحِدًا أَحَدًا صَمَدًا، لَمْ يَتَّخِذْ صَاحِبَةً وَلاَ وَلَدًا، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ)، خوای گەورە چل هەزار هەزار چاكەی بۆ دەنوسێت).

٣٤٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مَعْبَدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو الرَّقِّيُّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِي أُنَيْسَةَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَنْمٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ فِي دُبُرِ صَلاَةِ الفَجْرِ وَهُوَ ثَانٍ رِجْلَيْهِ قَبْلَ أَنْ يَتَكَلَّمَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ

الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ عَشْرَ مَرَّاتٍ، كُتِبَتْ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَمُحِيَ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ، وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ، وَكَانَ يَوْمَهُ ذَلِكَ كُلَّهُ فِي حِرْزٍ مِنْ كُلِّ مَكْرُوهٍ، وَحُرِسَ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَلَمْ يَنْبَغِ لِذَنْبٍ أَنْ يُدْرِكَهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ إِلاَّ الشِّرْكَ بِاللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبی (ذر)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لەدوای نوێژی بەیانی کە هێشتا قاچی نوشتاوەتەوە پێش ئەوەی قسە بکات دە جار بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). دە چاکەی بۆ دەنوسرێ، دە خراپەی بۆ دەسڕرێتەوە، دە پلە بەرزدەکرێتەوە، لەتەواوی ئەو رۆژەدا لە پارێزگاریدا دەبێت و پاسەنێتی دەکرێت لە هەموو خراپەیە، لە شەیتان دەپارێزرێت، لەو رۆژەدا هیچ گوناهێکی لەسەر نانوسرێت جگە لە (شیرك)هاوبەش بۆ خوا دانان).

## پاڕانەوەکان بە گشتی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٦٤ - بَابُ جَامِعِ الدَّعَوَاتِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٤٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عِمْرَانَ الثَّعْلَبِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً يَدْعُو وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، قَالَ: فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ سَأَلَ اللَّهَ بِاسْمِهِ الأَعْظَمِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ، وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، قَالَ زَيْدٌ، فَذَكَرْتُهُ لِزُهَيْرِ بْنِ مُعَاوِيَةَ، بَعْدَ ذَلِكَ بِسِنِينَ

فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ، قَالَ زَيْدٌ: ثُمَّ ذَكَرْتُهُ لِسُفْيَانَ، فَحَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَرَوَى شَرِيكٌ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، وَإِنَّمَا أَخَذَهُ أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ.

واته: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی بورەیدەی ئەسلەمیەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێ لە پیاوێ بوو دەپاڕایەوە و دەیوت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، الأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) خودایە من داوات لێ دەکەم شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەکی تر نیە جگە لەتۆ، تاك و تەنیای و جێی نیازی، ئەو خوایەی نەکەست لێ بووەو نە لەکەس بوویت، کەس لە هاو وێنەو هاوتای تۆ نیە.

فەرمووی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، دڵنیابە تۆ بەو ناوە شکۆمەند و گەورەکەی خوا پاڕایتەوە کە هەرکەس بەو ناوەوە داوای لێ بکات ئەیدرێتێ، هەرکەسێ پێی بپاڕێتەوە نائومێدی ناکات و پاڕانەوەکەی گیرا دەکات).

## ٦٥ - بَابٌ

٣٤٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِي هَانِئٍ الخَوْلاَنِيِّ، عَنْ أَبِي عَلِيٍّ الجَنْبِيِّ، عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاعِدٌ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَجِلْتَ أَيُّهَا الْمُصَلِّي، إِذَا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ فَاحْمَدِ اللَّهَ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، وَصَلِّ عَلَيَّ ثُمَّ ادْعُهُ. قَالَ: ثُمَّ صَلَّى رَجُلٌ آخَرُ بَعْدَ ذَلِكَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَصَلَّى عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّهَا الْمُصَلِّي ادْعُ

تُحَبْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رَوَاهُ حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِي هَانِئٍ الخَوْلاَنِيِّ. وَأَبُو هَانِئٍ اسْمُهُ: حُمَيْدُ بْنُ هَانِئٍ، وَأَبُو عَلِيٍّ الجَنْبِيُّ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ مَالِكٍ.

واتە: لە (فَضَالَةَ)ی کوڕی عوبێدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مزگەوت دانیشتبوو، پیاوێ هاتەژوورەوە نوێژی کرد، هەرکە سەلامی دایەوە وتی: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي). پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی نوێژخوێن پەلەت کرد، کاتێ نوێژت کرد و دانیشتیت سوپاسی خوا بکە بە جوانترین شێوە کە شایستەی بێ، جا سڵاوات بدە لەسەر من لەپاشدا دەست بکە بە پاڕانەوە). پیاوێکی تر نوێژی کرد، هەرکە سەلامی دایەوە سوپاسی خوای کرد، سڵاواتی دا لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی نوێژخوێن دەست بکە بە پاڕانەوە، خوای گەورە پاڕانەوەکانت قبوڵ دەکات).

٣٤٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هَانِئٍ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ مَالِكٍ الجَنْبِيَّ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ، يَقُولُ: سَمِعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً يَدْعُو فِي صَلاَتِهِ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَجِلَ هَذَا، ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَحْمِيدِ اللهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ لْيُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ لْيَدْعُ بَعْدُ بِمَا شَاءَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (فَضَالَةَ)ی کوڕی عوبێدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لە پیاوێ بوو دەپاڕایەوە، بەبێ ئەوەی سڵاوات بدا لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەمە پەلەی کرد)، لەپاشدا بانگی کرد، پێی فەرموو یان بە جگە

لەوی فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە نوێژی کرد با بە سوپاس کردنی خوا دەست پێ بکات، لەپاشدا سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئینجا چۆن دەیەوێ بە ئارەزووی خۆی بپاڕێتەوە).

٣٤٧٨ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي زِيَادٍ القَدَّاحِ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اسْمُ اللهِ الأَعْظَمُ فِي هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ (وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ) وَفَاتِحَةِ آلِ عِمْرَانَ (الم اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الحَيُّ القَيُّومُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ناوە شکۆمەند و گەورەکەی خوا لەم دوو ئایەتەدایە: **(وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ)**. (البقرة:١٦٣). واتە: پەرستراوی ئێوە پەرستراوێکی تاك و تەنیایە، هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە تەنیا ئەو نەبێ کە بەخشندەی میهرەبانە. وە سەرەتای سورەتی (آلِ عِمْرَانَ): **(الم اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ)**. (آلِ عِمْرَان ١-٢). واتە: خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لە ئەو زیندووی ڕاگری بوونەوەرە.

## ٦٦ - بَابٌ

٣٤٧٩ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاوِيَةَ الجُمَحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَالِحٌ الْمُرِّيُّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ادْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالإِجَابَةِ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَجِيبُ دُعَاءً

مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاَهٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ سَمِعْت عَبَّاسًا العَنْبَرِيَّ يَقُولُ: اكْتُبُوا عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُعَاوِيَةَ الجُمَحِيِّ فَإِنَّهُ ثِقَةٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (باش بزانن خوای گەورە پاڕانەوەی کەسێ وەرناگرێت لەکاتی پاڕانەوەکەدا دڵی غافڵ و بێ ئاگابێ).

## ٦٧ - بَابٌ

٣٤٨٠ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ حَمْزَةَ الزَّيَّاتِ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي جَسَدِي، وَعَافِنِي فِي بَصَرِي، وَاجْعَلْهُ الوَارِثَ مِنِّي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الحَلِيمُ الكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ العَرْشِ العَظِيمِ، الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ سَمِعْت مُحَمَّدًا يَقُولُ: حَبِيبُ بْنُ أَبِي ثَابِتٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ شَيْئًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي جَسَدِي، وَعَافِنِي فِي بَصَرِي، وَاجْعَلْهُ الوَارِثَ مِنِّي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الحَلِيمُ الكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ العَرْشِ العَظِيمِ، الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ). واتە: خودایە جەستەم ساغ و سەلامەت بکە، چاوەکانم ساغ و سەلامەت بکە هەتا مردن، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە (الله)ی هێدی و خاوەن حیلم و بەرێز، سوپاس و ستایشی بۆ خوای خاوەن عەرشی گەورە و شکۆمەند، سوپاس و ستایشی بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

## ٦٨ - بَابٌ

٣٤٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَسْأَلُهُ خَادِمًا، فَقَالَ لَهَا: قُولِي: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبَّ العَرْشِ العَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالقُرْآنِ، فَالِقَ الحَبِّ وَالنَّوَى، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ البَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّيَ الدَّيْنَ، وَأَغْنِنِي مِنَ الفَقْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَهَكَذَا رَوَى بَعْضُ أَصْحَابِ الأَعْمَشِ عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَ هَذَا. وَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ مُرْسَلاً، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (فاطمة) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم داوای خزمەتگوزارێکی لێ کرد، ئەویش پێی فەرموو: (بڵێ: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبَّ العَرْشِ العَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالقُرْآنِ، فَالِقَ الحَبِّ وَالنَّوَى، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ البَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ، وَأَغْنِنِي مِنَ الفَقْرِ). خودایە ئەی پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و زەوی، ئەی پەروەردگاری خاوەن عەرشی گەورە و شکۆمەند، ئەی پەروەردگاری ئێمە و هەموو شتێك، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، تەقێنەرەی دانەوێڵەو ناوك و سەوزکردنی، پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و

زیانی هەموو ئەو دروستکراوانەی خۆت کە جڵەویان بە دەست تۆیە، خودایە هیچ شتێکت لەپێشەوە نەبووەو دەمێنیت لەدوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان و بەهێز و بە توانایت، هیچ شتێکیش لەسەرووی تۆوە نیە، هەموو دروستکراوەکان پێویستیان بەتۆیەو کەسیش نیە هاوشێوەی تۆ بێ، سا خودایە قەرزاریمان لەسەر لابەرەو دەوڵەمەندیشمان بکە لە هەژاری.

## ٦٩ - بَابٌ

٣٤٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ زُهَيْرِ بْنِ الأَقْمَرِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَؤُلاَءِ الأَرْبَعِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَؤُلاَءِ الأَرْبَعِ). خودایە پەنات پێ دەگرم لە دڵێ نەترسێ، لە پاڕانەوەیە گیرا نەبێ، لە دەروونێ تێر نەخوات، لە زانستێ کەڵکی نەبێ، خودایە پەنات پێ دەگرم لەو چوارە.

## ٧٠ - بَابٌ

٣٤٨٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ شَبِيبِ بْنِ شَيْبَةَ، عَنِ الحَسَنِ البَصْرِيِّ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَبِي: يَا حُصَيْنُ كَمْ تَعْبُدُ اليَوْمَ إِلَهًا؟ قَالَ أَبِي: سَبْعَةً سِتَّةً فِي الأَرْضِ وَوَاحِدًا فِي السَّمَاءِ. قَالَ: فَأَيُّهُمْ تَعُدُّ لِرَغْبَتِكَ وَرَهْبَتِكَ؟ قَالَ: الَّذِي فِي السَّمَاءِ. قَالَ: يَا حُصَيْنُ أَمَا إِنَّكَ لَوْ أَسْلَمْتَ عَلَّمْتُكَ كَلِمَتَيْنِ تَنْفَعَانِكَ. قَالَ: فَلَمَّا أَسْلَمَ حُصَيْنٌ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلِّمْنِيَ الكَلِمَتَيْنِ اللَّتَيْنِ وَعَدْتَنِي، فَقَالَ: قُلْ: اللَّهُمَّ أَلْهِمْنِي رُشْدِي، وَأَعِذْنِي مِنْ شَرِّ نَفْسِي. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە باوکمی فەرموو: (ئەی حوصەین ئەمڕۆ چەند خوا ئەپەرستی؟)، باوکم وتی: حەوت شەش لە زەوی و یەک لە ئاسمان، فەرمووی: (ئەگەر بەڵایە یەخەی گرتی پەنا بۆ کامیان دەبەیت؟) وتی: بۆ ئەوەی لە ئاسمانە، فەرمووی: (ئەی حوصەین ئەگەر باوەڕ بهێنی دوو وشەت فێر دەکەم سودت پێ بگەیەنن)، وتی: کاتێ حوصەین موسوڵمان بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو دوو وشەیەم فێر بکە کە بەڵێنت پێدام، فەرموو: (بڵێ: **(اللَّهُمَّ أَلْهِمْنِي رُشْدِي، وَأَعِذْنِي مِنْ شَرِّ نَفْسِي)**. خودایە دڵم شارەزای ڕێی ڕاست بکە، پەنام بدە لە شەڕ و خراپەی دەروونی خۆم.

## ٧١ - بَابٌ

٣٤٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ الْعَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُصْعَبٍ الْمَدَنِيُّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، مَوْلَى الْمُطَّلِبِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَثِيرًا مَا كُنْتُ أَسْمَعُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الكَلِمَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالحَزَنِ وَالعَجْزِ وَالكَسَلِ وَالبُخْلِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجَالِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: زۆر جار گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم وشانە دەپاڕایەوە: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالحَزَنِ وَالعَجْزِ وَالكَسَلِ وَالبُخْلِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجَالِ**). خودایە پەنات پێ دەگرم لە غەم و پەژارە و دەستەوسانی و تەمەڵی و چروکی و کەوتنە ژێر باری قەرز و زاڵبوونی پیاوان.

٣٤٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانَ يَدْعُو يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ وَالهَرَمِ وَالجُبْنِ وَالبُخْلِ، وَفِتْنَةِ الْمَسِيحِ، وَعَذَابِ القَبْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەپاڕایەوە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ وَالهَرَمِ وَالجُبْنِ وَالبُخْلِ، وَفِتْنَةِ الْمَسِيحِ، وَعَذَابِ القَبْرِ). خودایە پەنات پێ دەگرم لە تەمەڵی و پیری و پەککەوتەیی ترسنۆکی و چروکی و فیتنە و ئاژاوەی دەجالی درۆزن و سزاو ئازاری گۆڕ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی تەسبیحات بە پەنجەکانی دەست

٧٢ - بَاب مَا جَاءَ فِي عَقْدِ التَّسْبِيحِ بِالْيَدِ

٣٤٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَثَّامُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ بِيَدِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ الأَعْمَشِ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ. وَرَوَى شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، بِطُولِهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلمە دی بە پەنجەکانی دەستی تەسبیحاتی دەکرد.

٣٤٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ ثَابِتٍ البُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَادَ رَجُلاً قَدْ جُهِدَ حَتَّى صَارَ مِثْلَ الفَرْخِ فَقَالَ لَهُ: أَمَا كُنْتَ تَدْعُو؟ أَمَا كُنْتَ تَسْأَلُ رَبَّكَ العَافِيَةَ؟ قَالَ: كُنْتُ أَقُولُ: اللَّهُمَّ مَا كُنْتَ مُعَاقِبِي بِهِ فِي الآخِرَةِ فَعَجِّلْهُ لِي فِي الدُّنْيَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سُبْحَانَ اللهِ، إِنَّكَ لاَ تُطِيقُهُ أَوْ لاَ تَسْتَطِيعُهُ، أَفَلاَ كُنْتَ تَقُولُ: اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەردانی پیاوێکی نەخۆشی کرد بینی لاواز بووە وەك بێچوە مەلی لێهاتووە، پێی فەرموو: (ئایا تۆ هەرگیز

پاڕاویتەتەوە لـە خـواو داوای هـیچ شـتێکت لـێ کـردووە؟) وتـی: بـەڵێ، دەمـوت: خودایە ئەگەر لـە ڕۆژی دوایـی تۆڵـەی تـاوانێکم لـێ دەسـێنی لـەم دونیایـەدا لـێم بسێنە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ( تۆ بەرگەی ئەوە ناگری، یان توانای ئەوەت نیە، دەبوو بتگوتایە: (اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) واتـە: خودایـە! لـە دنیـاو لـە دوارۆژدا چـاکەمان پـێ ببەخشەو لەسزای دۆزەخ بمانپارێزە.

٣٤٨٧م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، نَحْوَهُ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٣٤٨٨ - (حسن لغيره) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنِ الْحَسَنِ فِي قَوْلِهِ: (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً)، قَالَ: فِي الدُّنْيَا الْعِلْمُ وَالْعِبَادَةُ، وَفِي الآخِرَةِ الْجَنَّةُ.

واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە: (اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) واتـە: خودایـە! لـە دنیـاو لـە دوارۆژدا چـاکەمان پـێ ببەخشەو لەسزای دۆزەخ بمانپارێزە.

حەسـەن فـەرمووی: چـاکە لـە دونیـادا زانسـت و پەرستشـە، لـە دوارۆژیشـدا بەهەشتە.

## ٧٣ - بَابٌ

٣٤٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الأَحْوَصِ، يُحَدِّثُ عَنْ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الهُدَى وَالتُّقَى وَالعَفَافَ وَالغِنَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم دوعایەی دەكرد: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الهُدَى وَالتُّقَى وَالعَفَافَ وَالغِنَى). خودایە داوای ڕێنموونی و هیدایەت و پارێزكاری و تەقواو دەست و دەم و داوێن پاكی و دەوڵەمەندیت لێ دەكەم.

٣٤٩٠ - (ضعيف إلا قوله في داود: (كان أعبد البشر) فهو عند (م) ابن عمر) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَبِيعَةَ الدِّمَشْقِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَائِذُ اللهِ أَبُو إِدْرِيسَ الخَوْلَانِيُّ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ دَاوُدَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ حُبَّكَ، وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَالعَمَلَ الَّذِي يُبَلِّغُنِي حُبَّكَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي وَأَهْلِي، وَمِنَ المَاءِ البَارِدِ قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا ذَكَرَ دَاوُدَ يُحَدِّثُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ أَعْبَدَ البَشَرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە پاڕانەوەكانی داود دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ حُبَّكَ، وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَالعَمَلَ الَّذِي يُبَلِّغُنِي حُبَّكَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي وَأَهْلِي، وَمِنَ المَاءِ البَارِدِ). خودایە داوای خۆشەویستی خۆتت لێ دەكەم، وە خۆشەویستی ئەو كەسەش كە تۆی خۆشدەوێ،

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ رَجُلٍ يَدْعُو اللَّهَ بِدُعَاءٍ إِلاَّ اسْتُجِيبَ لَهُ، فَإِمَّا أَنْ يُعَجَّلَ فِي الدُّنْيَا، وَإِمَّا أَنْ يُدَّخَرَ لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يُكَفَّرَ عَنْهُ مِنْ ذُنُوبِهِ بِقَدْرِ مَا دَعَا، مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ أَوْ يَسْتَعْجِلْ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَكَيْفَ يَسْتَعْجِلُ؟ قَالَ: يَقُولُ: دَعَوْتُ رَبِّي فَمَا اسْتَجَابَ لِي. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بپاڕێتەوە لە خوا پاڕانەوەکەی گیرا دەکات، جا یان لەدونیادا پێی دەبەخشرێت، یا بۆی پاشەکەوت دەکرێت بۆ قیامەت، یا بەقەد ئەوە گوناهو تاوانی دەسڕێتەوە، بەمەرجێ پاڕانەوەکەی بۆ کاری ناڕەوا و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی نەبێ و پەلەش نەکات) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، چۆن پەلە دەکات؟ فەرمووی: (دەڵێ هەر دەپاڕێمەوە لە پەروەردگارم هەر پاڕانەوەکەم گیرا نەبوو).

٣٦٠٤/ ٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَعْلَى بْنُ عُبَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ إِبِطُهُ يَسْأَلُ اللَّهَ مَسْأَلَةً، إِلاَّ آتَاهَا إِيَّاهُ مَا لَمْ يَعْجَلْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَكَيْفَ عَجَلَتُهُ؟ قَالَ: يَقُولُ: قَدْ سَأَلْتُ وَسَأَلْتُ وَلَمْ أُعْطَ شَيْئًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئەوەندە دەستەکانی بەرزبکاتەوە بن باڵەکانی دەرکەون و بپاڕێتەوە لە خوا و داوای شتێ بکات ئیللا خوای گەورە پێی دەبەخشێت، بەمەرجێ پەلە نەکات) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، چۆن؟ فەرمووی: (دەڵێ: هەر پاڕامەوە وە هەر پاڕامەوە گیرا نەبوو).

(صحيح) وَرَوَى هَذَا الحَدِيثَ الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ بپاڕێتەوە لە خوا ئیللا خوای گەورە پێی دەبەخشێت، بەمەرجێ پەلە نەكات بڵێ: هەر پاڕامەوە و پاڕانەوەكەم گیرا نەبوو).

## ١٣٧ - بَابٌ

٣٦٠٤/ ٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا صَدَقَةُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ وَاسِعٍ، عَنْ شُتَيْرِ بْنِ نَهَارٍ العَبْدِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ حُسْنَ الظَّنِّ بِاللَّهِ مِنْ حُسْنِ عِبَادَةِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (گومانی باش بردن بە خوای گەورە لە باش پەرستنەوەیە).

## ١٣٨ - بَابٌ

٣٦٠٤/ ٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِيَنْظُرَنَّ أَحَدُكُمْ مَا الَّذِي يَتَمَنَّى فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا يُكْتَبُ لَهُ مِنْ أُمْنِيَّتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با یەکێ لە ئێوە سەرنج بدات و بیربکاتەوە ئاوات بۆچی دەخوازێ چونکە بێگومان نازانێ لە ئاواتەکانی چی بۆ دەنوسرێت).

## ١٣٩ - بَابٌ

٣٦٠٤/ ٧ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا جَابِرُ بْنُ نُوحٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو فَيَقُولُ: اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِسَمْعِي وَبَصَرِي وَاجْعَلْهُمَا الوَارِثَ مِنِّي، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ يَظْلِمُنِي، وَخُذْ مِنْهُ بِثَأْرِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەپاڕایەوە و دەیفەرموو: (خودایە سوودمەندم بکە لە بیستن و بینینم و بیانکەرە میراتگرم، سەرم بخە بەسەر ئەوەدا ستەمم لێ دەکات، تۆڵەم بۆ بسێنە).

## ١٤٠ - بَابٌ

٣٦٠٤/ ٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ سُلَيْمَانُ بْنُ الأَشْعَثِ السِّجْزِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَطَنٌ البَصْرِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِيَسْأَلْ أَحَدُكُمْ رَبَّهُ حَاجَتَهُ كُلَّهَا حَتَّى يَسْأَلَ شِسْعَ نَعْلِهِ إِذَا

انْقَطَعَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر یەکێ لە ئێوە بۆ هەر شتێ کە پێویستیەتی لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە بپاڕێتەوە تەنانەت بۆ پەت یان قەیتانی پێڵاوەکەی کە دەپچڕێ).

٣٦٠٤/ ٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لِيَسْأَلْ أَحَدُكُمْ رَبَّهُ حَاجَتَهُ حَتَّى يَسْأَلَهُ الْمِلْحَ، وَحَتَّى يَسْأَلَهُ شِسْعَ نَعْلِهِ إِذَا انْقَطَعَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ قَطَنٍ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ سُلَيْمَانَ.

واتە: لە (ثابت)ی بونانیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر یەکێ لە ئێوە بۆ هەر شتێ کە پێویستیەتی لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە تەنانەت بۆ خوێ و پەت و قەیتانی پێڵاوەکەی کە دەپچڕێ).

# باسەکانی چاکە و پلەوپایەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

# ٤٦ - أَبْوَابُ الْمَنَاقِبِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ١ - بَابٌ فِي فَضْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ أَسْلَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُصْعَبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ أَبِي عَمَّارٍ، عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى مِنْ وَلَدِ إِبْرَاهِيمَ، إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ بَنِي كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ بَنِي كِنَانَةَ قُرَيْشًا، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە (واثلـة)ی کـوڕی ئەسـقەعەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (خـوای گـەورە لەناو کوڕەکانی ئیبراهیمدا ئیسماعیلی هەڵبژاردووە، لەناو نەوەی ئیسماعیلدا بـەنی کینانەی هەڵبژاردووە، لەناو بەنی کینانەشدا هۆزی قورەیشـی هەڵبـژاردووە، لـەناو هـۆزی قورەیشـدا بـەنی هاشـیمی هەڵبـژاردووە، لـەناو بـەنی هاشیمیشـدا منـی هەڵبژاردووە).

٣٦٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الدِّمَشْقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي شَدَّادٌ أَبُو عَمَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنِي وَاثِلَةُ بْنُ الأَسْقَعِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى هَاشِمًا مِنْ قُرَيْشٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

٣٦٠٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنِ العَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ قُرَيْشًا جَلَسُوا فَتَذَاكَرُوا أَحْسَابَهُمْ بَيْنَهُمْ، فَجَعَلُوا مَثَلَكَ كَمَثَلِ نَخْلَةٍ فِي كَبْوَةٍ مِنَ الأَرْضِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الخَلْقَ فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِهِمْ مِنْ خَيْرِ فِرَقِهِمْ وَخَيْرِ الفَرِيقَيْنِ، ثُمَّ تَخَيَّرَ القَبَائِلَ فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ قَبِيلَةٍ، ثُمَّ تَخَيَّرَ البُيُوتَ فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ بُيُوتِهِمْ، فَأَنَا خَيْرُهُمْ نَفْسًا، وَخَيْرُهُمْ بَيْتًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ الحَارِثِ هُوَ: ابْنُ نَوْفَلٍ.

واتە: لە عەباسی كوڕی (عبد المطلب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، قورەیش دانیشتبوون لەناو خۆیاندا باسی بنەچە و ڕەچەڵەكی خۆیان دەكرد، تۆیان دانا بە دارخورمای سەر كۆڵان واتە تانەیان دا لە نەسەبی تۆ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (كاتێ خوای گەورە دروستكراوانی دروستكرد، لەهەرەباشەكەیان ڕەگەز و بنەچەی منی دروستكرد، لە باشترین چینی ئەوان منی دروستكرد، لە دوو دەستە و تاقمەكەش لەهەرەباشەكەیان منی دروستكرد، لەپاشدا هۆزەكانی هەڵبژارد منی خستە چاكترین هۆزیانەوە، ئینجا بنەماڵەكانی هەڵبژارد منی خستە چاكترین بنەماڵەوە، كەواتە من لە خۆتان باشترم و بنەماڵەكەشم پشتاو پشت باشترینە).

٣٦٠٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ، قَالَ: جَاءَ العَبَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَأَنَّهُ سَمِعَ شَيْئًا فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: مَنْ أَنَا؟ قَالُوا: أَنْتَ رَسُولُ اللهِ عَلَيْكَ السَّلاَمُ. قَالَ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الخَلْقَ فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِهِمْ فِرْقَةً، ثُمَّ جَعَلَهُمْ فِرْقَتَيْنِ فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِهِمْ فِرْقَةً، ثُمَّ جَعَلَهُمْ قَبَائِلَ فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِهِمْ قَبِيلَةً، ثُمَّ جَعَلَهُمْ بُيُوتًا فَجَعَلَنِي فِي خَيْرِهِمْ بَيْتًا وَخَيْرِهِمْ نَفْسًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە (المطلب)ی کوڕی ئەبی وەداعەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عەباس هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وەك ئەوەی شتێکی بیستبێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە سەر مینبەر فەرمووی: (من کێم؟) وتیان: تۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (من موحەممەدی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی (عبد المطلب)م، بێگومان کاتێ خوای گەورە دروستکراوانی دروستکرد، لەهەرەباشەکەیان رەگەز و بنەچەی منی دروستکرد، لە باشترین چینی ئەوان منی دروستکرد، لە دوو دەستە و تاقمەکەش لەهەرەباشەکەیان منی دروستکرد، لەپاشدا هۆزەکانی هەڵبژارد منی خستە چاکترین هۆزیانەوە، ئینجا بنەماڵەکانی هەڵبژارد منی خستە چاکترین بنەماڵەوە، کەواتە من لە خۆتان باشترم و بنەماڵەکەشم پشتاو پشت باشترینە).

٣٦٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو هَمَّامٍ الوَلِيدُ بْنُ شُجَاعِ بْنِ الوَلِيدِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ مَتَى وَجَبَتْ لَكَ النُّبُوَّةُ؟ قَالَ: وَآدَمُ بَيْنَ الرُّوحِ وَالجَسَدِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، كەی پێغەمبەرایەتی تۆ كەی پێ بەخشراو جێگیربوو؟ فەرمووی: (هێشتا ئادەم جەستەبوو روح نەكرابوو بە بەریدا).

٣٦١٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ يَزِيدَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَا أَوَّلُ النَّاسِ خُرُوجًا إِذَا بُعِثُوا، وَأَنَا خَطِيبُهُمْ إِذَا وَفَدُوا، وَأَنَا مُبَشِّرُهُمْ إِذَا أَيِسُوا، لِوَاءُ الحَمْدِ يَوْمَئِذٍ بِيَدِي، وَأَنَا أَكْرَمُ وَلَدِ آدَمَ عَلَى رَبِّي وَلاَ فَخْرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كاتێ خەڵك زیندوو دەكرێنەوە من یەكەم كەسم لەگۆڕ دەردەچم، كاتێ دەڕۆن بۆ خزمەت پەروەردگاریان من دەمڕاست و قسەكەریان دەبم، كاتێ نائومێد دەبن مـوژدەدەری خۆشیان دەبم دڵیان خۆش دەكەم، لەوكاتەدا ئاڵای سوپاسگوزاری بەدەست منەوەیە، لەو رۆژەدا من بەڕێزترین نەوەی ئادەمم، بە فەخر نەبێ).

٣٦١١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ يَزِيدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ يَزِيدَ أَبِي خَالِدٍ، عَنِ الْمِنْهَالِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ فَأُكْسَى الحُلَّةَ مِنْ

حُلَلِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ أَقُومُ عَنْ يَمِينِ الْعَرْشِ لَيْسَ أَحَدٌ مِنَ الْخَلاَئِقِ يَقُومُ ذَلِكَ الْمَقَامَ غَيْرِي.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مـن یەکـەم کەسـم زەویـم بـۆ شــەق دەکرێــت و زینــدوو دەکرێمــەوە، پۆشــاکێ لــە پۆشــاکەکانی بەهەشــتم لەبەردەکرێت، لەپاشدا لەلای راستی عەرشەوە رادەوەستم، جگە لە من هیچ کەسێ لە دروستکراوان ئەو شەرەفەی پێ نابڕێت و ناگاتە ئەو پایە).

٣٦١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ وَهُوَ الثَّوْرِيُّ، عَنْ لَيْثٍ وَهُوَ ابْنُ أَبِي سُلَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنِي كَعْبٌ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سَلُوا اللَّهَ لِيَ الوَسِيلَةَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الوَسِيلَةُ؟ قَالَ: أَعْلَى دَرَجَةٍ فِي الجَنَّةِ لاَ يَنَالُهَا إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ أَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَإِسْنَادُهُ لَيْسَ بِالْقَوِيِّ. وَكَعْبٌ لَيْسَ هُوَ بِمَعْرُوفٍ، وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَوَى عَنْهُ غَيْرَ لَيْثِ بْنِ أَبِي سُلَيْمٍ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (داوای (وسیلە)م بـۆ بکـەن لـە خوا). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، (وسیلە) چیە؟ فەرمووی: (بەرزترین شوێنی بەهەشتە هـیچ کـەس پێـی ناگـات جگـە لـە یـەك کـەس نـەبێ، هیوادارم ئەو کەسە من بم).

٣٦١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ،

أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَثَلِي فِي النَّبِيِّينَ كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى دَارًا فَأَحْسَنَهَا وَأَكْمَلَهَا وَأَجْمَلَهَا وَتَرَكَ مِنْهَا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِالبِنَاءِ وَيَعْجَبُونَ مِنْهُ، وَيَقُولُونَ: لَوْ تَمَّ مَوْضِعُ تِلْكَ اللَّبِنَةِ، وَأَنَا فِي النَّبِيِّينَ مَوْضِعُ تِلْكَ اللَّبِنَةِ.

واتە: لە (طفیل)ی کوڕی ئوبەی کوڕی کەعبەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نمونەی من لەناو پەیامبەراندا نمونەی پیاوێکە بە چاکترین و تەواوترین و جوانترین شێوە خانویەکی دروستکردووە جێگەی خشتێکی دانەنابێ و تەرکی کردبێ، خەڵك بە دەوریا دەسوڕێنەوە و پێی سەرسام دەبن و دەڵێن: خۆزگە ئەم خشتەش دابنرایە، دەی من لەناو پەیامبەراندا وەك ئەو خشتە وام).

(حسن) وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ القِيَامَةِ كُنْتُ إِمَامَ النَّبِيِّينَ وَخَطِيبَهُمْ وَصَاحِبَ شَفَاعَتِهِمْ، غَيْرُ فَخْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: بە هەمان سەنەد لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (ڕۆژی قیامەت هات من پێشەوا دەمڕاست و قسەکەری پەیامبەران و خاوەنی تکا و شەفاعەتیانم بە فەخر نەبێ).

٣٦١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَيْوَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنَا كَعْبُ بْنُ عَلْقَمَةَ، سَمِعَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ جُبَيْرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا لِيَ الوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللهِ وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، وَمَنْ سَأَلَ لِيَ الوَسِيلَةَ حَلَّتْ عَلَيْهِ الشَّفَاعَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَالَ

مُحَمَّدٌ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جُبَيْرٍ هَذَا قُرَشِيٌّ وَهُوَ مِصْرِيٌّ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ شَامِيٌّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومری کوڕی (عاص)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە فەرموویەتی: (کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگبێژ چی فەرموو ئێوەش ئەوە بڵێن، پاشان سڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە هەر کەسێك سڵاواتێك لەسەر من بدات خوای گەورە دە جار ڕەحمەت دەڕێژێت بە سەریدا، داوای (وسیلە)م بۆ بکەن کە مەنزڵگایەکە لە بەهەشتدا دانراوە بۆ یەکێك لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوا، هیوادارم کە ئەو بەندەیە من بم، هەر کەسێك داوای (وسیلە)م بۆ بکات شەفاعەتی من بۆ ئەو قبوڵ دەبێت).

٣٦١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ جُدْعَانَ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ القِيَامَةِ وَلاَ فَخْرَ، وَبِيَدِي لِوَاءُ الحَمْدِ وَلاَ فَخْرَ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمُ فَمَنْ سِوَاهُ إِلاَّ تَحْتَ لِوَائِي، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ وَلاَ فَخْرَ. وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا من گەورەی نەوەکانی ئادەمم بە فەخر نەبێ، ئاڵای سوپاسگوزاری بەدەست منەوەیە بە فەخر نەبێ، وە هەرچی پەیامبەران و لەوان خوارتریش هەیە لەژێر ئاڵای مندان، یەکەم کەسم زەویم بۆ شەق دەکرێت و زیندوو دەکرێمەوە بە فەخر نەبێ).

٣٦١٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَمْعَةُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ وَهْرَامَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: جَلَسَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْتَظِرُونَهُ قَالَ: فَخَرَجَ حَتَّى إِذَا دَنَا مِنْهُمْ سَمِعَهُمْ يَتَذَاكَرُونَ فَسَمِعَ حَدِيثَهُمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَجَبًا إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ اتَّخَذَ مِنْ خَلْقِهِ خَلِيلاً، اتَّخَذَ مِنْ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً، وَقَالَ آخَرُ: مَاذَا بِأَعْجَبَ مِنْ كَلاَمِ مُوسَى كَلَّمَهُ تَكْلِيمًا، وَقَالَ آخَرُ: فَعِيسَى كَلِمَةُ اللهِ وَرُوحُهُ، وَقَالَ آخَرُ: آدَمُ اصْطَفَاهُ اللَّهُ. فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ فَسَلَّمَ، وَقَالَ: قَدْ سَمِعْتُ كَلاَمَكُمْ وَعَجَبَكُمْ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلُ اللهِ وَهُوَ كَذَلِكَ وَمُوسَى نَجِيُّ اللهِ وَهُوَ كَذَلِكَ، وَعِيسَى رُوحُهُ وَكَلِمَتُهُ وَهُوَ كَذَلِكَ وَآدَمُ اصْطَفَاهُ اللَّهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، أَلاَ وَأَنَا حَبِيبُ اللهِ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا حَامِلُ لِوَاءِ الْحَمْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يُحَرِّكُ حِلَقَ الْجَنَّةِ فَيَفْتَحُ اللَّهُ لِي فَيُدْخِلُنِيهَا وَمَعِي فُقَرَاءُ الْمُؤْمِنِينَ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا أَكْرَمُ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ وَلاَ فَخْرَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانیشتبوون چاوەڕێی پێغەمبەریان صلى الله عليه وسلم دەکرد، ئەویش لەماڵ دەرچوو هەتا نزیك بوویەوە لێیان گوێی لە قسەو باسیان بوو، هەندێکیان دەیانوت: سەیرە خوای گەورە یەکێ لە دروسکراوانی خۆی کردۆتە دۆست و خۆشەویستی خۆی، ئیبراهیمی کردۆتە دۆست و خۆشەویستی خۆی، یەکێکی تر فەرمووی: لەوە سەیر تر چی بێ خوای گەورە راستەوخۆ قسەی لەتەك موسا کردووە، یەکێکی تریان فەرمووی: عیسا روحێکی پاکەو لەلایەن خواوە بە یەك وشە پەیدا بووە، یەکێکی تریان فەرمووی: خوای گەورە ئادەمی بە دانسقە هەڵبژاردووە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چوو بۆ

ناویان سڵاوی لێ کردن فەرمووی: (بێگومان گوێم لە قسەکانتان بوو پێتان سەیر بوو خوای گەورە ئیبراهیمی کردۆتە دۆست و خۆشەویستی خۆی و راستەوخۆ قسەی لەتەك موسا کردووە و عیسا روحێکی پاکەو لەلایەن خواوە بە یەك وشە پەیدا بووە و ئادەمی بە دانسقە هەڵبژاردووە بەڵێ وایە ئەوانە هەموو هەق و راستین، ئاگاداربن بە فەخر نەبێ منیش خۆشەویستی خوام، لەرۆژی قیامەتدا ئالای سوپاسگوزاری بەدەست منەوەیە و یەکەم تکاکارم و یەکەم کەسیشم تکام لێ وەردەگیرێ و یەکەم کەسم ئەڵقەی دەرگای بەهەشت رائەوەشێنم خوای گەورە دەرگاکەم بۆ دەکاتەوە و دەمباتە ناوی لەتەك موسوڵمانە هەژارەکاندا، سەروەر و بەرێزترینی سەرەتا و کۆتایی سەرجم خەڵکم).

٣٦١٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ الطَّائِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو مَوْدُودٍ الْمَدَنِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الضَّحَّاكِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يُوسُفَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: مَكْتُوبٌ فِي التَّوْرَاةِ صِفَةُ مُحَمَّدٍ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ يُدْفَنُ مَعَهُ قَالَ: فَقَالَ أَبُو مَوْدُودٍ وَقَدْ بَقِيَ فِي البَيْتِ مَوْضِعُ قَبْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: (عبد الله)ی کوڕی سەلام هاوەڵی بەناوبانگی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەفەرموێت: سیفەتەکانی موحەممەد صلی الله علیه وسلم لە تەوراتدا نوسراوە، هەروەها نوسراوە عیسای کوڕی مەریەم لەتەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەسپەردە دەکرێت - دوای ئەوەی دابەزی ژن دەهێنێ و منداڵی دەبێ و دەمرێ ئەو کاتە - ئەبو مەودود دەڵێ: لەماڵی عائیشەدا کە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم تێدا نێژراوە جێگەی گۆڕێ ماوە.

٣٦١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ هِلاَلٍ الصَّوَّافُ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الضُّبَعِيُّ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: لَمَّا كَانَ اليَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ اليَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا نَفَضْنَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الأَيْدِي وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە شاری مەدینە هەموو شتێ شەوقی دەدایەوە و ئەدرەوشایەوە، ئەو ڕۆژەش کە وەفاتی کرد لە شاری مەدینە هەموو شتێ تاریك بوو، هێشتا سەرقاڵی ناشتنی بووین و دەستمان هەڵنەگرتبوو دڵمان گۆڕا.

## دەربارەی لەدایك بوونی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيلاَدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦١٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ العَبْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْحَاقَ، يُحَدِّثُ عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسِ بْنِ مَخْرَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: وُلِدْتُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الفِيلِ، قَالَ: وَسَأَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ قُبَاثَ بْنَ أَشْيَمَ أَخَا بَنِي يَعْمَرَ بْنِ لَيْثٍ: أَنْتَ أَكْبَرُ أَمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكْبَرُ مِنِّي وَأَنَا أَقْدَمُ مِنْهُ فِي الْمِيلاَدِ، قَالَ: وَرَأَيْتُ خَذْقَ الْفِيلِ أَخْضَرَ مُحِيلاً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ.

واتە: لە (عبد المطلب)ی کوڕی (عبد الله)ی قەیسی کوڕی مەخرەمەوە، لە

باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: مـن و پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ساڵی فیل لەدایك بووین - واتە ئەو ساڵەی ئەبرەهە فیلەکانی بە سوپاوە هێنایە سەر کەعبە و ویستی بیڕوخێنێ بەڵام خوای گەورە خۆی و سوپاکەی تەفروتونا کرد و لەناوی بردن - ، (قُبَاث)ی کوڕی ئەشیەم برای بەنی یەعمەر لە پێشەوا (عثمان)ی ڕەزای خوای لێ بێ پرسی: تۆ گەورەتری یان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: ئەو لە من گەورەترە وەلێ من لەپێش ئەوەوە لەدایك بووم، پێشەوا (عثمان) فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ساڵی فیل لەدایك بووە،بیرم دێ دایکم هەڵی گرتم و بردمی شوێنی فیلەکانی نیشاندام و پیسایی فیلەکانم دی وەك شیاکە سەوز هەڵگەڕابوون.

## دەربارەی دەسپێکی پەیامبەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بَدْءِ نُبُوَّةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦٢٠ - (صحيح لكن ذكر بلال فيه منكر كما قيل) حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ سَهْلٍ أَبُو العَبَّاسِ الأَعْرَجُ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ غَزْوَانَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: خَرَجَ أَبُو طَالِبٍ إِلَى الشَّامِ وَخَرَجَ مَعَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَشْيَاخٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَلَمَّا أَشْرَفُوا عَلَى الرَّاهِبِ هَبَطُوا فَحَلُّوا رِحَالَهُمْ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمُ الرَّاهِبُ وَكَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ يَمُرُّونَ بِهِ فَلاَ يَخْرُجُ إِلَيْهِمْ وَلاَ يَلْتَفِتُ. قَالَ: فَهُمْ يَحُلُّونَ رِحَالَهُمْ، فَجَعَلَ يَتَخَلَّلُهُمُ الرَّاهِبُ حَتَّى جَاءَ فَأَخَذَ بِيَدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: هَذَا سَيِّدُ العَالَمِينَ، هَذَا رَسُولُ رَبِّ العَالَمِينَ، يَبْعَثُهُ اللَّهُ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ، فَقَالَ لَهُ أَشْيَاخٌ مِنْ قُرَيْشٍ: مَا عِلْمُكَ، فَقَالَ: إِنَّكُمْ حِينَ أَشْرَفْتُمْ مِنَ العَقَبَةِ لَمْ يَبْقَ شَجَرٌ وَلاَ حَجَرٌ إِلاَّ خَرَّ سَاجِدًا وَلاَ يَسْجُدَانِ إِلاَّ

لِنَبِيٍّ، وَإِنِّي أَعْرِفُهُ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ أَسْفَلَ مِنْ غُضْرُوفِ كَتِفِهِ مِثْلَ التُّفَّاحَةِ، ثُمَّ رَجَعَ فَصَنَعَ لَهُمْ طَعَامًا، فَلَمَّا أَتَاهُمْ بِهِ وَكَانَ هُوَ فِي رِعْيَةِ الإِبِلِ، قَالَ: أَرْسِلُوا إِلَيْهِ، فَأَقْبَلَ وَعَلَيْهِ غَمَامَةٌ تُظِلُّهُ، فَلَمَّا دَنَا مِنَ الْقَوْمِ وَجَدَهُمْ قَدْ سَبَقُوهُ إِلَى فَيْءِ الشَّجَرَةِ، فَلَمَّا جَلَسَ مَالَ فَيْءُ الشَّجَرَةِ عَلَيْهِ، فَقَالَ: انْظُرُوا إِلَى فَيْءِ الشَّجَرَةِ مَالَ عَلَيْهِ، قَالَ: فَبَيْنَمَا هُوَ قَائِمٌ عَلَيْهِمْ وَهُوَ يُنَاشِدُهُمْ أَنْ لاَ يَذْهَبُوا بِهِ إِلَى الرُّومِ، فَإِنَّ الرُّومَ إِنْ رَأَوْهُ عَرَفُوهُ بِالصِّفَةِ فَيَقْتُلُونَهُ، فَالتَفَتَ فَإِذَا بِسَبْعَةٍ قَدْ أَقْبَلُوا مِنَ الرُّومِ فَاسْتَقْبَلَهُمْ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكُمْ؟ قَالُوا: جِئْنَا، إِنَّ هَذَا النَّبِيَّ خَارِجٌ فِي هَذَا الشَّهْرِ، فَلَمْ يَبْقَ طَرِيقٌ إِلاَّ بُعِثَ إِلَيْهِ بِأُنَاسٍ وَإِنَّا قَدْ أُخْبِرْنَا خَبَرَهُ فَبُعِثْنَا إِلَى طَرِيقِكَ هَذَا، فَقَالَ: هَلْ خَلْفَكُمْ أَحَدٌ هُوَ خَيْرٌ مِنْكُمْ؟ قَالُوا: إِنَّمَا أُخْبِرْنَا خَبَرَهُ بِطَرِيقِكَ هَذَا. قَالَ: أَفَرَأَيْتُمْ أَمْرًا أَرَادَ اللهُ أَنْ يَقْضِيَهُ هَلْ يَسْتَطِيعُ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ رَدَّهُ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَبَايَعُوهُ وَأَقَامُوا مَعَهُ قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللهِ أَيُّكُمْ وَلِيُّهُ؟ قَالُوا: أَبُو طَالِبٍ، فَلَمْ يَزَلْ يُنَاشِدُهُ حَتَّى رَدَّهُ أَبُو طَالِبٍ وَبَعَثَ مَعَهُ أَبُو بَكْرٍ بِلاَلاً وَزَوَّدَهُ الرَّاهِبُ مِنَ الكَعْكِ وَالزَّيْتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبی بەکری کوڕی ئەبی موسای ئەشعەریەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو (طالب) و لەتەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هەندێ لە پیاوە ریش سپی و بە تەمەنەکانی قورەیش چوون بۆ سەفەری شام، کە دەگەنە لای راهیبەکە — کە بەناوبانگ بووە بە بوحەیرای راهیب — لەوێ لادەدەن و دادەبەزن و باردەخەن، راهیبەکە دێتە دەرەوە بۆ لایان، لەکاتێکدا پێشتر نەدەهاتە دەرەوە بۆ لایان و ئاوڕی لێ نەدەدانەوە و گوێی پێ نەدەدان، ئەبو موسا فەرمووی: ئەوان هێشتا خەریکی بارخستن بوون دێ بۆ لایان و دەسوڕێتەوە بە ناویاندا هەتا دەگاتە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی دەگرێ و دەڵێ: ئەمە گەورە و سەروەری هەموو جیهانیانە، خوای گەورە

دەیکاتە پەیامبەری هەموو جیهانیان، رەحمەتە بۆ هەموو جیهانیان، پیاوە پیاوە ریش سپی و بە تەمەنەکانی قورەیش وتیان: تۆ ئەمە چۆن دەزانی؟ وتی: کە ئێوە لە بەرزاییەکەوە سەرکەوتن دار و بەرد نەما سەجدەی بۆ نەبات، بێگومان جگە لە پێغەمبەران سەجدە نابەن بۆ کەس، بەو نیشانەدا دەیناسم کە مۆری پێغەمبەرایەتیە بە قەد سێوێ دەبێ وابە بەخوار کرکراگەی دەفەی شانیەوە، لەپاشدا گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی و خواردنی بۆ دروستکردن، کاتێ خواردنەکەی بۆ هێنان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لای وشترەکان بوو دەیلەوەڕاندن، وتی: بنێرن بە دوایدا با بێت، کە هات پەڵەیە هەور بەڕاسەریەوە بوو سێبەری بۆ کردبوو، کاتێ لە خەڵکەکە نزیك بوویەوە جێگەی نەمابوو لە سێبەری دارەکەدا دانیشێ لەو لاوە بۆ خۆی دانیشت خێرا سێبەری دارەکە بایدایەوە بۆ سەر ئەو، راهیبەکە وتی: سەیرکەن چۆن سێبەری دارەکە بایدایەوە بۆ سەر ئەو، ئەبو موسا فەرمووی: راهیبەکە لەدیاریان راوەستا بوو ئامۆژگاری کردن کە نەیبەن بۆ رۆم، چونکە بێگومان ئەگەر بیبەن بەو ناونیشانە رۆمەکان دەیناسنەوە و دەیکوژن، لەوکاتەدا راهیبەکە ئاوڕی دایەوە سەیری کرد وا حەوت کەس لەڕۆمەوە هاتن چوو بەپیریانەوە و وتی: بۆچی هاتوون؟ وتیان: لەم مانگەدا ئەو پێغەمبەرە لەماڵ دەردەچێ رێگا نەماوە کۆمەڵێکی بۆ رەوانە نەکرابێ ئێمەیش هاتووین بۆ ئەم رێگایە بزانین لێرەوە نایەت بیکوژین، وتی: لەدوای ئێوەوە کەسی تر هەیە لەئێوە چابوك تر بێ و راوانە کرابێ بۆ ئەو مەبەستە؟ وتیان: نەخێر، ئێمەیان بە تایبەتی هەڵبژاردووە بۆ ئەم رێگەی تۆ، وتی: ئەگەر کارێ خوا بڕیاری لەسەر بدات کەس ئەتوانێ رەتی بکاتەوە؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: پەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و لەلای مانەوە، راهیبەکە وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا کێتان سەپەرشتیاری ئەو کوڕەن؟ وتیان: ئەبو (طالب)، ئیتر وازی لێ

نەهێنا هەتا ئەبو (طالب) پێغەمبەری صلى الله علیه وسلم گێڕایە دواوە، ئەبو بەکریش بیلالی لەگەڵ پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم ناردەوە، راهیبەکەش کولیچە و رۆن زەیتونی دانێ.

## دەربارەی رەوانەکردنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و تەمەنی چەند بوو

## ٤ - بَابٌ فِي مَبْعَثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَابْنُ كَمْ كَانَ حِينَ بُعِثَ؟

٣٦٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ ابْنُ أَرْبَعِينَ، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرًا، وَتُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم تەمەنی چل ساڵ بوو وەحی بۆ هات، سیانزە ساڵ لە مەککە مایەوە و دە ساڵیشی لە مەدینە بەسەر برد، هەر لەوێش لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا وەفاتی کرد.

٣٦٢٢ - (شاذ) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قُبِضَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ ابْنُ خَمْسٍ وَسِتِّينَ سَنَةً، هَكَذَا حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَرَوَى عَنْهُ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، مِثْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا وەفاتی کرد.

٣٦٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ (ح) وحَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالطَّوِيلِ البَائِنِ، وَلاَ بِالقَصِيرِ، وَلاَ بِالأَبْيَضِ الأَمْهَقِ، وَلاَ بِالآدَمِ، وَلَيْسَ بِالجَعْدِ القَطَطِ، وَلاَ بِالسَّبِطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ وَبِالمَدِينَةِ عَشْرًا، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً، وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بالآی مام ناوەندی بوو نە درێژێکی دیار بوو نە کورتێکی بەرچاو بوو، نە زۆر سپی بوو نە گەنم ڕەنگیش بوو، قژیشی نە زۆر لول بوو نە زۆر خاو، لە سەری ساڵی چل ساڵەی تەمەنیدا خوای گەورە کردی بە پەیامبەر و ڕەوانەی کرد، دە ساڵ لە مەککە مایەوە و دە ساڵیشی لە مەدینە بەسەر برد، هەر لەوێش لە سەری ساڵی شەست ساڵەی تەمەنیدا وەفاتی کرد، سەر و ریشی دە تەڵ مووی سپی تێدا نەبوو.

## دەربارەی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

### ٥ - بَابٌ فِي آيَاتِ نُبُوَّةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا قَدْ خَصَّهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهِ

٣٦٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: أَخْبَرَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ مُعَاذٍ الضَّبِّيُّ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ

سَمُرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ بِمَكَّةَ حَجَرًا كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ لَيَالِيَ بُعِثْتُ، إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیری كوڕی سەمورەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەو شەوانەدا كە كرام بە پەیامەر لە مەككە بەردێ هەبوو سڵاوی لێ دەكردم، بێگومان ئێستا ئەزانم كام بەردەیە).

٣٦٢٥ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي العَلاَءِ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَتَدَاوَلُ فِي قَصْعَةٍ مِنْ غُدْوَةٍ حَتَّى اللَّيْلِ يَقُومُ عَشَرَةٌ وَيَقْعُدُ عَشَرَةٌ، قُلْنَا: فَمَا كَانَتْ تُمَدُّ؟ قَالَ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَعْجَبُ فَمَا كَانَتْ تُمَدُّ إِلاَّ مِنْ هَاهُنَا وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى السَّمَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو العَلاَءِ اسْمُهُ: يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ.

واتە: لە سەمورەی كوڕی جومدوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، بە نۆبە هەر لە بەیانیەوە هەتا شەو لە خواردنێكمان دەخوارد دەكەس تێریان دەخوارد و هەڵەسان و دەكەسیش دادەنیشتن بۆ نان خواردن هەر تەواو نەدەبوو، بە سەمورەمان وت: سەیرە چۆن تەواو نەدەبوو هەر زیادی دەكرد، فەرمووی: بۆچی بەلاتانەوە سەیرە لە ئاسمانەوە بەرەكەتی تێ دەكەوت بە دەستی ئاماژەی كرد بۆ ئاسمان.

### ٦ - بَابٌ

٣٦٢٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ يَعْقُوبَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ أَبِي ثَوْرٍ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ فَخَرَجْنَا فِي بَعْضِ نَوَاحِيهَا فَمَا اسْتَقْبَلَهُ جَبَلٌ وَلاَ شَجَرٌ إِلاَّ وَهُوَ يَقُولُ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الوَلِيدِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، وَقَالَ: عَنْ عَبَّادِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ، مِنْهُمْ فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ لە مەككە لەتەك پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووم، دەرچووین بۆ دەوروبەری لەرێگە تووشی هەر كێو و درەختێ دەبوو دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سڵاوی خوات لەسەر بێ.

٣٦٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ يُونُسَ، عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ عَمَّارٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ إِلَى لِزْقِ جِذْعٍ وَاتَّخَذُوا لَهُ مِنْبَرًا، فَخَطَبَ عَلَيْهِ فَحَنَّ الجِذْعُ حَنِينَ النَّاقَةِ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَسَّهُ فَسَكَتَ. وَفِي البَابِ عَنْ أُبَيٍّ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَحَدِيثُ أَنَسٍ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە تەنیشت بنكی دار خورمایەكەوە وتاری دەدا، مینبەرێكیان بۆ دروستكرد پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چووە سەری بۆ وتار دان بنكی دار خورماكە ناڵەی لێوە دەهات وەك ناڵەی وشتری مێ بۆ بێچوەكەی، جا هاتە خوارەوە و گرتیە باوەشی و بێ دەنگ

بوو.

٣٦٢٨ - (صحيح دون قوله: فأسلم الأعرابي) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ أَبِي ظَبْيَانَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ بِمَ أَعْرِفُ أَنَّكَ نَبِيٌّ؟ قَالَ: إِنْ دَعَوْتُ هَذَا العِذْقَ مِنْ هَذِهِ النَّخْلَةِ تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَدَعَاهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَعَلَ يَنْزِلُ مِنَ النَّخْلَةِ حَتَّى سَقَطَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: ارْجِعْ فَعَادَ، فَأَسْلَمَ الأَعْرَابِيُّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: عەرەبێكی دەشتەكی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتی: بە چیدا بزانم كە تۆ پێغەمبەریت؟ فەرمووی: ئەو پەلكە خورما بانگ دەكەم بێت و شایەتی بدات لەسەر ئەوەی كە من پێغەمبەری خودام، بانگی كرد و لە دارخورماكە كەوتی خوارەوە و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و شایەتی دا، لەپاشدا فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆت، ئەویش گەڕایەوە، جا عەرەبە دەشتەكیەكە موسوڵمان بوو.

٣٦٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَزْرَةُ بْنُ ثَابِتٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلْبَاءُ بْنُ أَحْمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زَيْدِ بْنُ أَخْطَبَ، قَالَ: مَسَحَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ عَلَى وَجْهِي وَدَعَا لِي. قَالَ عَزْرَةُ: إِنَّهُ عَاشَ مِائَةً وَعِشْرِينَ سَنَةً وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ إِلاَّ شُعَيْرَاتٌ بِيضٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو زَيْدٍ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ أَخْطَبَ.

واتە: لە زەیدی كوڕی (أَخْطَبَ)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی هێنا بەرو خسارمداو

بوو.

٣٦٢٨ - (صحيح دون قوله: فأسلم الأعرابي) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ أَبِي ظَبْيَانَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ بِمَ أَعْرِفُ أَنَّكَ نَبِيٌّ؟ قَالَ: إِنْ دَعَوْتُ هَذَا العِذْقَ مِنْ هَذِهِ النَّخْلَةِ تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَدَعَاهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَعَلَ يَنْزِلُ مِنَ النَّخْلَةِ حَتَّى سَقَطَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: ارْجِعْ فَعَادَ، فَأَسْلَمَ الأَعْرَابِيُّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، وتی: بە چیدا بزانم کە تۆ پێغەمبەریت؟ فەرمووی: ئەو پەلکە خورما بانگ دەکەم بێت و شایەتی بدات لەسەر ئەوەی کە من پێغەمبەری خودام، بانگی کرد و لە دارخورماکە کەوتی خوارەوە و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم و شایەتی دا، لەپاشدا فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆت، ئەویش گەڕایەوە، جا عەرەبە دەشتەکیەکە موسوڵمان بوو.

٣٦٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَزْرَةُ بْنُ ثَابِتٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلْبَاءُ بْنُ أَحْمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زَيْدِ بْنُ أَخْطَبَ، قَالَ: مَسَحَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ عَلَى وَجْهِي وَدَعَا لِي. قَالَ عَزْرَةُ: إِنَّهُ عَاشَ مِائَةً وَعِشْرِينَ سَنَةً وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ إِلاَّ شُعَيْرَاتٌ بِيضٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو زَيْدٍ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ أَخْطَبَ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (أَخْطَبَ)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دەستی هێنا بەرو خسارمداو

بۆم پاڕایەوە، (عَزْرَة)ی كوڕی (ثابت) فەرمووی: زەید بە بەرەكەتی ئەو پاڕانەوەیە سەدو بیست ساڵ ژیا چەند تەڵێ مووی سپی بە سەریەوە بوو.

٣٦٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: عَرَضْتُ عَلَى مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: قَالَ أَبُو طَلْحَةَ لأُمِّ سُلَيْمٍ: لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ضَعِيفًا، أَعْرِفُ فِيهِ الجُوعَ فَهَلْ عِنْدَكِ مِنْ شَيْءٍ؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَأَخْرَجَتْ أَقْرَاصًا مِنْ شَعِيرٍ، ثُمَّ أَخْرَجَتْ خِمَارًا لَهَا فَلَفَّتِ الخُبْزَ بِبَعْضِهِ، ثُمَّ دَسَّتْهُ فِي يَدِي وَرَدَّتْنِي بِبَعْضِهِ، ثُمَّ أَرْسَلَتْنِي إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَذَهَبْتُ بِهِ إِلَيْهِ فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ وَمَعَهُ النَّاسُ، قَالَ: فَقُمْتُ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَرْسَلَكَ أَبُو طَلْحَةَ؟ فَقُلْتُ نَعَمْ. قَالَ: بِطَعَامٍ؟ فَقُلْتُ نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَنْ مَعَهُ: قُومُوا، قَالَ: فَانْطَلَقُوا، فَانطَلَقْتُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ حَتَّى جِئْتُ أَبَا طَلْحَةَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ قَدْ جَاءَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ مَعَهُ وَلَيْسَ عِنْدَنَا مَا نُطْعِمُهُمْ. قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَانْطَلَقَ أَبُو طَلْحَةَ حَتَّى لَقِيَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو طَلْحَةَ مَعَهُ حَتَّى دَخَلاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلُمِّي يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا عِنْدَكِ؟ فَأَتَتْهُ بِذَلِكَ الخُبْزِ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَفُتَّ وَعَصَرَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ بِعُكَّةٍ لَهَا فَأَدَمَتْهُ، ثُمَّ قَالَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، فَأَذِنَ لَهُمْ فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، فَأَذِنَ لَهُمْ فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، فَأَكَلَ القَوْمُ كُلُّهُمْ وَشَبِعُوا وَالقَوْمُ سَبْعُونَ أَوْ ثَمَانُونَ رَجُلاً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو (طلحة) ئوممو سولەیمی فەرموو: گوێم لە دەنگی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەنگی کز بوو، وا ئەزانم لەبەر برسێتی بێ، هیچ خواردنێکت لەلا هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، چەند کولێرەیەکی جۆی دەرهێنا بە لایەکی لەچکەکەی پێچایەوە و خستیە بن دەستم و ئەولای لەچکەکەی تێوە ئاڵاندم بۆ ئەوەی دەرنەکەون، ئینجا ناردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەنەس فەرمووی: منیش چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم روانیم لە مزگەوت دانیشتووە و خەڵکەکە لە خزمەتیدان، منیش بە دیاریانەوە ڕاوەستام، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەنەس ئەبو (طلحة) ناردویتی؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی: (بە تۆدا نانی ناردووە؟) وتم: بەڵێ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەوانەی لەتەکی بوون فەرمووی: (هەستن با بچین بۆ ماڵی ئەبو (طلحة)، ئەنەس فەرمووی: ئەوان کەوتنە ڕێ و منیش پێش ئەوان خۆم گەیاندە ماڵەوە و هەواڵم ڕاگەیاند بە ئەبو (طلحة)، فەرمووی: ئوممو سولەیم بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆ ماڵەوە و خەڵکیشی لەگەڵە، ئێمەش هیچ خواردنێکمان نیە هەتا دەرخواردیان بدەین، ئوممو سولەیم فەرمووی: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، ئەبو (طلحة) چوو بە پیریەوە و لەتەکیدا هاتەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئوممو سولەیم خواردن چی هەیە بیهێنە)، ئەویش کولێرەکانی هێنا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا وردیان کردن، ئوممو سولەیم چەوری کردن، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێ دوعای بەسەردا خوێند، لەپاشدا فەرمووی: (فەرموو لە دە کەس بکە با بێنە ژوورەوە لێی بخۆن)، جا فەرمووی لە دە کەس دەکرد دەچوونە ژوورەوە تێریان

دەخوارد، لەپاشدا دەچوونە دەرەوە، لەپاشدا فەرمووی: (فەرمووی لە دە کەسی تر بکە با بێنە ژوورەوە لێی بخۆن)، جا فەرمووی لە دە کەس دەکرد دەچوونە ژوورەوە تێریان دەخوارد، لەپاشدا دەچوونە دەرەوە، بەو شێوەیە هەتا خەڵکەکە هەموو تێریان لێ خوارد، خەڵکەکە حەفتا کەس یان هەشتا پیاو دەبوون.

٣٦٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَانَتْ صَلاَةُ العَصْرِ وَالتَمَسَ النَّاسُ الوَضُوءَ فَلَمْ يَجِدُوا، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَضُوءٍ فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ فِي ذَلِكَ الإِنَاءِ وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّئُوا مِنْهُ قَالَ: فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ النَّاسُ حَتَّى تَوَضَّئُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ. وَفِي البَابِ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرٍ، وَحَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم دی کاتی نوێژی عەسر بوو، خەڵکەکە ویستیان دەستنوێژبگرن ئاویان دەست نەکەوت، لە دەفرێکدا ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوەی دەستنوێژی پێ هەڵگرێ، دەستی خستە ناو دەفرەکەوە و فەرمانی کرد بە خەڵکەکە هەر هەموویان بێن لەو دەفرەدا دەستنوێژبگرن، ئەنەس فەرمووی: من دەمبینی لە نێوانی پەنجەکانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هەڵدەقوڵیە ناو دەفرەکە هەتا هەموو خەڵکەکە دەستنوێژیان گرت.

٣٦٣٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ،

أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا ابْتُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ النُّبُوَّةِ حِينَ أَرَادَ اللَّهُ كَرَامَتَهُ وَرَحْمَةَ العِبَادِ بِهِ أَنْ لاَ يَرَى شَيْئًا إِلاَّ جَاءَتْ كَفَلَقِ الصُّبْحِ، فَمَكَثَ عَلَى ذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَمْكُثَ، وَحُبِّبَ إِلَيْهِ الخَلْوَةُ فَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَخْلُوَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: یەکەمین دەستپێکی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە خوای گەورە ویستی ڕێزی لێ بنێ و بیکاتە ڕەحمەت و بەزەیی بۆ بەندەکان ئەمە بوو سەرەتا هەر خەوێکی دەبینی وەك سپێدەی بەیان دەهاتە دی، ئەوەندەی خوا حەز بکات بەو شێوەیە مایەوە، جا گۆشەگیری لەلا خۆشەویست کرا، هیچ شتێکی ئەوەندەی گۆشەگیری لەلا خۆشەویست نەبوو).

٣٦٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: إِنَّكُمْ تَعُدُّونَ الآيَاتِ عَذَابًا وَإِنَّا كُنَّا نَعُدُّهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَرَكَةً، لَقَدْ كُنَّا نَأْكُلُ الطَّعَامَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ. قَالَ: وَأُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِإِنَاءٍ فَوَضَعَ يَدَهُ فِيهِ فَجَعَلَ الْمَاءُ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: حَيَّ عَلَى الوَضُوءِ الْمُبَارَكِ وَالبَرَكَةُ مِنَ السَّمَاءِ حَتَّى تَوَضَّأْنَا كُلُّنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێوە موعجیزەکان بە سزا هەژمار دەکەن لەکاتێکدا کە ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بە بەرەکەت هەژمارمان دەکردن، بێگومان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خواردنمان دەخوارد،

گوێمان لە تەسبیحاتی خواردنەکە دەبوو، فەرمووی: لە دەفرێکدا ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی دەستنوێژی پێ هەڵگرێ، دەستی خستە ناو دەفرەکەوە لە نێوانی پەنجەکانیەوە ئاو هەڵدەقوولّی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وەرن بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن بەم ئاوە موبارەکە بەرەکەتەکەی لە ئاسمانەوەیە)، هەتا هەموومان دەستنوێژمان گرت.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چۆن وەحی دەهات بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

### ٧ - بَابُ مَا جَاءَ كَيْفَ كَانَ يَنْزِلُ الوَحْيُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ الحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ، سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَيْفَ يَأْتِيكَ الوَحْيُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلُ صَلْصَلَةِ الجَرَسِ وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ الْمَلَكُ رَجُلاً فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي اليَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە (حارث)ی کوڕی هیشام لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسی: چۆن وەحیت بۆ دێ؟ فەرمووی: (هەندێ جار لە شێوەی دەنگی زەنگ(جەرەس) بۆم دێ کە ئەمەیان قورسترینە لەسەرم، پاشان قورسیەکە لەسەرم لادەچێ و هەرچیم پێ وتراوە لەبەرم کردووە، هەندێ جاری تریش مەلائیکەی وەحی لەسەر شێوەی پیاوێ دێت بۆ لام پەیامەکەم

پیێ دەگەیەنیێ منیش راستەوخۆ تێدەگەم دەڵێ چی و لەبەری دەكەم، عائیشە رەزای خوای لیێ بیێ فەرمووی: لە رۆژێكی زۆر ساردا وەحی بۆ دادەبەزی ناوچاوانی ئارەقی لیێ هەڵدەنیشت.

## دەربارەی سیفەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ، بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، لَمْ يَكُنْ بِالْقَصِيرِ وَلاَ بِالطَّوِيلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەرائەوە رەزای خوای لیێ بیێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پۆشاكێكی سوری تازەی لەبەردا بوو كەسم نەدیوە ئەوەندە جوان و پێكەوتوو بێت، قژێكی پێوە بوو دەیدا لە سەرشانی، بالاّ مامناوەندی بوو، نە بالاّی بەرز بوو نە كورتەبالاّش بوو.

٣٦٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ الْبَرَاءَ: أَكَانَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَ السَّيْفِ؟ قَالَ: لاَ مِثْلَ الْقَمَرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبی ئیسحاقەوە دەگێڕنەوە، كە پیاوێ دەربارەی رووی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە بەڕائی رەزای خوای لیێ بیێ پرسی وتی: ئایا رووی وەك شمشێر بوو، فەرمووی: نەخێر، وەك مانگ بوو خڕ بوو.

٣٦٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمَسْعُودِيُّ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مُسْلِمِ بْنِ هُرْمُزَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالطَّوِيلِ وَلاَ بِالقَصِيرِ شَثْنَ الكَفَّيْنِ وَالقَدَمَيْنِ، ضَخْمَ الرَّأْسِ، ضَخْمَ الكَرَادِيسِ طَوِيلَ الْمَسْرُبَةِ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ تَكَفُّؤًا كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنِ الْمَسْعُودِيِّ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نە بالآی بەرز بوو، نە کورتەبالآش بوو، دەست و پێی و سەر و کەللەی و سەر جومگەکانی قەوی بوون، مووی سەرسنگی تا خوارەوە وەك كلافە قەتارەی بەستبوو، لەکاتی ڕۆشتندا کەمێ بە بەردا دەینواند، ئەتوت لە هەورازەوە دێتەخوارێ، نە لەپاش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و نە لەپاش ئەو کەسم نەدیوە وەك ئەو ئەوەندە جوان و پێکەوتوو بێ.

٣٦٣٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ الحُسَيْنِ بْنِ أَبِي حَلِيمَةَ مِنْ قَصْرِ الأَحْنَفِ، وَأَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ مَوْلَى غُفْرَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُحَمَّدٍ، مِنْ وَلَدِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ، إِذَا وَصَفَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْمُمَّغِطِ وَلاَ بِالقَصِيرِ الْمُتَرَدِّدِ، وَكَانَ رَبْعَةً مِنَ القَوْمِ، وَلَمْ يَكُنْ بِالجَعْدِ القَطَطِ وَلاَ بِالسَّبِطِ كَانَ جَعْدًا رَجِلاً وَلَمْ يَكُنْ بِالمطَهَّمِ، وَلاَ بِالمكَلْثَمِ، وَكَانَ فِي الوَجْهِ تَدْوِيرٌ، أَبْيَضُ مُشْرَبٌ، أَدْعَجُ العَيْنَيْنِ، أَهْدَبُ الأَشْفَارِ، جَلِيلُ الْمُشَاشِ، وَالكَتَدِ، أَجْرَدُ ذُو مَسْرُبَةٍ شَثْنُ الكَفَّيْنِ وَالقَدَمَيْنِ، إِذَا مَشَى تَقَلَّعَ كَأَنَّمَا يَمْشِي فِي

صَبَبٍ، وَإِذَا التَفَتَ التَفَتَ مَعًا، بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ وَهُوَ خَاتَمُ النَّبِيِّينَ، أَجْوَدُ النَّاسِ صَدْرًا، وَأَصْدَقُ النَّاسِ لَهْجَةً، وَأَلْيَنُهُمْ عَرِيكَةً، وَأَكْرَمُهُمْ عِشْرَةً، مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ، وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ، يَقُولُ نَاعِتُهُ: لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ. قَالَ أَبُو جَعْفَرٍ: سَمِعْتُ الأَصْمَعِيَّ، يَقُولُ فِي تَفْسِيرِ صِفَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُمَّغِطُ الذَّاهِبُ طُولاً. وَسَمِعْتُ أَعْرَابِيًّا يَقُولُ فِي كَلاَمِهِ: تَمَغَّطَ فِي نُشَّابَتِهِ أَيْ مَدَّهَا مَدًّا شَدِيدًا. وَأَمَّا الْمُتَرَدِّدُ: فَالدَّاخِلُ بَعْضُهُ فِي بَعْضٍ قِصَرًا. وَأَمَّا القَطَطُ. فَالشَّدِيدُ الجُعُودَةِ، وَالرَّجِلُ الَّذِي فِي شَعْرِهِ حُجُونَةٌ أَيْ: يَنْحَنِي قَلِيلاً. وَأَمَّا الْمُطَهَّمُ، فَالبَادِنُ الكَثِيرُ اللَّحْمِ. وَأَمَّا الْمُكَلْثَمُ: فَالمُدَوَّرُ الوَجْهِ. وَأَمَّا الْمُشْرَبُ: فَهُوَ الَّذِي فِي بَيَاضِهِ حُمْرَةٌ. وَالأَدْعَجُ: الشَّدِيدُ سَوَادِ العَيْنِ، وَالأَهْدَبُ، الطَّوِيلُ الأَشْفَارِ، وَالكَتَدُ، مُجْتَمَعُ الكَتِفَيْنِ، وَهُوَ الكَاهِلُ. وَالمَسْرُبَةُ، هُوَ الشَّعْرُ الدَّقِيقُ الَّذِي هُوَ كَأَنَّهُ قَضِيبٌ مِنَ الصَّدْرِ إِلَى السُّرَّةِ. وَالشَّثْنُ: الغَلِيظُ الأَصَابِعِ مِنَ الكَفَّيْنِ وَالقَدَمَيْنِ. وَالتَّقَلُّعُ: أَنْ يَمْشِيَ بِقُوَّةٍ. وَالصَّبَبُ: الحُدُورُ، نَقُولُ: انْحَدَرْنَا فِي صَبُوبٍ وَصَبَبٍ. وَقَوْلُهُ: جَلِيلُ الْمُشَاشِ، يُرِيدُ رُءُوسَ الْمَنَاكِبِ. وَالعِشْرَةُ: الصُّحْبَةُ، وَالعَشِيرُ: الصَّاحِبُ. وَالبَدِيهَةُ: الْمُفَاجَأَةُ، يُقَالُ بَدَهْتُهُ بِأَمْرٍ: أَيْ فَجَأْتُهُ.

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ بەم شێوەیە وەسفی شكڵ و شێوەی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم بۆ دەكات: نە قوچێكی درێژ بوو، نە كورتەباڵاش بوو، پیاوێكی باڵابەرزی مام ناوەندی بوو، قژی نە زۆر لول بوو نە زۆر خاو، جەستەی گۆشتن نەبوو، ڕوومەتی پان بوو بەڵام گوپن نەبوو، سور و سپی بوو، كە دەڕۆیشت ئەتوت لە هەورازەوە دێتەخوارێ، كە ئاوڕی دەدایەوە بە تەواوی ڕووی تێ دەكردی، مۆری پەیامبەری بە نێو شانیەوە بوو، دواهەمین پەیامبەر بوو، دەست و دڵ و دەروونی گوشاد بوو سەخیترین و بەخشندەترین و لێبووردەترین

كەس بوو، راستگۆترین كەس بوو، نەرم و نیانترین كەس بـوو، روخـۆش و رەفتـاری جوان بـوو لەتـەك خەڵكـدا، ئـەوەی لـەناكاو دەیـدی سـامی لـیّ دەنیشـت، ئـەوەی تێكەڵی بكردایە و بیناسیایە خۆشی دەویست، ئەوەی بیەوێ وەسفی بكـات دەڵـیّ: نە لەپاش پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و نە لەپاش ئەو كەسم نەدیوە وەك ئەو ئەوەندە جوان و پێكەوتوو بێ.

## دەربارەی قسەكردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

## ٩ - بَابٌ فِي كَلاَمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦٣٩ - (حسن) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ الأَسْوَدِ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْرُدُ سَرْدَكُمْ هَذَا، وَلَكِنَّهُ كَانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلاَمٍ يُبَيِّنُهُ، فَصْلٌ، يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ. وَقَدْ رَوَاهُ يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ.

واتـە: لـە عائیشـەوە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە قسەكردندا وەك ئێوە بە پەلـە نـەبوو ئـاوا نەیدەدا بەسەر یەكدا، بەڵكو بە شـێنەیی قسـەی دەكـرد، بـواری دەدا، بـە شـێوەیە دەذوا ئەوی لای دادەنیشت قسەكانی لەبەر دەكرد.

٣٦٤٠ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُثَنَّى، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعِيدُ الكَلِمَةَ ثَلاَثًا لِتُعْقَلَ عَنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُثَنَّى.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كە فەرمایشتێكی دەفەرموو سێ جار وشەی دووبارە دەكردەوە بۆ ئەوەی بە باشی لێی تێ بگەن.

## دەربارەی ڕوخۆشی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ١٠ - بَابٌ فِي بَشَاشَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ تَبَسُّمًا مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ مِثْلُ هَذَا.

واتە: لە (حارث)ی كوڕی (جزء)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هیچ كەسێكم نەدیوە وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاوا زۆر دەمی بە زەردەخەنەوە بێ.

٣٦٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ أَحْمَدُ بْنُ خَالِدٍ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ، قَالَ: مَا كَانَ ضَحِكُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ تَبَسُّمًا. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ لَيْثِ بْنِ سَعْدٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی (حارث)ی كوڕی (جزء)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ

دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێکەنینی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەنها زەردەخەنە بوو.

### دەربارەی مۆری پێغەمبەرایەتی

### ١١ - بَاب فِي خَاتَمِ النُّبُوَّةِ

٣٦٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنِ الجَعْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: سَمِعْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ، يَقُولُ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ، فَمَسَحَ بِرَأْسِي وَدَعَا لِي بِالبَرَكَةِ وَتَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، فَقُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَنَظَرْتُ إِلَى الخَاتَمِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ فَإِذَا هُوَ مِثْلُ زِرِّ الحَجَلَةِ. الزِّرُّ: يُقَالُ بَيْضٌ لَهَا. وَفِي البَابِ عَنْ سَلْمَانَ، وَقُرَّةَ بْنِ إِيَاسٍ الْمُزَنِيِّ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَأَبِي رِمْثَةَ، وَبُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسَ، وَعَمْرِو بْنِ أَخْطَبَ، وَأَبِي سَعِيدٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ڕەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: پورم بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەم خوشکەزایەم ئازاری هەیە، دەستی هێنا بەسەرمدا دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کردم، دەستنوێژی گرت و لەئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، ئینجا هەستام چوومە دوایەوە تەماشای مۆرەکەیم کرد لەنێو شانیدا بە قەد هێلکەی کەوێ دەبوو.

٣٦٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَعْقُوبَ الطَّالَقَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ جَابِرٍ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كَانَ خَاتَمُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ، يَعْنِي الَّذِي بَيْنَ كَتِفَيْهِ، غُدَّةً حَمْرَاءَ مِثْلَ بَيْضَةِ الحَمَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە جـابری کـوڕی سـەمورەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: مۆرەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە بـە نێـو شـانیەوە بوو لوویەکی سور بوو بە قەد هێلکەی کۆترێ دەبوو.

## دەربارەی سیفەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

### ١٢ - بَابٌ فِي صِفَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٦٤٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ العَوَّامِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الحَجَّاجُ هُوَ ابْنُ أَرْطَاةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كَانَ فِي سَاقَيْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُمُوشَةٌ، وَكَانَ لاَ يَضْحَكُ إِلاَّ تَبَسُّمًا، وَكُنْتُ إِذَا نَظَرْتُ إِلَيْهِ قُلْتُ: أَكْحَلُ العَيْنَيْنِ وَلَيْسَ بِأَكْحَلَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتـە: لـە جـابری کـوڕی سـەمورەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: هەردوو لاقی پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم کـەمێ باریـك بوون، پێکەنینی تەنها زەردەخەنە بوو، کە تەماشات دەکرد ئـەتوت چـاوی ڕێـژراوە لەکاتێکدا چاوی نەڕێژرا بوو، بەڵکو خۆی چاوی ڕەش بوو.

٣٦٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قَطَنٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضَلِيعَ الفَمِ، أَشْكَلَ العَيْنَيْنِ، مَنْهُوسَ الْعَقِبِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە جـابری کـوڕی سـەمورەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە

فەرموويەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم دەمی نە گەورە بوو بە بچوك، سپێنەی چاوی سووری تێدا بوو، پاژنەی گۆشتی كەم بوو.

٣٦٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضَلِيعَ الفَمِ، أَشْكَلَ العَيْنَيْنِ، مَنْهُوسَ العَقِبِ قَالَ شُعْبَةُ: قُلْتُ لِسِمَاكٍ: مَا ضَلِيعُ الفَمِ؟ قَالَ: وَاسِعُ الفَمِ. قُلْتُ: مَا أَشْكَلُ الْعَيْنِ؟ قَالَ: طَوِيلُ شَقِّ العَيْنِ. قُلْتُ: مَا مَنْهُوسُ الْعَقِبِ؟ قَالَ: قَلِيلُ اللَّحْمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابری كوڕی سەمورەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموويەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم دەمی نە گەورە بوو بە بچوك، سپێنەی چاوی سووری تێدا بوو، پاژنەی گۆشتی كەم بوو. شوعبە فەرمووی: بە سیماكم وت: (ضَلِيعُ الفَمِ) یانی چی؟ فەرمووی: دەمی فراون بوو واتە زۆر بچوك نەبوو، وتم: (أَشْكَلُ الْعَيْنِ) یانی چی؟ فەرمووی: كالانەی چاوی درێژ بوو، وتم: (مَنْهُوسُ الْعَقِبِ) یانی چی؟ فەرمووی: پاژنەی گۆشتن نەبوو.

٣٦٤٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ أَبِي يُونُسَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنَّ الشَّمْسَ تَجْرِي فِي وَجْهِهِ، وَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَسْرَعَ فِي مَشْيِهِ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنَّمَا الأَرْضُ تُطْوَى لَهُ، إِنَّا لَنُجْهِدُ أَنْفُسَنَا، وَإِنَّهُ لَغَيْرُ مُكْتَرِثٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموويەتی: هیچ شتێكم نەدیوە چاكتر بێ لە پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم، ئەتوت خۆر لەڕووی ئەو هەڵدێ، هیچ كەسێكم نەدیوە ئەوەندەی ئەو خێرا بێ لەڕۆشتندا، وەك ئەوەی زەوی بۆ پێچرابێتەوە، هێمە خۆمان هیلاك و ماندوو دەكرد كەچی پێی

رانەدەگەیشتین، ئەویش هەر گوێی لێ نەبوو خۆشی ماندوو نەدەکردو ئاسایی رێی دەکرد.

٣٦٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: عُرِضَ عَلَيَّ الأَنْبِيَاءُ، فَإِذَا مُوسَى ضَرْبٌ مِنَ الرِّجَالِ كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ، وَرَأَيْتُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَإِذَا أَقْرَبُ النَّاسِ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهًا عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، وَرَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهًا صَاحِبُكُمْ يَعْنِي نَفْسَهُ، وَرَأَيْتُ جِبْرِيلَ فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهًا دِحْيَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پەیامبەرانم پێ نیشاندران، موسام دی دەتوت یەکێکە لە پیاوانی شەنوئەی یەمەن، عیسام دی سەیردەکەم لە عوروەی کوڕی مەسعود دەچێت، ئیبراهیمم دی زۆرترین کەس کە لەو بچێ هاوەڵەکەتانە واتە خۆی، جیبریلم دی زۆر لە دیحیەی دەکرد).

## دەربارەی تەمەنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و لەچەند ساڵیدا مرد

## ١٣ - بَابٌ فِي سِنِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَابْنُ كَمْ كَانَ حِينَ مَاتَ

٣٦٥٠ - (شاذ) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَيَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَمَّارٌ، مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ ابْنُ خَمْسٍ وَسِتِّينَ.

واتە: لە عەمارەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو وەفاتی کرد.

٣٦٥١ - (شاذ) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمَّارٌ، مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ خَمْسٍ وَسِتِّينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنُ الإِسْنَادِ صَحِيحٌ.

واتە: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو وەفاتی کرد.

٣٦٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: مَكَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ، يَعْنِي يُوحَى إِلَيْهِ، وَتُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَنَسٍ، وَدَغْفَلِ بْنِ حَنْظَلَةَ وَلاَ يَصِحُّ لِدَغْفَلٍ سَمَاعٌ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَحَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ.

واتە: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سیانزە ساڵ لە مەککە مایەوە واتە وەحی بۆ دەهات، تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو وەفاتی کرد.

٣٦٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَخْطُبُ يَقُولُ: مَاتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَأَنَا ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لێی بوو وتاری دەدا دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو وەفاتی کرد، هەردوو پێشەوا ئەبو بەکر و عومەر کوڕی (خطاب) ڕەزای خوایان لێ بێ بە هەمان شێوە، منیش پێم وایە هەر لەو تەمەنەدا دەمرم.

٣٦٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا العَبَّاسُ العَنْبَرِيُّ، وَالحُسَيْنُ بْنُ مَهْدِيٍّ الْبَصْرِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: أُخْبِرْتُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَقَالَ: الحُسَيْنُ بْنُ مَهْدِيٍّ، فِي حَدِيثِهِ: ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَاتَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ ابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، مِثْلَ هَذَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو وەفاتی کرد.

## چاکە و پلەوپایەی ئەبو بەکر کە ناوی (عبد الله)ی کوڕی (عثمان)ەو نازناوی عەتیقە

## ١٤ - بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَاسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُثْمَانَ وَلَقَبُهُ عَتِيقٌ

٣٦٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَبْرَأُ إِلَى كُلِّ خَلِيلٍ مِنْ خِلِّهِ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ ابْنَ أَبِي

قُحَافَةَ خَلِيلاً، وَإِنَّ صَاحِبَكُمْ لَخَلِيلُ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ الزُّبَيْرِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن، من وازدەهێنم لە دۆستایەتی هەموو دۆستێ، ئەگەر بێتو دۆستێکم هەڵبژاردایە ئەوا کوڕی ئەبی قوحافە واتە ئەبو بەکرم هەڵدەبژارد، بێگومان هاوڕێکەتان دۆست و خۆشەویستی خوای گەورەیە).

٣٦٥٦ - (حسن) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلاَلٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، قَالَ: أَبُو بَكْرٍ سَيِّدُنَا وَخَيْرُنَا وَأَحَبُّنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ گەورەمانە، لەهەمووومان چاکترە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهەمووومان زیاتری خۆشەویست.

٣٦٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَيُّ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللهِ؟ قَالَتْ: أَبُو بَكْرٍ، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَتْ: عُمَرُ، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَتْ: ثُمَّ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: فَسَكَتَتْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شەقیقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ وت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ هاوەڵێکی لە

هەموو کەس زیاتری خۆشدەویست؟ فەرمووی: پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ، وتم: لەپاشدا کێی تر؟ فەرمووی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ، وتم: لەپاشدا کێی تر؟ فەرمووی: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح رەزای خوای لێ بێ، وتم: لەپاشدا کێی تر؟ فەرمووی: بێدەنگ بوو قسەی نەکرد.

٣٦٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي حَفْصَةَ، وَالأَعْمَشِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ صَهْبَانَ، وَابْنِ أَبِي لَيْلَى، وَكَثِيرٍ النَّوَّاءِ كُلِّهِمْ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ أَهْلَ الدَّرَجَاتِ العُلَى لَيَرَاهُمْ مَنْ تَحْتَهُمْ كَمَا تَرَوْنَ النَّجْمَ الطَّالِعَ فِي أُفُقِ السَّمَاءِ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ مِنْهُمْ وَأَنْعَمَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عَطِيَّةَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان ئێوە چۆن لە ژوور سەرتانەوە ئەستێرە بە ئاسمانەوە دەبینن لە ئاسۆوە هەڵدێ، خاوەن پایە بەرزەکانیش وان بەو شێوەیە دەبینرێن لەلایەن ئەوانەوە پایەیان لە خوار ئەوانەوەیە، پێشەوا ئەبو بەکر و پێشەوا عومەریش رەزای خوایان لێ بێ لەو خاوەن پایە بەرزانەن بگرە لەسەرووی ئەوانیشەوەن).

## ١٥ - بَابٌ

٣٦٥٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي الْمُعَلَّى، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ يَوْمًا فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً خَيَّرَهُ رَبُّهُ بَيْنَ أَنْ يَعِيشَ فِي الدُّنْيَا مَا شَاءَ أَنْ يَعِيشَ وَيَأْكُلَ فِي الدُّنْيَا مَا شَاءَ أَنْ يَأْكُلَ وَبَيْنَ لِقَاءِ رَبِّهِ فَاخْتَارَ لِقَاءَ

رَبِّهِ. قَالَ: فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَ تَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا الشَّيْخِ إِذْ ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً صَالِحًا خَيَّرَهُ رَبُّهُ بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ لِقَاءِ رَبِّهِ فَاخْتَارَ لِقَاءَ رَبِّهِ. قَالَ: فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ أَعْلَمَهُمْ بِمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلْ نَفْدِيكَ بِآبَائِنَا وَأَمْوَالِنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَمَنَّ إِلَيْنَا فِي صُحْبَتِهِ وَذَاتِ يَدِهِ مِنْ ابْنِ أَبِي قُحَافَةَ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ ابْنَ أَبِي قُحَافَةَ خَلِيلاً، وَلَكِنْ وُدٌّ وَإِخَاءُ إِيمَانٍ، وُدٌّ وَإِخَاءُ إِيمَانٍ، مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، أَلاَ وَإِنَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيلُ اللهِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ أَبِي عَوَانَةَ عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ بِإِسْنَادٍ غَيْرِ هَذَا. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: أَمَنَّ إِلَيْنَا يَعْنِي: أَمَنَّ عَلَيْنَا. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە کوڕی ئەبی موعەللاوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا فەرمووی: (بێگومان بەندەیە پەروەردگاری سەرپشکی کردووە لەنێوان گەیشتن بە دیداری پەروەردگاری و چەند بیەوێ لە دونیا بژی و بخواو بخواتەوە، ئەویش گەیشتن بە دیداری پەروەردگاری هەڵبژارد)، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لیّ بیّ دەستی کردە گریان، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویان: ئایا سەرسام نابن لەم شێخە، لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی بەندەیەکی چاك دەکات پەروەردگاری لەنێوان گەیشتن بە دیداری پەروەردگاری و ژیانی دونیادا سەرپشکی کردووە، ئەویش گەیشتن بە دیداری پەروەردگاری هەڵبژاردووە، فەرمووی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لیّ بیّ لەهەموو کەس زیاتر لە مەبەستی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تێگەیشت، فەرمووی: بەخۆمان و باوك و ماڵ و سامانمانەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم،

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڕاستی ئەبو بەكر لەهەموو كەس زیاتر پیاوەتی بەسەرمانەوە هەیە بە سەر و بە ماڵ، ئەگەر بیێتو دۆستێكم هەڵبژاردایە ئەوا كوڕی ئەبی قوحافە واتە ئەبو بەكرم هەڵدەبژارد، بەڵام خۆشەویستی و برایەتی ئیمانی لە نێوانماندا بە هێزە، خۆشەویستی و برایەتی ئیمانی لە نێوانماندا بە هێزە دوو سێ جار ئەمەی فەرموو، بێگومان هاوڕێكەتان دۆست و خۆشەویستی خوای گەورەیە).

٣٦٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: إِنَّ عَبْدًا خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا مَا شَاءَ وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ مَا عِنْدَهُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَدَيْنَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا. قَالَ: فَعَجِبْنَا، فَقَالَ النَّاسُ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا الشَّيْخِ يُخْبِرُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ عَبْدٍ خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا مَا شَاءَ وَبَيْنَ مَا عِنْدَ اللهِ وَهُوَ يَقُولُ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللهِ هُوَ الْمُخَيَّرُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ هُوَ أَعْلَمَنَا بِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنْ أَمَنِّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَمَالِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً وَلَكِنْ أُخُوَّةُ الإِسْلاَمِ، لاَ تُبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ خَوْخَةٌ إِلاَّ خَوْخَةُ أَبِي بَكْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر دانیشتبوو فەرمووی: (بێگومان بەندەیە خوای گەورە سەرپشكی كردووە لەنێوان هەڵبژاردنی جوانی و خۆشیەكانی ژیانی دونیا و ئەوەی لای خوا بۆی دانراوە، ئەویش ئەوەی هەڵبژارد كە

لای خوا بۆی دانراوە)، پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بە خۆمان و دایك و باوكمانەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەبو سەعید فەرمووی: ئێمەش سەیر بوو بەلامانەوە، خەڵكەكە وتیان: سەیری ئەو شێخە بكەن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی بەندەیە دەكات خوای گەورە سەرپشكی كردووە لەنێوان هەڵبژاردنی جوانی و خۆشیەكانی ژیانی دونیا و ئەوەی لای خوا بۆی دانراوە، ئەویش ئەوەی هەڵبژارد كە لای خوا بۆی دانراوە، كەچی ئەو دەڵێ: بە خۆمان و دایك و باوكمانەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی سەرپشك كرابوو، پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ لە هەموومان زیاتر لە مەبەستی فەرمایشتەكە تێگەیشت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڕاستی ئەبو بەكر لەهەموو كەس زیاتر پیاوەتی بەسەرمانەوە هەیە بە سەر و بە ماڵ، ئەگەر بێتو دۆستێكم هەڵبژاردایە ئەوا ئەبو بەكرم هەڵدەبژارد، بەڵام برایەتی ئیمانی لە نێوانماندا بە هێزە، هەر دەرگایە لەسەر مزگەوتە دەبێ بگیرێ جگە لە دەرگای ماڵی ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ).

٣٦٦١ - (ضعيف دون قوله: (وما نفعني...) فصحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحَسَنِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَحْبُوبُ بْنُ مُحْرِزٍ القَوَارِيرِيُّ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ يَزِيدَ الأَوْدِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا لأَحَدٍ عِنْدَنَا يَدٌ إِلاَّ وَقَدْ كَافَيْنَاهُ مَا خَلاَ أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا يَدًا يُكَافِئُهُ اللَّهُ بِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَمَا نَفَعَنِي مَالُ أَحَدٍ قَطُّ مَا نَفَعَنِي مَالُ أَبِي بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، أَلاَ وَإِنَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيلُ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دەستی یارمەتی و پیاوەتی کەسمان بەسەرەوە نەماوە هەقمان بۆ نەکردبێتەوە جگە لە ئەبو بەکر، لەڕۆژی قیامەتدا خوا بۆ خۆی پاداشتی دەداتەوە، هەرگیز ماڵ و دارایی کەس وەك ماڵ و دارایی ئەبو بەکر سوودی پێ نەگەیاندووم، ئەگەر بێتو دۆستێکم هەڵبژاردایە ئەوا ئەبو بەکرم هەڵدەبژارد، بێگومان هاوڕێکەتان دۆست و خۆشەویستی خوای گەورەیە).

## چاکە و پلەوپایەی ئەبو بەکر و عومەر هەردووکیان

## ١٦ - بَابٌ مناقب ابو بكر و عمر رضي الله عنهما كليهما

٣٦٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَزَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ.

واتە: لە (حذیفة)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو دوانەی دوای من بکەنە پێشەنگ و سەرمەشق بۆ خۆتان ئەبی بەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ).

٣٦٦٢ (م) - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، نَحْوَهُ. وَكَانَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ يُدَلِّسُ فِي هَذَا الحَدِيثِ، فَرُبَّمَا ذَكَرَهُ عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، وَرُبَّمَا لَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ زَائِدَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَفِيهِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ مَوْلًى لِرِبْعِيٍّ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

وَرَوَى هَذَا الحَدِيثَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ هِلاَلٍ، مَوْلَى رِبْعِيٍّ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ أَيْضًا، عَنْ رِبْعِيٍّ عَنْ حُذَيْفَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٣٦٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأُمَوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي العَلاَءِ الْمُرَادِيِّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ هَرِمٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَدْرِي مَا بَقَائِي فِيكُمْ، فَاقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي. وَأَشَارَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ.

واتە: لە (حذيفة)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم دانیشتبوین فەرمووی: (من نازانم تاكەی لەناوتاندا دەمێنمەوە بۆیە ئەو دوانەی دوای من بكەنە پێشەنگ و سەرمەشق بۆ خۆتان، ئاماژەی كرد بۆ ئەبی بەكر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ).

٣٦٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَزَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: هَذَانِ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الجَنَّةِ مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ إِلاَّ النَّبِيِّينَ وَالمُرْسَلِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە ئەبی بەكر و عومەری فەرموو: (ئەم دوانە سەردار و گەورەی سەرجەم خەڵكانی كامڵی بەهەشتن، جگە لە پێغەمبەران و نێرراوان).

٣٦٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمُوقَرِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الحُسَيْنِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ طَلَعَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَذَانِ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الجَنَّةِ مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ إِلاَّ النَّبِيِّينَ وَالمُرْسَلِينَ، يَا عَلِيُّ لاَ تُخْبِرْهُمَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. وَالوَلِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمُوقَرِيُّ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَلِيٍّ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووم، ئەبو بەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەرکەوتن، فەرمووی: (ئەم دوانە سەردار و گەورەی سەرجەم خەڵکانی کامڵی بەهەشتن، جگە لە پێغەمبەران و نێرراوان، ئەی عەلی هەواڵیان مەدەرێ و پێیان مەڵێ).

٣٦٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، قَالَ: ذَكَرَهُ دَاوُدُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الجَنَّةِ مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ مَا خَلاَ النَّبِيِّينَ وَالمُرْسَلِينَ، لاَ تُخْبِرْهُمَا يَا عَلِيُّ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەبی بەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ سەردار و گەورەی سەرجەم خەڵکانی کامڵی بەهەشتن، جگە لە پێغەمبەران و نێرراوان، ئەی عەلی هەواڵیان مەدەرێ و پێیان مەڵێ).

٣٦٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَلَسْتُ أَحَقَّ النَّاسِ بِهَا؟ أَلَسْتُ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ؟ أَلَسْتُ صَاحِبَ كَذَا، أَلَسْتُ صَاحِبَ كَذَا؟.هَذَا حَدِيثٌ قَدْ رَوَاه بَعْضُهُمْ عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ، وَهَذَا أَصَحُّ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: ئایا من شایستەترین کەس نیم بە خەلافەت؟ ئایا من یەکەم کەس نیم کە باوەڕم هێنا؟ ئایا من خاوەنی فلان و فلان نیم؟

٣٦٦٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ عَطِيَّةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَخْرُجُ عَلَى أَصْحَابِهِ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ وَهُمْ جُلُوسٌ وَفِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَلاَ يَرْفَعُ إِلَيْهِ أَحَدٌ مِنْهُمْ بَصَرَهُ إِلاَّ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَإِنَّهُمَا كَانَا يَنْظُرَانِ إِلَيْهِ وَيَنْظُرُ إِلَيْهِمَا وَيَتَبَسَّمَانِ إِلَيْهِ وَيَتَبَسَّمُ إِلَيْهِمَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الحَكَمِ بْنِ عَطِيَّةَ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُهُمْ فِي الحَكَمِ بْنِ عَطِيَّةَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم لەکۆچەران و یاریدەدەران دانیشتبوون، ئەبو بەکر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ لەناویاندا بوون، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە بۆ ناویان، هیچ کەس

چاوی هەڵنەبڕی سەیری بکات جگە لە ئەبو بەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ سەیریان دەکرد و زەردەخەنەیان بۆ دەکرد، ئەویش هەروەها سەیری ئەوانی دەکرد و زەردەخەنەی بۆ دەکردن.

٣٦٦٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُجَالِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ ذَاتَ يَوْمٍ وَدَخَلَ الْمَسْجِدَ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِهِ وَالآخَرُ عَنْ شِمَالِهِ وَهُوَ آخِذٌ بِأَيْدِيهِمَا، وَقَالَ: هَكَذَا نُبْعَثُ يَوْمَ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَسَعِيدُ بْنُ مَسْلَمَةَ لَيْسَ عِنْدَهُمْ بِالقَوِيِّ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە و چووە مزگەوتەوە ئەبو بەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ یەکێکیان لای ڕاستیەوە بوو ئەوی تریشیان لای چەپیەوە بوو، دەستی هەردووکیانی گرت و فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتدا بەم شێوەیە زیندوودەکرێینەوە).

٣٦٧٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى القَطَّانُ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ مَنْصُورِ بْنِ أَبِي الأَسْوَدِ قَالَ: حَدَّثَنِي كَثِيرٌ أَبُو إِسْمَاعِيلَ، عَنْ جُمَيْعِ بْنِ عُمَيْرٍ التَّيْمِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأَبِي بَكْرٍ: أَنْتَ صَاحِبِي عَلَى الحَوْضِ وَصَاحِبِي فِي الغَارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پێشەوا ئەبو بەکری ڕەزای خوای لێ بێ فەرموو: (تۆ

هـاوڕێی منـی لەسـەر حـەوزی کەوسـەر، وەك چـۆن هـاوڕێم بـووی لـە ئەشـكەوتی (ثور)دا).

٣٦٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ الْمُطَّلِبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَنْطَبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ فَقَالَ: هَذَانِ السَّمْعُ وَالبَصَرُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَهَذَا حَدِيثٌ مُرْسَلٌ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ حَنْطَبٍ لَمْ يُدْرِكِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی (حنطب)ەوە دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی: جـارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەبو بەكر و عومەری ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دی فەرمووی: (ئەم دووانە بۆ دینی ئیسلام و موسوڵمانان وەك گوێ و چاون).

٣٦٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ مَقَامَكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ البُكَاءِ فَأْمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، قَالَتْ: فَقَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ: قُولِي لَهُ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ مَقَامَكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ البُكَاءِ فَأْمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَفَعَلَتْ حَفْصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّكُنَّ لأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَقَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ: مَا كُنْتُ لأُصِيبَ مِنْكِ خَيْرًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي مُوسَى، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَسَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ.

واتـە: لـە عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویـەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی نەخۆش بوو فەرمووی: (فەرمان بکە با ئەبو بەکر پێش نوێژی بکات بۆ ئەو خەڵکە). عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ پیاوێکی دڵ نەرمە ئەگەر بچێتە جێگەکەی تۆ لەبەر گریان خەڵك گوێی لێی نابێت، لەبەرئەوە فەرمان بکە با پێشەوا عومەر پێش نوێژی بکات بۆ ئەو خەڵکە، عائیشە فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (فەرمان بکە با ئەبو بەکر پێش نوێژی بکات بۆ ئەو خەڵکە). عائیشە فەرمووی: منیش بە حەفصەم وت: پێی بڵێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەسە ئێوە دەڵێی ئافرەتانی دەوری یوسفن، فەرمان بکە با ئەبو بەکر پێش نوێژی بکات بۆ ئەو خەڵکە)، حەفصە بە عائیشەی فەرموو: هەرگیز خێرم لەتۆ نەدیوە.

٣٦٧٣ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ عِيسَى بْنِ مَيْمُونٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَنْبَغِي لِقَوْمٍ فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَؤُمَّهُمْ غَيْرُهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ قەومێ نیە پێشەوا ئەبو بەکر لەناویاندا بێ و کەسێکی تر بێت پێش نوێژیان بۆ بکات).

٣٦٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللهِ نُودِيَ فِي الجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللهِ هَذَا خَيْرٌ،

فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلاَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي مَا عَلَى مَنْ دُعِيَ مِنْ هَذِهِ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك دووشت لەجۆرێك لە پێناوی خوادا ببەخشێ(دوو مەڕ،یان دووبزن)، ئەوا لە دەرگاکانی بەهەشت بانگ دەکرێ: ئەی بەندەی خوا! وەرە ئەمەزۆر چاکە، جا ئەگەر ئەهلی نوێژ بوو لەدەرگای نوێژەوە، ئەگەر ئەهلی جیهادو تێکۆشان بوو لەدەرگای جیهادو تێکۆشانەوە، ڕۆژوەوان لەدەرگای ڕەیانەوە کە تایبەتە بە ڕۆژووانان، ئەهلی خێرو خێرات لەدەرگای خێرو خێراتەوە، ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! باوك و دایکم بە قوربانت بێت کەس هەیە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێ و بچێتە ژوورەوە، فەرمووی: (بەڵێ، هیوادارم تۆش یەکێك بیت لەوانە).

٣٦٧٥ - (حسن) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللهِ البَزَّازُ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ دُكَيْنٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، يَقُولُ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَتَصَدَّقَ فَوَافَقَ ذَلِكَ عِنْدِي مَالاً، فَقُلْتُ: اليَوْمَ أَسْبِقُ أَبَا بَكْرٍ إِنْ سَبَقْتُهُ يَوْمًا، قَالَ: فَجِئْتُ بِنِصْفِ مَالِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا أَبْقَيْتَ لأَهْلِكَ؟ قُلْتُ: مِثْلَهُ، وَأَتَى أَبُو بَكْرٍ بِكُلِّ مَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ مَا أَبْقَيْتَ لأَهْلِكَ؟ قَالَ: أَبْقَيْتُ لَهُمُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، قُلْتُ: لاَ أَسْبِقُهُ إِلَى شَيْءٍ أَبَدًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عومەری كوڕی (خَطَّاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ كردین كە خێر و سەدەقە بكەین، وا ڕێكەوت ماڵ و سامانێكم هەبوو، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەمڕۆ پێش ئەبو بەكر دەدەمەوە كە هەرگیز پێشی نەكەوتووم، جا نیوەی ماڵ و سامانەكەم هێنا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چیت بۆ خێزانەكەت هێشتۆتەوە؟). وتم: ئەوەندەی ئەمە، عومەر فەرمووی: جا ئەبو بەكر هات بە خۆی و هەرچیەكەوە كە هەیبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چیت بۆ خێزانەكەت هێشتۆتەوە؟). وتی: خواو پێغەمبەرەكەی، وتم: ناتوانم لە هیچ شتێكدا پێشبڕكێت لەگەڵ بكەم.

٣٦٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، أَنَّ أَبَاهُ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِمٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَلَّمَتْهُ فِي شَيْءٍ فَأَمَرَهَا بِأَمْرٍ، فَقَالَتْ: أَرَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللهِ إِنْ لَمْ أَجِدْكَ؟ قَالَ: إِنْ لَمْ تَجِدِينِي فَائْتِي أَبَا بَكْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جوبەیری كوڕی (مطعم)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە ئافرەتێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ كارێ، ئەویش فەرمانی پێ كرد بە كارێ، ئافرەتەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێم بڵێ ئەی ئەگەر دەستم نەكەوت چی؟ فەرمووی: (بڕۆ بۆ لای ئەبە بەكر ئەو بۆت جێبەجێ دەكات).

٣٦٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ رَاكِبٌ بَقَرَةً، إِذْ قَالَتْ: لَمْ

أُخْلَقْ لِهَذَا، إِنَّمَا خُلِقْتُ لِلْحَرْثِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: آمَنْتُ بِذَلِكَ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: وَمَا هُمَا فِي الْقَوْمِ يَوْمَئِذٍ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جارێ پیاوێ سواری مانگایە بوو، وتی: من بۆ ئەمە دروست نەکراوم، بەڵکو بۆ جووتکردن دروستکراوم، من باوەڕ بەم قسە دەکەم، من و ئەبو بەکر و عومەریش). ئەبو سەلەمە وتی: لەو کاتەدا ئەبی بەکر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ لەناو خەڵکەکەدا نە بوون.

٣٦٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُخْتَارِ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ رَاشِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَرَ بِسَدِّ الأَبْوَابِ إِلاَّ بَابَ أَبِي بَكْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دەرکرد هەموو دەرگاکانی ئەو ماڵانەی لەسەر مزگەوت بوون دابخرێن، جگە لە دەرگای ماڵی ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ.

٣٦٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يَحْيَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَمِّهِ إِسْحَاقَ بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: أَنْتَ عَتِيقُ اللهِ مِنَ النَّارِ فَيَوْمَئِذٍ سُمِّيَ عَتِيقًا. هَذَا

حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ مَعْنٍ، وَقَالَ: عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ چووەژوورەو بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: (تۆ رزگارکراوی خوای لە ئاگر). ئیتر لەو ڕۆژەوە ناونرا (عەتیق).

٣٦٨٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا تَلِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي الجَحَّافِ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ لَهُ وَزِيرَانِ مِنْ أَهْلِ السَّمَاءِ وَوَزِيرَانِ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، فَأَمَّا وَزِيرَايَ مِنْ أَهْلِ السَّمَاءِ فَجِبْرِيلُ وَمِيكَائِيلُ، وَأَمَّا وَزِيرَايَ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ فَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو الجَحَّافِ اسْمُهُ: دَاوُدُ بْنُ أَبِي عَوْفٍ. عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الجَحَّافِ وَكَانَ مَرْضِيًّا.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەموو پەیامبەرێ دوو وەزیری هەیە لەسەر زەوی و دوانیش لە ئاسمان، ئەو دوانەی لە ئاسمانن بریتین لە جیبریل و میکایل، ئەو دووانەش کە لەسەر زەوین بریتین لە ئەبی بەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ).

## دەربارەی چاکە و پلەوپایەی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ

### ١٨ - بَابٌ فِي مَنَاقِبِ أَبِي حَفْصٍ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٦٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَارِجَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ أَعِزَّ الإِسْلاَمَ بِأَحَبِّ هَذَيْنِ الرَّجُلَيْنِ إِلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ أَوْ بِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: وَكَانَ أَحَبَّهُمَا إِلَيْهِ عُمَرُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خودایە لەم دوانە ئەبو جەهل و عومەری کوڕی (خطاب)، کامیانت خۆش دەوێ، بەوەیان ئیسلام سەرخەی و شکۆداری بکەی). فەرمووی: ئەوەیان خوای گەورە خۆشیویست پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بوو.

٣٦٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَارِجَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ جَعَلَ الحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ وَقَلْبِهِ. وقَالَ ابْنُ عُمَرَ: مَا نَزَلَ بِالنَّاسِ أَمْرٌ قَطُّ فَقَالُوا فِيهِ، وَقَالَ فِيهِ عُمَرُ أَوْ قَالَ ابْنُ الخَطَّابِ فِيهِ، شَكَّ خَارِجَةُ، إِلاَّ نَزَلَ فِيهِ القُرْآنُ عَلَى نَحْوِ مَا قَالَ عُمَرُ. وَفِي البَابِ عَنِ الفَضْلِ بْنِ العَبَّاسِ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە هەقی خستۆتە سەر زمان و دڵی

عومەری کوڕی (خطاب)). ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: هەر شتێ رووی بدایە خەڵك رای خۆیان تێدا دەربڕیایە و قسەیان تێدا بکردایە، پێشەوا عومەریش ڕەزای خوای لێ بێ رای خۆی دەربڕیایە و قسەی تێدا بکردایە، قورئان بە پێی قسەکەی پێشەوا عومەر دەهاتەخوارەوە.

٣٦٨٣ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنِ النَّضْرِ أَبِي عُمَرَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ أَعِزَّ الإِسْلاَمَ بِأَبِي جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ أَوْ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: فَأَصْبَحَ فَغَدَا عُمَرُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُهُمْ فِي النَّضْرِ أَبِي عُمَرَ، وَهُوَ يَرْوِي مَنَاكِيرَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خودایە بە ئەبو جەهل یان بە عومەری کوڕی (خطاب) ئیسلام سەرخەی و شکۆداری بکەی). فەرمووی: بۆ بەیانی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ هات موسوڵمان بوو.

٣٦٨٤ - (موضوع) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دَاوُدَ الوَاسِطِيُّ أَبُو مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ ابْنُ أَخِي مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ لأَبِي بَكْرٍ: يَا خَيْرَ النَّاسِ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَا إِنَّكَ إِنْ قُلْتَ ذَاكَ فَلَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ عَلَى رَجُلٍ خَيْرٍ مِنْ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێشەوا عومەر بە پێشەوا ئەبی بەکری فەرموو: ئەی چاکترین کەس لەپاش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێشەوا ئەبی بەکر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: کە تۆ ئاوا دەفەرمووی، بەڕاستی منیش بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: لەم سەر زەویەدا هیچ پیاوێ لە پێشەوا عومەر باشتر نیە.

٣٦٨٥ - (صحيح الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دَاوُدَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ: مَا أَظُنُّ رَجُلاً يَنْتَقِصُ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ يُحِبُّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: هیچ کەسێکم نەدیوە سوکایەتی بکات بە پێشەوا عومەر و پێشەوا ئەبو بەکر و پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم خۆشویستبێ.

٣٦٨٦ - (حسن) حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُقْرِئُ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ بَكْرِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ مِشْرَحِ بْنِ هَاعَانَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ كَانَ نَبِيٌّ بَعْدِي لَكَانَ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ. قَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مِشْرَحِ بْنِ هَاعَانَ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەپاش من کەسێکی تر ببوایە بە پێغەمبەر، ئەوە عومەری کوڕی (خطاب) دەبوو بە پێغەمبەر).

٣٦٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَأَيْتُ كَأَنِّي أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ فَأَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ العِلْمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە خەومدا پەرداخێ شیریان بۆ هێنام لێم خواردەوە و ئەوەی مایەوە دام بە عومەری کوڕی (خطاب) ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەو خەونەت چۆن لێکدایەوە؟ فەرمووی: (زانستە).

٣٦٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: دَخَلْتُ الجَنَّةَ فَإِذَا أَنَا بِقَصْرٍ مِنْ ذَهَبٍ فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا القَصْرُ؟ قَالُوا: لِشَابٍّ مِنْ قُرَيْشٍ، فَظَنَنْتُ أَنِّي أَنَا هُوَ، فَقُلْتُ: وَمَنْ هُوَ؟ فَقَالُوا: عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چوومە بەهەشتەوە کۆشکێکم لە زێڕ دی، وتم: (ئەم کۆشکە بۆ کێیە؟) وتیان: کۆشکی لاوێکە لە قورەیش، گومانم برد ئەو کەسە من بم، وتم: (ئەو لاوە کێیە؟) وتیان: عومەری کوڕی (خطاب)ە.

٣٦٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ أَبُو عَمَّارٍ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي بُرَيْدَةَ، قَالَ: أَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَعَا بِلَالاً فَقَالَ: يَا بِلَالُ بِمَ

سَبَقْتَنِي إِلَى الجَنَّةِ؟ مَا دَخَلْتُ الجَنَّةَ قَطُّ إِلاَّ سَمِعْتُ خَشْخَشَتَكَ أَمَامِي، دَخَلْتُ البَارِحَةَ الجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْخَشَتَكَ أَمَامِي، فَأَتَيْتُ عَلَى قَصْرٍ مُرَبَّعٍ مُشْرِفٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا القَصْرُ؟ فَقَالُوا: لِرَجُلٍ مِنَ العَرَبِ، فَقُلْتُ: أَنَا عَرَبِيٌّ، لِمَنْ هَذَا القَصْرُ؟ قَالُوا لِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَقُلْتُ: أَنَا قُرَشِيٌّ، لِمَنْ هَذَا القَصْرُ؟ قَالُوا: لِرَجُلٍ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: أَنَا مُحَمَّدٌ لِمَنْ هَذَا القَصْرُ؟ قَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ. فَقَالَ بِلاَلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَذَّنْتُ قَطُّ إِلاَّ صَلَّيْتُ رَكْعَتَيْنِ، وَمَا أَصَابَنِي حَدَثٌ قَطُّ إِلاَّ تَوَضَّأْتُ عِنْدَهَا وَرَأَيْتُ أَنَّ لِلَّهِ عَلَيَّ رَكْعَتَيْنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بِهِمَا. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَمُعَاذٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: رَأَيْتُ فِي الجَنَّةِ قَصْرًا مِنْ ذَهَبٍ فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ: لِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: أَنِّي دَخَلْتُ البَارِحَةَ الجَنَّةَ يَعْنِي: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنِّي دَخَلْتُ الجَنَّةَ، هَكَذَا رُوِيَ فِي بَعْضِ الحَدِيثِ. وَيُرْوَى عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ قَالَ: رُؤْيَا الأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ.

واتە: لە ئەبو بورەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بەیانیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیلالی بانگ کرد فەرمووی: (ئەی بیلال بە چی پێشم کەوتی بۆ بەهەشت؟ هەموو جارێ کە چووبێتمە بەهەشتەوە گوێم لە خشپەی ڕۆیشتنی تۆ بووە لە پێشمەوە، دوێنێ لەخەودا چوومە بەهەشتەوە گوێم لە خشپەی ڕۆیشتنی تۆ بوو لە پێشمەوە، ئینجا هاتمە لای کۆشك و تەلارێکی چوارگۆشەی زێڕین، وتم: (ئەمە بۆ کێیە؟) وتیان: بۆ پیاوێکە لە عەرەب، وتم: (دەی خۆ من عەرەبم، ئەم کۆشکە بۆ کێیە؟) وتیان: کۆشکی پیاوێکە لە قورەیش، وتم: (دەی خۆ من قورەیشیم، ئەم کۆشکە بۆ کێیە؟) وتیان: بۆ پیاوێکە ئوممەتی موحەممەد صلی الله علیه وسلم، وتم: (من موحەممەدم ئەم

كۆشكە هی كێیە؟) وتیان: بۆ عومەری كوڕی (خطاب)ە. بیلال ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هەركاتێ بانگم دابێ دوو ركات نوێژم كردووە، هەركە دەستنوێژەكەم شكابێ یەكسەر دەستنوێژم گرتۆتەوە و دوو ركات نوێژم كردووە وام زانیوە خوای گەورە واجبی كردووە لەسەرم. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی ئەو فەزڵە بە هۆی ئەو دوو سیفەتەوەیە).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە بەهەشت كۆشكێكم لە زێڕ دی، وتم: (ئەم كۆشكە بۆ كێیە؟) وترا: بۆ عومەری كوڕی (خطاب)ە.

٣٦٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي بُرَيْدَةَ، يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ جَاءَتْ جَارِيَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ إِنْ رَدَّكَ اللَّهُ سَالِمًا أَنْ أَضْرِبَ بَيْنَ يَدَيْكَ بِالدُّفِّ وَأَتَغَنَّى، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ كُنْتِ نَذَرْتِ فَاضْرِبِي وَإِلاَّ فَلاَ. فَجَعَلَتْ تَضْرِبُ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَهِيَ تَضْرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عَلِيٌّ وَهِيَ تَضْرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهِيَ تَضْرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَأَلْقَتِ الدُّفَّ تَحْتَ اسْتِهَا، ثُمَّ قَعَدَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ لَيَخَافُ مِنْكَ يَا عُمَرُ، إِنِّي كُنْتُ جَالِسًا وَهِيَ تَضْرِبُ فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَهِيَ تَضْرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عَلِيٌّ وَهِيَ تَضْرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهِيَ تَضْرِبُ، فَلَمَّا دَخَلْتَ أَنْتَ يَا عُمَرُ أَلْقَتِ الدُّفَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ بُرَيْدَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ.

واتە: لە ئەبو بورەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چوو بۆ غەزایە، کاتێ گەڕایەوە، کەنیزەکێکی رەشتاڵە هاتە خزمەتی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەزرم کردووە لەسەر خۆم ئەگەر خوای گەورە بە سەلامەتی گەڕاندیتیەوە بە ئامادەبوونی تۆ تەپڵ لێ بدەم و گۆرانی بڵێم، فەرمووی: (ئەگەر نەزرت کردووە ئەوە باشە گەر نا کاری وا مەکە)، ئەبی بەکر و عوسمان و عەلی رەزای خوایان لێ بێ یەك لەدوای یەك هاتنە ژوورەوە، ئەو هەر بەردەوام تەپڵی لێ دەدا، بەڵام کاتێ پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ هاتەژوورەوە، تەپڵەکەی خستە ژێر سمتی لەپاشدا لەسەری دانیشت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بەراستی شەیتان لەتۆ دەترسێ ئەی عومەر، ئەبی بەکر و عوسمان و عەلی رەزای خوایان لێ بێ یەك لەدوای یەك هاتنە ژوورەوە، ئەو هەر بەردەوام تەپڵی لێ دەدا، بەڵام کاتێ تۆ هاتیت دای نا).

٣٦٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَزَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ خَارِجَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سُلَيْمَانَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ رُومَانَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا فَسَمِعْنَا لَغَطًا وَصَوْتَ صِبْيَانٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا حَبَشِيَّةٌ تَزْفِنُ وَالصِّبْيَانُ حَوْلَهَا، فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ تَعَالَيْ فَانْظُرِي. فَجِئْتُ فَوَضَعْتُ لَحْيَيَّ عَلَى مَنْكِبِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهَا مَا بَيْنَ الْمَنْكِبِ إِلَى رَأْسِهِ، فَقَالَ لِي: أَمَا شَبِعْتِ، أَمَا شَبِعْتِ. قَالَتْ: فَجَعَلْتُ أَقُولُ لاَ، لأَنْظُرَ مَنْزِلَتِي عِنْدَهُ إِذْ طَلَعَ عُمَرُ، قَالَتْ: فَارْفَضَّ النَّاسُ عَنْهَا: قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي لأَنْظُرُ إِلَى شَيَاطِينِ الإِنْسِ وَالجِنِّ قَدْ فَرُّوا مِنْ عُمَرَ قَالَتْ: فَرَجَعْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوو گوێمان لە دەنگە دەنگی منداڵان و ژاوە ژاوێ بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا تەماشای کرد ئافرەتێکی حەبەشیە سەما دەکات و دەف لێ دەدات و منداڵان لەدەوری کۆبوونەتەوە، فەرمووی: (ئەی عائیشە وەرە سەیرکە). منیش چووم چەناکەم نایە سەر شانی، دەستم کرد بە سەیرکردنی حەبەشیەکە، پێی فەرمووم: (ئەرێ تێر نەبووی، ئەرێ تێر نەبووی)، منیش بۆ ئەوەی پایە و خۆشەویستی خۆم ببینم لە لایەن پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، دەمووت: نەخێر، هەتا لەپڕ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دەرکەوت ئیتر بڵاوەیان لێ کرد، منیش وتم: لەترسی پێشەوا عومەر منداڵەکان هەموویان بڵاوەیان لێ کرد و دەوری حەبەشیەکەیان چۆڵ کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەبینم شەیتانەکان چ جنۆکەیان، چ ئادەمیزادیان لەترسی عومەر هەڵهاتن).

٣٦٩٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نَافِعٍ الصَّائِغُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ العُمَرِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ ثُمَّ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرُ، ثُمَّ آتِي أَهْلَ البَقِيعِ فَيُحْشَرُونَ مَعِي، ثُمَّ أَنْتَظِرُ أَهْلَ مَكَّةَ حَتَّى أُحْشَرَ بَيْنَ الحَرَمَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَعَاصِمُ بْنُ عُمَرَ الْعُمَرِيُّ لَيْسَ بِالْحَافِظِ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (من خۆم یەکەم کەسم زەوی شەق دەبات بۆم و لەگۆڕ دێمەدەرەوە، لەپاشدا ئەبو بەکر و عومەر، ئینجا دەڕۆم بۆ لای خەڵکانی گۆڕستانی بەقیع ئەوانیش لەتەك خۆم حەشر دەکرێن، پاشان چاوەڕێی خەڵکی مەککە دەکەم هەتا هەموومان پێکەوە دەڕۆین بۆ دەشتی مەحشەر).

٣٦٩٣ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الأُمَمِ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُ فِي أُمَّتِي أَحَدٌ فَعُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَخْبَرَنِي بَعْضُ أَصْحَابِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، قَالَ: قَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ: مُحَدَّثُونَ يَعْنِي: مُفَهَّمُونَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەناو گەلانی پێش ئێوەدا کەسانێ هەبوون بە هۆی باوەڕی پتەویانەوە خوای گەورە شتی دەخستە دڵیانەوە و قسەیان ڕاست دەردەچوو، ئەگەر لەناو ئوممەتی منیشدا کەسێکی لەوجۆرە هەبێ ئەوە عومەرە ڕەزای خوای لێ بێ).

٣٦٩٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ القُدُّوسِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَبِيدَةَ السَّلْمَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَطَّلِعُ عَلَيْكُمْ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ فَاطَّلَعَ أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ قَالَ: يَطَّلِعُ عَلَيْكُمْ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ فَاطَّلَعَ عُمَرُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي مُوسَى، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئێستا پیاوێکی بەهەشتی دەردەکەوێ، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ دەرکەوت)، لەپاشدا فەرمووی: (ئێستا پیاوێکی بەهەشتی دەردەکەوێ، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دەرکەوت).

٣٦٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَرْعَى غَنَمًا لَهُ إِذْ جَاءَ ذِئْبٌ فَأَخَذَ شَاةً فَجَاءَ صَاحِبُهَا فَانْتَزَعَهَا مِنْهُ، فَقَالَ الذِّئْبُ: كَيْفَ تَصْنَعُ بِهَا يَوْمَ السَّبُعِ يَوْمَ لاَ رَاعِيَ لَهَا غَيْرِي؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَآمَنْتُ بِذَلِكَ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: وَمَا هُمَا فِي الْقَوْمِ يَوْمَئِذٍ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جارێ پیاوێ مەڕەکانی دەلەوەڕاند گورگێ هات مەڕێکی فڕاند، پیاوەکە دوای کەوت هەتا لێی سەندەوە، گورگەکە وتی: ئەی ڕۆژێ فیتنە و ئاژاوە ڕوودەدات جگە لە خۆم کەس شوانیان نەبوو کێ ڕزگاریان دەکات لەدەستم، من باوەڕ بەم قسە دەکەم، من و ئەبو بەکر و عومەریش).

**دەربارەی چاکە و پلەوپایەی پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ خاوەنی دوو نازناوە: ئەبی عەمر و ئەبو (عبد الله)**

**١٩ - بَابٌ فِي مَنَاقِبِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ،**
**وَلَهُ كُنْيَتَانِ، يُقَالُ: أَبُو عَمْرٍو، وَأَبُو عَبْدِ اللَّهِ**

٣٦٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عَلَى حِرَاءَ هُوَ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ فَتَحَرَّكَتِ الصَّخْرَةُ، فَقَالَ

النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اهْدَأْ، فَمَا عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَسَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَسَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَبُرَيْدَةَ، هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و ئەبو بەكر و عومەر و عوسمان و عەلی و (طلحة) و زوبێر لەسەر كێوی (حِرَاء) بوون كەوتە لەرزە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی (حِرَاء) دامەزرێ و هێوربەرەوە پێغەمبەرێك و (صدیق)راستگۆیەك و شەهیدێ بەسەرتەوەن).

٣٦٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَعِدَ أُحُدًا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ فَرَجَفَ بِهِمْ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اثْبُتْ أُحُدُ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەتەك ئەبو بەكر و عومەر و عوسمان سەركەوتنە سەر كێوی ئوحود، كێوەكە كەوتە لەرزە و رایوەشاندن، فەرمووی: (ئەی ئوحود دامەزرێ و هێوربەرەوە پێغەمبەرێك و (صدیق)راستگۆیەك و دوو شەهید بەسەرتەوەن).

٣٦٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ اليَمَانِ، عَنْ شَيْخٍ، مِنْ بَنِي زُهْرَةَ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِكُلِّ نَبِيٍّ رَفِيقٌ وَرَفِيقِي، يَعْنِي فِي الجَنَّةِ - عُثْمَانُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ، وَهُوَ مُنْقَطِعٌ.

واتە: لە (طلحة)ی کوڕی (عبيد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەموو پەیامبەرێ لەبەهەشتدا هاوڕێیەکی هەیە، هاوڕێی منیش عوسمانە).

٣٦٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ الرَّقِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ زَيْدٍ هُوَ ابْنُ أَبِي أُنَيْسَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، قَالَ: لَمَّا حُصِرَ عُثْمَانُ، أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ فَوْقَ دَارِهِ، ثُمَّ قَالَ: أُذَكِّرُكُمْ بِاللهِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ حِرَاءَ حِينَ انْتَفَضَ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اثْبُتْ حِرَاءُ فَلَيْسَ عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: أُذَكِّرُكُمْ بِاللهِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي جَيْشِ الْعُسْرَةِ: مَنْ يُنْفِقُ نَفَقَةً مُتَقَبَّلَةً، وَالنَّاسُ مُجْهَدُونَ مُعْسِرُونَ فَجَهَّزْتُ ذَلِكَ الْجَيْشَ؟ قَالُوا: نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ أُذَكِّرُكُمْ بِاللهِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رُومَةَ لَمْ يَكُنْ يَشْرَبُ مِنْهَا أَحَدٌ إِلاَّ بِثَمَنٍ فَابْتَعْتُهَا فَجَعَلْتُهَا لِلْغَنِيِّ وَالْفَقِيرِ وَابْنِ السَّبِيلِ؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ، نَعَمْ، وَأَشْيَاءَ عَدَّدَهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ عَنْ عُثْمَانَ.

واتە: لە ئەبی (عبد الرحمن)ی سولەمییەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێشەوا عوسمانیان ڕەزای خوای لێ بێ گەمارۆدا بۆ ئەوەی بیکوژن، سەرکەوتە سەر بانی ماڵەکەی، لەپاشدا فەرمووی: لەبەر خوا بیرتان دەخەمەوە، ئایا دەزانن کاتێ کێوی ئوحود کەوتە لەرزە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئوحود دامەزرێ و هێوربەرەوە پێغەمبەرێك و (صديق)ڕاستگۆیەك و شەهیدێ بەسەرتەوەن؟). وتیان: بەڵێ، فەرمووی: لەبەر خوا بیرتان دەخەمەوە، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئامادەکردنی خەرجی سوپای (العسرة) بۆ جەنگ، فەرمووی: (کێ دەیەوێ خێر و خێراتێکی وا بکات لای خوا

گیرا بێ)، لەو کاتەدا خەڵك هەژار و نەدارا بوون، من لە ماڵ و سامانی خۆم خەرجی ئەو هەموو سوپایەم گرتە ئەستۆی خۆم و بەرێم کردن بۆ جەنگ؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: لەبەر خوا بیرتان دەخەمەوە، ئایا دەزانن کە بیری رۆمە ئاوەکەی بە پارە بوو، بە پارە نەبوایە کەس لێی نەدەخواردەوە، من بیرەکەم کڕی و وەقفم کرد بۆ هەژار و دەوڵەمەند و رێبوار؟ وتیان: بەڵێ، بە خوا وابوو، هەندێ شتی تری لەو بابەتە هەژمار کرد.

٣٧٠٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا السَّكَنُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، وَيُكْنَى أَبَا مُحَمَّدٍ مَوْلًى لِآلِ عُثْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ أَبِي هِشَامٍ، عَنْ فَرْقَدٍ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَبَّابٍ، قَالَ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَحُثُّ عَلَى جَيْشِ العُسْرَةِ فَقَامَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلَيَّ مِائَةُ بَعِيرٍ بِأَحْلَاسِهَا وَأَقْتَابِهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ حَضَّ عَلَى الجَيْشِ فَقَامَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلَيَّ مِائَتَا بَعِيرٍ بِأَحْلَاسِهَا وَأَقْتَابِهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ حَضَّ عَلَى الجَيْشِ فَقَامَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلَيَّ ثَلَاثُ مِائَةِ بَعِيرٍ بِأَحْلَاسِهَا وَأَقْتَابِهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، فَأَنَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْزِلُ عَنِ الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَقُولُ: مَا عَلَى عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ هَذِهِ، مَا عَلَى عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ هَذِهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، لَا نَعْرِفُهُ إِلَّا مِنْ حَدِيثِ السَّكَنِ بْنِ الْمُغِيرَةِ وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی خەبابەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خۆم لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم ئامادەبووم خەڵکی هاندەدا بۆ ئەوەی خەرجی سوپای (العسرة) بدەن و بەرێی بکەن بۆ غەزای تەبوك، پێشەوا عوسمان

ڕەزای خوای لێ بێ هەستایەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سەد وشتر بە کۆپان و ژێر کۆپانەوە لەسەر من لە پێناوی خوا، لەپاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەڵکی هاندەدا بۆ ئەوەی خەرجی سوپای (العسرة) بدەن و بەرێی بکەن بۆ غەزای تەبوك، پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ هەستایەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دوو سەد وشتر بە کۆپان و ژێر کۆپانەوە لەسەر من لە پێناوی خوا، پاشان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەڵکی هاندایەوە بۆ ئەوەی خەرجی سوپای (العسرة) بدەن و بەرێی بکەن بۆ غەزای تەبوك، دیسانەوە پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ هەستایەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سێ سەد وشتر بە کۆپان و ژێر کۆپانەوە لەسەر من لە پێناوی خوا، بە چاوی خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دی لەسەر مینبەر هاتەخوارەوە، دەیفەرموو: (لەپاش ئەمە عوسمان هەرچی بکات هیچی لەسەر نیە، لەپاش ئەمە عوسمان هەرچی بکات هیچی لەسەر نیە، واتە خوا لە سەرجەم تاوانەکانی خۆشبووە).

٣٧٠١ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ وَاقِعٍ الرَّمْلِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ضَمْرَةُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَوْذَبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ كَثِيرٍ، مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: جَاءَ عُثْمَانُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَلْفِ دِينَارٍ، قَالَ الحَسَنُ بْنُ وَاقِعٍ: وَكَانَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ مِنْ كِتَابِي، فِي كُمِّهِ، حِينَ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ فَنَثَرَهَا فِي حِجْرِهِ. قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَلِّبُهَا فِي حِجْرِهِ وَيَقُولُ: مَا ضَرَّ عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ اليَوْمِ مَرَّتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەریكی رێكخستنی سوپای (العسرة) بوو بۆ غەزای تەبوك، پێشەوا عوسمان رەزای خوای لێ بێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هەزار لیرەی زێری لە قۆڵی كراسەكەیدا هێناو هەڵی رژانده كۆشی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، (عبد الرحمن) فەرمووی: بە چاوی خۆم دیم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە كۆشیدا پارەكەی ئەم دیو دیو دەكرد، دەیفەرموو: (ئیتر لە ئەمڕۆ بەدواوە عوسمان هەرچی بكات زیانی پێ ناگەیەنێ، ئیتر لە ئەمڕۆ بەدواوە عوسمان هەرچی بكات زیانی پێ ناگەیەنێ).

٣٧٠٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ بِشْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: لَمَّا أُمِرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَيْعَةِ الرِّضْوَانِ كَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ رَسُولَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ قَالَ: فَبَايَعَ النَّاسَ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ عُثْمَانَ فِي حَاجَةِ اللهِ وَحَاجَةِ رَسُولِهِ. فَضَرَبَ بِإِحْدَى يَدَيْهِ عَلَى الأُخْرَى، فَكَانَتْ يَدُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعُثْمَانَ خَيْرًا مِنْ أَيْدِيهِمْ لأَنْفُسِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حودەیبیەوە پێشەوا عوسمانی رەزای خوای لێ بێ بە نوێنەری خۆی نارد بۆ ناو خەڵكی مەككە بۆ گفتوگۆكرد، هەواڵ هات وتیان قورەیش كوشتویانە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ تۆڵەی خوێنی پێشەوا عوسمان رەزای خوای لێ بێ لەژێر درەختەكەی حودەیبیەدا بەیعەت و پەیمانی لە هاوەڵانی وەرگرت، لەجیاتی دەستی عوسمان، دەستێكی خۆی كێشا بە دەستەكەی تریدا و فەرمووی: ئەمەش لەجیاتی عوسمان،

بێگومان دەستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ عوسمان چاکترە لەدەستی هەر هەموویان چاکتر بوو بۆ خۆیان.

٣٧٠٣ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَعَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَ: عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي الحَجَّاجِ الْمَنْقَرِيِّ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ حَزْنٍ القُشَيْرِيِّ، قَالَ: شَهِدْتُ الدَّارَ حِينَ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ عُثْمَانُ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِصَاحِبَيْكُمُ اللَّذَيْنِ أَلَّبَاكُمْ عَلَيَّ. قَالَ: فَجِيءَ بِهِمَا فَكَأَنَّهُمَا جَمَلاَنِ أَوْ كَأَنَّهُمَا حِمَارَانِ، قَالَ: فَأَشْرَفَ عَلَيْهِمْ عُثْمَانُ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللهِ وَالإِسْلاَمِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ يُسْتَعْذَبُ غَيْرَ بِئْرِ رُومَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ يَشْتَرِي بِئْرَ رُومَةَ فَيَجْعَلَ دَلْوَهُ مَعَ دِلاَءِ الْمُسْلِمِينَ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الجَنَّةِ؟ فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِي فَأَنْتُمُ اليَوْمَ تَمْنَعُونِي أَنْ أَشْرَبَ مِنْهَا حَتَّى أَشْرَبَ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ. قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ. فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللهِ وَالإِسْلاَمِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ الْمَسْجِدَ ضَاقَ بِأَهْلِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ يَشْتَرِي بُقْعَةَ آلِ فُلاَنٍ فَيَزِيدَهَا فِي الْمَسْجِدِ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الجَنَّةِ؟ فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِي فَأَنْتُمُ اليَوْمَ تَمْنَعُونِي أَنْ أُصَلِّيَ فِيهَا رَكْعَتَيْنِ؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ، نَعَمْ. قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللهِ وَبِالْإِسْلاَمِ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنِّي جَهَّزْتُ جَيْشَ العُسْرَةِ مِنْ مَالِي؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللهِ وَالإِسْلاَمِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عَلَى ثَبِيرِ مَكَّةَ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَأَنَا فَتَحَرَّكَ الجَبَلُ حَتَّى تَسَاقَطَتْ حِجَارَتُهُ بِالحَضِيضِ قَالَ: فَرَكَضَهُ بِرِجْلِهِ وَقَالَ: اسْكُنْ ثَبِيرُ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ، نَعَمْ. قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ شَهِدُوا لِي وَرَبِّ الكَعْبَةِ أَنِّي شَهِيدٌ، ثَلاَثًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عُثْمَانَ.

واتە: لە (ثمامة)ی کوڕی حەزنی قوشەیریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خۆم لەوێ بووم کاتێ پێشەوا عوسمانیان ڕەزای خوای لێ بێ گەمارۆدا بوو لەسەربانەوە فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە خواو بە دینی ئیسلام، ئەو دوو کەسەم بۆ بانگ بکەن کە ئێوەیان وروژاندووە لێم، هێنانیان لە دوو نێرە وشتر یان دوو نێرەکەر دەچوون، لەسەربانەوە قسەی لەتەك کردن، فەرمووی: لەبەر خوا بیرتان دەخەمەوە، ئایا دەزانن کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەشریفی هێنا بۆ مەدینە ئاوی سازگار و زولاڵی لێ نەبوو بیخۆنەوە جگە لە ئاوی بیری ڕۆمە نەبێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ بیری ڕۆمە دەکڕێ بۆ خێر بۆ موسوڵمانان، بەمەرجێ خۆشی وەك ئەوان سوودی لێ ببینێ ئەوە خوا لە بەهەشتدا بە باشتر هەقی بۆ دەکاتەوە)، من ئەو بیرەم بە ماڵی ساغی خۆم کڕی کردم بە وەقف بۆ موسوڵمانان کەچی ئێوە ئەمڕۆ ڕێگەنادەن لێی بخۆمەوە، ناچار ئاوی تاڵی دەریا دەخۆمەوە، وتیان: بەڵێ، بە خوا وایە، فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە خواو بە دینی ئیسلام، ئایا دەزانن مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەنگەبەر بوو جێگەی خەڵکەکە نەدبووەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ ئەو پارچە زەویەی فلان کەس دەکڕێ و دیخاتە سەر مزگەوت، خوا لە بەهەشتدا لەوە باشتری دەداتێ)، من ئەو ئەو پارچە زەویەم بە ماڵی ساغی خۆم کڕی کردم بە وەقف بۆ مزگەوت، کەچی ئێوە ئەمڕۆ ڕێگەنادەن دوو ڕکاتی نوێژی تێدا بکەم، وتیان: بەڵێ، بە خوا وایە، فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە خواو بە دینی ئیسلام، ئایا دەزانن بە ماڵی خۆم سوپای (العسرة)م ڕێکخست بۆ غەزای تەبوك، لەو کاتەدا خەڵك هەژار و نەدارا بوون، من لە ماڵ و سامانی خۆم خەرجی ئەو هەموو سوپایەم گرتە ئەستۆی خۆم و بەڕێم کردن بۆ جەنگ؟ وتیان: بەڵێ، بە خوا وایە، لەپاشدا فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە خواو بە دینی ئیسلام، ئایا دەزانن

رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر چیای (ثبیر)ی مەککە بوو، پێشەوا ئەبو بەکر و عومەر و منیشی لەگەڵ بوو، چایەکە بە شێوەیە لەریەوە بەردەکانی خل بوونەوە بۆ بنی، فەرمووی: (ئەی چیای (ثبیر) دامەزرێ و هێوربەرەوە پێغەمبەرێك و (صدیق)راستگۆیەك و دوو شەهید بەسەرتەوەن). وتیان: بەڵێ، بە خوا وایە، سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: (الله أكبر) بە پەروەردگاری کەعبە بۆ خۆیان شایەتیم بۆ دەدەن کە من شەهیدم.

٣٧٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي الأَشْعَثِ الصَّنْعَانِيِّ، أَنَّ خُطَبَاءَ قَامَتْ بِالشَّامِ وَفِيهِمْ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَامَ آخِرُهُمْ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: مُرَّةُ بْنُ كَعْبٍ، فَقَالَ: لَوْلاَ حَدِيثٌ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا قُمْتُ وَذَكَرَ الفِتَنَ فَقَرَّبَهَا، فَمَرَّ رَجُلٌ مُقَنَّعٌ فِي ثَوْبٍ فَقَالَ: هَذَا يَوْمَئِذٍ عَلَى الهُدَى، فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ. قَالَ: فَأَقْبَلْتُ عَلَيْهِ بِوَجْهِهِ، فَقُلْتُ: هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ حَوَالَةَ، وَكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ.

واتە: لە مورەی کوری کەعبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسە فیتنەو ئاژاوەی دەکردوو نزیکی کردبوونەوە، لەوکاتەدا پیاوێ لەوێوە رەت بوو، سەرتاپا خۆی داپۆشیبوو بە پۆشاکەکەی خۆی، فەرمووی: (ئەم پیاوە لەورۆژەدا رێگەی راست بەرنادات و لەسەر رێی هیدایەتە). منیش هەستام چووم بۆ لای پیاوەکە تەماشام کرد پێشەوا عوسمان رەزای خوای لێ بێ بوو، روویم کردە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، وتم: ئەم پیاوە، فەرمووی: (بەڵێ، ئەو پیاوە).

٣٧٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُجَيْنُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَا عُثْمَانُ إِنَّهُ لَعَلَّ اللَّهَ يُقَمِّصُكَ قَمِيصًا، فَإِنْ أَرَادُوكَ عَلَى خَلْعِهِ فَلاَ تَخْلَعْهُ لَهُمْ. وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتــە: لــە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی عوسمان بەڵكو خوای گەورە پۆشاكێكت لەبەر بكات، ئەگەر ویستیان لەبەرت دابكەنن قبوڵی مەكە واتە واز لە خەلیفایەتی مەهێنە).

٣٧٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ مِصْرَ حَجَّ البَيْتَ فَرَأَى قَوْمًا جُلُوسًا فَقَالَ: مَنْ هَؤُلاَءِ؟ قَالُوا: قُرَيْشٌ. قَالَ: فَمَنْ هَذَا الشَّيْخُ؟ قَالُوا: ابْنُ عُمَرَ فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ شَيْءٍ فَحَدِّثْنِي، أَنْشُدُكَ اللَّهَ بِحُرْمَةِ هَذَا البَيْتِ أَتَعْلَمُ أَنَّ عُثْمَانَ فَرَّ يَوْمَ أُحُدٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَتَعْلَمُ أَنَّهُ تَغَيَّبَ عَنْ بَيْعَةِ الرِّضْوَانِ فَلَمْ يَشْهَدْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَتَعْلَمُ أَنَّهُ تَغَيَّبَ يَوْمَ بَدْرٍ فَلَمْ يَشْهَدْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: تَعَالَ أُبَيِّنْ لَكَ مَا سَأَلْتَ عَنْهُ: أَمَّا فِرَارُهُ يَوْمَ أُحُدٍ فَأَشْهَدُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ عَفَا عَنْهُ وَغَفَرَ لَهُ، وَأَمَّا تَغَيُّبُهُ يَوْمَ بَدْرٍ فَإِنَّهُ كَانَتْ عِنْدَهُ أَوْ تَحْتَهُ ابْنَةُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَكَ أَجْرُ رَجُلٍ شَهِدَ بَدْرًا وَسَهْمُهُ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَخْلُفَ عَلَيْهَا وَكَانَتْ عَلِيلَةً. وَأَمَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَيْعَةِ الرِّضْوَانِ فَلَوْ كَانَ أَحَدٌ أَعَزَّ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ عُثْمَانَ لَبَعَثَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَانَ عُثْمَانَ، بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُثْمَانَ وَكَانَتْ بَيْعَةُ الرِّضْوَانِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ عُثْمَانُ إِلَى مَكَّةَ. قَالَ: فَقَالَ

رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ الْيُمْنَى: هَذِهِ يَدُ عُثْمَانَ. وَضَرَبَ بِهَا عَلَى يَدِهِ، فَقَالَ: هَذِهِ لِعُثْمَانَ، قَالَ لَهُ: اذْهَبْ بِهَذَا الآنَ مَعَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: پیاوێکی میصری چوو بۆ حەج تەوافی ماڵی خوای کرد، کۆمەڵێ خەڵك دانیشتبوون، وتی: ئەوانە کێن؟ وتیان: قورەیشین، وتی: ئەو شێخە کێیە لەناویاندا؟ وتیان: ئەوە ئیبنو عومەرە ڕەزای خوایان لێ بێ، چوو بۆ خزمەتی وتی: دەربارەی شتێ پرسیارت لێ دەکەم تۆش وەڵامم بدەرەوە، سوێندت دەدەم بە خواو بە حورمەتی ئەم ماڵە، ئایا دەزانی پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ ڕۆژی جەنگی ئوحود هەڵهاتبوو؟ فەرمووی: بەڵێ، وایە، ئایا ئەزانی لە ڕۆژی پەیمانی ژێر دارەکەی حودەیبیەدا ئامادە نەبوو؟ فەرمووی: بەڵێ، وایە، ئایا ئەزانی بەشداری جەنگی بەدری نەکرد، فەرمووی: بەڵێ، وایە، کابرا لەخۆشیاندا وتی: (الله أكبر)، ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: وەرە با پرسیارەکانت بۆ ڕون بکەمەوە، دەربارەی هەڵهاتنی لە ڕۆژی جەنگی ئوحود من شایەتی بۆ دەدەم کە خوای گەورە لێی خۆش بووە، سەبارەت بە بەشداری نەکردنی لە جەنگی بەدردا، هۆکارەکەی ئەوە بوو یەکێ لە کچەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە هاوسەری پێشەوا عوسمان بوو لەوکاتەدا نەخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی دا بەشداری نەکات، پێی فەرموو: (پاداشتی پیاوێکت بۆ هەیە کە بەشداری جەنگی بەدری کردبێ، لەگەڵ پشکێ لە دەستکەوتی جەنگی بەدر)، سەبارەت بە ئامادە نەبوونی لە ڕۆژی بەیعەت و پەیمانی ژێر دارەکەی حودەیبیەدا، هۆکارەکەی ئەوە بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نوێنەری خۆی ناردبووی بۆ مەککە بۆ گفتو گۆ لەگەڵ قورەیش، بەیعەت و پەیمانی ژێر دارەکەی حودەیبیە لەدوای ئەوە بوو بۆیە ئامادە نەبوو، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەجیاتی عوسمان، بە دەستی ڕاستی ئاماژەی کرد، دای بە دەستی چەپی خۆیا، دوو جار فەرمووی: (ئەم بەیعەت و پەیمانە لەجیاتی عوسمانە)، ئیبنو عومەر بە کابرای فەرموو: دەی بڕۆ ئەم وەڵامانە لەگەڵ خۆت بەرە.

٣٧٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا العَلَاءُ بْنُ عَبْدِ الجَبَّارِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَارِثُ بْنُ عُمَيْرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كُنَّا نَقُولُ وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَيٌّ: أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، يُسْتَغْرَبُ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە ژیاندا بوو، ئێمە ئەمانوت: چاکترین کەسی ئەم ئوممەتە لەدوای ئەو پێشەوا ئەبو بەکر و پاشان پێشەوا عومەر ئینجا پێشەوا عوسمانە ڕەزای خوایان لێ بێ.

٣٧٠٨ - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَاذَانُ الأَسْوَدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ سِنَانِ بْنِ هَارُونَ، عَنْ كُلَيْبِ بْنِ وَائِلٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِتْنَةً، فَقَالَ: يُقْتَلُ هَذَا فِيهَا مَظْلُومًا لِعُثْمَانَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم باسی ئاژاوەیەکی دەکرد کە بەرپا دەبێ، فەرمووی: (ئەم پیاوە لەو ئاژاوەدا بە ناڕەوا دەکوژرێ واتە پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ).

٣٧٠٩ - (موضوع) حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ البَغْدَادِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ زُفَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلَانَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِجَنَازَةِ رَجُلٍ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا رَأَيْنَاكَ تَرَكْتَ الصَّلَاةَ عَلَى أَحَدٍ قَبْلَ هَذَا؟

قَالَ: إِنَّهُ كَانَ يَبْغَضُ عُثْمَانَ فَأَبْغَضَهُ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ هَذَا هُوَ صَاحِبُ مَيْمُونِ بْنِ مِهْرَانَ ضَعِيفٌ فِي الحَدِيثِ جِدًّا وَمُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ صَاحِبُ أَبِي هُرَيْرَةَ هُوَ بَصْرِيٌّ ثِقَةٌ وَيُكْنَى أَبَا الحَارِثِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ الأَلْهَانِيُّ صَاحِبُ أَبِي أُمَامَةَ ثِقَةٌ يُكْنَى أَبَا سُفْيَانَ شَامِيٌّ.

واته: له جابیرەوه رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوه، كه فەرموویەتی: جەنازەی پیاوێكیان هێنا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی لەسەر بكات، نوێژی لەسەر نەكرد، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەپێش ئەمەدا نەماندیوە نوێژ لەسەر جەنازەی كەسێكی تر نەكەیت؟ فەرمووی: (ئەمە رقی لە پێشەوا عوسمان بوو، خوایش رقی لەو بوو بۆیە نوێژم لەسەر نەكرد).

٣٧١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ حَائِطًا لِلأَنْصَارِ فَقَضَى حَاجَتَهُ، فَقَالَ لِي: يَا أَبَا مُوسَى أَمْلِكْ عَلَيَّ البَابَ فَلاَ يَدْخُلَنَّ عَلَيَّ أَحَدٌ إِلاَّ بِإِذْنٍ. فَجَاءَ رَجُلٌ فَضَرَبَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ، قَالَ: ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ. فَدَخَلَ وَبَشَّرْتُهُ بِالجَنَّةِ، وَجَاءَ رَجُلٌ آخَرُ فَضَرَبَ البَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُمَرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا عُمَرُ يَسْتَأْذِنُ، قَالَ: افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ. فَفَتَحْتُ البَابَ وَدَخَلَ وَبَشَّرْتُهُ بِالجَنَّةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ آخَرُ فَضَرَبَ البَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: عُثْمَانُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا عُثْمَانُ يَسْتَأْذِنُ، قَالَ: افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ.

واته: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوه رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوه، كه

فەرموويەتی: لەتەك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرچووين چووە ناو باخی كابرايەكی ئەنصاری دەستی بە ئاو گەياند، فەرمووی: (ئەی ئەبا موسا نەيەڵی لەو دەرگاوە بەبێ مۆڵەت با كەس نەيەتە ژوورەوە بۆ لام، پياوێ هات دای لەدەرگا وتم: كێی؟ فەرمووی: ئەبو بەكر، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەبو بەكر داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوە دەكات، فەرمووی: (مۆڵەتی بدە با بێتە ژوورەوە، موژدەی بەهەشتیشی بدەرێ)، هاتەژوورەوە و موژدەی بەهەشتم دايە، پاشان پياوێكی تر هات دای لەدەرگا وتم: كێی؟ فەرمووی: عومەر، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم عومەر داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوە دەكات، فەرمووی: (با ئەويش بێتە ژوورەوە و موژدەی بەهەشتيشی بدەرێ)، منيش دەرگاكەم بۆ كردەوە، هاتەژوورەوە و موژدەی بەهەشتم دايە، جا پياوێكی تر هات دای لەدەرگا وتم: كێی؟ فەرمووی: عوسمان، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم عوسمان داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوە دەكات، فەرمووی: (با ئەويش بێتە ژوورەوە و موژدەی بەهەشتيشی بدەرێ لەسەر ئەو بەڵاو موسيبەتەی كە تووشی دەبێ).

٣٧١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَهْلَةَ، قَالَ: قَالَ عُثْمَانُ يَوْمَ الدَّارِ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ عَهِدَ إِلَيَّ عَهْدًا فَأَنَا صَابِرٌ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ.

واتە: ئەبو سەهلە فەرمووی: ئەو ڕۆژەی دەوری ماڵی پێشەوا عوسمانين دا ڕەزای خوای لێ بێ بۆ ئەوەی بيكوژن، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەڵێنێكی پێ داوم بەڕاستی ئارام دەگرم لەسەری. مەبەستی پێشەوا عوسمان ئەم فەرمايشتەی پێغەمبەری خوايە صلى الله عليه وسلم: (ئەی عوسمان بەڵكو خوای

گەورە پۆشاكێكت لەبەر بكات، ئەگەر ویستیان لەبەرت دابكەنن قبوڵی مەكە واتە واز لە خەلیفایەتی مەهێنە).

## دەربارەی چاكە و پلەوپایەی پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێخاوەنی دوو نازناوە: ئەبو تراب و ئەبو حەسەن

### ٢٠ - بَابُ مَنَاقِبِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يُقَالُ وَلَهُ كُنْيَتَانِ: أَبُو تُرَابٍ، وَأَبُو الْحَسَنِ

٣٧١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الضُّبَعِيُّ، عَنْ يَزِيدَ الرِّشْكِ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَيْشًا وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَمَضَى فِي السَّرِيَّةِ فَأَصَابَ جَارِيَةً فَأَنْكَرُوا عَلَيْهِ، وَتَعَاقَدَ أَرْبَعَةٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: إِذَا لَقِينَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرْنَاهُ بِمَا صَنَعَ عَلِيٌّ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ إِذَا رَجَعُوا مِنَ السَّفَرِ بَدَءُوا بِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمُوا عَلَيْهِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا إِلَى رِحَالِهِمْ فَلَمَّا قَدِمَتِ السَّرِيَّةُ سَلَّمُوا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَامَ أَحَدُ الأَرْبَعَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلَمْ تَرَ إِلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ صَنَعَ كَذَا وَكَذَا، فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ الثَّانِي فَقَالَ مِثْلَ مَقَالَتِهِ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ قَامَ إِلَيْهِ الثَّالِثُ فَقَالَ مِثْلَ مَقَالَتِهِ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ قَامَ الرَّابِعُ فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالُوا، فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالغَضَبُ يُعْرَفُ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: مَا تُرِيدُونَ مِنْ عَلِيٍّ؟ مَا تُرِيدُونَ مِنْ عَلِيٍّ؟ مَا تُرِيدُونَ مِنْ عَلِيٍّ؟ إِنَّ عَلِيًّا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَهُوَ وَلِيُّ كُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ بَعْدِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ جَعْفَرِ بْنِ سُلَيْمَانَ.

واتـە: لـە عیمرانـی کـوڕی حوصـەینەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم سـوپایەکی ڕەوانـەکرد بـۆ شوێنێ بەسەرکردایەتی پێشـەوا عـەلی ڕەزای خـوای لـێ بـێ، سـوپاکە بەڕێکـەوت لەڕێگا پێشەوا عەلی چووە لای کەنیزەکێ خەڵکەکە ئینکاری ئـەو کارەیـان کـرد، چوار کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم، بەڵێنیانـدا وتیـان: کە گەڕاینەوە بۆ پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم باس دەکـەین کـە پێشـەوا عەلی چی کردووە، موسوڵمانان عادەتیان وابوو کە لەسـەفەر دەگەڕانـەوە دەچـوونە خزمەت پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم، سـەلامیان لـێ دەکـرد، لەپاشـدا دەچوون بەلای بنە و بارگەی خۆیانەوە و دەچوونەوە بۆ ماڵی خۆیان، کاتێ سـوپاکە گەڕایەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سەلامیان لێ کرد، یەکێ لە چوار کەسەکە هەسـتایەوە وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسلم، ئایا دەزانی کە عـەلی ئیشێکی وای کردووە؟ ڕووی لێ وەرچەرخاند، لەپاشـدا یەکێکی تر لە چوار کەسەکە هەستایەوە وتی ئەوی تـر چـی وت ئـەویش دووبـارەی کـردەوە، پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم ڕووی لــێ وەرچــەرخاند، جــا سێیەمیان هەستایەوە قسەکەی ئەوانی دووبارە کردەوە، ڕووی لەویش وەرچـەرخاند، پاشـان چـوارەمیان هەسـتایەوە ئـەوان چـیان وت ئـەویش دووبـارەی کـردەوە، ڕووی لەویش وەرچەرخاند، پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم تـووڕەیی بـە ڕوویـەوە دیار بوو سێ جار فەرمووی: (ئەوە چیتان دەوێ لە عەلی، عەلی پارچەیەکە لە مـن و منیش پارچەیەکم لە عەلی، لەدوای من گەورە و سەرداری هەموو باوەڕدارێکە).

٣٧١٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الطُّفَيْلِ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي سَرِيحَةَ، أَوْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، شَكَّ شُعْبَةُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كُنْتُ مَوْلاَهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مَيْمُونٍ أَبِي عَبْدِ اللهِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَأَبُو سَرِيحَةَ هُوَ: حُذَيْفَةُ بْنُ أَسِيدٍ صَاحِبُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەرکەسێ من گەورە و سەرداری بم عەلیش گەورە و سەرداریەتی).

٣٧١٤ – (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا أَبُو الخَطَّابِ زِيَادُ بْنُ يَحْيَى البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَتَّابٍ سَهْلُ بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُخْتَارُ بْنُ نَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَحِمَ اللَّهُ أَبَا بَكْرٍ زَوَّجَنِي ابْنَتَهُ، وَحَمَلَنِي إِلَى دَارِ الهِجْرَةِ، وَأَعْتَقَ بِلاَلاً مِنْ مَالِهِ، رَحِمَ اللَّهُ عُمَرَ، يَقُولُ الحَقَّ وَإِنْ كَانَ مُرًّا، تَرَكَهُ الحَقُّ وَمَا لَهُ صَدِيقٌ، رَحِمَ اللَّهُ عُثْمَانَ، تَسْتَحْيِيهِ الْمَلاَئِكَةُ، رَحِمَ اللَّهُ عَلِيًّا، اللَّهُمَّ أَدِرِ الحَقَّ مَعَهُ حَيْثُ دَارَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕەحمەتی خوا لە ئەبو بەکر کچەکەی خۆی دامێ، بە سواری وڵاخەکەی خۆی منی گەیاندە مەدینە، بە ماڵ و سامانی خۆی بیلالی ڕزگار کرد لە کۆیلەیی، ڕەحمەتی خوا لە عومەر هەمشە قسەی هەق دەکات، هەرچەندە تاڵیش بێ، قسەی هەق هاوڕێی نەهێشتۆتەوە بۆ عومەر، ڕەحمەتی خوا لە عوسمان مەلائیکە شەرمی لێ دەکەن، ڕەحمەتی خوا لە

عەلی، خودایە هەق و راستی لەگەڵ عەلی بسوڕێنە، عـەلی لـە کـوێ بـێ هـەق و راستیش لەوێ بێ).

٣٧١٥ - (ضعيف الإسناد لكن جملة الأخيرة صحيحة متواترة) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، بِالرَّحَبَةِ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ الحُدَيْبِيَةِ خَرَجَ إِلَيْنَا نَاسٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فِيهِمْ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو وَأُنَاسٌ مِنْ رُؤَسَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ خَرَجَ إِلَيْكَ نَاسٌ مِنْ أَبْنَائِنَا وَإِخْوَانِنَا وَأَرِقَّائِنَا وَلَيْسَ لَهُمْ فِقْهٌ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا خَرَجُوا فِرَارًا مِنْ أَمْوَالِنَا وَضِيَاعِنَا فَارْدُدْهُمْ إِلَيْنَا. فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِقْهٌ فِي الدِّينِ سَنُفَقِّهُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ لَتَنْتَهُنَّ أَوْ لَيَبْعَثَنَّ اللهُ عَلَيْكُمْ مَنْ يَضْرِبُ رِقَابَكُمْ بِالسَّيْفِ عَلَى الدِّينِ، قَدْ امْتَحَنَ اللهُ قُلُوبَهُمْ عَلَى الْإِيمَانِ. قَالُوا: مَنْ هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: مَنْ هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ وَقَالَ عُمَرُ: مَنْ هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: هُوَ خَاصِفُ النَّعْلِ، وَكَانَ أَعْطَى عَلِيًّا نَعْلَهُ يَخْصِفُهَا، قَالَ: ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيْنَا عَلِيٌّ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ رِبْعِيٍّ عَنْ عَلِيٍّ. وَسَمِعْتُ الجَارُودَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا، يَقُولُ: لَمْ يَكْذِبْ رِبْعِيُّ بْنُ حِرَاشٍ فِي الإِسْلاَمِ كَذْبَةً. وأَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي الأَسْوَدِ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ مَهْدِيٍّ، يَقُولُ: مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ أَثْبَتُ أَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بـێ لـە رەحبـە لـە کوفـە بـۆی گێڕاینـەوە، فەرمووی: رۆژی رێکەوتنی حودەیبیـە چـەند کەسـێ لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران هاتنەدەرەوە سوهەیلی کوڕی عەمر و چەند کەسێ لە گەورەکانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانیان لەناودا بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هەنـدێ

کەس لە نەوەکانمان و براکانمان و بەندە و کۆیلەکانمان لە مەککە دەرچوون و هاتوون بۆ لای تۆ ئەوانە لەدین تێ ناگەن بەڵکو لەتاو ئیش و کار و خزمەتی ماڵ و منداڵ و زەوی زار و مەزراو رایان کردووە لەبەرئەوە بیاندەرەوە پێمان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: لەمەولا خۆمان لە شارەزایان دەکەین لە دین، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی قورەیش یا ئەوەتا وازدەهێنن لەو قسانە، یان ئەوەتا خوای گەورە پیاوێکتان بۆ دەنێرێ بە شمشێر دەدات لەگەردنتان لەسەر دین، بەڕاستی ئا ئەو کەسە خوای گەورە دڵی زاخاوداوە بۆ پارێزگاری و خۆپاراستن لەهەموو کارێکی خراپ و ناڕەوا). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوە کێیە؟ پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوە کێیە؟ پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوە کێیە؟ فەرمووی: (ئا ئەمەیە کە ئەو پێڵاوانە دەدورێتەوە)، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێڵاوەکانی خۆی دابوو بە من دەمدورینەوە بۆی، راوی وتی: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ لای کردەوە بۆ لای ئێمە و فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت: (ئەوەی بە ئارەزوو بەناوی منەوە درۆ بکات با جێگەیە لە ناو ئاگری دۆزەخدا بۆ خۆی دابنێ).

٣٧١٦ - حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ إِسْرَائِيلَ (ح) وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَنْتَ مِنِّي وَأَنَا مِنْكَ وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ. قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر

صلی الله علیه وسلم بە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ فەرموو: (تۆ پارچەیەکی لە من و منیش پارچەیەکم لەتۆ).

٣٧١٧ - (ضعيف الإسناد جدا) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي هَارُونَ الْعَبْدِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعْرِفُ الْمُنَافِقِينَ نَحْنُ مَعْشَرَ الأَنْصَارِ بِبُغْضِهِمْ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ تَكَلَّمَ شُعْبَةُ فِي أَبِي هَارُونَ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: ئێمەی کۆمەڵی ئەنصارەکان دووڕووەکانمان بەوەدا دەناسی کە ڕقیــان لە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی (طالب).

٣٧١٧ م- (ضعيف) حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَبِي نَصْرٍ، عَنِ الْمُسَاوِرِ الحِمْيَرِيِّ، عَنْ أُمِّهِ، قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَسَمِعْتُهَا تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ يُحِبُّ عَلِيًّا مُنَافِقٌ وَلاَ يَبْغَضُهُ مُؤْمِنٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە موساویری حیمیەریــەوە، لــە دایکیــەوە دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: چوومە خزمەت ئوممو سەلەمە بۆ خۆم گوێم لێی بوو دەیفــەرموو: پێغەمبــەر صــلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (مرۆڤی باوەڕدار ڕقی لە پێشەوا عــەلی نــابێ، مرۆڤــی دووڕوویش خۆشی ناوێ).

٣٧١٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى الْفَزَارِيُّ ابْنُ بِنْتِ السُّدِّيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي رَبِيعَةَ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِحُبِّ أَرْبَعَةٍ، وَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ يُحِبُّهُمْ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ سَمِّهِمْ لَنَا، قَالَ: عَلِيٌّ مِنْهُمْ، يَقُولُ ذَلِكَ ثَلاَثًا وَأَبُو ذَرٍّ، وَالْمِقْدَادُ، وَسَلْمَانُ أَمَرَنِي بِحُبِّهِمْ، وَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ يُحِبُّهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ.

واتە: لە بورەیدەوە، لە باوکیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم چوار کەسم خۆش بوێت، پێشی راگەیاندم کە خۆشم ئەوانەم خۆش دەوێت)، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ناویان چیە؟ سێ جار فەرمووی: (پێشەوا عەلی یەکێکە لەوانە)، سیانەکەی تریش: ( ئەبو (ذر) و میقداد و سەلمانن).

٣٧١٩ - (حسن) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ حُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَلِيٌّ مِنِّي وَأَنَا مِنْ عَلِيٍّ، وَلاَ يُؤَدِّي عَنِّي إِلاَّ أَنَا أَوْ عَلِيٌّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە حوبەشیی کوری جونادەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (عەلی پارچەیەکە لە من و منیش پارچەیەکم لە عەلی، کەسیش لە جیاتی من مافەکانی ناداتەوە مەگەر خۆم یان عەلی).

٣٧٢٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى الْقَطَّانُ الْبَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ قَادِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ صَالِحِ بْنِ حَيٍّ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ جُمَيْعِ بْنِ عُمَيْرٍ التَّيْمِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: آخَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ

عَلِيٌّ تَدْمَعُ عَيْنَاهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ آخَيْتَ بَيْنَ أَصْحَابِكَ وَلَمْ تُؤَاخِ بَيْنِي وَبَيْنَ أَحَدٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْتَ أَخِي فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَفِي البَابِ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِي أَوْفَى.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم لە هاوەڵانی کۆچەریەك و یاریدەدەرێکی کردە برای یەك، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ هاتە خزمەتی فرمێسك لەچاوەکانی دەباری، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، لە هاوەڵانت کردووە بە برای یەك، بەڵام کەست نەکردۆتە برای من، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ فەرموو: (تۆ برای منی لە دونیا و لە دوارۆژیشدا).

٣٧٢١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ عِيسَى بْنِ عُمَرَ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَيْرٌ فَقَالَ: اللَّهُمَّ ائْتِنِي بِأَحَبِّ خَلْقِكَ إِلَيْكَ يَأْكُلُ مَعِي هَذَا الطَّيْرَ فَجَاءَ عَلِيٌّ فَأَكَلَ مَعَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ السُّدِّيِّ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ، وَعِيسَى بْنُ عُمَرَ هُوَ كُوفِيٌّ، وَالسُّدِّيُّ اسْمُهُ: إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَدْ أَدْرَكَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ وَرَأَى الْحُسَيْنَ بْنَ عَلِيٍّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم گۆشتی باڵندەی لە بەردەستدا بوو، فەرمووی: (خوایە خۆشەویسترین دروستکراو بەلای خۆتەوە بنێرە با لەگەڵ من لە گۆشتی ئەم باڵندە بخوات)، خوای گەورە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ نارد لەتەکی لە گۆشتی باڵندەکەی خوارد).

٣٧٢٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ أَسْلَمَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَوْفٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ هِنْدٍ الجَمَلِيِّ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ: كُنْتُ إِذَا سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْطَانِي، وَإِذَا سَكَتُّ ابْتَدَأَنِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەگەر داوای شتێكم بكردایە لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی دەبەخشیم، ئەگەر بێ دەنگیش بوومایە لە منەوە دەستی پێ دەكرد).

٣٧٢٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمَرَ بْنِ الرُّومِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ، عَنِ الصُّنَابِحِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَا دَارُ الحِكْمَةِ وَعَلِيٌّ بَابُهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مُنْكَرٌ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ شَرِيكٍ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنِ الصُّنَابِحِيِّ وَلاَ نَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَحَدٍ مِنَ الثِّقَاتِ غَيْرِ شَرِيكٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (من ماڵی حیكمەت و دانایم و پێشەوا عەلیش دەرگاكەیەتی).

٣٧٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ مِسْمَارٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَمَّرَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ سَعْدًا، فَقَالَ: مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَسُبَّ أَبَا تُرَابٍ، قَالَ: أَمَّا مَا ذَكَرْتَ ثَلاَثًا قَالَهُنَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَنْ أَسُبَّهُ، لأَنْ تَكُونَ لِي وَاحِدَةٌ مِنْهُنَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ. سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لِعَلِيٍّ وَخَلَفَهُ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، فَقَالَ لَهُ

عَلِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ تَخْلُفُنِي مَعَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى إِلاَّ أَنَّهُ لاَ نُبُوَّةَ بَعْدِي، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ خَيْبَرَ: لَأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ رَجُلاً يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ. قَالَ: فَتَطَاوَلْنَا لَهَا، فَقَالَ: ادْعُوا لِي عَلِيًّا، فَأَتَاهُ وَبِهِ رَمَدٌ، فَبَصَقَ فِي عَيْنِهِ، فَدَفَعَ الرَّايَةَ إِلَيْهِ، فَفَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ، وَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ) الآيَةَ، دَعَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيًّا وَفَاطِمَةَ وَحَسَنًا وَحُسَيْنًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلاَءِ أَهْلِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕەزای خوای لێ بێ فەمانی کرد بە سەعد، فەرمووی: ئەی سەعد چی ڕێگری ئەوەت لێ دەکات جنێو نادەی بە ئەبو توراب واتە بە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی (طالب)؟ سەعد فەرمووی: لەبەر ئەم سێ فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هەرگیز جنێوی پێ نادەم، ئەگەر یەکێ لەوانەش هی من بێ لە گەلە وشتری سور پێم خۆشترە:

یەکەم: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ڕۆشت بۆ غەزایە، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ لەجێی خۆی دانا کردیە جێنشینی خۆی و خۆشی ڕۆشت بۆ غەزاکە، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، تۆ منت کردووە بە جێنشینی خۆت بەسەر ژنان و منداڵانەوە؟ بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بوو بە پێشەوا عەلی فەرموو: (تۆ بەوە ڕازی نابی کە تۆ بۆ من لەجێی هارون بیت بۆ موسای برای، ئەوەندە هەیە لەپاش من پێغەمبەری تر نیە).

دووەم: لە ڕۆژی غەزای قەڵای خەیبەردا، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی

الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست پیاوێ خواو پێغەمبەری خۆش دەوێ، خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێ). سەعد فەرمووی: ئێمەش خۆمان بۆ قوتكردەوە بۆ ئەوەی بزانین دەیداتە دەست كاممان، ئەوە بوو فەرمووی: (پێشەوا عەلیم رەزای خوای لێ بێ بۆ بانگ بكەن). پێشەوا عەلی هات چاوی ئێشی دەكرد، تفی دا لە چاوی، ئاڵاكەی دایە، لەسەر دەستی ئەو خوای گەورە خیبەری بۆ رزگار كرد، ئەم ئایەتە دابەزی: **(فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ).** سورة آل عمران: ٦١. واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: وەرن با كوڕانی ئێمە و كوڕانی ئێوە و ئافرەتانی ئێمە و ئافرەتانی ئێوە و خۆمان و خۆشتان بانگ بكەین ئامادەبین (لە شوێنێكی تایبەتدا)، لەپاشدا لە خوا بپاڕێینەوە و دواوا بكەین نەفرینی خوا داباریتە سەر درۆزنەكان.

جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشەوا عەلی و (فاطمة) و حەسەن و حوسەینی بانگ كرد بۆ ئەو مەبەستە. ئەمەش سێیەم.

٣٧٢٥ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَحْوَصُ بْنُ جَوَّابٍ أَبُو الجَوَّابِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَيْشَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَى أَحَدِهِمَا عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَعَلَى الآخَرِ خَالِدَ بْنَ الوَلِيدِ وَقَالَ: إِذَا كَانَ القِتَالُ فَعَلِيٌّ قَالَ: فَافْتَتَحَ عَلِيٌّ حِصْنًا فَأَخَذَ مِنْهُ جَارِيَةً، فَكَتَبَ مَعِي خَالِدٌ كِتَابًا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشِي بِهِ. قَالَ: فَقَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَرَأَ الكِتَابَ، فَتَغَيَّرَ لَوْنُهُ، ثُمَّ قَالَ: مَا تَرَى فِي رَجُلٍ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ؟ قَالَ: قُلْتُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ غَضَبِ اللهِ وَمِنْ غَضَبِ

رَسُولِهِ، وَإِنَّمَا أَنَا رَسُولٌ، فَسَكَتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە بەرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو سوپای ڕەوانەكرد بۆ جەنگ، یەكێكیان بە سەركردایەتی پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ ئەوی تریشیان بە سەركردایەتی خالیدی كوڕی وەلید ڕەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: (ئەگەر جەنگ بەرپا بوو ئەوە با پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ سەركردایەتی جەنگەكە بكات)، جا پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ قەڵایەكی رزگار كرد هەندێ ئافرەتیان گرت بە سەبایا یەكێكیانی هەڵبژارد بۆ خۆی، خالید نامەیەكی بە مندا نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەی پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دوو زمانی كرد، كاتێ نامەكەی خالید خوێنرایەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕەنگی تێك چوو، لەپاشدا فەرمووی: (چۆن دەبینن پیاوێ خواو پێغەمبەری خۆش دەوێ و خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێ؟)، براء فەرمووی: منیش وتم: پەنادەگرم بە خوا لە تووڕەیی خواو لە تووڕەیی پێغەمبەرەكەی، من نێردراوم، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێدەنگ بوو.

٣٧٢٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُنْذِرِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنِ الأَجْلَحِ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: دَعَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيًّا يَوْمَ الطَّائِفِ فَانْتَجَاهُ، فَقَالَ النَّاسُ: لَقَدْ طَالَ نَجْوَاهُ مَعَ ابْنِ عَمِّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا انْتَجَيْتُهُ وَلَكِنَّ اللهَ انْتَجَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الأَجْلَحِ. وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ ابْنِ فُضَيْلٍ، أَيْضًا عَنِ الأَجْلَحِ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: وَلَكِنَّ اللهَ انْتَجَاهُ. يَقُولُ: إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أَنْتَجِيَ مَعَهُ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ بانگ کرد چپەی لەگەڵ کرد، خەڵکەکە وتیان: چپە چپەکەیان درێژەی کێشا لەتەك ئامۆزاکەی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من چپە چپم لەتەکی نەکرد، خوای گەورە فەرمانی پێ کردم چپە چپی لەتەك بکەم).

٣٧٢٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُنْذِرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي حَفْصَةَ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَلِيٍّ: يَا عَلِيُّ لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ يُجْنِبُ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ غَيْرِي وَغَيْرَكَ قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمُنْذِرِ: قُلْتُ لِضِرَارِ بْنِ صُرَدٍ: مَا مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ؟ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ يَسْتَطْرِقُهُ جُنُبًا غَيْرِي وَغَيْرِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ سَمِعَ مِنِّي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ هَذَا الحَدِيثَ وَاسْتَغْرَبَهُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ فەرموو: (ئەی عەلی جگە لە من و تۆ بۆ کەسی تر نیە بە لەشگرانی بە ناو ئەم مزگەوتەدا گوزەر بکا).

٣٧٢٨ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَابِسٍ، عَنْ مُسْلِمٍ الْمُلاَئِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: بُعِثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ، وَصَلَّى وَعَلِيٌّ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُسْلِمٍ الأَعْوَرِ. وَمُسْلِمٌ الأَعْوَرُ لَيْسَ عِنْدَهُمْ بِذَلِكَ القَوِيِّ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ حَبَّةَ، عَنْ عَلِيٍّ، نَحْوَ هَذَا.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: رۆژی دوو شەممە پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم رەوانــەکرا نوێژی کرد، پێشەوا عەلیش رەزای خوای لـێ بـێ موسـوڵمان بـوو رۆژی سـێ شـەممە نوێژی کرد.

٣٧٢٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ أَسْلَمَ الْبَغْدَادِيُّ، حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، أَخْبَرَنَا عَوْفٌ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ هِنْدٍ الْجَمَلِيِّ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ كُنْتُ إِذَا سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم أَعْطَانِي وَإِذَا سَكَتُّ ابْتَدَأَنِي. قَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیــەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: ئەگــەر داوای شــتێکم بکردایــە لــە پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم پێــی دەبەخشیم، ئەگەر بێ دەنگیش بوومایە لە منەوە دەستی پێ دەکرد).

٣٧٣٠ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعَلِيٍّ: أَنْتَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى إِلاَّ أَنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ.

واتــە: لــە جــابیری کــوڕی (عبــد الله)وە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بە پێشەوا عەلی فەرموو: (تۆ بۆ من لـەجێی هارونیت بۆ موسای برای، ئەوەندە هەیە لەپاش من پێغەمبەری تر نیە).

٣٧٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ عَبْدِ السَّلاَمِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي

وَقَّاصٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعَلِيٍّ: أَنْتَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى إِلاَّ أَنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ سَعْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيُسْتَغْرَبُ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ.

واته: له سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە پێشەوا عەلی فەرموو: (تۆ بۆ من لەجێی هارونیت بۆ موسای برای، ئەوەندە هەیە لەپاش من پێغەمبەری تر نیە).

٣٧٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُخْتَارِ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي بَلْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَرَ بِسَدِّ الأَبْوَابِ إِلاَّ بَابَ عَلِيٍّ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ عَنْ شُعْبَةَ بِهَذَا الإِسْنَادِ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واته: له ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا بە داخستنی دەرگای ماڵەكانی سەر مزگەوت جگە لە دەرگای ماڵی پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ.

٣٧٣٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَخِي مُوسَى بْنُ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ عَنْ أَبِيهِ عَلِيِّ بْنِ الحُسَيْنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ بِيَدِ حَسَنٍ وَحُسَيْنٍ فَقَالَ: مَنْ أَحَبَّنِي وَأَحَبَّ هَذَيْنِ وَأَبَاهُمَا وَأُمَّهُمَا كَانَ مَعِي فِي دَرَجَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی حەسەن و حوسەینی گرت فەرمووی: (هەرکەس من ئەم دوانە و دایك و باوکیانی خۆش بوێت واتە عەلی و (فاطمة)، لە ڕۆژی قیامەتدا لەتەك منە لە پلە و پایەدا).

٣٧٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُخْتَارِ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي بَلْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَوَّلُ مَنْ صَلَّى عَلِيٌّ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي بَلْجٍ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ حُمَيْدٍ، وَأَبُو بَلْجٍ اسْمُهُ: يَحْيَى بْنُ أَبِي سُلَيْمٍ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ وقَالَ بَعْضُهُمْ: أَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ عَلِيٌّ، وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: أَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ مِنَ الرِّجَالِ أَبُو بَكْرٍ، وَأَسْلَمَ عَلِيٌّ وَهُوَ غُلاَمٌ ابْنُ ثَمَانِ سِنِينَ، وَأَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ مِنَ النِّسَاءِ خَدِيجَةُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: یەکەم کەس نوێژی کرد پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ بوو. زانایان لەوبارەوە ڕایان جیایە: هەندێکیان دەڵێن: یەکەم کەس پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ موسوڵمان بوو، هەندێکی تریان دەڵێن: یەکەم کەس پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ موسوڵمان بوو، هەندێ لە زانایان دەڵێن: یەکەم کەس لە پیاوان پێشەوا ئەبوو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ موسوڵمان بوو، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ کە موسوڵمان بوو تەمەنی هەشت ساڵ بوو، لە ژنانیش یەکەم کەس خەدیجە ڕەزای خوای لێ بێ موسوڵمان بوو.

٣٧٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ، يَقُولُ: أَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ عَلِيٌّ. قَالَ: عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ، لِإِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ، فَأَنْكَرَهُ وَقَالَ: أَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو حَمْزَةَ اسْمُهُ: طَلْحَةُ بْنُ يَزِيدَ.

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: یەکەم کەس پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ موسوڵمان بوو. عەمری کوڕی مورە فەرمووی: ئەمەم گێڕایەوە بۆ ئیبراهیمی نەخەعی ئینکاری کرد، فەرمووی: یەکەم کەس پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ موسوڵمان بوو.

٣٧٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ عُثْمَانَ ابْنِ أَخِي يَحْيَى بْنِ عِيسَى الرَّمْلِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ عِيسَى الرَّمْلِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: لَقَدْ عَهِدَ إِلَيَّ النَّبِيُّ الأُمِّيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ لاَ يُحِبُّكَ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَبْغَضُكَ إِلاَّ مُنَافِقٌ قَالَ عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ: أَنَا مِنَ الْقَرْنِ الَّذِي دَعَا لَهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵێن و پەیمانی پێدام: جگە لە مرۆڤی باوەڕدار کەس بەڕاستی تۆی خۆش ناوێ، جگە لە مرۆڤی دووڕوویش کەس رقی لە تۆ نابێ).

٣٧٣٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَيَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي الجَرَّاحِ قَالَ: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ صُبْحٍ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ شَرَاحِيلَ، قَالَتْ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ عَطِيَّةَ، قَالَتْ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَيْشًا

فِيهِمْ عَلِيٌّ، قَالَتْ: فَسَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْنِي حَتَّى تُرِيَنِي عَلِيًّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (أُمِّ عَطِيَّةَ)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سوپایەکی نارد بۆ جەنگ، پێشەوا عەلیش ڕەزای خوای لێ بێ لەناویاندا بوو، دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی: (خوایە نەمکوژی هەتا عەلی دەبینمەوە).

## دەربارەی چاکە و پایەی (طَلْحَةَ)ی کوڕی (عبيد الله) ڕەزای خوای لێ بێ

## ٢٢ - بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي مُحَمَّدٍ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٧٣٨ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنِ الزُّبَيْرِ، قَالَ: كَانَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ دِرْعَانِ فَنَهَضَ إِلَى صَخْرَةٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ فَأَقْعَدَ تَحْتَهُ طَلْحَةَ، فَصَعِدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى اسْتَوَى عَلَى الصَّخْرَةِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: أَوْجَبَ طَلْحَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە زوبێرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوو زرێی لەبەردا بوو، ویستی بچێتە سەر بەردێ نەیتوانی، (طَلْحَةَ) لە بنی بەردەکەدا پشتی بۆ دانا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر پشتی ئەوەوە چووە سەر بەردەکە، ((طَلْحَةَ) فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: ((طَلْحَةَ) بەهەشتی بۆ خۆی مسۆگەر کرد).

٣٧٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ مُوسَى، عَنِ الصَّلْتِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، قَالَ: قَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى شَهِيدٍ يَمْشِي عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الصَّلْتِ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي الصَّلْتِ بْنِ دِينَارٍ وَضَعَّفَهُ، وَتَكَلَّمُوا فِي صَالِحِ بْنِ مُوسَى.

واتە: لە جابیری كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەوەی پێی خۆشە سەیری شەهیدێ بكات هێشتا بەسەر زەویدا بڕوات ئەوە با سەیری (طَلْحَةَ) بكات).

٣٧٤٠ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ القُدُّوسِ بْنُ مُحَمَّدٍ العَطَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ يَحْيَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ عَمِّهِ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ: أَلاَ أُبَشِّرُكَ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: طَلْحَةُ مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ مُعَاوِيَةَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە موسای كوڕی (طَلْحَةَ)وە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: چوومە خزمەت موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: هۆشیاربە ئەرێ موژدەیەكی خۆشت نەدەمێ؟ بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: ((طَلْحَةَ) یەكێكە لە(**مَنْ قَضَى نَحْبَهُ**) كە لەم ئایەتەدا هاتووە: (**مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا**) سورة الأحزاب: ٢٣. واتە: مەردانێكی زۆر هەن لە باوەڕداران ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا، ڕاستیان كرد لەسەری ژیان و پابەندبوون پێوەی و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەكەی جێبەجێ كردوو مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بە هیچ

شێوەیەك گۆڕان و لاری رووی تیّ نەکردوون.

٣٧٤١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ مَنْصُورٍ العَنَزِيُّ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَلْقَمَةَ اليَشْكُرِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: سَمِعَتْ أُذُنِي مِنْ فِي رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَقُولُ: طَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ جَارَايَ فِي الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لیّ بیّ رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە گوێی خۆم لە دەمی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: ((طَلْحَةَ) و زوبێر لە بەهەشتدا دراوسێی منن).

٣٧٤٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا طَلْحَةُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ مُوسَى، وَعِيسَى ابْنَيْ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِمَا طَلْحَةَ، أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا: لأَعْرَابِيٍّ جَاهِلٍ: سَلْهُ عَمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ مَنْ هُوَ؟ وَكَانُوا لاَ يَجْتَرِئُونَ عَلَى مَسْأَلَتِهِ يُوَقِّرُونَهُ وَيَهَابُونَهُ، فَسَأَلَهُ الأَعْرَابِيُّ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ إِنِّي اطَّلَعْتُ مِنْ بَابِ الْمَسْجِدِ وَعَلَيَّ ثِيَابٌ خُضْرٌ، فَلَمَّا رَآنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ عَمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ؟ قَالَ الأَعْرَابِيُّ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: هَذَا مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي كُرَيْبٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ بُكَيْرٍ. وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ كِبَارِ أَهْلِ الحَدِيثِ عَنْ أَبِي كُرَيْبٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ. وسَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، يُحَدِّثُ بِهَذَا عَنْ أَبِي كُرَيْبٍ، وَوَضَعَهُ فِي كِتَابِ الفَوَائِدِ.

واتە: لە (طَلْحَةَ)وە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە عەرەبێکی دەشتەکی نەزانیان وت: دەربارەی (**مَنْ قَضَى نَحْبَهُ**) کە لەم ئایەتەدا هاتووە: (**مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا**

**مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا**).
سورة الأحزاب: ٢٣. واتە: مەردانێکی زۆر هەن لە باوەڕداران ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا، راستیان کرد لەسەری ژیان و پابەندبوون پێوەی و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کردوو مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بە هیچ شێوەیەك گۆڕان و لاری رووی تێ نەکردوون.

لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بپرسە، خۆیان جورئەتی ئەوەیان نەدەکرد ئەو پرسیارە بکەن چونکە زۆر قەدریان دەگرت و سامیان لێ دەکرد، جا عەرەبە دەشتەکیەکە سێ ئەو پرسیارەی لێ کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هەر سێ جارەکە رووی لێ وەرچەرخاند، لەپاشدا من لەدەرگای مزگەوتەوە دەرکەوتم، پۆشاکێکی سەوزم لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم کە منی دی فەرمووی: کێ بوو پرسیاری دەربارەی (**مَنْ قَضَى نَحْبَهُ**) پرسیاری لێ کردم؟ عەرەبە دەشتەکیەکە وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: (ئەمە واتە (طَلْحَةَ) یەکێکە لەوانە بەر ئەم ئایەتە دەکەوێ).

## دەربارەی چاکە و پایەی زوبێری کوڕی عەوام رەزای خوای لێ بێ

## ٢٣ - بَابُ مَنَاقِبِ الزُّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٧٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنِ الزُّبَيْرِ، قَالَ: جَمَعَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَوَيْهِ يَوْمَ قُرَيْظَةَ فَقَالَ: بِأَبِي وَأُمِّي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زوبێرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری

خوا صلى الله علیه وسلم، لە رۆژی جەنگی (قُرَيْظَةَ)دا باوك و دایكی پێكەوە ناو بردوو، فەرمووی: (باوك و دایكم فیدات بێ).

٣٧٤٤ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ بْنُ العَوَّامِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَيُقَالُ الْ حَوَارِيُّ هُوَ النَّاصِرُ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو پێغەمبەرێ هاوڕێ و یارمەتیدەری هەبووە، هاوڕێ و یارمەتیدەری منیش زوبێری كوڕی عەوامە رەزای خوای لێ بێ).

٣٧٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الحَفَرِيُّ، وَأَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ بْنُ العَوَّامِ وَزَادَ أَبُو نُعَيْمٍ فِيهِ: يَوْمَ الأَحْزَابِ. قَالَ: مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ القَوْمِ قَالَ الزُّبَيْرُ أَنَا، قَالَهَا ثَلاَثًا. قَالَ الزُّبَيْرُ أَنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە رۆژی جەنگی (الأَحْزَاب)دا زوبێر رەزای خوای لێ بێ هەڵوێستی زۆر جوامێرانەی نواند، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەموو پێغەمبەرێ هاوڕێ و یارمەتیدەری هەبووە، هاوڕێ و یارمەتیدەری منیش زوبێری كوڕی عەوامە). ئەبو نوعەیم ئەمەی بۆ زیاد كرد: ئەمە لە رۆژی جەنگی (الأَحْزَاب)دا بوو، سێ جار فەرمووی: كێ هەواڵی دوژمنمان بۆ دێنێ؟ هەر سێ

جارەکە زوبێر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: من.

٣٧٤٦ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ صَخْرِ بْنِ جُوَيْرِيَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، قَالَ: أَوْصَى الزُّبَيْرُ، إِلَى ابْنِهِ عَبْدِ اللهِ صَبِيحَةَ الجَمَلِ، فَقَالَ: مَا مِنِّي عُضْوٌ إِلاَّ وَقَدْ جُرِحَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى انْتَهَى ذَلِكَ إِلَى فَرْجِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە ڕۆژی جەنگی (جمل)دا واتە جەنگی نێوان پێشەوا عەلی و خاتوو عائیشە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ، سەر لە بەیانیەکەی زوبێر ڕەزای خوای لێ بێ وەسیەتی کرد بۆ (عبـد الله)ی کـوڕی و فەرمووی: هەموو ئەندامەکانی جەستەم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صـلی الله علیە وسلم برینـدار کـراون تەنانـەت شەرمگەشـم، (عبـد الله)ی کـوڕی فـەرمووی: هەتا دەگاتە شەرمگەشی.

## دەربارەی چاکە و پایەی (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف ڕەزای خوای لێ بێ

## ٢٦ - بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفِ بْنِ عَبْدِ عَوْفٍ الزُّهْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٧٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَبُو بَكْرٍ فِي الجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الجَنَّةِ وَالزُّبَيْرُ فِي الجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الجَنَّةِ، وَسَعِيدٌ فِي الجَنَّةِ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ فِي الجَنَّةِ. أَخْبَرَنَا أَبُو مُصْعَبٍ قِرَاءَةً، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَلَمْ

يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا، وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوفەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و (طَلْحَةَ) و زوبێر و (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف و سەعد و سەعید و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح بەهەشتین).

٣٧٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ مِسْمَارٍ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ يَعْقُوبَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ، حَدَّثَهُ فِي نَفَرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: عَشَرَةٌ فِي الجَنَّةِ: أَبُو بَكْرٍ فِي الجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَالزُّبَيْرُ وَطَلْحَةُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ وَأَبُو عُبَيْدَةَ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ. قَالَ: فَعَدَّ هَؤُلَاءِ التِّسْعَةَ وَسَكَتَ عَنِ العَاشِرِ، فَقَالَ القَوْمُ: نَنْشُدُكَ اللَّهَ يَا أَبَا الأَعْوَرِ مَنِ العَاشِرُ؟ قَالَ: نَشَدْتُمُونِي بِاللَّهِ، أَبُو الأَعْوَرِ فِي الجَنَّةِ. أَبُو الأَعْوَرِ هُوَ: سَعِيدُ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: هُوَ أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەم دە کەسە بەهەشتین: ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و (طَلْحَةَ) و زوبێر و (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح). فەرمووی: ئەم نۆ کەسەی ئیتر بێ دەنگ بوو، خەڵکەکە وتیان: سوێندت دەدەین بە خوای گەورە ئەی ئەبو ئەعوەر دەیەم کەس کێیە؟ فەرمووی: لەبەر

سوێندەکەتان خۆمم (ئەبو ئەعوەر بەهەشتیە)، ئەبو ئەعوەر واتە: زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل.

٣٧٤٩ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ صَخْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: إِنَّ أَمْرَكُنَّ لَمِمَّا يُهِمُّنِي بَعْدِي، وَلَنْ يَصْبِرَ عَلَيْكُنَّ إِلاَّ الصَّابِرُونَ. قَالَ: ثُمَّ تَقُولُ عَائِشَةُ، فَسَقَى اللهُ أَبَاكَ مِنْ سَلْسَبِيلِ الجَنَّةِ، تُرِيدُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَقَدْ كَانَ وَصَلَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَالٍ، يُقَالُ: بِيعَتْ بِأَرْبَعِينَ أَلْفًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەدوای مردنی خۆم گوزەران و کاروباری ئێوە زۆر بەلامەوە گرنگە، چونکە جگە لە ئارامگران کەس توانای ئارامگرتنی نیە). ئەبو سەلەمە کوڕی (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف فەرمووی: لەپاشدا عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: خوای گەورە لە کارێزی سەسەبیلی بەهەشت باوکت تێراو بکات، مەبەستی عائیشە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف بوو، کە هەمیشە بە ماڵ و سامان هاوسەرکانی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بەسەر دەکردەوە، دەوترێ: جاری وا هەبوو چل هەزاری بۆ دەناردن.

٣٧٥٠ - (حسن الإسناد صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عُثْمَانَ البَصْرِيُّ، وَإِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ حَبِيبٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا قُرَيْشُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، أَوْصَى بِحَدِيقَةٍ لأُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ بِيعَتْ بِأَرْبَعِ مِائَةِ أَلْفٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبی سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف باخێکی کردبوو بە وەقف بۆ دایکانی باوەڕداران واتە:

هاوسـەرکانی پێغەمبـەری خـوای صـلی الله علیـه وسـلم، جـاری وا هـەبوو لەدەستکەوتی ئەو باخە چوار سەد هەزاری بۆ دەناردن.

## دەربارەی چاکە و پایەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص رەزای خوای لیّ بیّ

## ٢٧ - بَابُ مَنَاقِبِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَاسْمُ أَبِي وَقَّاصٍ: مَالِكُ بْنُ وَهِيبٍ

٣٧٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا رَجَاءُ بْنُ مُحَمَّدٍ العُذْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَعْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ اسْتَجِبْ لِسَعْدٍ إِذَا دَعَاكَ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ اسْتَجِبْ لِسَعْدٍ إِذَا دَعَاكَ وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە سەعدەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خودایە نزاو پاڕانەوەی سەعد گیرا بکـە، هـەر کـاتیّ لیّت پاڕایەوە).

٣٧٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَأَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: أَقْبَلَ سَعْدٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَذَا خَالِي فَلْيُرِنِي امْرُؤٌ خَالَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُجَالِدٍ. وَكَانَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ مِنْ بَنِي زُهْرَةَ، وَكَانَتْ أُمُّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَنِي زُهْرَةَ فَلِذَلِكَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا خَالِي.

واتـە: لـە جـابیری کـوڕی (عبـد الله)وە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە

فەرموویەتی: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ڕەزای خوای لیّ بیّ هات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەمە خاڵی منە، با خەڵکیش خاڵی خۆیانم نیشان بدەن).

٣٧٥٣ - (منكر بذكر الغلام الحزور) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَزَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، وَيَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، سَمِعَا سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، يَقُولُ: قَالَ عَلِيٌّ: مَا جَمَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَاهُ وَأُمَّهُ لأَحَدٍ إِلاَّ لِسَعْدٍ، قَالَ لَهُ يَوْمَ أُحُدٍ: ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، وَقَالَ لَهُ: ارْمِ أَيُّهَا الغُلاَمُ الحَزَوَّرُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ سَعْدٍ. ناقصوَفِي الْبَابِ عَنْ سَعْدٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باوك و دایکی پێکەوە بە قوربانی کەسی تر نەکردوون جگە لە سەعد، لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا پێی فەرموو: (ئەی سەعد تیر بتەقێنە، تیربارانیان بکە باوك و دایکم بە قوربانت بن). هەروەها پێی فەرموو: (تیربارانیان بکە ئەی ڕۆڵەی نەبەردی چاو نەترس).

٣٧٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، وَعَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، قَالَ: جَمَعَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَوَيْهِ يَوْمَ أُحُدٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادِ بْنِ الهَادِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باوك و دایکی پێکەوە دەکردن بە قوربانم.

٣٧٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: مَا سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُفَدِّي أَحَدًا بِأَبَوَيْهِ إِلاَّ لِسَعْدٍ، فَإِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ أُحُدٍ: ارْمِ سَعْدُ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: نەمبیستووە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باوك و دایکی پێکەوە بە قوربانی کەسی تر نەکرددون جگە لە سەعد، لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەی سەعد تیر بتەقێنە، تیربارانیان بکە باوك و دایکم بە قوربانت بن).

٣٧٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سَهِرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقْدَمَهُ الْمَدِينَةَ لَيْلَةً. قَالَ: لَيْتَ رَجُلاً صَالِحًا يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ. قَالَتْ: فَبَيْنَمَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعْنَا خَشْخَشَةَ السِّلاَحِ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا جَاءَ بِكَ؟ فَقَالَ سَعْدٌ: وَقَعَ فِي نَفْسِي خَوْفٌ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجِئْتُ أَحْرُسُهُ، فَدَعَا لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ نَامَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە سەرەتای گەیشتنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ مەدینە شەوێ خەوی لێ زڕا، فەرمووی: (خۆزگا ئەمشەو پیاوێکی صالّح و چاك پاسەوانی بکردمایە)، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئێمە لەو مشت و مڕەدا بووین گوێمان لە خشەی چەك بوو، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتی: منم، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص،

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بۆچی هاتوویت؟) وتی: ترسێ کەوتە دڵمەوە وتم نەوەکا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تووشی شتێ ببێ بۆیە هاتووم پاسەوانی بکەم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆی پاڕایەوە، لەپاشدا خەوت.

## دەربارەی چاکە و پایەی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ڕەزای خوای لێ بێ

## ٢٨ – بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي الأَعْوَرِ، وَاسْمُهُ سَعِيدُ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٧٥٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ ظَالِمٍ الْمَازِنِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ، أَنَّهُ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى التِّسْعَةِ أَنَّهُمْ فِي الجَنَّةِ، وَلَوْ شَهِدْتُ عَلَى العَاشِرِ لَمْ آثَمْ. قِيلَ: وَكَيْفَ ذَاكَ؟ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحِرَاءَ، فَقَالَ: اثْبُتْ حِرَاءُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ. قِيلَ: وَمَنْ هُمْ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، وَعَلِيٌّ، وَطَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ، وَسَعْدٌ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ. قِيلَ فَمَنِ العَاشِرُ؟ قَالَ: أَنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي شُعْبَةُ، عَنِ الحُرِّ بْنِ الصَّيَّاحِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَخْنَسِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: شایەتی دەدەم ئەم نۆ کەسە بەهەشتین، خۆ ئەگەر شایەتی بدەم بۆ دەیەمیش گوناهبار نابم، وتیان: چۆن چۆنی؟ فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئێمە لەسەر کێوی حیرا بووین، کێوەکە کەوتە لەرزە، فەرمووی: (دامەزرێ ئەوانەی بەسەرتەوەن لەم سیانە بەدەر نین: پێغەمبەر یان راستگۆ و راساڵە، یا شەهیدە لەپێناوی خوا دەکوژرێت)، وترا: ئەوانە کێ بوون بەسەر کێوەکەوە؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و (طَلْحَـةَ) و زوبێر و سەعد و (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف بوون، وترا: ئەی دەیەم کەس کێ بوو؟ فەرمووی: من بووم.

## دەربارەی چاکە و پایەی عەباسی مامی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٢٩ - بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي الْفَضْلِ عَمِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٧٥٨ - (ضعيف الا قوله: (عم الرجل) فصحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الْمُطَّلِبِ بْنُ رَبِيعَةَ بْنِ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَنَّ العَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُغْضَبًا وَأَنَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: مَا أَغْضَبَكَ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا لَنَا وَلِقُرَيْشٍ، إِذَا تَلاَقَوْا بَيْنَهُمْ تَلاَقَوْا بِوُجُوهٍ مُبْشَرَةٍ، وَإِذَا لَقُونَا لَقُونَا بِغَيْرِ ذَلِكَ، قَالَ: فَغَضِبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَدْخُلُ قَلْبَ رَجُلٍ الإِيمَانُ حَتَّى يُحِبَّكُمْ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ آذَى عَمِّي فَقَدْ آذَانِي فَإِنَّمَا عَمُّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد المطلب)ی کوڕی رەبیعەی کوڕی (حارث)ی کوڕی (عبد

المطلب)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووم، عەباسی کوڕی (عبد المطلب) رەزای خوای لێ بێ بە تووڕییەوە هاتە خزمەتی، فەرمووی: (بۆچی تووڕە بوویت؟) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، قورەیش بە رووی خۆش و شەوق و زەوقەوە دەگەن بەیەك، کەچی کە دەگەن بە ئێمە بە شێوەیەکی ترن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تووڕە بوو رووی سور هەڵگەڕا، لەپاشدا فەرمووی: (سوێند بە (الله) کە گیانی منی بە دەستە ئیمان و باوەڕ ناچێتە دڵی کەسێکەوە هەتا لەبەر خواو لەبەر پێغەمبەرەکەی ئێوەی خۆش نەوێ). ئینجا فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! ئەوەی ئازاری مامم دەدا ئەوە ئازاری من دەدات، چونکە بێگومان مامەی پیاو لەجێی باوکیەتی).

٣٦٥٨ (م) - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَيُّ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللهِ؟ قَالَتْ: أَبُو بَكْرٍ، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَتْ: عُمَرُ، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَتْ: ثُمَّ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: فَسَكَتَتْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شەقیقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە عائیشەم رەزای خوای لێ بێ وت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ هاوەڵێکی لە هەموو کەس زیاتری خۆشدەویست؟ فەرمووی: پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ، وتم: لەپاشدا کێی تر؟ فەرمووی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ، وتم: لەپاشدا کێی تر؟ فەرمووی: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح رەزای خوای لێ بێ، وتم: لەپاشدا کێی تر؟ عائیشە بێدەنگ بوو.

٣٧٥٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ زَكَرِيَّا الْكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: العَبَّاسُ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (عەباس پارچەیەکە لە منو منیش پارچەیەکم لە عەباس).

٣٧٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نِعْمَ الرَّجُلُ أَبُو بَكْرٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ عُمَرُ، نِعْمَ الرَّجُلُ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باشترین پیاو پێشەوا ئەبو بەکرە، باشترین پیاو پێشەوا عومەرە، باشترین پیاو ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحە).

٣٧٦٠ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ الأَعْمَشَ يُحَدِّثُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي البَخْتَرِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعُمَرَ فِي العَبَّاسِ: إِنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ، وَكَانَ عُمَرُ كَلَّمَهُ فِي صَدَقَتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عومەر دەربارەی زەکاتەکەی عەباس قسەی کرد، پێغەمبەری خوا صلی

الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بێگومان مامەی پیاو لەجێی باوکیەتی).

٣٧٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدَّوْرَقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: العَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللهِ، وَإِنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ، أَوْ مِنْ صِنْوِ أَبِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الزِّنَادِ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (عەباس مامی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، بێگومان مامەی پیاو لەجێی باوکیەتی).

٣٧٦٢ - (حسن) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ بْنُ عَطَاءٍ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْعَبَّاسِ: إِذَا كَانَ غَدَاةَ الاِثْنَيْنِ فَأْتِنِي أَنْتَ وَوَلَدُكَ حَتَّى أَدْعُوَ لَهُمْ بِدَعْوَةٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهَا وَوَلَدَكَ، فَغَدَا وَغَدَوْنَا مَعَهُ فَأَلْبَسَنَا كِسَاءً ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْعَبَّاسِ وَوَلَدِهِ مَغْفِرَةً ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً لاَ تُغَادِرُ ذَنْبًا، اللَّهُمَّ احْفَظْهُ فِي وَلَدِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە عەباسی فەرمووی: (سەر لەبەیانی رۆژی دوو شەممە خۆت و منداڵەکانت وەرن بۆ لام، هەتا دوعایەکتان بۆ بکەم خوای گەورە بیکاتە مایەی خێر و چاکە بۆ خۆت و بۆ منداڵەمانت). جا سەر لەبەیانی لەتەك باوکم چووینە خزمەتی، پۆشاکێکی بە خەڵات داینێ یان بە عەبایە

دابپۆشین، فەرمووی: (خودایە لە عەباس و لە منداڵەكانی خۆشبە بە لێخۆشبوونێكی وەها گوناهی ئاشكراو نهێنیان پاك بكاتەوە و هیچ گوناهێكیان نەمێنێ، خودایە ئاگات لە منداڵەكانی بێت).

## دەربارەی چاكە و پایەی جەعفەری كوڕی ئەبی (طالب) رەزای خوای لێ بێ

## ٣٠ - بَابُ مَنَاقِبِ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَخِي عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٧٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَأَيْتُ جَعْفَرًا يَطِيرُ فِي الجَنَّةِ مَعَ الْمَلاَئِكَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ، وَقَدْ ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ وَغَيْرُهُ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ هُوَ وَالِدُ عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەبەهەشتدا جەعفەرم دی لەتەك مەلائیكەدا دەفڕی).

٣٧٦٤ - (صحيح الإسناد موقوفا) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: مَا احْتَذَى النِّعَالَ وَلاَ انْتَعَلَ وَلاَ رَكِبَ الْمَطَايَا وَلاَ رَكِبَ الْكُورَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفْضَلُ مِنْ جَعْفَرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

لەپاش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باشترین کەسێ پێڵاوی لەپێ کردبێ و سواری ولاخ و کۆپان زین بووبێ جەعفەری کوڕی ئەبی (طالب)ە رەزای خوای لێ بێ.

٣٧٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِجَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَشْبَهْتَ خَلْقِي وَخُلُقِي وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه بە جەعفەری کوڕی ئەبی (طالب)ی فەرموو: (شکڵ و شێوە و رەفتاری جوانت لەخۆم دەچێ).

٣٧٦٦ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ أَبُو يَحْيَى التَّيْمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ أَبُو إِسْحَاقَ الْمَخْزُومِيُّ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: إِنْ كُنْتُ لأَسْأَلُ الرَّجُلَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الآيَاتِ مِنَ القُرْآنِ أَنَا أَعْلَمُ بِهَا مِنْهُ، مَا أَسْأَلُهُ إِلاَّ لِيُطْعِمَنِي شَيْئًا، فَكُنْتُ إِذَا سَأَلْتُ جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ لَمْ يُجِبْنِي حَتَّى يَذْهَبَ بِي إِلَى مَنْزِلِهِ فَيَقُولُ لاِمْرَأَتِهِ: يَا أَسْمَاءُ أَطْعِمِينَا، فَإِذَا أَطْعَمَتْنَا أَجَابَنِي، وَكَانَ جَعْفَرٌ يُحِبُّ الْمَسَاكِينَ وَيَجْلِسُ إِلَيْهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ وَيُحَدِّثُونَهُ، فَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَكْنِيهِ بِأَبِي الْمَسَاكِينِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو إِسْحَاقَ الْمَخْزُومِيُّ هُوَ: إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْفَضْلِ الْمَدِينِيُّ، وَقَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئایەتەکانی قورئان لە یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم

دەپرسی لەكاتێكدا خۆم لەو باشتر شارەزا بووم، بەس لەبەر ئەوە لێم دەپرسی شتێكم بداتیّ بیخۆم و تێرم بكات، جا كاتیّ پرسیارم دەكرد لە جەعفەری كوڕی ئەبی (طالب)، وەڵامی نەدەدامەوە هەتا دەیبردمەوە بۆ ماڵی خۆیان، بە ژنەكەی دەفەرموو: ئەی ئەسما خواردنمان بدەریّ، جا ئەویش خواردنی دەدایێ ئەو كاتەوەڵامی پرسیارەكەی دەدامەوە، جەعفەر هەژارانی خۆشدەویست لەگەڵیان دادەنیشت و گفتوگۆی لەتەك دەكردن و ئەوانیش گفتوگۆیان لەتەك دەكرد.
پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوی نابوو: باوكی هەژاران.

٣٧٦٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدُ حَاتِمُ بْنُ سِيَاهٍ الْمَرْوَزِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ عَنْ يَزِيدَ بْنِ قُسَيْطٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ كُنَّا نَدْعُو جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَبَا الْمَسَاكِينِ، فَكُنَّا إِذَا أَتَيْنَاهُ قَرَّبْنَا إِلَيْهِ مَا حَضَرَ فَأَتَيْنَاهُ يَوْمًا فَلَمْ يَجِدْ عِنْدَهُ شَيْئًا فَأَخْرَجَ جَرَّةً مِنْ عَسَلٍ فَكَسَرَهَا فَجَعَلْنَا نَلْعَقُ مِنْهَا. قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئێمە جەعفەری كوڕی ئەبی (طالب)مان ڕەزای خوای لیّ بیّ بە باوكی هەژاران بانگ دەكرد، جاریّ ڕۆشتین بۆ خزمەتی هیچ نەبوو بیخۆین، گۆزەی هەنگوینەكەی هێنا شكاندی ئێمەش دەمانلستەوە و دەمانخوارد.

إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَبِيكَ، وَكَانَ أُسَامَةُ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللهِ مِنْكَ، فَآثَرْتُ حُبَّ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى حُبِّي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە سێ هەزار و پێنج سەدی مووچە بڕییەوە بۆ ئوسامەی كوڕی زەید، سێ هەزاری مووچە بڕییەوە بۆ (عبد الله)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ، (عبد الله)ی كوڕی عومەر بە باوكی وت: بۆچی فەزڵی ئوسامە دەدەی بەسەر مندا سوێند بە (الله) لە هیچ (مشهد)دیمەنێكی نواندندا پێش من نەكەوتووە، فەرمووی: چونكە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زەیدی باوكی ئەوی لە باوكت زیاتر خۆشەویست و ئوسامەشی لە تۆ زیاتر خۆشەویست، خۆشەویستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەدەم بەسەر خۆشەویستی خۆمدا.

٣٨١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: مَا كُنَّا نَدْعُو زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ إِلاَّ زَيْدَ ابْنَ مُحَمَّدٍ حَتَّى نَزَلَتْ (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سالیمی كوڕی (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئێمە هەرگیز بە زەیدی كوڕی (حارثة) بانگمان نەدەكرد بەڵكو هەر بە زەیدی كوڕی موحەممەد بانگمان دەكرد هەتا قورئان دابەزی: **(ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ)**. سورة الاحزاب: ٥. واتە: بە ناوی باوكیانەوە بانگیان بكەن، چونكە لای خوا هەر ئەوە پەسەندو دادگەرانەیە.

٣٨١٥ - (حسن) حَدَّثَنَا الْجَرَّاحُ بْنُ مَخْلَدٍ الْبَصْرِيُّ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمَرَ بْنِ الرُّومِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ أَبِي

عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي جَبَلَةُ بْنُ حَارِثَةَ، أَخُو زَيْدٍ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ابْعَثْ مَعِي أَخِي زَيْدًا قَالَ: هُوَ ذَا، فَإِنْ انْطَلَقَ مَعَكَ لَمْ أَمْنَعْهُ. قَالَ زَيْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَاللَّهِ لاَ أَخْتَارُ عَلَيْكَ أَحَدًا، قَالَ: فَرَأَيْتُ رَأْيَ أَخِي أَفْضَلَ مِنْ رَأْيِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ الرُّومِيِّ عَنْ عَلِيِّ بْنِ مُسْهِرٍ.

واتە: لە (جبلة)ە کوڕی (حارثة)وە، برای زەید دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، زەیدی برای منە بمدەرەوە، فەرمووی: (ئەوە خۆیەتی مـن ڕێگەی لێ ناگرم ئەگەر لەگەڵت دێتەوە). زەید فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سوێند بە (الله) مـن لای تۆ بە هیچ شوێنێکی تر ناگۆڕمەوە، وتی: لەپاشدا بۆم دەرکەوت ڕای زەیدی برام باشتر بوو لە ڕای من.

٣٨١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ بَعْثًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ فَطَعَنَ النَّاسُ فِي إِمْرَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ تَطْعَنُوا فِي إِمْرَتِهِ فَقَدْ كُنْتُمْ تَطْعَنُونَ فِي إِمْرَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلُ، وَايْمُ اللهِ إِنْ كَانَ لَخَلِيقًا لِلإِمَارَةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذَا مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشکرێکی نارد بۆ غەزا بە سەرکردایەتی

ئوسامەی کوڕی زەید، خەڵك تانەیان دا لە فەرمانداری ئوسامە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: پێشتریش تانەتان دا لە فەرمانداری باوکی، سوێند بە (الله) زەید شایستەی فەرمانداری بوو، خۆشەویسترین کەس بوو بەلامەوە، لەپاش ئەویش ئوسامەی کوڕی خۆشەویسترین کەسە بەلامەوە.

## دەربارەی چاکە و پایەی ئوسامەی کوڕی زەید

## ٤١ - بَابُ مَنَاقِبِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨١٧ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ السَّبَّاقِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَبَطْتُ وَهَبَطَ النَّاسُ الْمَدِينَةَ، فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ أَصْمَتَ فَلَمْ يَتَكَلَّمْ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَضَعُ يَدَيْهِ عَلَيَّ وَيَرْفَعُهُمَا فَأَعْرِفُ أَنَّهُ يَدْعُو لِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: نەخۆشینەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرە بەرە تاوی سەندو گران بوو، خەڵکی چواردەوری مەدینە دەچوون بۆ خزمەتی، منیش چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کە چووم قسەی بۆ نەدەکرا، دەستەکانی لەسەر جەستەی من دادەناو هەڵی دەبڕین بۆ ئاسمان، ئیتر زانیم دوعای خێرم بۆ دەکات.

٣٨١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: أَرَادَ النَّبِيُّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُنَحِّيَ مُخَاطَ أُسَامَةَ. قَالَتْ عَائِشَةُ: دَعْنِي حَتَّى أَكُونَ أَنَا الَّذِي أَفْعَلُ قَالَ: يَا عَائِشَةُ أَحِبِّيهِ فَإِنِّي أُحِبُّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ویستی چڵمی ئوسامە بسڕێ، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ڕێگەم بدە با من لوتی بسـڕم، فـەرمووی: (ئـەی عائیشـە، ئوسامەت خۆش بوێت، چونکە من زۆرم خۆش دەوێت).

٣٨١٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الْحَسَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا إِذْ جَاءَ عَلِيٌّ وَالْعَبَّاسُ يَسْتَأْذِنَانِ، فَقَالاَ: يَا أُسَامَةُ اسْتَأْذِنْ لَنَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلِيٌّ وَالعَبَّاسُ يَسْتَأْذِنَانِ، فَقَالَ: أَتَدْرِي، مَا جَاءَ بِهِمَا؟ قُلْتُ: لاَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَكِنِّي أَدْرِي، فَأَذِنَ لَهُمَا، فَدَخَلاَ، فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللهِ جِئْنَاكَ نَسْأَلُكَ أَيُّ أَهْلِكَ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: فَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ، فَقَالاَ: مَا جِئْنَاكَ نَسْأَلُكَ عَنْ أَهْلِكَ. قَالَ: أَحَبُّ أَهْلِي إِلَيَّ مَنْ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتُ عَلَيْهِ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ. قَالاَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ. قَالَ العَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ جَعَلْتَ عَمَّكَ آخِرَهُمْ؟ قَالَ: لأَنَّ عَلِيًّا قَدْ سَبَقَكَ بِالهِجْرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَكَانَ شُعْبَةُ يُضَعِّفُ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ.

واتــە: لــە ئوســامەی کــوڕی زەیــدەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: بۆ خۆم دانیشتبووم، پێشەوا عەلی و عـەباس ڕەزای خوایـان لـێ بـێ هاتن وتیان: ئەی ئوسامە داوای مۆڵەتی چوونەژورەوەمان لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ بکە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم، پێشـەوا

عەلی و عەباس دەیانەوێ بێنە خزمەتت، فەرمووی: (ئەزانی بۆچی هاتوون؟) وتم: نەخێر، فەرمووی: (من ئەزانم)، ڕێگەی پێدان، چوونەژوورەوە وتیان: هاتووین پرسیارت لێ بکەین کێت زیاتر خۆش دەوێ لە کەسوکارت؟ فەرمووی: ((فاطیمة)ی کچی موحەممەد)، وتیان: مەبەستمان کەسە نزیکەکانی خۆت نیە، فەرمووی: خۆشەویسترین کەس لەلام ئوسامەی کوڕی زەیدە کە خوا چاکەی لەگەڵ کردووە و خۆشم چاکەم لەگەڵ کردووە، وتیان: ئەی لەدوای ئەو؟ فەرمووی: (لەپاشدا عەلی کوڕی (طالب)، عەباس فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مامەتت خستە دواوە، فەرمووی: (عەلی لەپێش تۆوە کۆچی کردووە بۆ مەدینە).

## چاکە و پایەی جەریری کوڕی (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ

## ٤٢ - بَابُ مَنَاقِبِ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْبَجَلِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو الأَزْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ بَيَانٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنْذُ أَسْلَمْتُ وَلاَ رَآنِي إِلاَّ ضَحِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جەریری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەوەتی موسوڵمان بووم، هەرکاتێ دەچووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکسەر ڕێگەی دەدام و دەچوومە خزمەتی، هەرکاتێ چاوی پێم دەکەوت پێ دەکەنی.

٣٨٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ جَرِيرٍ، قَالَ مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنْذُ أَسْلَمْتُ وَلاَ رَآنِي إِلاَّ تَبَسَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جەریرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەوەتی موسوڵمان بووم، هەرکاتێ دەچووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکسەر ڕێگەی دەدام و دەچوومە خزمەتی، هەرکاتێ چاوی پێم دەکەوت زەردەخەنەی دەکرد.

## چاکە و پایەی (عبد الله)ی کوڕی عەباس رەزای خوایان لێ بێ

## ٤٣ - بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا

٣٨٢٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ أَبِي جَهْضَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ مَرَّتَيْنِ، وَدَعَا لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ مُرْسَلٌ، وَأَبُو جَهْضَمٍ لَمْ يُدْرِكِ ابْنَ عَبَّاسٍ وَاسْمُهُ مُوسَى بْنُ سَالِمٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دووجار جیبریلی دیوە و، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دووجار بۆی پاڕاوەتەوە.

٣٨٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَاتِمٍ الْمُؤَدِّبُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ بْنُ مَالِكٍ الْمُزَنِيُّ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: دَعَا لِي

رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُؤْتِيَنِي اللَّهُ الْحِكْمَةَ مَرَّتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ عَطَاءٍ. وَقَدْ رَوَاهُ عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دووجار لە خوا بۆم پاڕاوەتەوە حیکمەت و دانایيم پێ ببەخشێ.

٣٨٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: ضَمَّنِي إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم گوشیمی بە خۆیەوە و فەرمووی: (خودایە فێری حیکمەت و دانایی بکە).

## چاکە و پایەی (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ

## ٤٤ - بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا

٣٨٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّمَا بِيَدِي قِطْعَةُ إِسْتَبْرَقٍ وَلاَ أُشِيرُ بِهَا إِلَى مَوْضِعٍ مِنَ الْجَنَّةِ إِلاَّ طَارَتْ بِي إِلَيْهِ فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنَّ أَخَاكِ رَجُلٌ صَالِحٌ، أَوْ: إِنَّ عَبْدَ اللهِ رَجُلٌ صَالِحٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە

خەودا دیم وەك پارچەیە ئاوریشمی ئەستوور و رەقم بەدەستەوەبێ وابوو، بەرەو هەرجێگەیە لە بەهەشت ئاراستەم دەکرد دەیبردم بۆ ئەوێ ، خەوەکەم گێڕایەوە بۆ حەفصەی خوشکم، ئەویش دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (بێگومان براکەت پیاوی چاکە).

## چاکە و پایەی (عبد الله)ی کوڕی زوبێر رەزای خوای لێ بێ

## ٤٥ - بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٢٦ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِسْحَاقَ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُؤَمَّلِ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى فِي بَيْتِ الزُّبَيْرِ مِصْبَاحًا، فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ مَا أُرَى أَسْمَاءَ إِلاَّ قَدْ نُفِسَتْ فَلاَ تُسَمُّوهُ حَتَّى أُسَمِّيَهُ. فَسَمَّاهُ عَبْدَ اللهِ وَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەماڵی زوبێر چرایەکی دی، فەرمووی: (ئەی عائیشە، پێم وایە ئەسمای خوشکت منداڵی بووە، با ناوی لێ نەنێ خۆم ناوی دەنێم، ناوی نا (عبد الله)، خورمای خستە ناو دەمی خۆی و هێنای بەناو دەم و مەلاشووی (عبد الله)دا).

## چاكە و پایەی ئەنەسی كوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ

## ٤٦ - بَابُ مَنَاقِبِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنِ الجَعْدِ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمِعَتْ أُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ صَوْتَهُ، فَقَالَتْ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللهِ، أُنَيْسٌ. قَالَ: فَدَعَا لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثَ دَعَوَاتٍ، قَدْ رَأَيْتُ مِنْهُنَّ اثْنَتَيْنِ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَرْجُو الثَّالِثَةَ فِي الآخِرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تێپەڕی دایكم گوێی لەدەنگی بوو، فەرمووی: (دایك و باوكم فیدات بێ ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەمە ئونەیسە دوعای بۆ بكە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، سێ دوعای بۆ كردم، دوانیانم هەر لەدونیادا بە چاوی خۆم دیی هاتنەدی، ئومێد دەكەم سێیەمیشیان لە قیامەتدا بێتەدی.

٣٨٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: رُبَّمَا قَالَ لِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا ذَا الأُذُنَيْنِ. قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: يَعْنِي يُمَازِحُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هەندێ جار پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گاڵتەی لەگەڵ دەكردم و دەیفەرموو: (ئەی خاوەنی دوو گوێچكە).

٣٨٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَنَسٌ خَادِمُكَ ادْعُ اللهَ لَهُ. قَالَ: اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئومو سولەیمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەنەس خزمەتكاری تۆیە بۆی بپاڕێرەوە، فەرمووی: خودایە ماڵ و منداڵی زۆری پێ ببەخشە، بەرەكەت بخەرە ماڵ و منداڵیەوە).

٣٨٣٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ الطَّائِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ أَبِي نَصْرٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَنَّانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَقْلَةٍ كُنْتُ أَجْتَنِيهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ جَابِرٍ الْجُعْفِيِّ عَنْ أَبِي نَصْرٍ. وَأَبُو نَصْرٍ هُوَ: خَيْثَمَةُ بْنُ أَبِي خَيْثَمَةَ الْبَصْرِيُّ رَوَى عَنْ أَنَسٍ أَحَادِيثَ.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت: روەكێكم بەخێو دەركردوو بەرەكەیم دەچنی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ناوی ئەو رۆەكەوە نازناوی بۆ دانام.

٣٨٣١ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَيْمُونٌ أَبُو عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، قَالَ: قَالَ لِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، يَا ثَابِتُ خُذْ عَنِّي فَإِنَّكَ لَنْ تَأْخُذَ عَنْ أَحَدٍ أَوْثَقَ مِنِّي، إِنِّي أَخَذْتُهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَخَذَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ جِبْرِيلَ، وَأَخَذَهُ جِبْرِيلُ عَنِ اللهِ تَعَالَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ زَيْدِ بْنِ حُبَابٍ.

واتە: لە (ثابت)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ پێی فەرمووم: ئەی (ثابت) زانستی شەرعی و دین لە من وەربگرە چونکە کەسێکی ترت دەست ناکەوێ وەك من جێگەی باوەڕ بێ، من زانستی شەرعی و دینم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەرگرتووە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە جبریلی وەرگرتووە، جبریلیش لە خوای گەورەی وەرگرتووە.

٣٨٣٢ - حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ مَيْمُونٍ أَبِي عَبْدِ اللهِ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، نَحْوَ حَدِيثِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ يَعْقُوبَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ وَأَخَذَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ جِبْرِيلَ.

وەك فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتووە، بەس باسی ئەوەی تێدا نەکرد کە (پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە جبریلی وەرگرتووە).

٣٨٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ أَبِي خَلْدَةَ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي العَالِيَةِ، سَمِعَ أَنَسٌ، مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَدَمَهُ عَشْرَ سِنِينَ وَدَعَا لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ لَهُ بُسْتَانٌ يَحْمِلُ فِي السَّنَةِ الفَاكِهَةَ مَرَّتَيْنِ، وَكَانَ فِيهَا رَيْحَانٌ يَجِدُ مِنْهُ رِيحَ الْمِسْكِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو خَلْدَةَ اسْمُهُ خَالِدُ بْنُ دِينَارٍ وَهُوَ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ. وَقَدْ أَدْرَكَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ وَرَوَى عَنْهُ.

واتە: ئەنەس رەزای خوای لێ بێ دە ساڵ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆی پاڕایەوە، باخێکی هەبوو ساڵی دووجار بەری دەگرت، رێحانەیەکی تێدا بوو بۆنی میسکی دەدا.

## چاکە و پایەی ئەبو هورەیر ڕەزای خوای لێ بێ

## ٤٧ - بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٣٤ - (حسن الإسناد صحيحة) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمَرَ بْنِ عَلِيٍّ الْمُقَدَّمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ أَبِي الرَّبِيعِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَسَطْتُ ثَوْبِي عِنْدَهُ، ثُمَّ أَخَذَهُ فَجَمَعَهُ عَلَى قَلْبِي، فَمَا نَسِيتُ بَعْدَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پۆشاکەکەم ڕاخست لەلای فەرمایشتەکانم لێ وەرگرت، لەپاشدا پۆشاکەکەم کۆکردەوە و لەسەر دڵم دامنا، لەوە بەدواوە ئیتر هیچ فەرموودەیەکی ئەوم لەبیر نەدەچووەوە.

٣٨٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَسْمَعُ مِنْكَ أَشْيَاءَ فَلاَ أَحْفَظُهَا، قَالَ: ابْسُطْ رِدَاءَكَ فَبَسَطْتُ، فَحَدَّثَ حَدِيثًا كَثِيرًا، فَمَا نَسِيتُ شَيْئًا حَدَّثَنِي بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێ شتت لێ دەبیستم بۆم لەبەر ناکرێت، فەرمووی: (پۆشاکەکەت ڕاخە) مەنیش پۆشاکەکەی خۆمم ڕاخست، فەرمایشتی زۆری بۆ باس کردین، لەوە بەدواوە ئیتر هیچ فەرموودەیەکی ئەوم لەبیر نەدەچووەوە.

٣٨٣٦ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَعْلَى بْنُ عَطَاءٍ، عَنِ الْوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ قَالَ لأَبِي هُرَيْرَةَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْتَ كُنْتَ أَلْزَمَنَا لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَحْفَظَنَا لِحَدِيثِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ بە ئەبو هورەیرەی ڕەزای خوای لێ بێ فەرموو: ئەی ئەبو هورەیرە تۆ لەهەموو کەس زیاتر لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بوویت و زیاتر فەرموودەکانیت لەبەرە.

٣٨٣٧ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي شُعَيْبٍ الْحَرَّانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، فَقَالَ يَا أَبَا مُحَمَّدٍ أَرَأَيْتَ هَذَا الْيَمَانِيَّ، يَعْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ، أَهُوَ أَعْلَمُ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْكُمْ؟ نَسْمَعُ مِنْهُ مَا لاَ نَسْمَعُ مِنْكُمْ، أَوْ يَقُولُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لَمْ يَقُلْ. قَالَ: أَمَّا أَنْ يَكُونَ سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لَمْ نَسْمَعْ عَنْهُ، وَذَاكَ أَنَّهُ كَانَ مِسْكِينًا لاَ شَيْءَ لَهُ ضَيْفًا لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَدُهُ مَعَ يَدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكُنَّا نَحْنُ أَهْلَ بُيُوتَاتٍ وَغِنًى، وَكُنَّا نَأْتِي رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَرَفَيِ النَّهَارِ، لاَ أَشُكُّ إِلاَّ أَنَّهُ سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لَمْ نَسْمَعْ، وَلاَ تَجِدُ أَحَدًا فِيهِ خَيْرٌ يَقُولُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لَمْ يَقُلْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ. وَقَدْ رَوَاهُ يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، وَغَيْرُهُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ.

واتە: لە مالیکی کوڕی ئەبی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت (طَلْحَةَ) کوڕی (عبيد الله) وتی: ئەی ئەبا موحەممەد ئەو یەمانییە

دەبینی واتە ئەبو هورەیرە، ئەو لەهەمووتان زیاتر شارەزای فەرموودەی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، ئەوەی لەو دەیبیستم لە ئێوەی نابیستم، ئەوەی ئەو دەیڵێ لەبارەی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ئێوە نایڵێن، ئەوانیش وتیان: گومانی تێدا نیە ئێمە خاوەنی ماڵ و منداڵین تەنیا ئێواران دەچووینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەلام ئەو هەژار و بێ نەوابوو هەمیشە دەستی بە دەستی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم بوو، بۆ هەركوێ دەچوو لەخزمەتیدا بوو، بۆیە ئەوەی ئەو دەیبیست ئێمە نەمان دەبیست، ئەو كەسە خێری تێدا نیە بە ناوی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم شتێ شتێ بلێ ئەو نەیفەرموو بێ.

٣٨٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ آدَمَ ابْنِ بِنْتِ أَزْهَرَ السَّمَّانِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَلْدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو العَالِيَةِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ قَالَ: قُلْتُ: مِنْ دَوْسٍ. قَالَ: مَا كُنْتُ أَرَى أَنَّ فِي دَوْسٍ أَحَدًا فِيهِ خَيْرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَأَبُو خَلْدَةَ اسْمُهُ: خَالِدُ بْنُ دِينَارٍ وَأَبُو العَالِيَةِ اسْمُهُ: رُفَيْعٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: لەچی تیرەو هۆزێكیت؟ وتم: لە تیرەی ئەوسم، فەرمووی: (لەمەوپێش وام ئەزانی كەس نیە لە تیرەی ئەوس خێری تێدا بێ، بەلام لەسایەی ئیسلامەوە ئاوا پیاوی باشی وەك تۆیان تێدایە).

٣٨٣٩ - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مُوسَى القَزَّازُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُهَاجِرُ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ الرِّيَاحِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِتَمَرَاتٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ادْعُ اللَّهَ فِيهِنَّ بِالبَرَكَةِ فَضَمَّهُنَّ ثُمَّ دَعَا لِي

فِيهِنَّ بِالبَرَكَةِ. فَقَالَ لِي: خُذْهُنَّ وَاجْعَلْهُنَّ فِي مِزْوَدِكَ هَذَا، أَوْ فِي هَذَا الْمِزْوَدِ، كُلَّمَا أَرَدْتَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا فَأَدْخِلْ يَدَكَ فِيهِ فَخُذْهُ وَلاَ تَنْثُرْهُ نَثْرًا، فَقَدْ حَمَلْتُ مِنْ ذَلِكَ التَّمْرِ كَذَا وَكَذَا مِنْ وَسْقٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَكُنَّا نَأْكُلُ مِنْهُ وَنُطْعِمُ، وَكَانَ لاَ يُفَارِقُ حِقْوِي حَتَّى كَانَ يَوْمُ قَتْلِ عُثْمَانَ فَإِنَّهُ انْقَطَعَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واته: له ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چەن دەنکە خورمایەکم برد بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتم: داوا بکە لە خوا پیت و بەرەکەتیان تێ بخات و زیاد بکەن، ئەویش کۆیکردنەوە، لەپاشدا دوعای بەرەکەتی بەسەردا خوێندن، پێی فەرمووم: (بیانکەرەوە ناو ئەم تۆشەبەرەی خۆتەوە هەرکاتێ ویستت هەندێکی لێ دەرکەی دەستی پێدا بکە و هەندێ دەربکە، بەڵام هەڵیان مەبژێرەو خاڵی مەکە)، لەو تۆزە خورمایە ئەوەندە و ئەوەندە ربەم لێ بەخشیوە لەڕێی خوا، خواردنی خۆشمانی لەسەر بوو، هەتا ڕۆژی شەهید کردنی پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ ئەو تۆشەبەرە هەر لە پشتما بوو، ئیتر پێچرایەوە و پیت و بەرەکەتی نەما.

٣٨٤٠ - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ الْمُرَابِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَافِعٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي هُرَيْرَةَ، لِمَ كُنِّيتَ أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ أَمَا تَفْرَقُ مِنِّي؟ قُلْتُ: بَلَى وَاللَّهِ إِنِّي لأَهَابُكَ. قَالَ: كُنْتُ أَرْعَى غَنَمَ أَهْلِي، فَكَانَتْ لِي هُرَيْرَةٌ صَغِيرَةٌ فَكُنْتُ أَضَعُهَا بِاللَّيْلِ فِي شَجَرَةٍ، فَإِذَا كَانَ النَّهَارُ ذَهَبْتُ بِهَا مَعِي فَلَعِبْتُ بِهَا فَكَنَّوْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واته: لە (عبد الله)ی ڕافیعەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە ئەبو هورەیرەم ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆچی نازناوی ئەبو هورەیرەت لێ نراوە، فەرمووی: ئەوە بۆ لێم دوورناکەویتەوە، من شوانی مەڕەکانی خۆمان بووم، پیشیلەیەکی

بچوکم هەبوو بەشەو لەناو درەختێکدا دام دەنا، بەرۆژ هەڵم دەگرت و لەگەڵ خۆم دەمبرد یاریم پێ دەکرد، بۆیە ئەو نازناوەیان لێ نام.

٣٨٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَخِيهِ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: لَيْسَ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنِّي إِلاَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَكُنْتُ لاَ أَكْتُبُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جگـە لە (عبد الله)ی کوڕی عەمر رەزای خوایان لێ بـێ کـەس لـەمن زیـاتر فـەرموودەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم لەبەر نەبوو، ئەویش لەبەرئەوە بوو کە ئـەو فەرموودەکانی دەنووسی، بەڵام من نەمدەنووسین.

## چاکە و پایەی موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان رەزای خوای لێ بێ

### ٤٨ - بَابُ مَنَاقِبِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

٣٨٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قال: حَدَّثَنَا أَبُو مُسْهِرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عُمَيْرَةَ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ لِمُعَاوِيَةَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا وَاهْدِ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبی عومەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە موعاویەی فەرموو: (خوایـە بیکـە بـە رێنمایی کار و رێنمایی کراو، هەروەها بیکە بەهۆی هیدایەت و رێنموونی).

٣٨٤٣ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ النُّفَيْلِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ وَاقِدٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ حَلْبَسٍ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيِّ، قَالَ: لَمَّا عَزَلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ عُمَيْرَ بْنَ سَعْدٍ عَنْ حِمْصَ وَلَّى مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ النَّاسُ: عَزَلَ عُمَيْرًا وَوَلَّى مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ عُمَيْرٌ: لاَ تَذْكُرُوا مُعَاوِيَةَ إِلاَّ بِخَيْرٍ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ اهْدِ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَعَمْرُو بْنُ وَاقِدٍ يُضَعَّفُ.

واتە: لە ئەبو ئیدریسی خەولانیەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ عومەیری کوڕی سەعدی لەسەر کار لادا، موعاویەی خستە شوێنی، خەڵك وتیان: عومەیری کوڕی سەعدی لەسەر کار لاداوە و موعاویەی خستۆتە شوێنی، عومەیر فەرمووی: باسی موعاویە مەکەن بە چاکە نەبێ، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەربارەی موعاویە دەیفەرموو: (خوایە بیکە بەهۆی هیدایەت و رێنموونی).

## چاکە و پایەی عەمری کوڕی عاص رەزای خوای لێ بێ

## ٤٩ - بَابُ مَنَاقِبِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٤٤ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ مِشْرَحِ بْنِ هَاعَانَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَسْلَمَ النَّاسُ وَآمَنَ عَمْرُو بْنُ العَاصِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ عَنْ مِشْرَحٍ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خەڵك موسوڵمان بوون و عەمری کوڕی عاص بە دڵ باوەڕی هێنا).

٣٨٤٥ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ قال: أَخْبَرَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ عُمَرَ الجُمَحِيِّ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ: قَالَ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ عَمْرَو بْنَ العَاصِ مِنْ صَالِحِي قُرَيْشٍ. هَذَا حَدِيثٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ نَافِعِ بْنِ عُمَرَ الجُمَحِيِّ. وَنَافِعٌ ثِقَةٌ وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ، ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ لَمْ يُدْرِكْ طَلْحَةَ.

واتە: لە (طَلْحَةَ)ی كوڕی (عبيد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (عەمری كوڕی عاص یەكێكە لە پیاوە چاكەكانی قورەیش).

## چاكە و پایەی خالیدی كوڕی وەلید ڕەزای خوای لێ بێ

### ٥٠ - بَابُ مَنَاقِبِ خَالِدِ بْنِ الوَلِيدِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: نَزَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْزِلاً، فَجَعَلَ النَّاسُ يَمُرُّونَ، فَيَقُولُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ هَذَا يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ فَأَقُولُ: فُلاَنٌ، فَيَقُولُ: نِعْمَ عَبْدُ اللهِ هَذَا، وَيَقُولُ: مَنْ هَذَا؟ فَأَقُولُ: فُلاَنٌ، فَيَقُولُ: بِئْسَ عَبْدُ اللهِ هَذَا، حَتَّى مَرَّ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ: هَذَا خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، فَقَالَ: نِعْمَ عَبْدُ اللهِ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَلاَ نَعْرِفُ لِزَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ سَمَاعًا مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَهُوَ عِنْدِي حَدِيثٌ مُرْسَلٌ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەسەفەرێكدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لەشوێنێ لاماندا

بۆ حەوانەوە، خەڵك تێ دەپەڕین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئەی ئەبو هورەیرە ئەمە کێیە؟) منیش ئەموت: ئەوە فلان کەسە، دەیفەرموو (ئەمە باشترین بەندەی خوایە)، یەکێکی تر تێ دەپەڕی دەیفەرموو: (ئەی ئەمە کێیە؟) ئەموت: ئەوە فلان کەسە، دەیفەرموو: (ئەمە خراپترین بەندەی خوایە)، هەتا خالیدی کوڕی وەلید تێ پەڕی، فەرمووی: (ئەی ئەمە کێیە؟) وتم: ئەوە خالیدی کوڕی وەلیدە، فەرمووی: (ئەمە باشترین بەندەی خوایە، شمشێرێکە لەشمشێرەکانی خوا).

## چاکە و پایەی سعدی کوڕی موعاز رەزای خوای لێ بێ

## ٥١ - بَابُ مَنَاقِبِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ قال: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ، قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَوْبُ حَرِيرٍ فَجَعَلُوا يَعْجَبُونَ مِنْ لِينِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەرائەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پۆشاکێکی ئاوریشمیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خەڵکەکە لە شل و نەرمیەکەی سەرسام بوون، فەرمووی: (سەرسام دەبن لە نەرمی ئەمە، دەستەسڕەکانی سعدی کوڕی موعاز لەبەهەشتدا لەمە نەرمترن).

٣٨٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ قال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قال: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قال: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: وَجَنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ: اهْتَزَّ لَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ. وَفِي البَابِ عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَرُمَيْثَةَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەکاتێکدا تەرمی سەعدی کوڕی موعاز ڕەزای خوای لێ بێ لەبەردەستیاندا بوو، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (عەرشی خوا بۆ ئەم تەرمە هاتە لەرزە).

٣٨٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قال: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قال: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: لَمَّا حُمِلَتْ جَنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ قَالَ الْمُنَافِقُونَ: مَا أَخَفَّ جَنَازَتَهُ، وَذَلِكَ لِحُكْمِهِ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ كَانَتْ تَحْمِلُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ تەرمی سعدی کوڕی موعازیان ڕەزای خوای لێ بێ هەڵگرت، دووڕووەکان وتیان: تەرمەکەی چەند سوکە، لەسەر بڕیارەکەی کەدای سەبارەت بە بەنی (قريظة) — کە جەنگاوەرەکانیان بکوژن و ژن و منداڵەکانیان دابەش بکەن بەسەر موسوڵماناندا ئیش و کاریان پێ بکەن — هەواڵەکە ڕاگەیەنرا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (بێگومان مەلائیکە تەرمەکەیان هەڵگرت).

## چاکە و پایەی قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە ڕەزای خوای لێ بێ

## ٥٢ - بَابُ مَنَاقِبِ قَيْسِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَرْزُوقٍ البَصْرِيُّ قال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ قال: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ قَيْسُ بْنُ سَعْدٍ مِنَ النَّبِيِّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَنْزِلَةِ صَاحِبِ الشُّرَطِ مِنَ الأَمِيرِ قَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَعْنِي مِمَّا يَلِي مِنْ أُمُورِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الأَنْصَارِيِّ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ قَوْلَ الأَنْصَارِيِّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: قەیسی کوڕی سەعد بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەجیاتی هێرشبەرانی ناوجەرگەی جەنگە بۆ سەرکردەی جەنگەکە.

## چاکە و پایەی جابیری کوڕی (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ

## ٥٣ - بَابُ مَنَاقِبِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا

٣٨٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قال: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ قال: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: جَاءَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْسَ بِرَاكِبِ بَغْلٍ وَلاَ بِرْذَوْنٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەهات بۆ سەردانم نە بەسواری ئێستر نە بە سواری بارگیر.

٣٨٥٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ قال: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: اسْتَغْفَرَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ البَعِيرِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ مَرَّةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: لَيْلَةَ البَعِيرِ مَا رُوِيَ عَنْ جَابِرٍ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ أَنَّهُ كَانَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَبَاعَ بَعِيرَهُ مِنَ

النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاشْتَرَطَ ظَهْرَهُ إِلَى الْمَدِينَةِ، يَقُولُ جَابِرٌ لَيْلَةَ بِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْبَعِيرَ اسْتَغْفَرَ لِي خَمْسًا وَعِشْرِينَ مَرَّةً، وَكَانَ جَابِرٌ قَدْ قُتِلَ أَبُوهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ حَرَامٍ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ بَنَاتٍ، فَكَانَ جَابِرٌ يَعُولُهُنَّ وَيُنْفِقُ عَلَيْهِنَّ، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبَرُّ جَابِرًا وَيَرْحَمُهُ لِسَبَبِ ذَلِكَ، هَكَذَا رُوِيَ فِي حَدِيثٍ عَنْ جَابِرٍ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەو شەوەی وشترەکەم فرۆشت بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیست و پێنج جار بۆم پاڕایەوە. لەسەفەرێکدا جابیر وشترەکەی خۆی فرۆشت بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بە مەرجێ هات مەدینە سواری ببێ لەپاشدا بیداتەوە، کاتێ گەیشتنەوە مەدینە فەرمووی: وشترەکەش بۆ خۆت لەگەڵ نرخەکەی، باوکی جابیر لە جەنگی ئوحوددا کوژرابوو چەند کچێکی هەتیوی لەپاش بەجێمابوو جابیر بەخێوی دەکردن، لەبەرئەوەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سۆزو بەزەیی هەبوو بەرامبەر بە جابر و چاکەی لەگەڵ دەکرد.

## چاکە و پایەی موصعەبی کوڕی عومەیر ڕەزای خوای لێ بێ

## ٥٤ - بَابُ مَنَاقِبِ مُصْعَبِ بْنِ عُمَيْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ خَبَّابٍ، قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبْتَغِي وَجْهَ اللَّهِ، فَوَقَعَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَاتَ لَمْ يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئًا، وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ فَهُوَ يَهْدِبُهَا، وَإِنَّ مُصْعَبَ بْنَ عُمَيْرٍ مَاتَ وَلَمْ يَتْرُكْ إِلاَّ ثَوْبًا، كَانُوا إِذَا غَطَّوْا بِهِ رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلاَهُ، وَإِذَا غَطَّوْا بِهِ رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَقَالَ

رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَطُّوا رَأْسَهُ وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ الإِذْخِرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ قال: حَدَّثَنَا ابْنُ إِدْرِيسَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ عَنْ خَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ، نَحْوَهُ.

واتە: لە خەبابەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم كۆچمان كرد بەس لە پێناوی خوادا بوو، پاداشتمان كەوتە سەر خوا، جا هەندێ كەسمان مردو هیچی لەو ئەجر و پاداشتە نەخوارد لەدونیادا، هەشمانە بەرهەمەكەی دەچنێ و دەیخوات، موصعەبی كوڕی عومەیر ڕەزای خوای لێ بێ مرد لەپاش خۆی تەنها پۆشاكێكی لێ بەجێما كردیان بە كفن بۆی، ئەویش ئەوەندە نەبوو بەشی بكات، كە قاچیان پێ دادەپۆشی سەری دەردەكەوت، كە سەریان پێ دادەپۆشی قاچی دەردەكەوت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (سەری پێ داپۆشن گیای (اذخر)یش بدەن بەسەر قاچەكانیدا).

## چاكە و پایەی بەرائی كوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ

### ٥٥ - بَابُ مَنَاقِبِ الْبَرَاءِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ قال: حَدَّثَنَا سَيَّارٌ قال: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ قال: حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، وَعَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَمْ مِنْ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لاَ يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ مِنْهُمُ الْبَرَاءُ بْنُ مَالِكٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە بەرائی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چەندەها كەس

هەن قژ ئالۆسکاو و خۆلاوی و جل و بەرگ شڕ کەس ئاوڕیان لێ نایاتەوە، ئەگەر سوێند بخۆن لەسەر خوا خوای گەورە سوێنەکەیان ناشکێنێ و داواکاریەکانیان بۆ جێبەجێ دەکات، بەرائی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ لەوانەیە).

## چاکە و پایەی جابیری کوڕی (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ

## ٥٦ - بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكِنْدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو يَحْيَى الحِمَّانِيُّ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ قَالَ: يَا أَبَا مُوسَى لَقَدْ أُعْطِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ بُرَيْدَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ.

واتە: لە ئەبو موساوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی ئەبا موسا بەڕاستی خوا دەنگ و ئاوازێکی خۆشی پێ داویت وەك دەنگ و ئاوازە خۆشەکەی داود پێغەمبەر).

٣٨٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَزِيعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الفُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَحْفِرُ الخَنْدَقَ وَنَحْنُ نَنْقُلُ التُّرَابَ وَيَمُرُّ بِنَا فَقَالَ: اللَّهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشَ الآخِرَهْ ... فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَأَبُو حَازِمٍ اسْمُهُ: سَلَمَةُ بْنُ دِينَارٍ الأَعْرَجُ الزَّاهِدُ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین خەندەقی

لێ دەدا، ئێمەش گڵ و خۆڵمان دەگواستەوە دەیدا بەلاماندا دەیفەرموو: (خوایە ژیان هەر ژیانی دوارۆژە، داواکارم لە کۆچەران و یاریدەدەران خۆش بیت).

٣٨٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قال: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، قال: حَدَّثَنَا أَنَسٌ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشَ الآخِرَهْ ، فَأَكْرِمِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوایە ژیان هەر ژیانی دوارۆژە، داواکارم ڕێزبگرە لە کۆچەران و یاریدەدەران).

## دەربارەی ئەوەی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم دیوە و هاوەڵێتی کردووە

### ٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَحِبَهُ

٣٨٥٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَبِيبِ بْنِ عَرَبِيٍّ الْبَصْرِيُّ قال: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ كَثِيرٍ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ طَلْحَةَ بْنَ خِرَاشٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ تَمَسُّ النَّارُ مُسْلِمًا رَآنِي أَوْ رَأَى مَنْ رَآنِي قَالَ طَلْحَةُ: فَقَدْ رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وقَالَ مُوسَى: وَقَدْ رَأَيْتُ طَلْحَةَ، قَالَ يَحْيَى: وَقَالَ لِيَ مُوسَى: وَقَدْ رَأَيْتَنِي وَنَحْنُ نَرْجُو اللَّهَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُوسَى بْنِ إِبْرَاهِيمَ الأَنْصَارِيِّ. وَرَوَى عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الحَدِيثِ عَنْ مُوسَى، هَذَا الحَدِيثَ.

واتە: لە جابیری كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ منی دیبێ یان كەسێكی دیبێ كە منی دیبێ ئاگری دۆزەخ نایسوتێنێ).

٣٨٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنِي هَنَّادٌ قال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ هُوَ السَّلْمَانِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي قَوْمٌ بَعْدَ ذَلِكَ تَسْبِقُ أَيْمَانُهُمْ شَهَادَاتِهِمْ أَوْ شَهَادَاتُهُمْ أَيْمَانَهُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَبُرَيْدَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاكترین خەڵك خەڵكی سەردەمی خۆمن، لەپاشدا ئەوانەی بەدوایاندا دێن، ئیجا ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن، لەپاشدا خەڵكانێ پەیدا دەبن ئەوەندە گوێ نادەن بە دین سوێندەكانیان پێش شایەتیەكانیان دەخەن یان شایەتیەكانیان پێش سوێندەكانیان دەخەن).

## فەزڵی ئەو کەسەی لەژێر درەختەکەدا پەیمانی دابێت

## ٥٨ - بَابٌ فِي فَضْلِ مَنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ

٣٨٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ مِمَّنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێ لەژێر درەختەکەدا پەیمانی دابێت ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە). — ئەوانەی لەکاتی ڕێکەوتنی حودەیبیەدا لەژێر (شجرة الرضوان) دا پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم -.

## دەربارەی کەسێ جنێوبدات بە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٥٩ - بَابٌ فِيمَنْ سَبَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٨٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ قال: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: سَمِعْتُ ذَكْوَانَ أَبَا صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: نَصِيفَهُ، يَعْنِي نِصْفَ مُدِّهِ. حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ قال: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله

عليه وسلم فەرموویەتی: (جنێو مەدەن بە هاوەڵانم سوێند بە (الله) کە روحی منی بەدەستە ئەگەر کەسێ لەئێوە بە قەد کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشێت ناگاتە مشتی یەکێکیان بگرە نیوەی مشتیشیان). - مشتێ گەنم -.

٣٨٦٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قال: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ قال: حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ بْنُ أَبِي رَائِطَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّهَ اللَّهَ فِي أَصْحَابِي، لاَ تَتَّخِذُوهُمْ غَرَضًا بَعْدِي، فَمَنْ أَحَبَّهُمْ فَبِحُبِّي أَحَبَّهُمْ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ فَبِبُغْضِي أَبْغَضَهُمْ، وَمَنْ آذَاهُمْ فَقَدْ آذَانِي، وَمَنْ آذَانِي فَقَدْ آذَى اللَّهَ، وَمَنْ آذَى اللَّهَ فَيُوشِكُ أَنْ يَأْخُذَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەغەففەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە خوا بترسن، لە خوا بترسن، دەربارەی هاوەڵانی من، لەپاش من مایانکەن بە نیانەی تانەو تەشەرتان، هەرکەس ئەوانی خۆش دەوێ ئەوە منی خۆش دەوێ لەبەر خۆشەویستی من ئەوانیشی خۆش دەوێت، هەرکەس رقی لەوانە ئەوە رقی لەمنە بۆیە رقی لەوانیشە، ئەوەی ئازاریان دەدات ئەوە ئازاری من دەدات، ئەوەش ئازاری من دەدات ئەوە با بزانێ ئازاری خوای گەورە دەدات، ئەوەی ئازاری خوای گەورە دەدات، بە زوویی خوای گەورە دەیگرێ و سزای دەدات و تۆڵەی لێ دەکاتەوە).

٣٨٦٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ قال: حَدَّثَنَا أَزْهَرُ السَّمَّانُ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ خِدَاشٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيَدْخُلَنَّ الجَنَّةَ مَنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ إِلاَّ صَاحِبَ الجَمَلِ الأَحْمَرِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی هەر کەسێ لەژێر درەختەکەدا پەیمانی دابێت دەچێتە بەهەشتەوە، جگە لە خاوەنی وشترە سورەکە نەبێ). — خاوەنی وشترە سورەکە لەو کاتەدا وشترەکەی ونکردبوو بۆی دەگەڕا، رۆشتن وتیان: وەرە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێت خۆش دەبێ، وتی: سوێند بە خوا وشترەکەم بدۆزمەوە زۆر پێم خۆشترە لەوەی هاوڕێکەتان لێم خۆش ببێ -.

٣٨٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ عَبْدًا لِحَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ جَاءَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشْكُو حَاطِبًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ لَيَدْخُلَنَّ حَاطِبٌ النَّارَ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَذَبْتَ لاَ يَدْخُلُهَا فَإِنَّهُ شَهِدَ بَدْرًا وَالْحُدَيْبِيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە (حاطب) کوڕی ئەبی بەلتەعە رەزای خوای لێ بێ بەندەیەکی هەبوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سکاڵای کرد لە دەستی (حاطب)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، (حاطب) دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، ئەویش فەرمووی: (نەخێر تۆ درۆ دەکەیت (حاطب) ناچێتە دۆزەخەوە، چونکە بەشداری جەنگی بەدر و رێکەوتنی حودەیبیەی کردووە و ئامادە بووە). — واتە لەژێر درەختەکەدا پەیمانی داوە -.

٣٨٦٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ قال: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ نَاجِيَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُسْلِمٍ أَبِي طَيْبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِي يَمُوتُ بِأَرْضٍ إِلاَّ بُعِثَ قَائِدًا وَنُورًا لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ.

هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. وَرُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُسْلِمٍ أَبِي طَيْبَةَ عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی بورەیدەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر كەسێ لە هاوەڵانی من لەهەر خاكێكدا بمرێ، لەڕۆی قیامەتدا كە زیندوو دەكرێتەوە دەبێتە رابەر و پێشەواو نورو روناكی بۆ خەڵكی ئەو شوێنە).

٦٠ - بَابٌ

٣٨٦٦ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ نَافِعٍ قال: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ حَمَّادٍ قال: حَدَّثَنَا سَيْفُ بْنُ عُمَرَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَسُبُّونَ أَصْحَابِي فَقُولُوا: لَعْنَةُ اللهِ عَلَى شَرِّكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركاتێ ئەوانەتان دی جنێویان دەدا بە هاوەڵانی من، بڵێن: نەفرەتی خوا لەشەڕ و خراپەكەتان بێ).

ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی (فاطمة) ڕەزای خوای لێ بێ

٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ فَاطِمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا

٣٨٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قال: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: إِنَّ بَنِي

هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ اسْتَأْذَنُونِي فِي أَنْ يُنْكِحُوا ابْنَتَهُمْ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ فَلاَ آذَنُ، ثُمَّ لاَ آذَنُ، ثُمَّ لاَ آذَنُ، إِلاَّ أَنْ يُرِيدَ ابْنُ أَبِي طَالِبٍ أَنْ يُطَلِّقَ ابْنَتِي وَيَنْكِحَ ابْنَتَهُمْ فَإِنَّهَا بِضْعَةٌ مِنِّي يَرِيبُنِي مَا رَابَهَا وَيُؤْذِينِي مَا آذَاهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: (بەنی هیشامی کوڕی موغیرە داوای ئەوەم لێ دەکەن ڕێیان بدەم کە کچی خۆیان بدەن بە عەلی کوڕی (أَبِی طَالِبٍ)، منیش هەرگیز ڕێیان پێ نادەم، لەپاشدا ڕێیان پێ نادەم، لەپاشدا ڕێیان پێ نادەم، مەگەر کوڕی (أَبِی طَالِبٍ) کچەکەم تەڵاق بدات و کچەکەی ئەوان بهێنێت، چونکە (فَاطِمَة) پارچەیەکە لە جەستەی من، ئەوەی توشی دوودڵی و گومان بکات ئەوە من توشی دوودڵی و گومان دەکات، هەرچی ئازار بەو بگەیەنێت بەمنیشی دەگەیەنێت).

٣٨٦٨ - (منكر) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الْجَوْهَرِيُّ قال: حَدَّثَنَا الأَسْوَدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ جَعْفَرٍ الأَحْمَرِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ أَحَبَّ النِّسَاءِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاطِمَةُ، وَمِنَ الرِّجَالِ عَلِيٌّ قَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ: يَعْنِي مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خۆشەویسترین ئافرەت لە کەسوکار بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم (فَاطِمَة) بوو، خۆشەویسترین کەسیش بەلایەوە لە پیاوان عەلی کوڕی (أَبِی طَالِبٍ) بوو.

٣٨٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ قال: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَلِيًّا، ذَكَرَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ

النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّمَا فَاطِمَةُ بِضْعَةٌ مِنِّي يُؤْذِينِي مَا آذَاهَا وَيُنْصِبُنِي مَا أَنْصَبَهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. هَكَذَا قَالَ أَيُّوبُ: عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، وَقَالَ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ. وَيُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، رَوَى عَنْهُمَا جَمِيعًا. وَقَدْ رَوَاهُ عَمْرُو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ نَحْوَ حَدِيثِ اللَّيْثِ.

واتـە: لـە (عبـد الله)ی كـوڕی زوبێـرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ باسی داوای كچێكی ئـەبو جـەهلی كرد، ئەو هەواڵەیان ڕاگەیاند بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فـەرمووی: ((فاطِمَة) پارچـەیەكە لـە جەسـتەی مـن، ئـەوەی ئـازار بـەو بگەیـەنێت بەمنیشـی دەگەیەنێت، ئەوەی ئەو ماندوو دەكات منیش ماندوو دەكات).

٣٨٧٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ عَبْدِ الجَبَّارِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ قَادِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَسْبَاطُ بْنُ نَصْرٍ الهَمْدَانِيُّ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ صُبَيْحٍ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعَلِيٍّ وَفَاطِمَةَ وَالحَسَنِ وَالحُسَيْنِ: أَنَا حَرْبٌ لِمَنْ حَارَبْتُمْ، وَسِلْمٌ لِمَنْ سَالَمْتُمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَصُبَيْحٌ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ لَيْسَ بِمَعْرُوفٍ.

واتـە: لـە زەیـدی كـوڕی ئەرقەمـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـه وسـلم بـە پێشـەوا عـەلی و (فاطِمَة) و حەسـەن و حوسەینی فەرموو: (من جەنگم بەرامبەر بەو كەسـانەی جـەنگتان لەگـەڵ دەكـەن، ئاشتیم بەرامبەر بەو كەسانەی ئاشتن لەگەڵتان).

٣٨٧١ - (صحيح بما تقدم رقم: (٣٧٨٧) ) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ،

أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَلَّلَ عَلَى الحَسَنِ وَالحُسَيْنِ وَعَلِيٍّ وَفَاطِمَةَ كِسَاءً، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلَاءِ أَهْلُ بَيْتِي وَخَاصَّتِي، أَذْهِبْ عَنْهُمُ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تَطْهِيرًا، فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: وَأَنَا مَعَهُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: إِنَّكِ إِلَى خَيْرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَهُوَ أَحْسَنُ شَيْءٍ رُوِيَ فِي هَذَا البَابِ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَأَبِي الحَمْرَاءِ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، كـە پێغەمبـەر صـلی الله علیه وسلم پۆشاكێكی دا بەسەر پێشەوا عەلی و (فاطمة) و حەسەن و حوسەین دا، لەپاشدا فەرمووی: (خودایە، ئەمانە خانەوادە و كەسوكاری تایبـەتی مـنن، لـە هەموو چڵك و چەپەڵی و، گشت كارێكی نارەواو نادروسـت دووریـان بخـەرەوە و بـە پوختیی و پاكی بیانهێڵەوە). ئوممو سەلەمە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیه وسلم، ئایا منیش لەگەڵ ئـەوانم؟ فـەرمووی: (بـەڵێ، تـۆ لەسـەر خێـر و چاكەی).

٣٨٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ مَيْسَرَةَ بْنِ حَبِيبٍ، عَنِ الْمِنْهَالِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَشْبَهَ سَمْتًا وَدَلًّا وَهَدْيًا بِرَسُولِ اللهِ فِي قِيَامِهَا وَقُعُودِهَا مِنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: وَكَانَتْ إِذَا دَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ إِلَيْهَا فَقَبَّلَهَا وَأَجْلَسَهَا فِي مَجْلِسِهِ، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ عَلَيْهَا قَامَتْ مِنْ مَجْلِسِهَا فَقَبَّلَتْهُ وَأَجْلَسَتْهُ فِي مَجْلِسِهَا، فَلَمَّا مَرِضَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَتْ فَاطِمَةُ فَأَكَبَّتْ عَلَيْهِ فَقَبَّلَتْهُ ثُمَّ رَفَعَتْ رَأْسَهَا فَبَكَتْ، ثُمَّ أَكَبَّتْ عَلَيْهِ ثُمَّ رَفَعَتْ رَأْسَهَا فَضَحِكَتْ، فَقُلْتُ: إِنْ كُنْتُ لَأَظُنُّ أَنَّ هَذِهِ مِنْ أَعْقَلِ نِسَائِنَا فَإِذَا هِيَ مِنَ النِّسَاءِ، فَلَمَّا تُوُفِّيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْتُ لَهَا:

أَرَأَيْتِ حِينَ أَكْبَبْتِ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَفَعْتِ رَأْسَكِ فَبَكَيْتِ ثُمَّ أَكْبَبْتِ عَلَيْهِ فَرَفَعْتِ رَأْسَكِ فَضَحِكْتِ، مَا حَمَلَكِ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَتْ: إِنِّي إِذًا لَبَذِرَةٌ أَخْبَرَنِي أَنَّهُ مَيِّتٌ مِنْ وَجَعِهِ هَذَا فَبَكَيْتُ، ثُمَّ أَخْبَرَنِي أَنِّي أَسْرَعُ أَهْلِهِ لُحُوقًا بِهِ فَذَاكَ حِينَ ضَحِكْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کەسم نەدیوە ئەوەندەی (فَاطِمَة) لە هەڵس و کەوت و گوفتار و رەفتاردا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بچێ، عائیشە فەرمووی: کاتێ (فَاطِمَة) دەچوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەڵەسایەوە لەبەری و ماچی دەکرد و لە کۆڕ و دانیشتی خۆیدا دایدەنیشاند، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەخۆش کەوت، (فَاطِمَة) چوو بۆ خزمەتی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سرتەیەکی لەگەڵ کرد (فَاطِمَة) سەری بەرزکردەوە و دەستی کردە گریان، دیسانەوە سرتەیەکی تری لەگەڵ کرد سەری بەرزکردەوە و دەستی کرد بە پێکەنین، وتم: من وا گومانم دەبرد (فَاطِمَة) یەکێکە لە ئاقڵترین ئافرەتەکانمان، کەچی ئەویش هەر یەکێکە لە ئافرەتان لەم حاڵەتەدا پێدەکەنێ، کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەفاتی کرد، پێم وت: ئەوە چی بوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینیم سرتەیەکی لەگەڵ کردی دەستت کرد بە گریان، دیسانەوە سرتەیەکی تری لەگەڵ کردی دەستت کرد بە پێکەنین؟ (فَاطِمَة) فەرمووی: ئێستا ئەو نهێنییە ئاشکرا دەکەم، یەکەم سرتە هەواڵی دامێ کە بەو نەخۆشییە دەمرێ بۆیە گریام، دووەم جار هەواڵی دامێ کە من یەکەم کەس دەبم لە کەسوکار دەمرم و زوو پێی دەگەم، بۆیە پێکەنیم.

٣٨٧٣ – (صحيح) أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ ابْنُ عَثْمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ يَعْقُوبَ الزَّمْعِيُّ، عَنْ هَاشِمِ بْنِ هَاشِمٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ وَهْبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَا فَاطِمَةَ عَامَ الْفَتْحِ فَنَاجَاهَا فَبَكَتْ ثُمَّ حَدَّثَهَا فَضَحِكَتْ. قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَأَلْتُهَا عَنْ بُكَائِهَا وَضَحِكِهَا. قَالَتْ: أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ يَمُوتُ فَبَكَيْتُ، ثُمَّ أَخْبَرَنِي أَنِّي سَيِّدَةُ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ إِلاَّ مَرْيَمَ ابْنَةَ عِمْرَانَ فَضَحِكْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ڕۆژی ڕزگاركردنی مەككەدا (فَاطِمَة)ی كچی خۆی بانگ كرد، سرتەیەكی لەگەڵ كرد (فَاطِمَة) گریا، دیسانەوە سرتەیەكی تری لەگەڵ كرد پێكەنی، دەربارەی ئەو گریان و پێكەنینەی لێم پرسی، پێی ڕاگەیاندم كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەفات دەكات بۆیە گریام، لەپاشدا پێی ڕاگەیاندم كە من گەورەی ئافرەتانی بەهەشتم جگە لە مەریەمی كچی عیمران بۆیە پێكەنیم.

٣٨٧٤ – (منكر) حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ يَزِيدَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ أَبِي الجَحَّافِ، عَنْ جُمَيْعِ بْنِ عُمَيْرٍ التَّيْمِيِّ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ عَمَّتِي عَلَى عَائِشَةَ فَسُئِلَتْ أَيُّ النَّاسِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: فَاطِمَةُ، فَقِيلَ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَتْ: زَوْجُهَا، إِنْ كَانَ مَا عَلِمْتُ صَوَّامًا قَوَّامًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو الجَحَّافِ اسْمُهُ: دَاوُدُ بْنُ أَبِي عَوْفٍ. وَيُرْوَى عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الجَحَّافِ، وَكَانَ مَرْضِيًّا.

واتە: لە جومەیعی كوڕی عومەیری تەمیمیەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

لەگەڵ پورم چووینە خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ، لێم پرسی: خۆشەویسترین کەس کێ بوو بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: (فَاطِمَة)، وترا: ئەی لە پیاوان؟ عائیشە فەرمووی: هاوسەرەکەی واتە: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ، ئەوەندەی کە من بزانم شەو نوێژ زۆر دەکات و زۆریش بە رۆژوو دەبێ.

## چاکە و پلەوپایەی خەدیجە رەزای خوای لێ بێ

## ٦٢ - بَابُ فَضْلِ خَدِيجَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا

٣٨٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ وَمَا بِي أَنْ أَكُونَ أَدْرَكْتُهَا، وَمَا ذَلِكَ إِلاَّ لِكَثْرَةِ ذِكْرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهَا، وَإِنْ كَانَ لَيَذْبَحُ الشَّاةَ فَيَتَتَبَّعُ بِهَا صَدَائِقَ خَدِيجَةَ فَيُهْدِيهَا لَهُنَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: غیرەم نەکردووە بەرامبەر بە هیچ هاوسەرێکی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هێندەی خەدیجە رەزای خوای لێ بێ، لەکاتێکدا من فریای خەدیجە نەکەوتووم و نەمدیوە، ئەمەش لەبەرئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر ناوی دەبرد و یادی دەکرد، ئەگەر مەڕێکی سەربڕیایە بەشی دەستەخوشك و ئاشناکانی ئەوی بەدیاری دەنارد.

٣٨٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَا حَسَدْتُ امْرَأَةً مَا حَسَدْتُ خَدِيجَةَ،

وَمَا تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ بَعْدَ مَا مَاتَتْ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَشَّرَهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. مِنْ قَصَبٍ قَالَ: إِنَّمَا يَعْنِي بِهِ قَصَبَ اللُّؤْلُؤِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئیرەیم نەبردووە بە هیچ هاوسەرێكی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هێندەی خەدیجە رەزای خوای لێ بێ، لەكاتێكدا كە لەدوای مردنی ئەو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم منی مارەكردوە، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مژدەی ماڵێكی لە قامیشی مرواری پێدا لە بەهەشتدا دەنگە دەنگ و ماندووبوونی تێدایە نیە.

٣٨٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الْهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: خَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ وَخَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی جەعفەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ بوو دەیفەرموو: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (چاكترین ئافرەت لە ئافرەتانی دونیا مەریەمی كچی عیمرانە، چاكترین ئافرەتیش لە ئافرەتانی ئەم ئوممەتە خەدیجەی كچی خوەلیدە).

٣٨٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ زَنْجُوَيْهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: حَسْبُكَ مِنْ نِسَاءِ

الْعَالَمِينَ: مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ، وَخَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ، وَفَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ وَآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەسە بۆ تۆ لە ئافرەتانی جیهانیاندا: مەریەمی کچی عیمران، خەدیجەی کچی خوەلید، (فَاطِمَة)ی کچی موحەممەد، ئاسیەی ژنی فیرعەون).

## دەربارەی چاکە و پلەوپایەی عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ

## ٦٣ - بَابُ مِنْ فَضْلِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا

٣٨٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ دُرُسْتَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ، قَالَتْ: فَاجْتَمَعَ صَوَاحِبَاتِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَقُلْنَ: يَا أُمَّ سَلَمَةَ إِنَّ النَّاسَ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ وَإِنَّا نُرِيدُ الْخَيْرَ كَمَا تُرِيدُ عَائِشَةُ، فَقُولِي لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرِ النَّاسَ يُهْدُونَ إِلَيْهِ أَيْنَمَا كَانَ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ أُمُّ سَلَمَةَ فَأَعْرَضَ عَنْهَا، ثُمَّ عَادَ إِلَيْهَا فَأَعَادَتِ الْكَلَامَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ صَوَاحِبَاتِي قَدْ ذَكَرْنَ أَنَّ النَّاسَ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ فَأْمُرِ النَّاسَ يُهْدُونَ أَيْنَمَا كُنْتَ، فَلَمَّا كَانَتِ الثَّالِثَةُ قَالَتْ ذَلِكَ. قَالَ: يَا أُمَّ سَلَمَةَ لَا تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ، فَإِنَّهُ مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ الْوَحْيُ وَأَنَا فِي لِحَافِ امْرَأَةٍ مِنْكُنَّ غَيْرِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلًا. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ عَوْفِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ رُمَيْثَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، شَيْئًا مِنْ هَذَا. وَهَذَا حَدِيثٌ قَدْ رُوِيَ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَلَى رِوَايَاتٍ مُخْتَلِفَةٍ. وَقَدْ

رَوَى سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، نَحْوَ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ.

واته: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خەڵك دیاریەکانیان دەبرد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، چاوەڕوانی ئەو رۆژیان دەکرد کە سەرەی عائیشە بێ هەتا لەوێوە دیاریەکانی بۆ بەرن، جا هەویەکانم لە ماڵی ئوممو سەلەمە کۆدەبنەوە دەڵێن: ئەی ئوممو سەلەمە، خەڵك دیاریەکانیان دەبەن بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، چاوەڕوانی ئەو رۆژە دەکەن سەرەی عائیشە بێ هەتا لەوێوە دیاریەکانی بۆ بەرن، ئێمەش دەمانەوێ وەك عائیشە لەو خێرمان بەرکەوێ، لەبەر ئەوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڵێ: با فەرمان بکات بە خەڵك دیاریەکان بەرن بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئیتر لەماڵی هەر کامیان بێ، جیاوازی نەکەن لە نێوان ماڵی هاوسەرەکانیدا، ئوممو سەلەمە ئەوەی باسکرد بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەویش پشتی تێ کرد و وەڵامی نەدایەوە، لەپاشدا گەڕایەوە بۆ لای و وتەکەی دووبارە کردەوە وەڵامی نەدایەوە، بۆ جاری سێیەم هاتەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئوممو سەلەمە! لەسەر عائیشە ئازارم مەدە، هەرکاتێ وەحیم بۆ هاتووە ئیللا لەناو نوێنی عائیشەدا بووم، لەناو نوێنی هیچ یەکێ لە ئێوەدا نەبووم).

٣٨٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَلْقَمَةَ الْمَكِّيِّ، عَنِ ابْنِ أَبِي حُسَيْنٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ جِبْرِيلَ، جَاءَ بِصُورَتِهَا فِي خِرْقَةِ حَرِيرٍ خَضْرَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: هَذِهِ زَوْجَتُكَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَلْقَمَةَ. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ عَبْدِ اللهِ

بْنِ عَمْرِو بْنِ عَلْقَمَةَ، بِهَذَا الإِسْنَادِ مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَائِشَةَ. وَقَدْ رَوَى أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا مِنْ هَذَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جبریل وێنەی عائیشەی لەناو دەسماڵێکی ئاوریشمدا هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: ئەمە هاوسەری تۆیە لەدونیاو لە قیامەتیشدا.

٣٨٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا عَائِشَةُ هَذَا جِبْرِيلُ وَهُوَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلاَمَ قَالَتْ: قُلْتُ وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، تَرَى مَا لاَ نَرَى. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عائیشە ئەمە جبریلە سەلامت لێ دەکات)، وتی: وتم: سڵاو و رەحمەت و بەرەکاتی خوا لەسەر ئەو بێ، ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هەندێ شت هەیە تۆ دەیبینی بەڵام ئێمە نایبینین.

٣٨٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا زَكَرِيَّا، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ جِبْرِيلَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلاَمَ، فَقُلْتُ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (جبریل سەلامت لێ دەکات)،

وتم: سڵاو و رەحمەتی خوا لەسەر ئەو بێ.

٣٨٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ الرَّبِيعِ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ سَلَمَةَ الْمَخْزُومِيُّ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، قَالَ: مَا أَشْكَلَ عَلَيْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثٌ قَطُّ فَسَأَلْنَا عَائِشَةَ إِلاَّ وَجَدْنَا عِنْدَهَا مِنْهُ عِلْمًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو موساوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئیشكالمان هەبوایە لەسەر هەر فەرموودەیە لە عائیشەمان دەپرسیەوە ئەو بە باشی دەیزانی – جا ئیتر لەڕووی ماناوە بێ یان حوكم لێ وەرگرتنی یا بابەتێكی گرنگ - .

٣٨٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ الْكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَفْصَحَ مِنْ عَائِشَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە موسای كوڕی (طَلْحَة)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هیچ كەسێكم نەدیوە ئەوەندەی عائیشە رەوانبێژ و زمان پاراو بێ.

٣٨٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ، وَمُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ وَاللَّفْظُ لِابْنِ يَعْقُوبَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ الْمُخْتَارِ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَعْمَلَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلاَسِلِ قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: عَائِشَةُ. قُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: أَبُوهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی عاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردی بە فەرماندە و سەرکردەی لەشکری جەنگی (ذَاتِ السّلاَسِلِ)، فەرمووی: چوومە خزمەتی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆشەویسترین کەس بەلاتەوە کێیە؟ فەرمووی: (عائیشە)، وتم: ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی: (باوکی) واتە: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ.

٣٨٨٦ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأُمَوِيُّ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ العَاصِ أَنَّهُ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيْكَ؟ قَالَ: عَائِشَةُ. قَالَ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: أَبُوهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ.

واتە: لە عەمری کوڕی عاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆشەویسترین کەس بەلاتەوە کێیە؟ فەرمووی: (عائیشە)، وتم: ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی: (باوکی).

٣٨٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَعْمَرٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي مُوسَى. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَعْمَرٍ هُوَ: أَبُو طُوَالَةَ الأَنْصَارِيُّ الْمَدِينِيُّ ثِقَةٌ. وَقَدْ رَوَى عَنْهُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فەزڵ و گەورەیی عائیشە وەك فەزڵ و گەورەیی گۆشتاو وایە بەسەر خواردنەکانی تردا).

٣٨٨٨ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ غَالِبٍ، أَنَّ رَجُلاً نَالَ مِنْ عَائِشَةَ عِنْدَ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، فَقَالَ: أَغْرِبْ مَقْبُوحًا مَنْبُوحًا أَتُؤْذِي حَبِيبَةَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی غالیبەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ لە لای عەماری کوڕی یاسر باسی عائیشەی کرد بە خراپە، عەمار فەرمووی: دوور بکەوەرەوە و لاچۆ لەبەرچاوم ئەوە تۆ خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئازار دەدەی.

٣٨٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي حُصَيْنٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زِيَادٍ الأَسَدِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمَّارَ بْنَ يَاسِرٍ، يَقُولُ: هِيَ زَوْجَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، يَعْنِي عَائِشَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی زیادی ئەسەدیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە عەماری کوڕی یاسر بوو دەیفەرموو: عائیشە هاوسەری پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم لە دونیاو لە قیامەتیشدا.

٣٨٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيْكَ؟ قَالَ: عَائِشَةُ، قِيلَ: مِنَ الرِّجَالِ. قَالَ: أَبُوهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆشەویسترین کەس

بەلاتەوە کێیە؟ فەرمووی: (عائیشە)، وترا: ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی: (باوکی) واتە: پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ.

## چاکە و پلەوپایەی هاوسەرانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

## ٦٤ - بَابٌ فِي فَضْلِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣٨٩١ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ العَنْبَرِيُّ أَبُو غَسَّانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَلْمُ بْنُ جَعْفَرٍ وَكَانَ ثِقَةً، عَنِ الحَكَمِ بْنِ أَبَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: قِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ مَاتَتْ فُلَانَةُ لِبَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَجَدَ، فَقِيلَ لَهُ: أَتَسْجُدُ هَذِهِ السَّاعَةَ؟ فَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا رَأَيْتُمْ آيَةً فَاسْجُدُوا، فَأَيُّ آيَةٍ أَعْظَمُ مِنْ ذَهَابِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عیکریمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەدوای نوێژی بەیانی بە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ وترا: یەکێ لە هاوسەرانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەفاتی کردووە، ئەویش سەجدەی برد، پێی وترا: ئەم لەم کات و ساتەدا چۆن سەجدە دەبەی هێشتا خۆر هەڵنەهاتوە و بەرزنەبۆتەوە؟ فەرمووی: ئەی مەگەر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نافەرمووێت: (کاتێ نیشانەیەکی ترسناکتان دی سەجدە بەرن، دەی چ نیشانەیە گەورەتر و ساماناکترە لە مردن و رۆشتنی هاوسەرانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەوانە مایەی رەحمەت و بەرەکەتن.

٣٨٩٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَاشِمٌ هُوَ ابْنُ سَعِيدٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا كِنَانَةُ، قَالَ: حَدَّثَتْنَا

صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ بَلَغَنِي عَنْ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ كَلاَمٌ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: أَلاَ قُلْتِ: فَكَيْفَ تَكُونَانِ خَيْرًا مِنِّي وَزَوْجِي مُحَمَّدٌ وَأَبِي هَارُونُ وَعَمِّي مُوسَى؟ وَكَانَ الَّذِي بَلَغَهَا أَنَّهُمْ قَالُوا: نَحْنُ أَكْرَمُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا، وَقَالُوا: نَحْنُ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَنَاتُ عَمِّهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ صَفِيَّةَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ هَاشِمٍ الكُوفِيِّ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ.

واتە: لە صەفیەی کچی حویەییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لام، قسەیەکم دەربارەی حەفصە و عائیشە پێ گەیشتبوو پێم ڕاگەیاند، فەرمووی: (ئاگاداربە بۆ پێت نەوتن: چۆن ئێوە لەمن چاکترن لەکاتێکدا کە من هاوسەری موحەممەد و هارون باوکمە و موسا ماممە) – صەفیە لەنەوەی هاروونی برای موسا بووە -. ئەوەی پێی ڕاگەیەنرا بوو ئەوە بوو ئەوان وتیان: لەلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێمە بەڕێزترین لە صەفیە، وتیان: ئێمە هاوسەری پێغەمبەرین صلی الله علیه وسلم، وە کچانی مامی ئەویشین.

٣٨٩٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ ابْنُ عَثْمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ يَعْقُوبَ الزَّمْعِيُّ، عَنْ هَاشِمِ بْنِ هَاشِمٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ وَهْبٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَا فَاطِمَةَ عَامَ الفَتْحِ فَنَاجَاهَا فَبَكَتْ ثُمَّ حَدَّثَهَا فَضَحِكَتْ، قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَأَلْتُهَا عَنْ بُكَائِهَا وَضَحِكِهَا. قَالَتْ: أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ يَمُوتُ فَبَكَيْتُ، ثُمَّ أَخْبَرَنِي أَنِّي سَيِّدَةُ نِسَاءِ أَهْلِ الجَنَّةِ إِلاَّ مَرْيَمَ بِنْتَ عِمْرَانَ فَضَحِكْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئومو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا (فَاطِمَة)ی کچی خۆی بانگ کرد، سرتەیەکی لەگەڵ کرد (فَاطِمَة) گریا، لەپاشدا سرتەیەکی تری لەگەڵ کرد پێکەنی، کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەفاتی کرد، دەربارەی ئەو گریان و پێکەنینەی لێم پرسی، فەرمووی: پێی ڕاگەیاندم کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەفات دەکات بۆیە گریام، لەپاشدا پێی ڕاگەیاندم کە من گەورەی ئافرەتانی بەهەشتم جگە لە مەریەمی کچی عیمران بۆیە منیش پێکەنیم.

٣٨٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالاَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: بَلَغَ صَفِيَّةَ أَنَّ حَفْصَةَ، قَالَتْ: بِنْتُ يَهُودِيٍّ، فَبَكَتْ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ تَبْكِي، فَقَالَ: مَا يُبْكِيكِ؟ فَقَالَتْ: قَالَتْ لِي حَفْصَةُ: إِنِّي بِنْتُ يَهُودِيٍّ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَإِنَّكِ لاَبْنَةُ نَبِيٍّ، وَإِنَّ عَمَّكِ لَنَبِيٌّ، وَإِنَّكِ لَتَحْتَ نَبِيٍّ، فَفِيمَ تَفْخَرُ عَلَيْكِ؟ ثُمَّ قَالَ: اتَّقِي اللَّهَ يَا حَفْصَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە صەفیەیان ڕاگەیاند کە حەفصە پێی وتوە: کچی جولەکە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چوو بۆ لای صەفیە دەگریا، فەرمووی: (بۆچی دەگریت؟) وتی: حەفصە پێی وتوم: تۆ کچی جولەکەیت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چوو بۆ لای صەفیە دەگریا، فەرمووی: (تۆ کچی پێغەمبەر هارونی، موسای مامت پێغەمبەر بوو، هاوسەرەکەت پێغەمبەرە، ئیتر بەچی فەخر و شانازی دەکات بەسەرتدا؟)، لەپاشدا فەرمووی: (لەخوا بترسە ئەی حەفصە).

٣٨٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ وَأَنَا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي، وَإِذَا مَاتَ صَاحِبُكُمْ فَدَعُوهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِيَ هَذَا عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترینتان چاکترینە بۆ هاوسەر و خانەوادەکەی، من خۆشم چاکترین کەسم بۆ هاوسەر و خانەوادەکەم، ئەگەر کەسێکتان مرد وازی لێ بهێنن).

٣٨٩٦ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ الوَلِيدِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُبَلِّغُنِي أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِي شَيْئًا؛ فَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَخْرُجَ إِلَيْهِمْ وَأَنَا سَلِيمُ الصَّدْرِ. قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَالٍ فَقَسَّمَهُ، فَانْتَهَيْتُ إِلَى رَجُلَيْنِ جَالِسَيْنِ وَهُمَا يَقُولاَنِ: وَاللهِ مَا أَرَادَ مُحَمَّدٌ بِقِسْمَتِهِ الَّتِي قَسَمَهَا وَجْهَ اللهِ وَلاَ الدَّارَ الآخِرَةَ. فَتَثَبَّتُّ حِينَ سَمِعْتُهُمَا، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَخْبَرْتُهُ فَاحْمَرَّ وَجْهُهُ وَقَالَ: دَعْنِي عَنْكَ فَقَدْ أُوذِيَ مُوسَى بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ زِيدَ فِي هَذَا الإِسْنَادِ رَجُلٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لەئێوە هەواڵێ یان قسەیەکم بۆ نەهێنێ لە یەکێ لە هاوەڵەکانمەوە کە پێم ناخۆش بێ و لێی توڕە بم، چونکە من پێم خۆشە بە دڵێکی ساف و بێگەردەوە لەماڵ

دەرچم و بێم بۆ ناوتان). — واتە جاسوسی و سیخوڕی بەسەر یەکەوە مەکەن - .
(عبد الله) فەرمووی: ماڵێکیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دابەشی کرد، گەیشتم بە دوو پیاو دانیشتبوون دەیانوت: مەبەستی ڕەزامەندی خوا و دوارۆژ نیە واتە بە عەدالەت دابەشی ناکات، کە گوێم لێ بوو قسەکەیانم لەبەرم کرت ، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، روخساری سور هەڵگەڕا، فەرمووی: وازم لێ بێنە لەوەش زیاتر ئازاری موسایان دا بەڵام ئەو ئارامی گرت و خۆڕاگر بوو).

٣٨٩٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، وَالحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ أَبِي هِشَامٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يُبَلِّغُنِي أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ شَيْئًا. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا مِنْ هَذَا مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لەئێوە هەواڵێ یان قسەیەکم بۆ نەهێنێ لە هیچ کەسێکەوە).

## چاکە و پلەوپایەی ئوبەی کوڕی کەعب ڕەزای خوای لێ بێ

## ٦٥ - بَابُ فَضْلِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

٣٨٩٨ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَاصِمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ رَسُولَ

اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ، فَقَرَأَ عَلَيْهِ (لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا) وَقَرَأَ فِيهَا: إِنَّ ذَاتَ الدِّينِ عِنْدَ اللهِ الْحَنِيفِيَّةُ الْمُسْلِمَةُ لاَ الْيَهُودِيَّةُ وَلاَ النَّصْرَانِيَّةُ وَلاَ الْمَجُوسِيَّةُ، مَنْ يَعْمَلْ خَيْرًا فَلَنْ يُكْفَرَهُ وَقَرَأَ عَلَيْهِ: لَوْ أَنَّ لاِبْنِ آدَمَ وَادِيًا مِنْ مَالٍ لاَبْتَغَى إِلَيْهِ ثَانِيًا، وَلَوْ كَانَ لَهُ ثَانِيًا، لاَبْتَغَى إِلَيْهِ ثَالِثًا، وَلاَ يَمْلأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الْوَجْهِ رَوَاهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ. وَقَدْ رَوَاهُ قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ.

واتــە: لــە ئوبــەی کــوڕی کەعبــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبــەری خوا صـلی الله علیــە وسـلم بــە ئوبــەی کــوڕی کــەعبی فەرموو: (خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم قورئانت لەلا بخوێنم: سورەتی: **(لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا)**ی بۆ خوێندەوە، ئەمەی تێدا خوێندەوە: دینی ڕاست و دروست پاك و بێگەرد لەلای خوا دینی ئیسلامە، نەك دینی گاور و جولەکە و ئاگرپەرست، ئەوەی کار و کردەوەی چاکە ئەنجام بدات فەرامۆش ناکرێت، ئەمەشی بۆ خوێندەوە: (ئەگەر ئەوەی ئادەم پڕی شیوێ ماڵ و سامانی هەبێ، هەوڵ دەدات بیکات بە دوو شیو، ئەگەر دوو شیوشی هەبێ دوای هەوڵ دەدات بیکات بە سیان، مەگەر گڵی گۆڕەکەی دەمی تێر بکات ئەگینا تێر ناخوات، خوای گەورەش لەکەسە خۆش دەبێ تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە).

## دەربارەی چاکە و پلەوپایەی یاریدەدەران و قورەیش

## ٦٦ - بَابٌ فِي فَضْلِ الأَنْصَارِ وَقُرَيْشٍ

٣٨٩٩ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، عَنْ زُهَيْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْلاَ الهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ.

واتە: لە (طفیل)ی کوڕی ئوبەی کوڕی کەعبەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کۆچکردن نەبوایە منیش یەکێ دەبووم لە (ئەنصار)یاریدەدەران).

٣٩٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فِي الأَنْصَارِ: لاَ يُحِبُّهُمْ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَبْغَضُهُمْ إِلاَّ مُنَافِقٌ، مَنْ أَحَبَّهُمْ فَأَحَبَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ فَأَبْغَضَهُ اللَّهُ فَقُلْتُ لَهُ: أَأَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنَ الْبَرَاءِ؟ فَقَالَ: إِيَّايَ حَدَّثَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا أَوْ شِعْبًا لَكُنْتُ مَعَ الأَنْصَارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی یاریدەدەران فەرموویەتی: (جگە لە باوەڕدار کەس خۆشی ناوێن، جگە لە بێ باوەڕیش کەس ڕقی لەوان نیە، ئەوەی خۆشی دەوێن خوا خۆشی دەوێ، ئەوەی ڕقی لەوانە خواش ڕقی لەوە). پێم وت: ئایا بۆ خۆت ئەمەت بیست لە بەرائی کوڕی عازیب ڕەزای خوای لێ بێ؟ فەرموی: بەڵێ.

٣٩٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: هَلْ فِيكُمْ أَحَدٌ مِنْ غَيْرِكُمْ؟ قَالُوا: لاَ، إِلاَّ ابْنَ أُخْتٍ لَنَا، فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ ابْنَ أُخْتِ القَوْمِ مِنْهُمْ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ قُرَيْشًا حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِجَاهِلِيَّةٍ وَمُصِيبَةٍ، وَإِنِّي أَرَدْتُ أَنْ أَجْبُرَهُمْ وَأَتَأَلَّفَهُمْ، أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَرْجِعَ النَّاسُ بِالدُّنْيَا وَتَرْجِعُونَ بِرَسُولِ اللهِ إِلَى بُيُوتِكُمْ؟ قَالُوا: بَلَى، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا أَوْ شِعْبًا وَسَلَكَتِ الأَنْصَارُ وَادِيًا أَوْ شِعْبًا لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ أَوْ شِعْبَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەندێ ماڵ و سامانی دابەش کرد بەسەر قورەیشدا کە تازە کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە، بۆیە کۆمەڵێ خەڵکی لە یاریدەدەران کۆکردەوە فەرمووی: (جگە لە یاریدەدەران کەسی بێگانەتان تێدایە؟) وتیان: نەخێر، جگە لە خوشکەزایەکمان نەبێ، فەرمووی: (بێگومان خوشکە زای هەر قەومێ لەو قەومەیە)، لەپاشدا فەرمووی: (قورەیش تازە دەرچوون لە نەفامی و کارەسات، بێگومان منیش ویستم خۆشەویستیان بۆ دەربڕم و دڵیان هۆگری ئیسلام و موسوڵمانان بکەم، ئایا ئێوە ڕازی نابن خەڵك بە ماڵ و سامانی دونیاوە بگەڕێنەوە، ئێوەش بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانتان؟)، وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (ئەگەر خەڵك شیوێ یان هەردێ بگرنەبەر، یاریدەدەرانیش شیوێ یان هەردێ بگرنەبەر، من شیو و یان هەردی یاریدەدەران دەگرمەبەر).

٣٩٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ زَيْدِ بْنِ جُدْعَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى أَنَسِ بْنِ

مَالِكٍ يُعَزِّيهِ فِيمَنْ أُصِيبَ مِنْ أَهْلِهِ وَبَنِي عَمِّهِ يَوْمَ الحَرَّةِ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ: إِنِّي أُبَشِّرُكَ بِبُشْرَى مِنَ اللهِ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَلِذَرَارِيِّ الأَنْصَارِ وَلِذَرَارِيِّ ذَرَارِيهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. ناقصوَقَدْ رَوَاهُ قَتَادَةُ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ.

واتە: لە زەیدی كوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پرسەنامەی نووسی بۆ ئەنەسی كوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ بەبۆنەی لەدەستدانی هەندێ لە كەسەكانی لە جەنگی حەڕەدا، بۆی نووسی: موژدەی خوایت پێ دەدەم، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (خودایە لە یاریدەدەران و وەچە و نەوەكانیان و وەچە و نەوەی نەوەكانیان خۆش ببە).

٣٩٠٣ - (ضعيف لكن صح منه الشطر الثاني) حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الخُزَاعِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، وَعَبْدُ الصَّمَدِ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ ثَابِتٍ البُنَانِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْرِئْ قَوْمَكَ السَّلاَمَ فَإِنَّهُمْ مَا عَلِمْتُ أَعِفَّةٌ صُبُرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبی (طلحة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (سەلامی من بگەیەنە بە قەومەكەت چونكە بێگومان ئەوەندەی من بیزانم دەس و دڵ پاكن و سواڵ ناكەن و لەكاتی جەنگدا خۆڕاگرن).

٣٩٠٤ - (منكر بذكر أهل البيت) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ قَالَ: حَدَّثَنِي الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَلاَ إِنَّ عَيْبَتِيَ الَّتِي آوِي إِلَيْهَا أَهْلُ بَيْتِي، وَإِنَّ كَرِشِيَ الأَنْصَارُ، فَاعْفُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ، وَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن، بێگومان جێگەی متمانە و دالّدەدەری تایبەتی من خانەوادە و کەسوکاری خۆمن، یاریدەدەران نهێنی پارێز و پشتیوانی منن، لە خراپەکاریان چاوپۆشی بکەن، لە چاکەکاریان وەربگرن).

٣٩٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ الهَاشِمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ الحَكَمِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ يُرِدْ هَوَانَ قُرَيْشٍ أَهَانَهُ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سەعدەوە، لە باوکیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك سوکایەتی بە قورەیش بکات، خوای گەورە سوکی دەکات).

٣٩٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، وَالمُؤَمَّلُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِي: لاَ يَبْغَضُ الأَنْصَارَ أَحَدٌ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (هیچ كەسێك نیە باوەڕی بە خوا و بە دوارۆژ هەبێ رقی لە یاریدەدەران بێ).

٣٩٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الأَنْصَارُ كَرِشِي وَعَيْبَتِي، وَإِنَّ النَّاسَ سَيَكْثُرُونَ وَيَقِلُّونَ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَتَجَاوَزُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (یاریدەدەران جێگەی متمانە و دالّدەدەری نهێنی پارێز و پشتیوانی منن، خەلّك زۆر دەبن و كەم دەكەن، لە چاكەكاریان وەربگرن، لە خراپەكاریان چاوپۆشی بكەن).

٣٩٠٨ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو يَحْيَى الحِمَّانِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اللَّهُمَّ أَذَقْتَ أَوَّلَ قُرَيْشٍ نَكَالاً فَأَذِقْ آخِرَهُمْ نَوَالاً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الوَرَّاقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأُمَوِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (خودایە قورەیش سەرەتا لەرۆژی جەنگی بەدردا سزای زۆرت پێ چەشتن بە كوشتن و زەبر و زەنگ، لەمەودوا ناز و نیعمەت و سەركەوتنیان پێ ببەخشە).

٣٩٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ جَعْفَرٍ الأَحْمَرِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ، وَلأَبْنَاءِ الأَنْصَارِ، وَلأَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ، وَلِنِسَاءِ الأَنْصَارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خودایە لە یاریدەدەران و نەوەكانیان و نەوەی نەوەكانیان و ئافرەتانیان خۆش ببە).

## دەربارەی باشترین خانەی یاریدەدەران ڕەزای خوایان لێ بێ

## ٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَيِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ

٣٩١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ دُورِ الأَنْصَارِ، أَوْ بِخَيْرِ الأَنْصَارِ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: بَنُو النَّجَّارِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ بَنُو عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ بَنُو الحَارِثِ بْنِ الخَزْرَجِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ بَنُو سَاعِدَةَ، ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ فَقَبَضَ أَصَابِعَهُ، ثُمَّ بَسَطَهُنَّ كَالرَّامِي بِيَدَيْهِ، قَالَ: وَفِي دُورِ الأَنْصَارِ كُلِّهَا خَيْرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا أَيْضًا عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ السَّاعِدِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن، باشترین خانەی یاریدەدەران یان باشترین یاریدەدەرانتان پێ ڕابگەیەنم؟) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (باشترین خانەی

یاریدەدەران خانەکانی بەنو نەجارن، لەپاشدا ئەوانەی دوای ئەوان بەنو (عبد الأشهل)، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان بەنو (حارث)ی کوڕی خەزرەج، جا ئەوانەی دوای ئەوان بەنو (ساعدة)، بە دەستی ئاماژەی کردوو فەرمووی: (خانەکانی یاریدەدەران هەر هەموویان خێر و چاکن).

٣٩١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ السَّاعِدِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرُ دُورِ الأَنْصَارِ دُورُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ دُورُ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ بَنِي الحَارِثِ بْنِ الخَزْرَجِ، ثُمَّ بَنِي سَاعِدَةَ، وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ، فَقَالَ سَعْدٌ: مَا أَرَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ قَدْ فَضَّلَ عَلَيْنَا، فَقِيلَ: قَدْ فَضَّلَكُمْ عَلَى كَثِيرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ اسْمُهُ: مَالِكُ بْنُ رَبِيعَةَ. وَقَدْ رُوِيَ نَحْوَ هَذَا عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَوَاهُ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، وَعُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو ئوسەیدی ساعدیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باشترین خانەی یاریدەدەران خانەکانی بەنو نەجارن، لەپاشدا ئەوانەی دوای ئەوان بەنو (عبد الأشهل)، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان بەنو (حارث)ی کوڕی خەزرەج، جا ئەوانەی دوای ئەوان بەنو (ساعدة)، خانەکانی یاریدەدەران هەر هەموویان خێر و چاکن). سەعد فەرمووی: پێم وایە باوی یاریدەدەران دا بەسەرماندا، وترا: بێگومان باوی ئێوەی داوە بەسەر زۆردا.

٣٩١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو السَّائِبِ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرُ دِيَارِ الأَنْصَارِ بَنُو النَّجَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باشترین خانەکانی یاریدەدەران خانەکانی بەنو نەجارن).

٣٩١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو السَّائِبِ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْرُ الأَنْصَارِ بَنُو عَبْدِ الأَشْهَلِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باشترین خانەکانی یاریدەدەران خانەکانی بەنو بەنو عەبد ( عبد الأشهل)ن).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی مەدینەی مونەووەرە

## ٦٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الْمَدِينَةِ

٣٩١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِحَرَّةِ السُّقْيَا الَّتِي كَانَتْ لِسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ائْتُونِي بِوَضُوءٍ، فَتَوَضَّأَ ثُمَّ قَامَ فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ عَبْدَكَ وَخَلِيلَكَ وَدَعَا

لأَهْلِ مَكَّةَ بِالبَرَكَةِ، وَأَنَا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ أَدْعُوكَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ أَنْ تُبَارِكَ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَصَاعِهِمْ مِثْلَيْ مَا بَارَكْتَ لأَهْلِ مَكَّةَ مَعَ البَرَكَةِ بَرَكَتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەتەك پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دەرچووین هەتا گەیشتینە حەرەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص — شوێنێکە لەدەوری مەدینە بەردی ڕەشی لێ بووە بۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە — ، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووی: (ئاوی دەستنوێژم بۆ بێنە). دەستنوێژی گرت و هەستا ڕووی کردە قیبلە، فەرمووی: (خودایە ئیبراهیم بەندە و دۆست و خۆشەویستی تۆیە دوعای بۆ فەڕ و بەرەکەتی کرد بۆ خەڵکی مەککە، تۆش فەڕو و بەرەکەتی خۆتت ڕژاند بەسەر خەڵکی مەککەدا، منیش بەندە و پێغەمبەری تۆم لێت دەپاڕێمەوە بۆ خەڵکی مەدینە پیت و بەرەکەت بخەیتە کێشانە و پێوانەی مشت و مەنیانەوە، دوو ئەوەندەی ئەو خێر و بەرەکەتەی بەخشیت بە شاری مەککە).

٣٩١٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو نُبَاتَةَ يُونُسُ بْنُ يَحْيَى بْنِ نُبَاتَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ وَرْدَانَ، عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْمُعَلَّى، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلی و ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویانە: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نێوان ماڵی من بۆ مینبەرەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت).

٣٩١٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَامِلٍ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ الزَّاهِدُ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ رَبَاحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الحَرَامَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نێوان ماڵی من بۆ مینبەرەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت). هەروەها فەرموویەتی: (نوێژکردن لەم مزگەوتەی مندا خێر و چاکەی هەزار نوێژی غەیری ئەم مزگەوتەی هەیە، جگە لە مزگەوتی حەرام).

٣٩١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ اسْتَطَاعَ أَنْ يَمُوتَ بِالمَدِينَةِ فَلْيَمُتْ بِهَا، فَإِنِّي أَشْفَعُ لِمَنْ يَمُوتُ بِهَا. وَفِي البَابِ عَنْ سُبَيْعَةَ بِنْتِ الحَارِثِ الأَسْلَمِيَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی ئەتوانێ لە مەدینە بمرێ با لە لەوێ بمرێت، بێگومان من تکا دەکەم بۆ ئەو کەسەی لە مەدینە دەمرێت).

٣٩١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ مَوْلَاةً لَهُ أَتَتْهُ فَقَالَتْ:

اشْتَدَّ عَلَيَّ الزَّمَانُ، وَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَخْرُجَ إِلَى العِرَاقِ. قَالَ: فَهَلاَّ إِلَى الشَّامِ أَرْضِ الْمَنْشَرِ اصْبِرِي لَكَاعِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ صَبَرَ عَلَى شِدَّتِهَا وَلأْوَائِهَا كُنْتُ لَهُ شَهِيدًا أَوْ شَفِيعًا يَوْمَ القِيَامَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَسُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ، وَسُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللَّهِ.

واتە: کارەکەرێکی ئازادکراوی ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ هاتە خزمەتی وتی: رۆژگاری ناهەموار زۆری بۆ هێناوم و دەستم کورتە بۆیە ئەمەوێ لێرە دەرچم و برۆم بۆ عێراق، ئیبنو عومەر فەرمووی: ئەی بۆ ناچی بۆ شام خاکی مەحشەر و دەشتی کۆبوونەوەیە، خۆڕاگربە و مەدینە بەجێ مەهێڵە، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەوەی خۆڕاگربێ بەرامبەر ئەشکەنجە و ئازاری و نەهامەتی و کەم درامەتی شاری مەدینە لەرۆژی قیامەتدا من شایەتی بۆ دەدەم یان تکای بۆ دەکەم).

٣٩١٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو السَّائِبِ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبِي جُنَادَةُ بْنُ سَلْمٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: آخِرُ قَرْيَةٍ مِنْ قُرَى الإِسْلاَمِ خَرَابًا الْمَدِينَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ جُنَادَةَ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کۆتا شار و وڵاتی ئیسلام کە وێران دەبێ شاری مەدینەیە).

٣٩٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا

بَايَعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الإِسْلاَمِ فَأَصَابَهُ وَعَكٌ بِالمَدِينَةِ فَجَاءَ الأَعْرَابِيُّ، إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا الْمَدِينَةُ كَالكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَتُنَصِّعُ طَيِّبَهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: عەرەبێكی دەشتەكی بەیعەت و پەیمانی دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر ئیسلامەتی، تووش بوو تاو لەرزی مەدینە هات، عەرەبە دەشتەكیەكە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: پەیمانەكەم هەڵوەشێنەرەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، قبوولی نەكرد و رازی نەبوو، عەرەبە دەشتەكیەكە دەرچوو رۆشت، لە پاشدا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: پەیمانەكەم هەڵوەشێنەرەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، قبوولی نەكرد و رازی نەبوو، عەرەبە دەشتەكیەكە پەیمانەكەی شكاند و رۆشتەوە بۆ ولاتی خۆی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بێگومان شاری مەدینە وەك كورە و موشەدەمە وایە ژەنگ و پیسی لا دەبات و جەوهەری دەردەخات). - واتە ئەوەی خێری تێدا نەبێ دەری دەكات - .

٣٩٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لَوْ رَأَيْتُ الظِّبَاءَ تَرْتَعُ بِالمَدِينَةِ مَا ذَعَرْتُهَا، إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا حَرَامٌ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَرَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، وَسَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ وَجَابِرٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر لە شاری مەدینە ئاسکەکان ببینم بلەوەڕێن دایان ناچڵەکێنم و نایانترسێنم، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەمپەڕو ئەو پەڕی مەدینەو نێوانی هەردوو رۆژهەڵات و خۆرئاوای قەدەغەیە).

٣٩٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ (ح) وحَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَلَعَ لَهُ أُحُدٌ، فَقَالَ: هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ، وَإِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چیای ئوحودی لێوە دەرکەوت فەرمووی: (ئەم کێوە ئێمەی خۆش دەوێ ئێمەش ئەومان خۆش دەوێت، خودایە ئیبراهیم مەککەی قەدەغەکرد، منیش نێوانی هەردوو رۆژهەڵات و خۆرئاوای مەدینە و ئەمپەڕو ئەو پەڕی قەدەغە دەکەم).

٣٩٢٣ - (موضوع) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ عِيسَى بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ عَبْدِ اللهِ العَامِرِيِّ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ اللهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَيَّ هَؤُلاَءِ الثَّلاَثَةِ نَزَلْتَ فَهِيَ دَارُ هِجْرَتِكَ: الْمَدِينَةَ، أَوِ البَحْرَيْنِ، أَوْ قِنَّسْرِينَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الفَضْلِ بْنِ مُوسَى.

واتە: لە جەریری کوڕی (عبد الله)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە وەحی بۆ ناردم: لەم سێ شوێنە لە کامیان دابەزیت ئەوە (دار الهجرة)خانەی کۆچکردنی تۆیە:

مەدینە یان بەحرەین یا قینەسرین). قینەسرین شوێنێكە لە شام.

٣٩٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ صَالِحِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَصْبِرُ عَلَى لأْوَاءِ الْمَدِينَةِ وَشِدَّتِهَا أَحَدٌ إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَفِيعًا أَوْ شَهِيدًا يَوْمَ القِيَامَةِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. وَصَالِحُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ أَخُو سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێك خۆڕاگربێ بەرامبەر ئەشكەنجە و ئازاری و نەهامەتی و كەم درامەتی شاری مەدینە لەڕۆژی قیامەتدا من تكای بۆ دەكەم یان شایەتی بۆ دەدەم).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی مەككەی پیرۆز

## ٦٩ - بَابٌ فِي فَضْلِ مَكَّةَ

٣٩٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ حَمْرَاءَ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاقِفًا عَلَى الحَزْوَرَةِ فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللهِ، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللهِ إِلَى اللهِ، وَلَوْلاَ أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ رَوَاهُ يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، نَحْوَهُ وَرَوَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَدِيثُ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ حَمْرَاءَ عِنْدِي أَصَحُّ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەدی كوڕی حەمرائەوە رەزای خوای لێ بێ

دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی لە حەزوەرە راوەستابوو — شوێنێکە لە مەککە —، فەرمووی: (سوێند بە (الله) ئەمە چاکترین زەوی و خاکی خوایە، خۆشەویسترین زەوی و خاکی خوایە بەلای خواوە، ئەگەر لە مەککە دەریانەکردمایە هەرگیز لێی دەرنەئەچووم).

٣٩٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ خُثَيْمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ، وَأَبُو الطُّفَيْلِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَكَّةَ: مَا أَطْيَبَكِ مِنْ بَلَدٍ، وَأَحَبَّكِ إِلَيَّ، وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمِي أَخْرَجُونِي مِنْكِ مَا سَكَنْتُ غَيْرَكِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە مەککەی فەرموو: (چەند وڵاتێکی خۆش و خۆشەویستی بەلامەوە، ئەگەر قەمەکەم دەریانەکردمایە لە هیچ شوێنێکی تر نیشتەجێ نەدەبووم).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی عەرەب

## ٧٠ - بَابٌ فِي فَضْلِ العَرَبِ

٣٩٢٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى الأَزْدِيُّ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو بَدْرٍ شُجَاعُ بْنُ الوَلِيدِ، عَنْ قَابُوسَ بْنِ أَبِي ظَبْيَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَلْمَانَ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا سَلْمَانُ لاَ تَبْغَضْنِي فَتُفَارِقَ دِينَكَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ كَيْفَ أَبْغَضُكَ وَبِكَ هَدَانَا اللَّهُ؟ قَالَ: تَبْغَضُ العَرَبَ فَتَبْغَضُنِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي بَدْرٍ شُجَاعِ بْنِ الوَلِيدِ.

وسَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، يَقُولُ: أَبُو ظَبْيَانَ لَمْ يُدْرِكْ سَلْمَانَ، مَاتَ سَلْمَانُ قَبْلَ عَلِيٍّ.

واتە: لە سەلمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (ئەی سەلمان، ڕقت لە من نەبێ لەدین دادەبڕێی)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن ڕقم لە تۆ دەبێ لەكاتێكدا بەهۆی تۆوە خوا هیدایەتی داوین بۆ سەر ڕێبازی ئیسلام؟ فەرمووی: (ئەگەر ڕقت لە عەرەب بێ بەگشتی ئەوە ڕقیشت لە منە).

٣٩٢٨ - (موضوع) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ العَبْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ حُصَيْنِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ مُخَارِقِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ غَشَّ العَرَبَ لَمْ يَدْخُلْ فِي شَفَاعَتِي وَلَمْ تَنَلْهُ مَوَدَّتِي. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حُصَيْنِ بْنِ عُمَرَ الأَحْمَسِيِّ عَنْ مُخَارِقٍ، وَلَيْسَ حُصَيْنٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ بِذَاكَ القَوِيِّ.

واتە: لە پێشەوا عوسمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموویەتی: (هەركەسێك غەش بكات لە عەرەب، بەر تكا و شەفاعەتی من ناكەوێت و خۆشەویستی و دۆستایەتی من بەدەست ناهێنێ).

٣٩٢٨ - (موضوع) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ العَبْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ حُصَيْنِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ مُخَارِقِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ غَشَّ العَرَبَ لَمْ يَدْخُلْ فِي شَفَاعَتِي وَلَمْ تَنَلْهُ مَوَدَّتِي. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ

نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حُصَيْنِ بْنِ عُمَرَ الأَحْمَسِيِّ عَنْ مُخَارِقٍ، وَلَيْسَ حُصَيْنٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ بِذَاكَ القَوِيِّ.

واتە: لە پێشەوا عوسمانەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموویەتی: (هەركەسێك غەش بكات لە عەرەب، بەر تكا و شەفاعەتی مـن ناكەوێت و خۆشەویستی منیش بەدەست ناهێنێت).

٣٩٢٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي رَزِينٍ، عَنْ أُمِّهِ قَالَتْ: كَانَتْ أُمُّ الحَرِيْرِ، إِذَا مَاتَ أَحَدٌ مِنَ العَرَبِ اشْتَدَّ عَلَيْهَا، فَقِيلَ لَهَا: إِنَّا نَرَاكِ إِذَا مَاتَ رَجُلٌ مِنَ العَرَبِ اشْتَدَّ عَلَيْكِ. قَالَتْ: سَمِعْتُ مَوْلاَيَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مِنْ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ هَلاَكُ العَرَبِ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي رَزِينٍ: وَمَوْلاَهَا طَلْحَةُ بْنُ مَالِكٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سُلَيْمَانَ بْنِ حَرْبٍ.

واتە: لە موحەممەدی كوڕی ئەبی رەزینەوە، لە دایكیەوە دەگێڕنەوە، كە عەرەبێ بمردایە ئوممو حەریر زۆر لەبەری قورس و گران بوو، پێی وترا: ئەوە بۆچی؟ وتی: بـۆ خۆم گوێم لە گەورەكەم بـوو دەیفـەرموو: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (یـەكێك لـە نیشـانەكانی نزیكبوونـەوەی قیامـەت لەناوچـوونی چاكەكانی عەرەبە).

٣٩٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى الأَزْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، يَقُولُ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ شَرِيكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لَيَفِرَّنَّ النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ حَتَّى يَلْحَقُوا بِالجِبَالِ. قَالَتْ أُمُّ شَرِيكٍ: يَا رَسُولَ اللهِ فَأَيْنَ العَرَبُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: هُمْ قَلِيلٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئوممو شورەیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵك لە دەججال هەڵدێن و پەنا دەبەنە بەر کێوەکان). ئوممو شورەیك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەوکاتەدا عەرەب لە کوێن؟ فەرمووی: (ئەوکاتە عەرەب ژمارەیان زۆر کەمە).

٣٩٣١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: سَامٌ أَبُو العَرَبِ، وَيَافِثُ أَبُو الرُّومِ، وَحَامٌ أَبُو الحَبَشِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَيُقَالُ: يَافِثُ وَيَافِتُ وَيَفَثُ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سام باوکی عەرەبەکانە، (یافث) باوکی ڕۆمەکانە، حام باوکی حەبەشیەکانە). دەڵێن: (یافث) و یافت و (یفث).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی عەجەم

## ٧١ - بَابٌ فِي فَضْلِ العَجَمِ

٣٩٣٢ - (ضعيف) أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ، مَوْلَى عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: ذُكِرَتِ الأَعَاجِمُ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لأَنَا بِهِمْ أَوْ بِبَعْضِهِمْ أَوْثَقُ مِنِّي بِكُمْ أَوْ بِبَعْضِكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، وَصَالِحٌ هَذَا يُقَالُ لَهُ: صَالِحُ بْنُ مِهْرَانَ مَوْلَى عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم باسی عەجەمەکان کرا، ئەویش فەرمووی: (من بە هەندێ لەوان متمانەم زیاترە بە هەندێ لەئێوە).

٣٩٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ثَوْرُ بْنُ زَيْدٍ الدِّيْلِيُّ، عَنْ أَبِي الغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أُنْزِلَتْ سُورَةُ الجُمُعَةِ فَتَلاَهَا، فَلَمَّا بَلَغَ (وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ) قَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِنَا؟ فَلَمْ يُكَلِّمْهُ. قَالَ: وَسَلْمَانُ الفَارِسِيُّ فِينَا. قَالَ: فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ، فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَ الإِيمَانُ بِالثُّرَيَّا لَتَنَاوَلَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلاَءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین کاتێ سورەتی (الجمعة) دابەزی، خوێندیەوە بۆمان، کە گەیشتە ئەم ئایەتە: **(وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ)** سورة الجمعة: ٣. واتە: وە ئەو پەیامبەرەی نارد، بۆ خەڵکانێکی تریش کە هێشتای پێیان نەگەیشتوون، واتە: لە دوای چەرخی ئەوانەوە دێن، کەوابوو پەیامبەرێکی گشتی خەڵکانی جیهانە.

پیاوێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەبێ ئەو خەڵکانەی تر کێبن کە تۆ پێغەمبەری ئەوانیشی؟ قسەی لەگەڵ نەکرد، وتی: سەلمانی فارسی لەناوماندا بوو، پەیامبەر صلی الله علیه وسلم دەستی خستە سەر شانی، فەرمووی: (سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، ئەگەر ئیمان لە ئەستێرەی سورەییا بێ پیاوانێ لەمانە خۆیانی دەگەیەننێ).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی یەمەن

## ٧٢ - بَابٌ فِي فَضْلِ اليَمَنِ

٣٩٣٤ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ القَطَّانُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَظَرَ قِبَلَ اليَمَنِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ أَقْبِلْ بِقُلُوبِهِمْ، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَمُدِّنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِمْرَانَ القَطَّانِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرەو یەمەن دەیڕوانی فەرمووی: (خودایە دڵی یەمەنیەکان روو بکەیتە ئێمە چونکە خواردنیان لەوێوە بۆ دەهات، خودایە فەڕ و بەرەکەت بخەیتە مەن و مشتمان). بە مەن و مشت پێوانەیان دەکرد.

٣٩٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَاكُمْ أَهْلُ اليَمَنِ، هُمْ أَضْعَفُ قُلُوبًا، وَأَرَقُّ أَفْئِدَةً، الإِيمَانُ يَمَانٍ، وَالحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي مَسْعُودٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵکی یەمەن هاتنە لاتان، دڵیان نەرم و ناسکە، باوەڕ و حیکمەت و دانایی یەمەنیە).

٣٩٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مَرْيَمَ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُلْكُ فِي قُرَيْشٍ، وَالقَضَاءُ فِي الأَنْصَارِ، وَالأَذَانُ فِي الحَبَشَةِ، وَالأَمَانَةُ فِي الأَزْدِ يَعْنِي: اليَمَنَ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ أَبِي مَرْيَمَ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ زَيْدِ بْنِ حُبَابٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قورەیش و دەسەلات، یاریدەدەران و دادپەروەری، حەبەشە و بانگدان — ئەوە بوو بیلالی حەبەشی بانگدەری بوو - ، ئەزد واتە یەمەن و ئەمانەت و دەستپاكی). ئەو شتانە هەر لەخۆیان جوانە.

٣٩٣٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ القُدُّوسِ بْنُ مُحَمَّدٍ العَطَّارُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمِّي صَالِحُ بْنُ عَبْدِ الكَبِيرِ بْنِ شُعَيْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمِّي عَبْدُ السَّلَامِ بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الأَزْدُ أَزْدُ اللهِ فِي الأَرْضِ يُرِيدُ النَّاسُ أَنْ يَضَعُوهُمْ وَيَأْبَى اللهُ إِلاَّ أَنْ يَرْفَعَهُمْ، وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَقُولُ الرَّجُلُ: يَا لَيْتَ أَبِي كَانَ أَزْدِيًّا يَا لَيْتَ أُمِّي كَانَتْ أَزْدِيَّةً. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. وَرُوِيَ عَنْ أَنَسٍ بِهَذَا الإِسْنَادِ مَوْقُوفًا وَهُوَ عِنْدَنَا أَصَحُّ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵكی ئەزد واتە یەمەن سەرباز و یاریدەدەر و پشتیوانی دینی خوان لەسەر زەوی دا، بەوە خوا رێزی لێ گرتوون، خەڵك دەیانەوێ سەرشۆڕیان بكەن، بەڵام خوای گەورە

سەربەرزیان دەکات و سەردەکەون بەسەر دوژمنانی دینەکەیاندا، ڕۆژگاریٚ دێتە پێشەوە، پیاو دەڵێ: خۆزگە دایك و باوکم ئەزدی واتە یەمەنی بویایەن).

٣٩٣٩ - (موضوع) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ زَنْجُوَيْهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ مِينَاءَ، مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَاءَهُ رَجُلٌ، أَحْسَبُهُ مِنْ قَيْسٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ العَنْ حِمْيَرًا، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ جَاءَهُ مِنْ الشِّقِّ الآخَرِ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ جَاءَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ جَاءَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَحِمَ اللَّهُ حِمْيَرًا، أَفْوَاهُهُمْ سَلاَمٌ، وَأَيْدِيهِمْ طَعَامٌ، وَهُمْ أَهْلُ أَمْنٍ وَإِيمَانٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ. وَيُرْوَى عَنْ مِينَاءَ أَحَادِيثُ مَنَاكِيرُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، پیاویٚ هات پێم وایە لە هۆزی قەیس بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەت بکە لە هۆزی حیمیەر بەدوور بن لە ڕەحمەتی خوا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پشتی تیٚ کرد، لەپاشدا لەلایەکی ترەوە هاتەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پشتی تیٚ کرد، ئینجا لەلایەکی ترەوە هاتەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەر پشتی تیٚ کرد، جا لەلایەکی ترەوە هاتەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پشتی تیٚ کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا لە حیمیەر، خەڵك لە دەم و زمانیان سەلامەتە، دەستیان پڕە لە خواردن واتە ناندەرن، خەڵکی خاوەن باوەڕ و سەلامەتن و زینیان بۆ کەس نیە).

## فەزڵ و گەورەیی هۆزی جوهەینە و موزەینە

## ٧٣ - بَابٌ فِي غِفَارٍ وَأَسْلَمَ وَجُهَيْنَةَ وَمُزَيْنَةَ

٣٩٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مَالِكٍ الأَشْجَعِيُّ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الأَنْصَارُ وَمُزَيْنَةُ وَجُهَيْنَةُ وَغِفَارٌ وَأَشْجَعُ وَمَنْ كَانَ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ مَوَالِيَّ، لَيْسَ لَهُمْ مَوْلًى دُونَ اللهِ، وَاللهُ وَرَسُولُهُ مَوْلاَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (یاریدەدەران و هۆزەكانی موزەینە و جوهەینە و غیفار و ئەشجەع ئەوانەی لە هۆزی بەنی (عبد الدار)ن ئەمانە یار و یاوەری منن، جگە لە خوای گەورە كەس یار و یاوەریان نیە، خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی یار و یاوەریانن).

٣٩٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ، وَغِفَارٌ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَعُصَيَّةُ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆزی ئەسلەم خوا سەلامەتیان بكات، هۆزی غیفار خوا لێیان خۆش بێ، هۆزی عوصەییە لە خوا و پێغەمبەرەكەی یاخی بوون).

## فەزڵ و گەورەیی هۆزی (ثقیف) و بەنی حەنیفە

## ٧٤ - بَابٌ فِي ثَقِيفٍ وَبَنِي حَنِيفَةَ

٣٩٤٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ خُثَيْمٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ أَحْرَقَتْنَا نِبَالُ ثَقِيفٍ فَادْعُ اللهَ عَلَيْهِمْ. قَالَ: اللَّهُمَّ اهْدِ ثَقِيفًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، تیرەكانی هۆزی (ثقیف) سوتاندوینی، دوعای شەڕیان لێ بكە لەلای خوای گەورە، فەرمووی: (خودایە هیدایەتی هۆزی (ثقیف) بدەی بۆ سەر دینی ئیسلام).

٣٩٤٣ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ الطَّائِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ القَاهِرِ بْنُ شُعَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: مَاتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَكْرَهُ ثَلاَثَةَ أَحْيَاءٍ ثَقِيفًا وَبَنِي حَنِيفَةَ وَبَنِي أُمَيَّةَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەتا وەفاتی كرد، حەزی لەم سێ خێڵە نەدەكرد: خێڵی (ثقیف) و خێڵی بەنی حەنیفە و خێڵی بەنی ئومەییە.

٣٩٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُصْمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فِي ثَقِيفٍ كَذَّابٌ وَمُبِيرٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرمووبـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە هۆزی (ثقیـف) درۆزنێـك و خەڵك لەناوبەرێ پەیدا دەبن). - درۆزنەکە موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی سەقەفی بوو، خەڵك لەناوبەرەکەش حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی بوو - .

٣٩٤٤م- حَـدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْـنُ وَاقِـدٍ، قَـالَ: حَـدَّثَنَا شَـرِيكٌ، بِهَـذَا الإِسْنَادِ نَحْـوَهُ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُصْمٍ يُكْنَى أَبَا عُلْوَانَ، وَهُوَ كُوفِيٌّ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ، وَشَرِيكٌ يَقُولُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عُصْمٍ، وَإِسْرَائِيلُ يَرْوِي عَنْ هَذَا الشَّيْخِ وَيَقُولُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عِصْمَةَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ.

٣٩٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَيُّوبُ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَهْدَى لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَكْرَةً فَعَوَّضَهُ مِنْهَا سِتَّ بَكَرَاتٍ فَتَسَخَّطَهَا، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ فُلاَنًا أَهْدَى إِلَيَّ نَاقَةً فَعَوَّضْتُهُ مِنْهَا سِتَّ بَكَرَاتٍ فَظَلَّ سَاخِطًا، لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لاَ أَقْبَلَ هَدِيَّةً إِلاَّ مِنْ قُرَشِيٍّ أَوْ أَنْصَارِيٍّ أَوْ ثَقَفِيٍّ أَوْ دَوْسِيٍّ. وَفِي الْحَدِيثِ كَلاَمٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا. هَذَا حَدِيثٌ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ يَرْوِي عَنْ أَيُّوبَ أَبِي الْعَلاَءِ وَهُوَ أَيُّوبُ بْنُ مِسْكِينٍ وَيُقَالُ: ابْنُ أَبِي مِسْكِينٍ، وَلَعَلَّ هَذَا الْحَدِيثَ الَّذِي رُوِيَ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ هُوَ: أَيُّوبُ أَبُو العَلاَءِ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرمووبـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فلأن کەس وشترێکی بـەدیاری بۆ هێنام، منـیش بـە شـەش بەچکە وشتر قـەرەبووم بـۆ کـردەوە بـەڵام ئـەو هـەر

نارازییە، بەڕاستی نیازم کرد دیاری وەرنەگرم مەگەر لە کەسێکی قورەیشی یان کەسێ لە یاریدەدەران، یا لە کەسێکی سەقەفی یا دەوسی).

٣٩٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ خَالِدٍ الحِمْصِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أَهْدَى رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاقَةً مِنْ إِبِلِهِ الَّتِي كَانُوا أَصَابُوا بِالغَابَةِ فَعَوَّضَهُ مِنْهَا بَعْضَ العِوَضِ فَتَسَخَّطَ، فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: إِنَّ رِجَالاً مِنَ العَرَبِ يُهْدِي أَحَدُهُمُ الهَدِيَّةَ فَأُعَوِّضُهُ مِنْهَا بِقَدْرِ مَا عِنْدِي ثُمَّ يَتَسَخَّطُهُ فَيَظَلُّ يَتَسَخَّطُ فِيهِ عَلَيَّ، وَايْمُ اللهِ لاَ أَقْبَلُ بَعْدَ مَقَامِي هَذَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ العَرَبِ هَدِيَّةً إِلاَّ مِنْ قُرَشِيٍّ أَوْ أَنْصَارِيٍّ أَوْ ثَقَفِيٍّ أَوْ دَوْسِيٍّ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ يَزِيدَ بْنِ هَارُونَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی بنی فەزارە وشترێکی کردە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش بە گوێرەی ئەوەی کە لەلای بوو قەرەبووی بۆ کردەوە، بەڵام ئەو هەر نارازی بوو، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: (بەڕاستی کەسانێ لە عەرەب یەکێ لەوان دیاریم بۆ دەهێنێ، منیش بە گوێرەی ئەوەی کە لەلامە قەرەبووی بۆ دەکەمەوە، بەڵام ئەو هەر نارازییە، سوێند بە (الله) لەپاش ئەمڕۆ دیاری لە هیچ پیاوێکی عەرەب وەرناگرم مەگەر لە کەسێکی قورەیشی یان کەسێ لە یاریدەدەران، یا لە کەسێکی سەقەفی یا کەسێکی دەوسی).

٣٩٤٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَلاَذٍ يُحَدِّثُ، عَنْ نُمَيْرِ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ مَسْرُوحٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ الأَشْعَرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نِعْمَ الحَيُّ الأَسْدُ وَالأَشْعَرُونَ، لاَ يَفِرُّونَ فِي القِتَالِ، وَلاَ يَغُلُّونَ، هُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ. قَالَ: فَحَدَّثْتُ بِذَلِكَ مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ: لَيْسَ هَكَذَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: هُمْ مِنِّي وَإِلَيَّ، فَقُلْتُ: لَيْسَ هَكَذَا حَدَّثَنِي أَبِي، وَلَكِنَّهُ حَدَّثَنِي قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: هُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ. قَالَ: فَأَنْتَ أَعْلَمُ بِحَدِيثِ أَبِيكَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ وَهْبِ بْنِ جَرِيرٍ، وَيُقَالُ: الأَسْدُ هُمُ الأَزْدُ.

واتە: لە عامیری كوڕی ئەبی عامیری ئەشعەریەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (باشترین خێڵ خێڵی ئەسەد و ئەشعەریەكانن، لەكاتی جەنگدا خۆڕاگرن و هەڵنایەن، دزی لە دەستكەوتی جەنگی و غەنیمەت ناكەن، من پابەندم بەوانەوە و ئەوانیش پابەندن بە منەوە).

٣٩٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ، وَغِفَارٌ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَأَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ، وَبُرَيْدَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هۆزی ئەسلەم خوا سەلامەتیان بكات، هۆزی غیفار خوا لێیان خۆش بێ).

٣٩٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، نَحْوَ حَدِيثِ شُعْبَةَ، وَزَادَ فِيهِ: وَعُصَيَّةُ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی دینارەوە، فەرموودەکەی شوعبە بە هەمان شێوە هاتووە، ئەمەی بۆ زیاد کرد: (هۆزی عوصەییە لە خوا و پێغەمبەرەکەی یاخی بوون).

٣٩٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَغِفَارٌ وَأَسْلَمُ وَمُزَيْنَةُ وَمَنْ كَانَ مِنْ جُهَيْنَةَ،، أَوْ قَالَ جُهَيْنَةُ، وَمَنْ كَانَ مِنْ مُزَيْنَةَ، خَيْرٌ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ أَسَدٍ وَطَيِّئٍ وَغَطَفَانَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەوەی گیانی گیانی منی بەدەستە هۆزەکانی غیفار و ئەسلەم و موزەینە و جوهەینە لەڕۆژی قیامەتدا چاکترن لەلای خوا لە هۆزەکانی ئەسەد و (طيي) و (غطفان)).

٣٩٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ جَامِعِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: جَاءَ نَفَرٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: أَبْشِرُوا يَا بَنِي تَمِيمٍ. قَالُوا: بَشَّرْتَنَا فَأَعْطِنَا، قَالَ: فَتَغَيَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَجَاءَ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ اليَمَنِ فَقَالَ: اقْبَلُوا البُشْرَى فَلَمْ يَقْبَلْهَا بَنُو تَمِيمٍ، قَالُوا: قَدْ قَبِلْنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چەند کەسێ لە بەنی تەمیم هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەی بەنی تەمیم موژدەتان لێ بێ)، وتیان: موژدەت

پێ داوین، ماڵ و سامانمان بدەرێ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رووی گۆڕا، چەند کەسێ لە خەڵکی یەمەن هاتن بۆ خزمەتی فەرمووی: ئەو موژدە قبوڵ بکەن کە بەنی تەمیم قبوڵیان نەکرد، وتیان: بێگومان قبوڵمانە.

٣٩٥٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَسْلَمُ وَغِفَارٌ وَمُزَيْنَةُ خَيْرٌ مِنْ تَمِيمٍ وَأَسَدٍ وَغَطَفَانَ وَبَنِي عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ. يَمُدُّ بِهَا صَوْتَهُ فَقَالَ القَوْمُ: قَدْ خَابُوا وَخَسِرُوا. قَالَ: فَهُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبی بکرەوە، لە باوکیەوە ەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هۆزەکانی ئەسلەم و غیفار و موزەینە چاکترن لە هۆزەکانی تەمیم و (غطفان) بەنی عامیر و بەنی صەعصەعە). دەنگی بەرزکردەوە، خەڵکەکە وتیان: بێگومان رەنجەڕۆ و خەسارەت مەند بوون و تیاچوون، فەرمووی: (ئەوان چاکترن لەوان واتە هۆزەکانی ئەسلەم و غیفار و موزەینە چاکترن لە هۆزەکانی تەمیم و (غطفان) بەنی عامیر و بەنی صەعصەعە).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی شام و یەمەن

## ٧٥ - بَابٌ فِي فضل الشام واليمن

٣٩٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ آدَمَ ابْنُ ابْنَةِ أَزْهَرَ السَّمَّانِ قَالَ: حَدَّثَنِي جَدِّي أَزْهَرُ السَّمَّانُ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا. قَالُوا: وَفِي نَجْدِنَا. فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا. قَالُوا: وَفِي نَجْدِنَا. قَالَ: هُنَالِكَ الزَّلَازِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا، أَوْ قَالَ: مِنْهَا يَخْرُجُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَوْنٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خودایە پیت و بەرەکەت بخەیتە شام و یەمەنمانەوە)، وتیان: نەجدیشمان، فەرمووی: (لەوێوە بومەلەرزە و ئاژاوە و ئاشوب و بشێوی پەیدا دەبێت)، یان فەرمووی: (هەر لەوێوە شاخی شەیتانیش سەردەردێنێ).

٣٩٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ أَيُّوبَ، يُحَدِّثُ عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِمَاسَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نُؤَلِّفُ القُرْآنَ مِنَ الرِّقَاعِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: طُوبَى لِلشَّامِ، فَقُلْنَا: لِأَيٍّ ذَلِكَ يَا

رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لأَنَّ مَلاَئِكَةَ الرَّحْمَنِ بَاسِطَةٌ أَجْنِحَتَهَا عَلَيْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ أَيُّوبَ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە پارچە چەرم و بەر و ئێسقانەکان قورئانمان کۆدەکردەوە، فەرمووی: (خۆشی لە خەڵکی شام)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بۆچی؟ ەرمووی: مەلائیکەکانی خوا باڵیان کێشاوە بەسەر خۆی و خەڵکەکەیدا و دەیانپارێزن لە دوژمنان).

٣٩٥٥ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ يَفْتَخِرُونَ بِآبَائِهِمُ الَّذِينَ مَاتُوا، إِنَّمَا هُمْ فَحْمُ جَهَنَّمَ، أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللهِ مِنَ الجُعَلِ الَّذِي يُدَهْدِهُ الخِرَاءَ بِأَنْفِهِ، إِنَّ اللَّهَ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الجَاهِلِيَّةِ وَفَخْرَهَا بِالآبَاءِ، إِنَّمَا هُوَ مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ، النَّاسُ كُلُّهُمْ بَنُو آدَمَ وَآدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرَابٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دەبێ کەسانێك وازبهێنن لە شانازی کردن بە باو باپیرانیانەوە ئەوانەیان کە مردوون، بێگومان ئەوانە خەڵوزی دۆزەخن، یان بێ بایەخترن لەلای خوا لەو قالۆنچەیەی کە بە لووتی پیسایی تل دەدات، بەڕاستی خوای گەورە لوت بەرزی و خۆ بەزلزانینی نەفامی و شانازیکردن بە باب و باپیرانی لەسەرتان لابردووە، خەڵك دوو جۆر کەسن: کەسێکی چاکەکار و

لە خوا ترس و بەڕێز لەلای خوا، یان کەسێکی خراپکاری نەگبەتی سوك و ریسوا لەلای خوا، سەرجەم خەڵك لەنەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە).

٣٩٥٦ - (حسن) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مُوسَى بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ الْفَرْوِيُّ الْمَدَنِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَدْ أَذْهَبَ اللَّهُ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَفَخْرَهَا بِالآبَاءِ، مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ، وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَذَا أَصَحُّ عِنْدَنَا مِنَ الْحَدِيثِ الأَوَّلِ، وَسَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ قَدْ سَمِعَ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَيَرْوِي عَنْ أَبِيهِ أَشْيَاءَ كَثِيرَةً، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَقَدْ رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ أَبِي عَامِرٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی خوای گەورە لوت بەرزی و خۆ بەزلزانینی نەفامی و شانازیکردن بە باب و باپیرانەوەی لەسەرتان لابردووە، خەڵك دوو جۆر کەسن: کەسێکی چاکەکار و لە خوا ترس و بەڕێز لەلای خوا، یان کەسێکی خراپکاری نەگبەتی سوك و ریسوا لەلای خوا، سەرجەم خەڵك لەنەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵە).

کۆتایی

ناصح سازانی

سلێمانی ٢١/ ٣/ ٢٠١٥ - ١٤٣٦ کۆچی دەستم پێ کرد

لە ٤ / ٧ / ٢٠١٧ – ١٤٣٨ی کۆچی کۆتایی هات

# ناوەرۆك